د.عەبدوڕڕەحمان عەبدوڕڕەحمان نەقیب

# بەدەم کاروانی ئیسلامیێتی مەعریفەوە

وەرگێڕانی:
محەمەد کەریم ئەحمەد
مەروان کەریم ئەحمەد

لە بڵاوکراوەکانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٦٠)

بەدەم کاروانی ئیسلامیێتی مەعریفەوە

محەمەد کەریم ئەحمەد
و.
مەروان کەریم ئەحمەد

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

**ئەم کتێبە:**

ڕێگای ئیسلامیێتی مەعریفە و لەوانەش مەعریفەی پەروەردەیی، ڕێگای زیندووبوونەوەی ژیاری گەلانی موسوڵمانە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگایەکی دوورودرێژ و سەختە، بەڵام بە ویستی خودای گەورە ڕێگایەکی بەرهەمدار دەبێت، هەر بۆیە ئەم ڕێگایە پێویستی بە ماندووبوون و تێکۆشانێکی زۆرە تاکو خۆش و ئاسان بکرێت بۆ ئەو کەسانەی دەیگرنە بەر، ماوەیەکی زۆرە نەوەکانی ئەم گەلانە لەم ڕێیە لایان داوە و ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بۆی بگەڕێنەوە، سەرلەنوێ دەست بکەنەوە بە داڕشتنەوەی زانست و مەعریفەکانی بە داڕشتنێکی ئیسلامیی نوێ، کاروانی ئیسلامیێتی مەعریفە بەڕێ کەوت و سوورە لە بەردەوامبوون لەسەر ڕێیەکەی، متمانەی بە توانای خۆی هەیە بۆ نوێکرنەوەی عەقڵیەتی گەلانی موسوڵمان، هەروەها باوەڕی وایە گەشتی هەزار میل بە هەنگاوێک دەست پێ دەکات.

ئەم پەرتووکە کۆمەڵێک توێژینەوەی پەروەردەیی لەخۆ دەگرێت، کە هەموویان پێکەوە پەیوەستن و خزمەت بە ڕێڕەوی ئیسلامیێتیی مەعریفە پەروەردەییەکان دەکەن خوێنەر ئاشنا دەکەن بەوەی کە چۆن ڕەهەندی مەعریفەی ئیسلامی ڕا و بۆچوونێکی ڕێک و دروست بە توێژەری پەروەردەیی و توێژەرەکانی تریش دەبەخشێت لە کاتی توێژینەوە و تاووتوێکردنی بابەتەکاندا، بەراورد بە توێژینەوەیەک کە دوور و دابڕاو بێت لە ڕێنوێنیی و ئاڕاستەکردنی سرووشی خودایی.

نرخ: (٦٠٠٠ دینار)



# بەدەم كاروانی

# ئیسلامیّتی مەعریفەوە

د.عەبدوڕڕەحمان عەبدوڕڕەحمان نەقیب

وەرگێڕانی: محەمەد كەریم ئەحمەد ـ مەروان كەریم ئەحمەد

**بەدەم کاروانی ئیسلامێتی مەعریفەوە**

.................................................................................

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
ژمارە (٦٠)

- نووسینی: **د.عەبدوڕڕەحمان عەبدوڕڕەحمان نەقیب**
- وەرگێڕانی: **محەمەد کەریم ئەحمەد/مەروان کەریم ئەحمەد**
- بابەت: ئاینیی
- دیزاین: رەوشت محەمەد.
- چاپ: یەکەم ٢٠١٨ ـ ناوەندی ڕێنوێن.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٩٢٩)ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە.

# ناوەڕۆك

## پێشەکی

ئەم پەرتووکە کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەی پەروەردەیی لەخۆ دەگرێت، کە هەموویان پێکەوە پەیوەستن و خزمەت بە ڕێڕەوی ئیسلامێتی مەعریفە پەروەردەییەکان دەکەن، بە واتای سەرقاڵبوونیان بە خواستی پەروەردەیی لە ڕوانگەیەکی ئیسلامییەوە، بۆ ئەم مەبەستەش وا پێویست دەکات مەعریفەی پەروەردەیی هاوچەرخ لە دواشێوەکانیدا بەپێی توانا کۆ بکەینەوە لەگەڵ ئەو مەعریفە ئیسلامییانەی بە بواری ئەم لێکۆڵینەوانەوە پەیوەستن، ئەمەش بۆ زیاتر پشتیوانیکردن و ڕاستکردنەوەی بابەتی لێکۆڵینەوەکان.[1]

زۆر سوپاسی هاوڕێ و دۆستم (د.فەتحی مەلکاوی–بەڕێوەبەری جێبەجێکاری پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامی) دەکەم، کەوا هۆکار بوو بۆ کۆکردنەوەی ئەم لێکۆڵینەوانە و دەرکەوتنیان لەژێر ناونیشانی (*بەدەم کاروانی ئیسلامێتی مەعریفەوە*) ئەویش لەڕێی ئەو گفتوگۆ و مشتومڕانەی لەگەڵ مندا بەردەوام

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئیسلامێتی مەعریفەکان و گرنگییان بۆ ئەنجامدامی چاکسازی لە ئوممەتدا: چۆن و بۆچی؟ ئەوا بگەڕێوە بۆ ئەم نووسراوانەی خوارەوە:

– إسلامية المعرفة: المعهد العالمي للفكر الإسلامي، هيرندت، الولايات المتحد الأمريكية، (١٩٨٦م).

– عبد الحميد أبو سليمان: أزمة العقل المسلم، هيرندت، الولايات المتحد الأمريكية، (١٩٩١م).

دەیوروژانـــدن دەربـــارەی ئـــەوەی ئایـــا ئێمـــە بـــە ڕادەی ئـــەوە لێکۆڵینـــەوەی پـــەروەردەییمان هەیـــە تـــا بتـــوانین ناویـــان لـــێ بنـــێین: مەعریفـــەی پـــەروەردەیی ئیسـلامی؟ پاشـان ئایـا ئـەم مەعریفـە پەروەردەییـە چ جیاوازییـەکی هەیـە لەگـەڵ مەعریفەی پەروەردەیی بە شێوەیەکی گشـتی یـاخود پـەروەردەی (عـەلمانی) هـەر وەکـو ناوزەنـد دەکرێـت، منـیش هـەردەم دووپـاتم دەکـردەوە کـە مەعریفـەی پـەروەردەیی ئیسـلامیی بریتییـە لـە مەعریفەیـەکی پـەروەردەیی هاوچـەرخ بـە ڕۆحیەتێکی ئیسلامییەوە، کە ئەم ڕۆحیەتە ئەرکی ڕێنـوێنیکردن و ڕاسـتکردنەوەی ئەم مەعریفەیەیە لەڕێی سرووشی ڕاست و جێگیری قورئان و فەرموودەوە لەئەستۆ دەگرێت.

کۆکردنەوەی نێوان ئەم دوو مەعریفەیەش کاریگەریی دەبێت لەسـەر نـاوەڕۆکی بابەتەکانی وانە و میتۆد و شێوازەکانی شیکردنەوەیان، بۆ ئەمەش دەگەڕامەوە بـۆ ئەو لێکۆڵینەوانەی خۆم نووسیبووم، یاخود کەسانی تر نووسـیویانە و کـە تیایانـدا مەعریفەی پەروەردەیی ڕۆژئاوا و ڕوانگەی ڕەسەنی ئیسلامیان پێکـەوە گـرێ داوە، پاشان بیرۆکەی ئەوەم بۆ هات ئەم لێکۆڵینەوە پەرشوبڵاوانە لە دووتوێی کتێبێکـدا کۆ بکەمەوە تاکو خزمەتی زیاتری ئەم بوارەی پێ بکەم، ئەو جیاوازییـە دیارانـەش بخەمە ڕوو کە بوونیان هەیە لەنێوان هزری پەروەردەیی ڕۆژئاوا –تەنانەت ئەگەر بە زمانی عەرەبییش نووسرابێت – لەگەڵ ئەو هزرە پەروەردەییـەی کـە توێژینـەوە و بیرکردنـەوە و ڕەفتارەکـانی لـە میتـۆدێکی ئیسـلامییەوە سەرچـاوەی گرتـووە: تەنانەت ئەگەر بە زمانێکی تر جگە لە عەرەبی نووسرابێت.

بانگەشەی ئەوەش ناکەم ئـەم لێکۆڵینەوانـە نموونەیـەکی بـێ کـەموکوڕی و بـێ خەوش بن لە بواری ئیسلامێتی مەعریفە، بەڵام کۆمەڵە هەوڵێکی تا ڕادەیەك باشن و

له کۆنگره زانستییه جیاوازەکاندا پێشکەش کراون و خراونەتە ڕوو، بە جۆرێك دەتوانین بڵێین ئەم لێکۆڵینەوانە چەند هەوڵێکن لەسەر ڕێگای ئیسلامێتی مەعریفە و مەعریفە پەروەردەییەکان و ئەم ڕێبازەش ڕەنگدانەوەی هەبوو لە هەڵبـژاردنی بابەتەکانیان و چۆنیەتیی مامەڵەکردنیان لەگەڵ ئەو بابەتانە و هەروەها توانای کۆکردنەوەیان لەنێوان هزری پەروەردەیی هاوچەرخ و ڕێنوێنیی خودایی لە تاووتوێکردنی بابەتاکاندا. بەدڵنیاییەوە لە ڕێگەیەوە خوێنەر دەتوانێت تێبینیی ئەوە بکات کە چۆن ڕەهەندی مەعریفەی ئیسلامیی ڕا و بۆچوونێکی ڕێك و دروست بە توێژەری پەروەردەیی و توێژەرەکانی تریش دەبەخشێت لە کاتی توێژینەوە و تاووتوێکردنی بابەتەکاندا، بەراورد بە توێژینەوەیەك کە دوور و دابڕاو بێت لە ڕێنوێنی و ئاڕاستەکردنی سرووشی خودایی.

هەر بۆیە گرنگیدانی پەیمانگای جیهانیی فکری ئیسلامیی بە (میتۆدی توێژینەوەی ئیسلامی) وەك میتۆدێکی بەرهەمهێن و بەکەڵك لە بواری زانستە مرۆیی و نامرۆییەکاندا هەروەها کارکردن بە ئاڕاستەی بەستن و کردنەوەی خولی تایبەت بە ڕاهێنانی نووسەران و توێژەران لەسەر ئەم میتۆدە هۆکارێکی تر بوون بۆ کۆکردنەوەی ئەم لێکۆڵینەوانە و دەرکەوتنی لەژێر ناونیشانی (*بەدەم کاروانی ئیسلامێتی مەعریفەوە*) ئەمەش بەڵگەیەکی کردارییە لەسەر ئەوەی (میتۆدی توێژینەوەی ئیسلامی) توانای بەرهەمهێنانی توێژینەوەی پەروەردەیی هەیە بە شێوەیەك کاریگەری و توانای زیاتری هەبێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گرفتە پەروەردەییە گرنگەکانی ئوممەتی ئیسلامی. (میتۆدی توێژینەوەی ئیسلامی) پێویستی دەکات لەسەر توێژەر، کە بابەتی گرنگتر بۆ لێکۆڵینەوە هەڵبـژێرێت و

دەستەواژە و چەمکی ڕێکتر و گونجاوتر لە ڕوانگـەی ئیسـلامییەوە بـەکار بهێنێـت، هەروەها ڕوانینی توێژەر لە توێژینەوەکەیدا بۆ گەردوون و مرۆڤ و کۆمەڵگا هەمووی لە ڕوانگەیەکی ئیسلامییەوە سەرچاوە دەگرێت و ئەمەش ڕەنـگ دەداتـەوە لەسـەر شیکردنەوە و خوێندنەوەی بۆ ئەو بابەتەی لێی دەکۆڵێتەوە، خوێنەر یان ڕاهێنـراو بەڕوونی دەتوانێت تێبینیی هەموو ئەمانە بکات لەم لێکۆڵینەوانەی کە لە دووتـوێی ئەم پەرتووکەدان.[١]

نـە زۆر، نـە کـەم، لەبـەردەم بابەتـەکانی ئـەم لێکۆڵینەوانـەدا ناوەسـتین، ئـەو ڕیزبەندییەی بۆم داناون بەپێی مێژووی پێشکەشکردنی هەریەکێکیان بووە لە بۆنـە زانستییە جیاوازەکاندا، بەڵام لێرەدا سەرنجتان بۆ دوو خاڵ ڕادەکێشم: یەکـەمیان: ئەم لێکۆڵینەوانە نەفەسیان کورتە، ئەمەش بەهۆی سروشتی ئـەو بۆنانـەی تێیانـدا خراونەتە ڕوو، کە کاتی تەواو و پێویستم بۆ نەڕەخساوە تاکو زیاتر لـەو بابەتانـەدا قـووڵ ببمـەوە، دووەم: هـەموو ڕەگـەزەکانی میتـۆدی توێژینـەوەی ئیسـلامیی بـە هەموو مەرجەکانیەوە لە یەك لێکۆڵینەوەدا کۆ نەبوونەتـەوە، بـەڵکو دابـەش بـوون بەسەر ئەو لێکۆڵینەوانەدا هەریـەکێکیان بـەپێی سروشـت و بـارودۆخی تایبـەت بـە

[١] – بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی (میتۆدی توێژینەوەی ئیسلامی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا... بۆچی و چۆن؟) ئەوا بگەڕێوە سەر ئەم سەرچاوانەی خوارەوە:

– محمد محمد آمزيان: منهج البحث الاجتماعي بين الوضعية و المعيارية، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، القاهرة، (١٩٩١م).

– نادية محمود مصطفى، سيف الدين عبدالفتاح (إعداد و إشراف): المنهجية الإسلامية في العلوم الاجتماعية: حقل العلوم السياسية نموذجا، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، القاهرة، (٢٠٠٣م).

– عبد الرحمن النقيب: المنهجية الإسلامية في البحث التربوي نموذجا: النظرية و التطبيق، دار الفكر العربي، (٢٠٠٤م).

خۆیان. بەڵام خوێنەر و کەسی ڕاهێندراو لەسەر ئەو میتۆدە ئیسلامییە دەتوانێت لەڕێی خوێندنەوەی کۆی ئەم لێکۆڵینەوانە ڕەگەز و مەرجەکانی ئەم میتۆدە دەستنیشان بکات.

بۆیە کەسی ڕاهێندراو و خوێنەر بەدڵنیاییەوە لەسەر سروشتی بابەتەکانی ئەم لێکۆڵنەوانە دەوەستن و دەرك بە گرنگییان دەکەن لە چارەسەری خواستە پەروەردەییەکانماندا، سەرەڕای دەرککردنی بە گرنگیی بەکارهێنانی چەمکەکان و پێویستیی بەکارهێنانیان بە شێوەیەکی زانستی و ڕەسەن، بێ ئەوەی تەنها لە دەرەوە هاوردە بکرێن. هەست بەو ڕۆحە ئیسلامییە دەکات کە ڕۆ دەچێت بەناو ئەو لێکۆڵینەوانەدا، سەرەڕای جیاوازیی ئەو بابەتانەی کە لەخۆیانی دەگرن. هەروەها هاوبەشیی توێژەر دەکات لە هەستکردنی بەوەی ئەم شێوازە لە لێکۆڵنەوە و توێژینەوە: بەئیسلامیکردنی زانستەکان، یاخود کۆکردنەوەی زانستە ڕۆژئاواییەکان لەگەڵ سرووش و ئاڕاستەکردنی سرووش بۆ ئەو زانستانە لەڕووی زانستی کرداریییەوە زۆر باشتر و ڕاسترە.[١]

لە کۆتاییدا... ڕێگای ئیسلامێتی مەعریفە و لەوانەش مەعریفەی پەروەردەیی، ڕێگای زیندووبوونەوەی ژیاریی ئەم ئوممەتەیە و لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگایەکی دووروودرێژ و سەختە، بەڵام بە ویستی خودای گەورە ڕێگایەکی بەرهەمدار دەبێت،

---

[١] – بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی (ئیسلامێتی چەمکەکان) کە لە لێکۆڵینەوە زانستییەکانماندا بەکاریان دەهێنین، بگەڕێوە سەر ئەم سەرچاوانەی خوارەوە:

– بناء المفاهيم دراسة معرفية ونماذج تطبيقية: إبراهيم البيومي غانم وآخرون، جزءان، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، القاهرة، (١٩٩٨م).

– بدرية صالح الميمان: نحو تأصيل إسلامي لمفهوم التربية وأهدافها، دراسة في التأصيل الإسلامي للمفاهيم، دار عالم الكتب، الرياض، (٢٠٠٢م).

هەر بۆیە ئەم ڕێگایە پێویستی بە ماندووبوون و تێکۆشانێکی زۆرە تاکو خۆش و ئاسان بکرێت بۆ ئەو کەسانەی دەیگرنە بەر، ماوەیەکی زۆرە نەوەکانی ئەم ئوممەتە لەم ڕێیە لایان داوە و ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بۆی بگەڕێنەوە و سەرلەنوێ دەست بکەنەوە بە داڕشتنەوەی زانست و مەعریفەکانی بە داڕشتنێکی ئیسلامیی نوێ، کاروانی ئیسلامێتی مەعریفە بەڕێ کەوت و سووره لە بەردەوامبوون لەسەر ڕێیەکەی، متمانەی بە توانای خۆی هەیە بۆ نوێکرنەوەی عەقڵیەتی ئوممەتی ئیسلامیی، هەروەها باوەڕی وایە گەشتی هەزار میل بە هەنگاوێك دەست پێ دەکات.

د.عەبدوڕڕەحمان عەبدوڕڕەحمان نەقیب

پرۆفیسۆری بنەماکانی پەروەردە لە زانکۆی مەنسووره

***

# پەروەردەی ئیسلامیی ئامرازێکە بۆ پەرەپێدان و پاراستنی ژینگە،بۆچی و چۆن؟[1]

## پێشەکی:

پـێش ئـەوەی بابەتەکـەم بخەمـە ڕوو، دەمـەوێت هەسـتی خۆمتـان پـێ بڵـێم سەبارەت بەو قەیرانـەی ئوممەتەکـەمانی تێـدا دەژی، هەرچـەندە وێنەکـەش لاتـان جێی سەرسوڕمان بێت: ئوممەتێك لەڕووی جوگرافییـەوە بـە سـێ کیشـوەردا درێـژ بووبێتەوە، چوار-یەکی ڕووی جیهانیی پڕ کردبێتـەوە، پێـنج-یـەکی دانیشـتووانی جیهان لەخۆ بگرێت، خاوەنی (٤٥٪)ی بەرهـەمی جیهـانیی نـەوت بێـت، خـاوەنی (٧٣٪)ی یـەدەگی زەیـتی موئەکـەد بێـت، خـاوەنی (٤٧٪)ی یـەدەگی غـاز بێـت، خــاوەنی (١٩,٩٪)ی ڕووی زەوییــە کشــتوکاڵییەکانی جیهــان بێــت، خــاوەنی سەروەتێکی دارایی نزیکەی یەك تریلیـۆن دۆلار (هـەزار ملیـارد) بێـت و ئەمـە جگـە لەوەی ١,٤ تریلیۆن دۆلار، کە لە دەرەوەی جیهانیی ئیسلامیی خراوەتە پڕۆژەکانی وەبەرهێنانەوە[2]، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا خـاوەنی ئـایینی گـەورەی ئیسلامە، کـە

---

[1] – کۆڕی پەروەردەی ئابووری و پەرەپێدان لە ئیسلامدا (٢٧ و ٢٠٠٢/٧/٢٨).

[2] – مصطفى الدسوقي كسبه: (الإمكانات الإقتصادية للعالم الإسلامي بين خصـائص الأسـواق ومتطلبـات

دەتوانێت هەموو ئەم توانایانە وەگەڕ بخات و پەیوەندییەکانیان بەهێز بکات، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە ئوممەتێکی دواکەوتووە، وە ئەو پرسیارەی کە ڕوو لە هەمووتان دەکات ئەوەیە: ئایا کێ بەرپرسە لەم دواکەوتووییە؟ ئایا ڕۆشنبیر و زانایانی ئەم ئوممەتەن کە نەیانتوانیوە لە بوارە جیاوازەکاندا چارەسەری زانستی کێشەکان بکەن: کێشەکانی دواکەوتوویی؟ یاخود پیاوانی دەسەڵات و سیاسەت بەرپرسن، کە توانایان لەدەست داوە بۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبردن و قۆستنەوەی وزە و تواناکانی ئوممەت، بۆ ئەوەی پێشکەوتنی خوازراو بەدی بهێنێت؟ یاخود هەردوولا بەرپرسن لە دواکەوتن و گرفتەکانی ئەم ئوممەتە؟

**لەدوای ئەم پێشەکییەی کە بەپوختی باس لە قەیرانی ئوممەتی ئیسلامیی دەکات، دەڵێین:**

ئەم جیهانەی ئەمڕۆ تێیدا دەژین جیاوازییەکی زۆری ئابووری و ڕامیاری و کۆمەڵایەتیی تێدا بەدی دەکرێت لەنێو وڵاتە جیاوازەکانیدا، بەتایبەتی ئەو وڵاتانەی کە پێشکەوتنێکی گەورەیان بەدی هێناوە لە بوارەکانی ئابووری و ڕامیاری و کۆمەڵایەتیدا، هەر وەکو وڵاتەکانی ئەوروپا و ئەمریکای باکور و یەکێتیی سۆڤیەت و یابان، ئەم وڵاتانە جیاوازییان زۆرە لەگەڵ وڵاتە پاشکەوتووکانی ئەفریقا و ئەمریکای لاتینی، کە هێشتا بەشوێن خود و پێگەی خۆیاندا دەگەڕێن لەم جیهانەدا.

ئەم جیاوازییەش زیاتر پەرەی پێ درا لە کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانییەوە، ئەمەش لە دەرئەنجامی پاشەکشەکردنی داگیرکاری و سەربەخۆبوونی زۆرێك لە وڵاتانی جیهانیی سێیەم، بە جۆرێك ئاشکرا بەدیار کەوت کە دوو جیهان بوونی هەیە: جیهانێکی پێشکەوتوو (Developed Countries) و جیهانێکی تری

---

الإقتصاد الإسلامي) في حولية أمتي في العالم، دار الشروق، (٢٠٠٢م)، ص٣٠٩، تحت الطبع.

دواکـەوتوو (Under Developed Countries) پاشـان زاراوەیـەکی نـویٚ سـەری هەڵـدا، ئـەویش ولاٚتـە تـازە گەشەسـەندووەکان ( Developing Countries) وەکو ئاماژەیەك بەو ولاٚتانەی کە سەربەخۆییان بەدەست هێناوە و نـزمترین ئاسـتی گەشـەی ئابوورییـان هەیـە، هـەروەها لەوانەیـە ئـارەزووی ئـەو کەسانەش لەخۆ بگرێت کە لـەم بوارانـەدا لێکۆڵینـەوە دەکـەن ئەمـەش بـۆ ئـەوەی هەستی ڕۆڵەکانی ئەو ولاٚتانە نەوروژێنن بەو ناوانەی تر کە لە ولاٚتە پاشکەوتووەکان دەنرێن.

هـەروەها ئـەوەی بـووە هـۆی زیـاتر بلاٚوبوونـەوەی ئـەم زاراوەیـە (ولاٚتـە تـازە گەشەسەندووەکان) کە گونجاوترە لە زاراوەکانی تـر، بـریتی بـوو لـە خـەریکبوونی ژمارەیەك لە زانایانی خودی ئەو ولاٚتانە بە پرسەکانی پەرەپێدانەوە لە ولاٚتەکانیاندا و هەروەها بەشداریکردنیان بە شێوەیەکی بەرچاو لە کۆنگرە و چالاکیی توێژینـەوە نێودەوڵەتییەکان لەم بوارانەدا، هەروەها ئەمانە بوونە هۆی زیاتر جێگیرکردنی ئەم زاراوە نوێیە[1].

هەروەها شەستەکانی سەدەی بیستەم دەرکەوتنی هەزاران پـەرتووك و گوتـار و لێکۆڵینـەوەی بەخۆیـەوە بـینی، کـە هـەوڵی دەستنیشـانکردنی گرفتـەکانی ولاٚتـە دواکەوتوو و تازە گەشەسەندووەکانی دەدا و هـەوڵی دیـاریکردنی ڕێگەچـارەیەکیان دەدا تا ئەو ولاٚتانە بیگرنە بەر بۆ ئەوەی بتوانن پێش بکەون و بگەنەوە بە کـاروانی ولاٚتە پێشکەوتووەکانی جیهاندا[2]. هەروەها لـە شەسـتەکانی سـەدەی ڕابـردوو و لـە

---

[1] – د. محمد الجوهري: مقدمة علم اجتماع التنمية، سجل العرب، القاهرة، (١٩٧٩)، (ص ١٤).

[2]– تەوەری دیارییکراوی ئەم لێکۆڵینەوەیە ناهێڵێت ئاماژە بە گرنگترین کارەکانی ئەم بوارە بکـەین، وە خوێنـەر دەتوانێت درك بەوە بکات ئەگەر بگەڕێتـەوە بـۆ لیسـتی سەرچـاوەکانی ئـەم کتێبـە عـەرەبیی و ڕۆژئاواییانەی خوارەوە:

د.السید محمد الحسیني وآخرون: دراسـات في التنميـة الإجماعيـة، دار المعـارف، القـاهرة، (١٩٧٩)، (ص

ئاستێکی نێودەوڵەتیدا بایەخێکی زۆر دراوە بە هاوکاریکردنی وڵاتانی جیهانیی سێیەم، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کێشە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانیان کە دەبنە ڕێگر لە پەرەسەندنی تەواوی ئەو وڵاتانە، لە نیشانەکانی ئەو بایەخدانە جیهانییە بەو کێشەیە ئەوە بوو نەتەوە یەکگرتووەکان ناوی لەو ماوەیە نا (سەردەمی پەرەپێدان) و زۆری نەخایاند تاوەکو بە هەمان شێوە حەفتاکانی سەدەی ڕابردووی ناو نرا: (سەردەمێکی تری پەرەپێدان)[١].

**هەروەها زۆربەی ئەو هەوڵ و نووسینانەی کە لەسەر ئاستی جیهاندا باس لە کێشەکانی دواکەوتن و پەرەسەندن دەکەن، لە چەند بنەمایەکی حاشاهەڵنەگرەوە هەنگاو دەنێن، کە توێژەر وای دەبینێت گرنگترینەکانیان بریتی بن لە:**

**یەکەم:** دیاریکردنی خەسڵەتەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکان وەکو: بەرزترین ڕێژەی داهاتی تاك و کەمیی ڕیژەی ئەو دانیشتووانەی کە بە کشتوکاڵەوە خەریکن و زۆریی ڕێژەی ئەوانەی لە بواری پیشەسازیدا کار دەکەن و بەرزیی ڕێژەی سەدیی ئەو دانیشتووانەی کە فێری خوێندنەوە و نووسین بوون و هەلی جۆراوجۆری فێرکردنیان بۆ دەڕەخسێت، و زۆریی ژمارەی دانیشتووانی شارەکان و زۆریی ژمارەی پزیشك و نەخۆشخانەکان، هەروەها تێکڕای ڕێژەی بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەکان و ژمارەی ئامێری ڕادیۆ و ئۆتۆمبێلەکان بەپێی ژمارەی تاکەکان و... هتد.

**دووەم:** دیاریکردنی خەسڵەتی وڵاتە دواکەوتوو و تازە گەشەسەندووەکانە:

---

٤٥٩–٤٩٣)، د. محمد لبيب النجيحي: دور التربية في التنمية الإجتماعية والإقتصادية للدول النامية، مكتبة الأنجلو، القاهرة، (١٩٧٦)، (ص ٢٧٥–٢٨٤).

Ziauddin Sardar: Science, Technology And Development In The Muslim World, Croom Helmi, London, (1977), (pp, 189-210).

[١]– د. السيد محمد الحسيني وآخرون: دراسات في التنمية الإجتماعية، (ص ١٤٩).

ئەمیش بە شێوەیەکی گشتی پێچەوانەی خەسڵەتەکانی خاڵی یەکەمە، کە بریتییە لە لاوازیی بواری پیشەسازی و پشتبەستنی زیاتری ئەم جۆرە وڵاتانە بە بواری کشتوکاڵی و کەمی ڕێژەی داهاتی تاك، خراپیی باری تەندروستی، نزمیی ئاستی فێرکردن، بڵاوبوونەوەی بێکاری و نەخۆشی و بەدخۆراکی، کەمی سەرمایە و شوێنکەوتەیی وڵاتە پێشکەوتووەکان لە لایەنی ئابوورییەوە و ڕێژەی بەرزیی نەخوێندەواری و... هتد[1].

**سێیەم:** دیاریکردنی خەسڵەتەکانی مرۆڤی هاوچەرخ، کەوا پێشکەوتنی بەدیهێناوە لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، کە مرۆڤێکە تایبەتمەندیی جیاکەرەوەی خۆی هەیە، وەکو ئامادەباشی بۆ پسپۆریەتە نوێکان و ڕازیبوون بە گۆڕانکاری و نوێکاری، بیرکراوەیی و لیبڕاڵیبوون و بوونی ئاڕاستەیەکی دیموکراسی و پاراستنی کات و مەوعیدەکان و کارکردن بەپێی پلان و پێوەپابەندبوونی، هەروەها باوەڕبوون بە پێشکەوتن و زانست و تەکنەلۆژیا... هتد، پێچەوانەی ئەم خەسڵەتانەش مرۆڤی دواکەوتوو یاخود پەرەسەندوو بەرهەم دێنێت[2].

**چوارەم:** ڕێگای پێشکەوتنی وڵاتە دواکەوتوو و تازە گەشەسەندووەکان بریتییە لە دەستگرتن بە چەمکی (پەرەپێدان) وەکو ئامرازێك، یاخود ڕێگایەك، کە لەڕێیەوە ئەم وڵاتانە دەتوانن ڕووبەڕووی کارەکتەرەکانی دواکەوتوویی ببنەوە، ئەمەش بە جێبەجێکردنی سیما و خەسڵەتەکانی کۆمەڵگای پێشکەوتوو و مرۆڤی هاوچەرخ[3]. پەرەپێدانیش، هەر وەکو ئەمینداری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان

---

[1]– سەرچاوەی پێشوو، (ص ٥٢–٦٤)، د.محمد نبیل نوفل: التعلیم والتنمیة الإقتصادیة، مکتبة الأنجلو، القاهرة، (١٩٧٩)، (ص ٧–٤٢).

[2]– سەرچاوەی پێشوو، (ص ٢٢٩–٢٣٣)، د. السید محمد الحسیني وآخرون: دراسات في التنمیة الإجتماعیة، سەرچاوەی پێشوو، (ص ٩٣–١٠٣).

[3]– د.محمد نبیل نوفل: التعلیم والتنمیة الإقتصادیة، سەچاوەیەکی پێشوو، (ص ١٣).

پێناسەی دەكات، لـە یـەكێك لـە ڕاپۆرتەكانـدا: ((گۆڕانكـاری و پەرەپێـدان لایـەنی كۆمەڵایەتی و ئابووریش لەخۆ دەگرێت، هەروەها ڕەهەندی چۆنێتی و چەندێتیشـی هەیە))[1]. هـەروەها وڵاتـە تـازە گەشەسـەندووەكان پـەنا دەبەنـە بـەر پلانـدانان بـە شێوازە جیاوازەكانیەوە، وەك میتۆدێـك بـۆ بـەدیهێنانی ئامانجـەكانی پەرەپێـدان، چەمكی پلاندانان بە شێوەیەكی گشتی بریتییە لە نەخشەكێشان و دیاریكردنی ئـەو یەكانەی كـە پێویسـتە پـەیڕەوییان لـێ بكرێـت ۆ ئاڕاسـتەكردنی چـالاكییە مرۆییـە ئـابووری و كۆمەڵایەتییـەكان بـۆ بـەدیهێنانی كۆمـەڵێك ئامـانجی دیـاریكراو و لـە ماوەیەكی زەمەنیی دیاریكراودا[2]، واتە پلاندانان بریتییە لە ئـامرازی كۆمەڵگـە تـازە گەشەسەندووەكان بـۆ پەرەسـەندن و بـەرەو پێشچـوون، پەرەپێـدانیش بەرهـەمی هـــەوڵی ئـــەو وڵاتانەیـــە كـــەوا هـــەوڵ دەدەن بگەنـــە تایبەتمەندییـــەكانی وڵاتـــە پێشكەوتووەكان و بە خەسڵەتی مرۆڤی هاوچەرخ بگەن، كە پێشتر باسی لێوە كرا.

بۆ ئەم مەبەستەش وڵاتە تـازە گەشەسـەندووەكان بـە شـێوەیەكی گشـتی پـەنا دەبەنـــە بـــەر چـــەند ئامرازێـــك، لەوانـــە: چـــاولێكەری و شـــوێنپێهەڵگرتنی وڵاتـــە پێشـكەوتووەكان لـە كـاركردن بـە ئاڕاسـتەی دروسـتكردن و وەبـەرهێنانی ئـامێری قـورس، جـا ئەگـەر ئـەم كـارەش لەسـەر ئۆبـاڵی كشـتوكاڵ و دابینكردنـی دەسـتی كـاریش بێـت[3]، هـەروەها ئـەم وڵاتانـە زۆر جـار دەرگایـان واڵا دەكـەن بـە ڕووی

---

[1]– د. عبد الفتاح جلال وآخرون: التنميـة والتخطـيط والتعلـيم الـوظيفي في الـبلاد العربيـة، سـرس الليـان، (١٩٧٢)، المقدمة (ص ط).

[2]– د. عبد الفتاح جلال وآخرون: التنميـة والتخطـيط والتعلـيم الـوظيفي في الـبلاد العربيـة، سـرس الليـان، (١٩٧٢)، المقدمة (ص ط).

[3]– لەبارەی شوێنەواری خراپی ڕووكردنە پیشەسازی لەسەر حیسـابی كشـتوكاڵ لـە جیهـانی سـێیەمدا، بڕوانە:
Ziauddin Sardar: Science, Technology and Development In The

وەبەرهێنەرە بیانییەکان و هەروەها وەرگرتنی هاوکاری و قەرزی دەرەکی، ئەمەش بە مەبەستی خێراترکردنی پرۆسەی پەرەپێدان[1]، بە هەمان شێوە زانست و تەکنەلۆژیای سەردەم هاوردە دەکەن، بەڵکو هەندێك جار دامەزراوە فێرکارییەکانیش لە وڵاتە پێشکەوتووەکانەوە هاوردە دەکەن[2]، لەوەش زیاتر هەندێك جار ئەم وڵاتانە زۆرێك لە دیاردەکانی خۆشگوزەرانی و جوانکاری هاوردە دەکەن، کە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ ئابووریی ئەو وڵاتانەدا ناگونجێت.

ئێمە لێرەدا کارمان گفتوگۆکردن نییە لەسەر سیاسەتە جیاوازەکانی پەرەپێدان بە شێوەیەکی گشتی و هەروەها کارمان هەڵسەنگاندنی ئەو سیاسەتانەش نییە، چونکە ئەمە لە ئامانجی لێکۆڵینەوەکە دوورمان دەخاتەوە و بۆ ئەو بابەتەش سەرچاوە و کەسانی پسپۆڕی تایبەت بە خۆی هەن، بەڵام ئەوەی لەم لێکۆڵینەوەیەدا بۆ ئێمە جێی بایەخە: ڕەخنەگرتنە لەو بنەما و سەلمێنراوانەی کە

---

Muslim World, Op, Cit, (PP, 105-121)

[1]– دەربارەی کاریگەریی خراپی وەبەرهێنانی بیانیی و قبوڵکردنی هاوکاری و قەرزە بیانییەکان، بگەڕێوە بۆ سەر: د. السيد محمد الحسيني وآخرين: دراسات في التنمية الإجتماعية، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ٧٦–٩٢، ١٢١–١٢٦).

W. L. Thorp: The Reality Of Foreign Aid, Praeger, New York, (1971)

[2]– دەربارەی شوێنەواری خراپی خوێندنی ڕۆژئاوایی لەسەر جیهانی ئیسلامیی، بۆ نموونە بڕۆرەوە سەر: د.محمد فاضل الجمالي: آفاق التربية الحديثة في البلاد النامية، الدار التونسية للنشر، تونس، (١٩٦٨)، (ص ١٢٥–١٥٣)، د. أحمد صيداوي: (الغزو التربوي الغربي)، من أبحاث مؤتمر التربية الإسلامية المنعقد في (١٥–٢١ آذار ١٩٨١م)، جمعية المقاصد الخيرية الإسلامية، بيروت، (١٩٨١م)، علي خليل مصطفى أبو العينين: الأصول الفلسفية للتربية في مصر الحديثة بين الفكر الإسلامي والفكر التغريبي، رسالة دكتوراه غير منشورة، تربية طنطا، (١٩٨١م).

S.H. Alatas: The Sociology Of Corruption, Donald Moore, Singapare, (1968)

پێشتر باسمان لێوە کرد، کە بیرۆکەی پەرەپێدانیان لەسەر بنیات نراوە، بەتایبەتی بۆ کۆمەڵگا ئیسلامییەکان و هەوڵ دەدەین لە ڕێگەی پەروەردەی ئیسلامییەوە جێگرەوەیەکی ئیسلامیی سەبارەت بە پەرەپێدان پێشکەش بکەین.

**ئەم بژاردە ئیسلامییە جێگرەوەیە لەسەر کۆمەڵێك سەلمێنراو دادەمەزرێت، کە دەبنە هەڵوەشێنەرەوەی ئەو سەلمێنراوانەی پێشتر باسمان کردن. گرنگترینیان ئەمانەن:**

١- ئەزموونی سەرمایەداری و کۆمۆنیستی تاکە دوو ئەزموون نین بۆ پەرەپێدان، بە شێوەیەك وڵاتە تازە گەشەسەندووەکان تەنها لە ڕێگەی ئەو دوو ئەزموونەوە نەبێت نەتوانن پێش بکەون و هەڵبستنەوە، بەڵکو پێویستە کۆمەڵگە تازە گەشەسەندووەکان خۆیان ڕێگاچارەیەك بۆ خۆیان بدۆزنەوە بۆ ئەوەی پێش بکەون، ئەمەش چونکە ئەزموونی پێشکەوتن لە وڵاتە سەرمایەداریەکاندا لەسەر داگیرکردنی گەلانی تر بنیات نرابوو و بەمەش سەروەتە ماددی و مرۆییەکانی ئەو گەلانەیان بۆ بەرژەوەندیی خۆیان دەقۆستەوە، ئەم کردارەش چیتر لە زەمینەی کرداری هاوچەرخدا گونجاو نییە، بەڵکو کارێکی بێزراو و نەخوازراوە. بە هەمان شێوە ئەزموونی پێشکەوتن لە وڵاتە کۆمۆنیستەکان بنیات نرابوو لەسەر چەوساندنەوە و قوربانیدان بە نەوەکانی ئێستا لەپێناو نەوەکانی داهاتوودا، ئەم شێوازەش چیتر ناگونجێ لەگەڵ گەلانێکدا کە زەمەنێکە لە هەموو خۆشییەك بێبەش کراون و چاویان لە ژیانێکی باشترە.

٢- وڵاتە پێشکەوتووەکان هەتاوەکو ئەمڕۆش گەلە تازە گەشەسەندووەکان بەکار دەهێنن بۆ پارێزگاریکردن لەو پێشکەوتنانەی کە بەدییان هێناوە، هەروەها ئەو وەبەرهێنانانەی کە وڵاتە پێشکەوتووکان لە وڵاتە دواکەوتوو و تازە گەشەسەندووەکاندا ئەنجامی دەدەن ئامانجێکی دیاریکراویان لێی هەیە، ئەویش

هێشتنەوەی ئەو وڵاتانەیە وەك سەرچاوەیەك بۆ مـاددە سـەرەتاییەکان و کـارکردن بۆ ئـەوەی پیشەسـازیی نـوێ نەچـێتە نـاو ئـەو وڵاتانـەوە، بـۆ ئـەوەی پێشـکەتنی ئابووری بەخۆیانەوە نەبینن. هەروەها ئەو قەرزانەی کە بە وڵاتە دواکـەوتوو و تـازە گەشەسەندووەکانی دەدەن زۆر کات بۆ خزمەتکردنی ئامانجی سیاسیی تایبـەت بـە خۆیانە، زۆربەی کات ئەو قەرزانە لەو بوارانـەدا بـەکار دەهێنـدرێن کـە بەرهـەمیان نییە، وەکو ڕێگاوبان و نەخۆشخانە و فڕۆکەخانە و... هتد، هـەروەها ئـەم قەرزانـە سوویەکی زۆریان لەسەرە و هاوپێچن لەگەڵ کۆمەڵێك مەرجی زۆر سەخت. هەروەها جیاوازییەکی زۆر بەدی دەکرێت لەنێوان ئەو مادده سـەرەتاییانەی کـە وڵاتـە تـازە گەشەســەندووەکان هــەناردەی دەکــەن لەگــەڵ ئــەو کاڵایانــەی کــە لــە وڵاتــە پێشکەوتووەکانەوە هاوردەی دەکـەن. هاوکارییـە دەرەکییـەکانیش تـەنها لایـەنی ئابووری لەخۆ ناگرن، بەڵکو کۆمەڵێك ئاماژەی سیاسیی زۆر گرنگ لەخۆ دەگرن، کە خۆیـان لـە ملکەچبوونی وڵاتــە قــەرزوەرگرتووەکان دەبیننــەوە لەســەر ئاســتی سیاسەتی ناوخۆیی و هەندێ جاریش لەسەر ئاسـتی سیاسـەتی دەرەوەش ناچـاری ملکەچکردن دەکرێن[١].

٣- ئەزموونی سەرمایەداری و کۆمۆنیستی دوو بەرزترین نموونە و ئەزموون نین کە وا پێویست بکات لەسەر مرۆڤایـەتی بیانکـەن بـە پێشـەنگ و شـوێنیان بکـەون، بــەڵکو دەســتکەوتەکانی ئــەم دوو ئەزموونــە نابێــت ڕووە ناشــرینەکانیانمان لــێ بشارنەوە، وەکو: هەردوو جەنگی جیهـانیی یەکـەم و دووەم، پێشـبڕکێی شـێتانەی خۆپڕچـەککردن و هەڵوەشـانەوەی ڕەوشــت و گاڵتــەکردن بــە بــەها باڵاکــان و بزووتنــەوەکانی یــاخیبونی گــەنجان لــە دەســەڵات و دابونەریتــەکان و ڕۆچـوونی

---

١- بۆ وردەکاریی بڕوانە:

W.L. Thorp: The Reality of Foreign Aid, Op, Cit.

تەواویان لە گاڵتەوگەپ و ڕابواردن و بێهۆشی و سێکس و هەروەها بەرزبوونەوەی ڕێژەی تاوانکاری و خۆکوشتن و نەخۆشییە دەروونییەکان و... هتد[١].

باشترین شتێك كە كۆتایی ئەم برگەی پێ بهێنین، وتەیەکی ((فرانتز فانون))ە Frantz Fanoon كە دەڵێت: "ئێمە –گەلانی جیهانیی سێیەم– پێویستمان بە پێشەنگە، بەڵام زۆرێك لە ئێمە ئەزموونی ئەوروپی سەرنجی ڕادەکێشێت، زیاد لە هەر ئەزموونێکی تر و بینیمان چۆن ئەم ڕکابەرایەتییە بەرەوە ڕووخانمان دەبات... پێویستە چیتر لەمەودوا فریوی پێ نەخۆین و هاوسەنگیمانی پێ لەدەست نەدەین، دەستکەوتە ئەوروپییەکان... من کاتێك بەدوای مرۆڤدا دەگەڕێم لە جیهانیی ئەوروپیدا جگە لە زنجیرەیەك نکوڵیکردن لە مرۆڤ و تاوانی کوشتنی مرۆڤ شتێکی تر نابینم"[٢]. ئەوەی کە فانون باسی دەکات سەبارەت بە ئەزموونی ئەوروپی هەمووی بەتەواوەتی بەسەر ئەزموونی کۆمۆنیستیدا جێبەجێ دەبێت، کە لە کۆتاییدا بەسەر خاوەنەکانیدا ڕووخا.

٤– ئەگەر ڕەوا بێت بۆ وڵاتە پەرەسەندووە نائیسلامییەکان لە بواری پەرەپێداندا چاو ببڕنە نموونەی ئەوروپی یان نموونەی کۆمۆنیستی و بە شێوەیەکی کاریکاتۆری شوێنپێیان هەڵگرن – لە کاتێکدا ئەم شێوازی چاوتێبڕینە هەرەسی

---

[١]– بۆ وردەکاریی ئەو داڕووخانە ڕەوشتییە، بڕۆرەوە سەر:

H.W. Armstrong: Modern Romans, The Decline of Western Civilization, Ambassador College Press , Pasarena, California, U.S.A, (1975) & Maryam Jameelah: Western Civilization Condemned By Itself, Sant Nagar, Lahor, Pakistan, (1976).

[٢]– بگەڕێوە سەر:

Frantz Fanon: The Wretched of The Earth, Benguin Book, (1970).

بۆ وەرگێڕانی عەرەبیی کتێبەکە بە ناونیشانی: معذبوا الأرض، ترجمة د. سامي الدروبي، د. جمال الأتاسي، دار الآفاق الجديدة، بيروت، (١٩٧٢م)، (ص ٢٢١، ٢٢٢)، بەدەستکارییەوە.

هێنـاوه – ئـەوا لـە هــەردوو ڕووی شــەرع و ئـاوەزەوە پێویســتە لەســەر وڵاتــە ئیسلامییەکان ڕێگایەکی ئیسلامیی بۆ پەرەپێدان دابهێنن و بدۆزنەوە، بە شێوەیەك جیاواز بێت لە هەردوو نموونەی ئەورووپی و کۆمۆنیستی، ئەمەش لەپێناو ئـەورووپا و هــەموو وڵاتـانی جیهـانیی ئـازاددا و لـەپێناو ڕووسـیا و هــەموو وڵاتـانی جیهـانیی کۆمۆنیستی و لەپێناو جیهانیی ئیسلامیدا... هەروەها لەپێناو مرۆڤایەتیدا پێویستە لەسەرمان – ئێمەی موسوڵمانان – بەرگێکی ئیسلامیی بپۆشین و بگەین بە هزرێکی ئیسلامیی نوێ، هەروەها هەوڵ بـدەین مرۆڤـی موسـوڵمانی هاوچـەرخ و کۆمـەڵگای ئیسلامیی ڕاستەقینە بنیـات بنـێین، بـۆ ئـەوەی ئـەو کێشـانە چارەسـەر بکـات کـە هەموو ئەورووپا و ئەمریکا و ڕووسیا نەیانتوانی چارەسەری بکەن... مرۆڤێکی نـوێ پێبگەیەنین کە وڵاتە پێشکەوتووەکانی تر نەیانتوانی لەم جیهانەدا پێیبگەن[1].

٥- لەژێر سـێبەری هەرەسـهێنانی ئـەزموونی کۆمۆنیسـتی لـە پەرەپێـدان بـە یەکێتیی سـۆڤیەتی ڕووخـاو و باڵادەسـتبوونی ئـەزموونی سـەرمایەداریی ئـەمریکی بەسەر بازاڕەکانی جیهاندا لەڕێگەی کۆمپانیا جیهانییەکانەوە و دامەزراوە ئابوورییە وەحشــیگەراکانی وەك: بــانکی نێودەوڵــەتی و ســـندوقی دراوی نێودەوڵــەتی و ڕێکخــراوی جــات، چــاوەڕێ دەکرێــت کــە هــەژارەکان زیــاتر هــەژار بــن و دەوڵەمەندەکانیش زیاتر دەوڵەمەند بن، کە ئەمەش دەبێتە هۆی پێشێلکردنی دادی کۆمەڵایەتی لەسەر ئاستی جیهان، سـەرەڕای بـەفیڕۆدانی سـەروەتە ژینگەییـەکانی

---

[1]– بۆ وەرگرتنی وێنەیەك لەبارەی توانا ماددیی و مرۆیی و ڕۆحییەکانی جیهانی ئیسـلامیی، کـە وای لـێ دەکات بەتوانا بێت لەسەر بنیادنانی نەموزەجی ئیسلامیی گەشەسەندن، بگەڕێوە سەر: یوسـف إبـراهیم یوسف: الأسلوب الإسلامي لتحقيق التنمية الإقتصادية، دراسة مقارنـة، رسـالة دكتـوراه في الإقتصـاد غـير منشورة، تجارة الأزهر، (١٩٨١م)، عبد العظيم مصـطفى فـودة: صـلاح المجتمـع في الإحتكـام إلى الشـريعة الإسلامية، رسالة دكتوراه غير منشورة، كلية دار العلوم، القاهرة، (١٩٧٩م).

جیهان لەپێناو بەکاربردنی ناژیرانەی ئەمریکی[1]. تەنها ئەوە بەسە لێرەدا باسی بکەین کە (٢٠٪)ی ولاّتانی جیهان دەوڵەمەندترین ولاّتانی جیهانن و خاوەنی (٨٥٪)ی کۆی داهاتی جیهانن و دانیشتووانەکانیشیان خاوەنی (٨٦٪)ی کۆی مدخراتی جیهانن[2]. چاوەڕوان دەکرێت لەژێر سێبەری جیهانگیرییدا ئەم وێنەیە زیاتر ڕەش و ناشرین بێت بە زیادبوونی وەحشیگەریی سەرمایەداریی ئەمریکی.

لەبەردەم ئەم ڕاستییە جیهانییە ستەمکارەدا ئەوا جیهانیی ئیسلامیی بەو ژمارە و ڕێژە زۆرەی کە هەیەتی لە توانا و هێزی مرۆیی و سامانی سروشتی و کەلەپووری ڕۆشنبیریی و ژیاری، بەکرداری شیاوە بۆ پێشکەشکردنی ئەزموونێکی نوێی تایبەت بە پەرەپێدان لە هەموو بوارەکاندا[3].

**لەپاش ئەم چوارچێوە ئیسلامییە گشتییەوە، دەتوانین ئەم سیما سەرەکییانە بخەینە ڕوو:**

١- بوونی بیروباوەڕێکی بەهێزی دامەزراو، کە کاریگەریی دروست دەکات لەسەر ژیانی تاك و کۆمەڵ، کە خۆی دەبینێتەوە لە باوەڕهێنان بە خوای گەورە و فریشتەکانی و پەرتووکەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و قەزاوقەدەر و هەروەها ڕەنگدانەوەی ئەم بیرو باوەڕانەش لە ژیانی خەڵکدا لێکەوتەی زۆری دەبێت کە باسکردنیان درێژە دەخایەنێت[4].

---

[1]- بۆ وردەکارییەکەی بڕۆرەوە سەر: هانس بيتر مارتن وآخرين: فخ العولمة، ترجمة عدنان عباس علي، سلسلة عالم المعرفة، العدد (٢٣٨)، الكويت، أكتوبر (١٩٩٨م).

[2]- هەمان سەرچاوەی پێشوو، (ص ٧٠).

[3]- بگەڕێوە سەر:

Ziauddin Asrdar: Science, Technology And Development In The Muslim World, Op, Cit, (PP, 7, 51-63).

[4]- بۆ نموونە بڕۆرەوە سەر: محمد الغزالي: عقيدة المسلم، دار الكتب الحديثة، القاهرة، بدون.

٢- ئەو پەرستشە ئیسلامییانەی کە مرۆڤ بە خوداکەی دەبەستێتەوە و زیاتر تواناداری دەکات لە ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنەکانی ڕاستی (الحق) لە ناوەوە و دەرەوە[1].

٣- ڕەوشتە ئیسلامییە جوانەکان، کە مرۆڤی موسوڵمان بەرز و ڕێزدار دەکات و هەروەها کۆمەڵگەی ئیسلامییش بەرز دەکاتەوە و دەیکاتە نموونەیەکی ئەخلاقی و پێشەنگ بۆ کۆمەڵگاکانی تر[2].

٤- سیستمێکی سیاسی، کە بنیات بنرێت لەسەر ملکەچبوونی دەسەڵات و گەل بۆ شەریعەتی خودای گەورە و لەسەر ڕێزگرتن لە تاك و هەروەها لەسەر کارکردن بە پرەنسیپەکانی دادپەروەریی و ڕاوێژی (شوری)ی ئیسلامی[3].

---

[1]- بۆ نموونە بگەڕێوە سەر: أبو حامد الغزالي: إحياء علوم الدين، دار إحياء الكتب العربية، القاهرة، (١٩٥٧م)، (١/١٤٥-٢٧٢).

[2]- بگەڕێوە سەر ئەم لێکۆڵینەوانە: د.محمد عبد الله دراز: دستور الأخلاق في القرآن، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: د.عبد الصبور شاهين، دار البحوث العلمية، الكويت، (١٩٨٠م)، د.مقداد يالجن: الإتجاه الأخلاقي في الإسلام، التربية الأخلاقية الإسلامية، رسالة ماجستير ودكتوراه، منشورتان، مكتبة الخانجي، القاهرة، (١٩٧٧م)، سعيد حوى: جند الله ثقافة وأخلاقا، بدون تأريخ، دار النشر، طبعة ثانية، (ص ١٦٥-٤١٧).

[3]- دەربارەی سیستەمی سیاسیی، بڕوانە ئەم لێکۆڵینەوە بەپێزانەی خوارەوە: د. عبدالحميد متولي: مبادئ نظام الحكم في الإسلام مع المقارنة بالمبادئ الدستورية الحديثة، دار المعارف، الإسكندرية، (١٩٦٦م)، د. محمد البهي: الفكر الإسلامي والمجتمع المعاصر، مشكلات الحكم والتوجيه، الدار القومية للطباعة والنشر، القاهرة، (١٩٦٥م)، د. عبدالقادر عودة: الإسلام وأوضاعنا السياسية، مؤسسة الرسالة، بيروت، بدون تأريخ، الإسلام وأوضاعنا القانونية، الإتحاد الإسلامي العالمي للمنظمات الطلابية، الكويت، بدون تأريخ، أبو الأعلى المودودي: نظرية الإسلام وهديه في السياسة والقانون والدستور، دار الفكر، بيروت (١٩٦٩م)، محمد الغزالي: الإسلام والإستبداد السياسي، دار الكتب الحديثة، (١٩٦١م).
Dr. Muhammad Hamisullah The Muslim Conduct of State Sh. Muhammad Ashraf, Lahor, Pakistan, (1977) & Dr. Sald Ramdan: Islamic Law Its Scope And Equity, Macmillan, London, (1961)

٥- بوونی سیستمێك له پەیوەندییه نێوولاتییەکان، که بنیات نراوه لەسەر ڕێزگرتن له مافەکانی مرۆڤ و هاوکاریکردن بۆ هەموو کارێکی چاکه و هەروەها دوورکەوتنەوه له کردەوه دوژمنکارییەکان، لەگەڵ ڕازینەبوون به ملشۆڕی و نەرمینواندن و دەستبەرداربوون له مافەکانمان و بانگەوازەکەمان[١].

٦- بوونی سیستمێکی ئابووری، که بنیات دەنرێت لەسەر ئەوەی ماڵ و سامان هەمووی هی خودایه و مرۆڤیش جێنشینه لەسەر ئەو سامانه، هەر بۆیه دەبێت ڕەچاوی سەرچاوەکانی داهات و سەرچاوەکانی خەرجی بکرێت و هەروەها زەکاتی لێ دەر بکرێت و مافی هەژارانی لێ بدرێت و دەستەبەری هەبێت لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگادا و هەروەها بەکارهێنانی هەموو سەرچاوەکانی سامان له بەرژەوەندیی ئیسلام و موسوڵماناندا[٢].

٧- سیستمێکی کۆمەلأیەتی، که بنیات دەنرێت لەسەر یەکسانی و دادپەروەریی لەنێوان تاکەکاندا بەبێ جیاوازیکردن لەسەر بنەمای ڕەگەز، یاخود ڕەنگ، یاخود ئایین، یاخود پێگەی کۆمەلأیەتی و ئابووری و جەختکردنەوه لەسەر

---

[١]- سيد قطب: السلام العالمي والإسلام، بدون دار نشر، (١٩٦٧م)، محمد الغزالي: حقوق الإنسان بين تعاليم الإسلام وإعلان الأمم المتحدة، دار الكتب الحديثة، (١٩٦٣م).

[٢]- لەبارەی ئابووریی ئیسلامییەوه بگەڕێوه بۆ ئەم لێکۆڵینەوه بەپێزانەی خوارەوه: د. عيسى عبده: الإقتصاد الإسلامي مدخل ومنهاج، دار النهضة، مصر، (١٩٧٤م)، د. أحمد النجار: المدخل إلى النظرية الإقتصادية، دار الفكر، بيروت، (١٩٧٣م)، د. شوقي إسماعيل شحاتة: التطبيق المعاصر للزكاة، دار الشروق، جدة، (١٩٧٧م)، البهى الخولي: الثروة في ظل الإسلام، دار الإعتصام، القاهرة، (١٩٧٨م)، السيد محمد باقر الصدر: اقتصادنا، دار التعارف للمطبوعات، بيروت، (١٩٧٩م)، البنك اللاربوي في الإسلام، دار التعارف للمطبوعات، بيروت، (١٩٧٨م)، هەروەها:

M.A Mann: Islamic Economics Theory And Practice, A comparative Study, Sh-Muhammad Ashraf, Lahore, Pakistan iii Uois, Islamic Publications Ltd, Lahore, Pakistan, (1974)

لایەنی ڕەوشت و برەودان بە خۆپارێزی (التقوی) و ملکەچنەبوونی مرۆڤ بۆ هیچ دروستکراوێکی تر، جا چ مرۆڤ بێت، یاخود ئامێر، یاخود سروشت بێت[1].

٨- سیستمێکی فێرکاری کە بنیات دەنرێت لەسەر پێویستیەتیی داواکردنی زانست لەلایەن هەموو موسوڵمانێکی نێر و مێ، زانست ڕێگای گەیشتنە بە خودا... هەروەها ڕێگای ڕێنوێنیکردنی مرۆڤ و ڕێزداربوونیەتی بۆ ئەوەی شیاو بێت جێنشینیی خودا بکات لەسەر زەوی، هەروەها داواکردنی زانستیش لە بێشکەوە بۆ ناو گۆڕ بەردەوام دەبێت. دواتر بەپوختی باس لەم خاڵە دەکەین، بە شێوەیەك بگونجێت لەگەڵ سروشتی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا[2]. لەپاڵ ئەمەشدا باس لە سیستمێکی ئیسلامیی تایبەت بە سەربازی دەکەین، هەروەها باس لە سیستمی ئاڕاستەکردن و ڕاگەیاندن دەکەین[3] لەپاڵ کۆمەڵێك سیمای تر کە پێویستە کۆمەڵگا ئیسلامییەکان جیا بکاتەوە و بیانکاتە پێشەنگ لە پەرەپێدان و پێشکەوتندا.

---

[1]- دەربارەی سیستەمی کۆمەلایەتیی ئیسلامیی، بگەڕێوە بۆ:

د. مصطفى السباعي: اشتراكية الإسلام، الدار القومية للطباعة والنشر، القاهرة، (١٩٦٠م)، سيد قطب: العدالة الإجتماعية في الإسلام، بدون دار نشر، (١٩٦٧م).

[2]- بگەڕێوە بۆ:

Prof. M. Raihan Sharie: Islamic Social Framework, Sh. Muhammad Ashraf, Lahore, Pakistan, (1970) & Ali Shariati: On The Sociology of Islam, Translated From The Persian By Hamid Algar, Mizan Press, Berkely, U.S.A, (1979) & Anwar Ahmad Qadri: Justice In Historical Islam, Sh. Muhammad Ashraf, Lahore, Pakistan, (1974). Ziauddin Sardar: Science, Technology And Development In The Muslim World, Op, Cit, (PP, 21-36) & Seyyed Hossein Nasr: Islamic Science an Illustrated Study. World of Islam Festefal Publishing Company Ltd, London, (1976), (PP, 1-24).

[3]- بڕوانە: محيي الدين عبد الحليم: الإعلام الإسلامي وتطبيقاته العملية، مكتبة الخانجي، القاهرة، (١٩٨٠م).

ئەگەر سیستمە هاوچەرخەکان دەرك بە گرنگیی ڕۆڵی پەرەوەردە بکەن لە بواری پەرەپێداندا، ئەوە پەنا دەبەنە بەر ئەوەی ناو دەبرێت بە پلانی پەروەردەیی بۆ بەدەستهێنانی پێویستییەکانی لە هێزی مرۆیی و یەکبوونی نیشتمانی بۆ بەردەوامبوونیان لە پەرەپێدان،[1] بێگومان لە ڕوانگەی ئێمەوە پەروەردەی ئیسلامیی باشترین و بەتواناترین جۆری پەروەردەیە، بەڵکو تاکە پەروەردەیە کە بتوانێت کۆمەڵگە ئیسلامییەکان بگەیەنێت بە مانای ئیسلامیی بۆ پەرەپێدان.

**بەڵام لێرەدا مەبەستمان چییە لە چەمکی پەروەردەی ئیسلامی؟**

لێرەدا گرنگترین پێناسەکانی زاراوەی پەروەردەی ئیسلامیی دەخەینە ڕوو، بە شێوەیەك هەموو ئەم پێناسانە ئاسانکاری دەکەن لە خستنەڕووی وێنەیەکی ڕوون لەوەی کە ئێمە مەبەستمانە بە پەروەردەی ئیسلامی.

**ئەمانەی خوارەوە چەند نموونەیەکن لەو پێناسانە[2]:**

---

[1]– لەبارەی ڕۆڵی زانست لەپێشکەوتندا، بڕوانە کتێبی بەپێز:
Science, Technology and Society Acroos Disciplinary Perspective, Edited By Inaspiegel Rosing And Derek De Salla Price, Sage Publication, London, (1977)

تێبینیی ئەوە دەکرێت کەزۆربەی ئەوەی تائێستا نووسراوە لەبارەی خوێندن و گەشەپێدان و پلاندانانی پەروەردەییەوە لە جیهانی ئیسلامیدا زۆربەی زۆریی درك بە جیاوازیی نێوان پەروەردەی ئیسلامیی و پەروەردەکانی تر ناکەن، بۆ نموونە بڕوانە: د. عبد الله عبد الدايم: التخطيط التربوي: أصوله وأساليبه الفنية وتطبيقاته في البلاد العربية، دار العلم للملايين، بيروت، (١٩٨٠)، هـ. ل. جفريت: التخطيط التربوي في البلاد النامية، ترجمة د. محمد نبيل نوفل، الأنجلو المصرية، (١٩٦٩م).

[2]– لەو نووسینانەی کە بەئاگایی ڕاستەقینەی تێدا دەر کەوتووە لە واتای ڕاستەقینەی پەروەردەی ئیسلامیی، ئەم لێکۆڵینەوانە: د. محمد سعيد رمضان البوطي: تجربة التربية الإسلامية في ميدان البحث، المكتبة الأموية بدمشق، بدون، د. زغلول راغب النجار: أزمة التعليم المعاصر وحلولها الإسلامية، من أبحاث المؤتمر العالمي للتعليم الإسلامي المنعقد بجامعة الملك عبدالعزيز بمكة المكرمة، الفترة من (٣/٢١ حتى ١٩٧٧/٤/٨م)، د. أحمد فؤاد الأهواني: التربية في الإسلام، دار المعارف، القاهرة، (١٩٨٠م)، محمد قطب:

**پەروەردەی ئیسلامیی بریتییە لە:** "پەرەپێدان بە کەسایەتیی ئیسلامیی لە هەموو ڕوویەکەوە، لەڕووی هزر و سۆز و جەستە و لایەنی کۆمەڵایەتی و هەروەها ڕێکخستنی ڕەفتارەکانی بەپێی پرنسیپ و ڕێنماییەکانی ئیسلام بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانی ئیسلام لە هەموو بوارەکاندا."

**پەروەردەی ئیسلامیی بریتییە لە:** "ئامادەکرنی تاکی موسوڵمان بە شێوەیەکی تەواو لە هەموو ڕوویەکەوە و لە هەموو قۆناغەکانی گەشەکردنیدا بۆ ژیانی دونیا و دوارۆژی، ئەمەش لەژێر ڕۆشنایی بەها و پرەنسیپەکانی ئیسلام و هەروەها لەژێر ڕۆشنایی شێواز و ڕێگاکانی پەرەوەردە کە ئیسلام هێناونی."

**پەروەردەی ئیسلامیی بریتییە لە:** "کۆمەڵێك چەمك کە لە چوارچێوەیەکی هزریدا پێکەوە پەیوەستن و پشت دەبەستێت بەو بەهاو پرنسیپانەی ئیسلام لەگەڵ خۆی هێناوە کە وێنەی کۆمەڵێك ڕێکار و ڕێگای کرداری دەکێشێت، کە جێبەجێکردنیان لەلایەن کەسێکەوە دەبێتە هۆی ئەوەی ڕەفتارەکانی ئەو کەسە لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامیدا یەك بگرێتەوە."

**پەروەردەی ئیسلامیی بریتییە لە:** "چالاکییەك کە تاك و کۆمەڵگە پێی هەڵدەستن بە مەبەستی پێگەیاندنی مرۆڤ لەڕووی هزر و بیروباوەڕ و هەروەها لە لایەنی کۆمەڵایەتی و جەستەیی و ویژدان و جوانی و ڕەوشت، هەروەها پڕکردنی بە زانست و زانیاری و بەها و لێهاتوویی پێویست بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی دروست و بەپێی ئامانجەکانی ئیسلام گەشە بکات و پەرە بسەنێت."

**پەروەردەی ئیسلامیی بریتییە لە:** "پڕۆسەیەکی ئامانجدارە لە ژێر ڕۆشنایی

---

منهج التربية الإسلامية، جزءان، دار الشروق، بيروت، (١٩٨٠م)، عبد الله علوان: تربية الأولاد في الإسلام، جزءان، دار السلام، القاهرة، (١٩٨١م)، هەروەها زۆربەی ئەو نامەکانی ماجستێر و دکتۆرا کە (د. عبد الغني عبود) سەرپەرشتیی کردووە لە بواری پەروەردەی ئیسلامییدا.

شەریعەتی ئیسلامیی ئەنجام دەدرێت، ئامانجی برەودانە بە هەموو ڕووەکانی کەسایەتیی مرۆڤ بۆ بەدیهێنانی بەندایەتیی تەواو بۆ خوای گەورە، تێیدا کۆمەڵێك کەسی لێهاتوو و پسپۆڕ هەڵدەستن بە ئاڕاستەکردنی کەسانی تر بە چەند ڕێگەیەکی گونجاو، بە بەکارهێنانی ناوەڕۆکێکی فێرکاریی دیاریکراو و ڕێگەیەکی ڕاستکەرەوەی گونجاو."

ئەوەی تێبینی دەکرێت لە هەموو ئەو پێناسانەدا، ئەوەیە کە پەروەردەی ئیسلامیی پێویستە سەرجەمی ئاڕاستە و فەلسەفە و مەبەستەکانی لە شەریعەتی ئیسلامییەوە وەر بگیرێت، هەروەها ئەو پێناسانە دووری و پەرگیریی پەروەردەی ئیسلامیی لە ئاڕاستە و ڕێنماییەکانی ئیسلام ڕەت دەکەنەوە، جا چ لەڕووی تیۆرییەوە بێت یاخود لەڕووی کردارییەوە. هەروەها پەروەردەی ئیسلامیی بەم واتایە پەروەردەیەکی ئامانجدارە و مەبەستی دروستکردن و پێکهێنانی تاکێکی موسوڵمان و کۆمەڵگەیەکی موسوڵمان و ئوممەتێکی موسوڵمانە، کە جێنشین کراوە لە زەویدا بۆ هەڵگرتنی پەیامی خودا، جیاوازیی نییە ئەم پەرەوەردەیە لەڕێی دامەزراوە فەرمییەکانی وەك قوتابخانە و زانکۆکانەوە ئەنجام بدرێت، یاخود لە ڕێگەی دامەزراوە نافەرمییەکانی وەك ماڵ و دەزگاکانی ڕاگەیاندن.

**پەروەردەی ئیسلامیی بەم واتایە بریتییە لە:** "سیستمێکی پەروەردەییە کە خودای گەورە پێویستی کردووە لەسەر موسوڵمانان کە خۆیان و منداڵەکانیانی لەسەر پەروەردە بکەن و هەروەها لەژێر ڕۆشنایی ئەم سیستمەدا خزم و کەسیان پێبگەیەنن و ئاڕاستەیان بکەن دوور لە سیستمە بێباوەڕی و ئاتایستەکان، یاخود سیستمە سیکولارە بێدینییە خواروخێچەکان."

**هەروەها پەروەردەی ئیسلامیی بریتییە لە:** "ئەو سیستمە پەروەردەییەی کە خودای گەورە پێویستی کردووە لەسەر دەسەڵاتدارانی موسوڵمانان و بەرپرسانی

کاروباری پەروەردەیی و فێرکاری و ئەو دامەزراوانەی کە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ پەیوەندییان پێوەی هەیە بۆ ئەوەی کار بۆ بەدیهێنانی ئامانج و مەبەستەکانی ئەم سیستمە بکەن، ئەمەش لە ڕێگەی ئەم دامەزراوە پەروەردەییانە و پڕۆگرام و جێبەجێکردن و سیستمەکانیانەوە."

لەگەڵ ئەوەی پەروەردەیەکی ئیسلامیی ڕەسەن لە واقعی ئەمڕۆماندا بەدی ناکرێت، بە جۆرێك بووە بە زاراوەیەکی مێژوویی و ئەگەر توێژەر بیەوێت واتا و سیماکانی ئەم زاراوەیەی بۆ ڕوون ببێتەوە، ئەوا پەنا دەباتە بەر پەرتووکەکانی کەلەپوور و مێژوو، سەرەڕای نائامادەیی پەروەردەی ئیسلامیی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، کە وای کردووە ئەو زاراوەیە لە بیری زۆر کەس و توێژەردا تێکەڵ ببێت بە پێکهاتە و بەشەکانی تری پەروەردەی ئیسلامی: وەکو پەروەردەی ئایینی[1] هەروەها پەروەردەی ئایینیی تایبەت بە بانگخوازی و هەندێ لە باسەکانی ڕەوشت و بەهاکان[2]، کەچی هێشتا مانای ڕاستەقینەی پەروەردەی ئیسلامیی لە توێژینەوەی هەندێك لە توێژەراندا ڕوون و ئاشکرایە بەوەی ئەم پەروەردەیە پەروەردەیەکی تایبەتمەندە و ((تاکی موسوڵمان)) بەرهەم دەهێنێت، ئەو تاکەی کە خاوەن پەیام و پڕۆگرامێکی ڕوونە لە هەموو بوارە جیاوازەکانی ژیاندا: بیروباوەڕ، پەرستشەکان، ڕەوشت، سیستمەکان، هەروەها هەوڵی سەرخستنی بەرنامەی خودا دەدات لە زەویدا، هەر بۆیە پەروەردەی ئیسلامیی خاوەن

---

[1]– تێبینیی دەکرێت کە زۆربەی وەزارەتەکانی پەروەردە و فێرکردن لە جیهاندا دەکەونە ئەم هەڵە زانستییە گەورەوە، کاتێك ناوی پەروەردەی ئیسلامیی لە کتێبی مەنهەجی پەروەردەی ئایینیی دەنێن لە خوێندنگەکانیاندا.

[2]– نموونە لەسەر ئەوە کتێبێك کە بەم نزیکانە لە بازاڕدا دەر کەوت بە ناونیشانی: التربية الإسلامية من هدي خير البرية، للشيخ عبد الله بن محمد الخليفي، دار الأصفهاني، جدة، بدون تأريخ، کە لەوە دەرناچێت کتێبێك بێت لەبارەی ڕەوشت و ئاکارە ئیسلامییەکانەوە.

چەمکێکی ڕوونە کە پێویستە بە هەمان شێوەی چەمکی پەروەردەی ڕووسی و ئەمریکی و پەروەردەکانی تر لەلامان ڕوون بێت...  ئەم پەروەردەیەش ڕووکار و سیما و تایبەتمەندێتیی خۆی هەیە[1].

**بەو ئومێدەی لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەمان بۆ پەروەردەی ئیسلامیی بتوانین گرنگترین تایبەتمەندییەکانی لەم خاڵانەی خوارەوەدا بخەینە ڕوو:**

١- پەروەردەی ئیسلامیی بەرپرسیارێتییەکەی لە یەك کاتدا لە ئەستۆی تاك و کۆمەڵگەدایە، بەرپرسیارێتییەکەی لە ئەستۆی تاکە بەو مانایەی کەوا هەر تاکێکی موسوڵمان بەرپرسە لەوەی خۆی پێبگەیەنێت و پەرە بە خۆی بدات، گومان لەوەدا نییە ئەوەی کە قورئانی پیرۆز و فەرموودە پیرۆزەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) لە خۆیانی دەگرن سەبارەت بە هاندانی ئیمانداران بۆ ئەوەی داوای زانست و زانیاری بکەن و بەدوایدا بگەڕێن هەر لە بێشکەوە تاکو ناو گۆڕ، ئەمانە هەمووی هۆکار بوون بۆ ئەوەی موسوڵمانان بە زانستەوە وابەستە بن، بە شێوەیەك کە داواکردنی زانست و هەوڵدان بۆی بووە بە کەلتوورێکی ئیسلامیی لە باوانەوە بۆ نەوەکان دەگوازرێتەوە، زانایانیش بوونەتە ڕەگەزێکی گرنگ و تایبەتمەند کە موسوڵمانان بە چاوی ڕێز و پڕبایەخەوە بۆیان دەڕوانن، بێگومان

---

[1]- دیارییکردنی واتای پەروەردەی ئیسلامیی و تایبەتمەندییەکانی و بوارەکانی لێکۆڵینەوە تێیدا لە مەسەلە گرنگەکانە، کە شایەنی ئەوەیە لێکۆڵینەوەی تێدا بکرێت. خودی لێکۆڵەریش لە ئێستادا خەریکی ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەیەکە لەم مەسەلەیەدا، لەو لێکۆڵینەوانەی شتێکیان لەو بارەوە تێدا دەبینین لەپاڵ ئەو لێکۆڵینەوانەی تۆزێك پێش ئێستا باسمان کردن لە پەراوێزدا، کە گوتمان لە بەئاگاترین لێکۆڵینەوەکانن لە واتای ڕاستەقینەی پەروەردەی ئیسلامیی، ئەم لێکۆڵینەوانەش: د. محمد منير مرسي: التربية الإسلامية: أصولها وتطورها في البلاد العربية، عالم الكتب، (١٩٧٧م)، (ص ٣٠، ٣١)، د. سعيد إسماعيل: أصول التربية الإسلامية، دار الثقافة، القاهرة، (١٩٧٦م): د. عبدالفتاح جلال: من الأصول التربوية في الإسلام، سرس الليان، (١٩٧٧م).

خودای گەورە داواکردنی زانستی پێویست کردووە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی نێر و مێ و سەبارەت بە زانستە ئاینییەکان فەرزی عەینە لەسەریان و سەبارەت بە زانستەکانی تریش فەرزی کیفایەیە. ئەمەش مانای ئەوەیە موسوڵمانی پێگەیشتوو لە ئیسلامدا بەرپرسە لە پەروەردە کردنی خۆی و سەرپەرشتیکار (ولی الامر) بەرپرسە لە پەروەردەکردنی ئەو منداڵە هەتاوەکو پێدەگات، هەروەها وڵاتی ئیسلامیی بەرپرسە لە دابینکردنی ڕێگاکانی پەروەردەکردن بۆ ڕۆڵەکانی خۆی، ئەگەر هاتوو خۆیان نەیانتوانی ئەم کارە بکەن، یاخود تەمبەڵییان تێدا کرد.

به هەمان شێوە پەروەردەکردن بەرپرسیارێتیی کۆمەڵگەشە بەو مانایەی کە کۆمەڵ بەرپرسە لە فێرکردنی تاك، ئەمەش هەر لە سەرتاوە بەڕوونی دیار بوو و خۆی دەبینییەوە لە کەسایەتیی پێغەمبەری ئازیزدا (دروودی خوای لەسەر)، کە خەڵکی لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەمدا فێر دەکرد، پاشان لە مزگەوتدا خەڵکی فێر دەکرد و هەروەها لە هەر شوێنێکدا کە بواری بۆ بڕەخسایە خەڵکی فێر بکات دریغیی نەدەکرد، بە هەمان شێوە جێنشینە ڕاشیدەکان لەسەر هەمان ڕێگای پێغەمبەر بەردەوام بوون، بۆ نموونە لە سەردەمی عومەردا (ڕەزای خوای لەسەر) گرنگیی زۆری بە پەروەردە دەدا هەر بۆیە هاوەڵانی زانای دەکردە فەرمانڕەوای ئەو ناوچانەی کە لەژێر دەستی خیلافەتدا بوون، بۆ ئەوەی لەپاڵ فەرمانڕەواییدا پەروەردەی خەڵکەکەش بکەن، هەروەها کۆمەڵێك پیاوی لەگەڵدا دەناردن کە تایبەتی کردبوون بە زانست و پەروەردەکردنەوە. هەروەها جێنشینە موسوڵمانەکان هەردەم لە خەمی زانستدا بوون و لە خەمی ئەوە بوون چۆن زانست بڵاو بکەنەوە و خەڵکی بۆ هان بدەن.

٢- بوونی فەلسەفەیەکی پەروەردەیی ڕوون و ئاشکرا، کە لە قورئان و سوننەتەوە وەر گیراوە و دیاریی دەکات کە مرۆڤ چییە؟ ڕەوشت چییە؟ ئایا

سەرچاوەکانی زانست چین؟ پەیوەندیی تاك بە کۆمەڵگاوە چییە؟ هەروەها مرۆڤ بۆچی دەژی؟[١].

لەژێر ڕۆشنایی ئەم فەلسەفە پەروەردەییە ڕوونەدا زانستەکان هەموویان شێوەی ئەڵقەیەکیان وێنا دەکرد کە باوەڕ و زانستی موسوڵمانی بە خودای گەورە زیاتر دەکرد، هەر بۆیە زانستە عەقڵی و نەقلییەکان هەموویان دەڕژێنە یەك ڕووبارەوە: ئەویش ڕووباری باوەڕ و یەکتاپەرستیە، بۆیە پەروەردەی ئیسلامیی جیاوازە لەو پەروەردانەی تر، کە زانست لە باوەڕ جیا دەکەنەوە، یاخود ئەو پەروەردانەی کە عەقڵ و ئاوەزیان وەر گرتووە و سرووش ڕەت دەکەنەوە، هەر بۆیە بە درێژایی هەموو مێژووی پەروەردەی ئیسلامیمان ئەم گونجان و هەماهەنگییە دەبینین لەنێوان عەقڵ و سرووشدا و ئەمەش لە هەموو زانا موسوڵمانەکاندا بەدی دەکرێت، جا چ زانای بواری شەریعەت بن، یاخود زانای بوارە عەقڵییەکانی تر بن، وەکو پزیشکی و فەلسەفە و زانستە جیاوازەکانی تر، بە هەمان شێوە زانستی ئیسلامیی هەردەم لە خزمەتی ژیان و زیندەوەراندا بووە و هەرگیز ئامرازێك نەبووە بۆ دەستبەسەرداگرتن و شێواندنیان.

٣- ئەو سیستمە کارگێڕیانەی لە دامەزراوە ئیسلامییەکاندا کاریان پێ کراوە، جا ئەم دامەزراوانە چ مزگەوت بووبێتن، یاخود قوتابخانە، یاخود یانەیەکی ئەدەبی... هتد، بریتی بوون لە چەند سیستمی ئاسان و ساکار کە تیایاندا ڕاوێژ و دیموکراسی و ڕێزگرتن لە کەسایەتیی زانا و فێرخواز بە شێوەیەکی بەرچاو بەدی

[١]- بۆنموونە بڕوانە: علي خليل أبو العينين: فلسفة التربية الإسلامية في القرآن الكريم، دار الفكر العربي، (١٩٨٠م)، عبدالجواد السيد بكر: التربية الإسلامية كما تبدو في ضوء الحديث الشريف، رسالة ماجستير غير منشورة، تربية طنطا، (١٩٨٠م)، د. عمر التومي الشيباني: فلسفة التربية الإسلامية، الشركة العامة للتوزيع والنشر، طرابلس، (١٩٧٨م).

کراوە. وە گومان لەوەدا نییە کە کارگێڕیی باش یەکێکە لە فاکتەرەکانی سەرکەوتن لە بواری پەروەردەدا بە هەمان شێوەی بوارە جیاوازەکانی تر.

٤- پەروەردەی ئیسلامیی شێوازێك پەیڕەو دەکات کە یەکسانی و هەلڕەخساندن لەنێوان خەڵکیدا بەدی دێنێت و هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوان هەژار و دەوڵەمەندا و هیچ ڕەگەزێك لە ڕەگەزێکی تر باشتر نییە و بە هەمان شێوە هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوان ڕەشپێست و سپیپێستدا و کەسیان لەپێشتر نین لەوی تریان، بەڵکو هەر تاکێك بەپێی هەوڵ و ماندووبوون و زیرەکیی خۆی دەتوانێت هەر بوارێکی زانستی بوێت بەدەستی بخات، هەر بۆیە زانامان هەیە بە ڕەگەز عەرەبە، یاخود فارسە، یاخود ڕۆمیە، یاخود لە چینی هەژار یان چینی دەوڵەمەندە و ئەم تایبەتمەندییەش شیاوی جۆرێك لە هەڵوەستەلەسەرکردن و تێڕامانە.

٥- پەروەردەی ئیسلامیی پەروەردەیەکە تێیدا زانست پەیوەستە بە کردارەوە و بیردۆزیش پەیوەستە بە جێبەجێکردنەوە، هەرگیز پەروەردەیەکی تیۆری نەبووە کە تەنها لە جیهانیی ئەندێشەدا مابێتەوە و یاخود خاوەنەکانی لە کۆمەڵگە و ژیان گۆشەگیر کردبێت، هەر بۆ نموونە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) هەڵدەستان بە لەبەرکردنی دە ئایەت لە قورئانی پیرۆز، دواتر لە ژیانی خۆیاندا جێبەجێیان دەکرد، پاشان هەڵدەستان بە لەبەرکردنی دە ئایەتی تر. هەروەها خودی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) پێش ئەوەی خەڵك بۆ ڕەوشتی جوان بانگ بکات، خۆی پێوەی پابەند دەبوو، سەرەڕای ئەوەی سروشی بۆ دادەبەزی، بەڵام لە هەموو بابەتێکدا ڕاوێژی بە هاوەڵانی دەکرد بۆ ئەوەی هەموو فەرمانڕەوایەك بزانێت و فێر ببێت چۆن فەرمانڕەوایی دەکات و هەروەها خەڵکیش بزانن چۆن دەست بە مافەکانیانەوە دەگرن لەبەرامبەر فەرمانڕەواکانیاندا. زانستە ئیسلامییەکانیش بەم شێوەیە بوون: ((فیقك)) بۆ ئەوەی خەڵك حوکمی

ڕەفتارەکانیان بزانن بەپێی ئیسلام، ((ڕاڤـە و فـەرموودە)) بـۆ زانـینی سەرچـاوەی حوکمـە شـەرعییەکان، ((ژیـانی پێغەمبـەر)) بـۆ پێشـەنگیکردن، ((پزیشـکی)) بـۆ چارەسەرکردن، ((گەردوونناسی)) بۆ بەدواداچوونی ئەستێرەکان، ((زمانەوانی)) بۆ شارەزابوون لە زانسـتەکان و ...هتـد، واتـە ئـەم پەروەردەیـە پراکتیکییـە و تـەنها تیۆری نییە، کە لە بورجی عاجی بژییێت.

٦- پەروەردەیەکی تەواوکارییە و تەنها گرنگیـی بـە ڕاهێنـان لەسـەر پیشـە و کـارکردن نـادات، هـەر وەکـو ئـەوەی کـە پـەروەردەی میسـریی فیرعـەونی پێـی هەستاون، بەتەنها گرنگیی بە بەهێزکردنی جەستە نادات، هـەر وەکـو ئـەوەی کـە پەروەردەی ڕۆمانی ئەنجامی داوە، بەتەنها گرنگیی بە عەقڵ و فەلسەفە نادات، بە شێوازی پەروەردەی یۆنانییەکان، هەروەها بەتەنها گرنگیی بە لایەنی ڕۆحی نادات، هـەر وەکـو پـەروەردەی مەسـیحی گرنگیـی پـێ دەدات، بـەڵکو پەروەردەیـەکی تەواکارییە، کە بایەخ بە عەقڵ و جەستە و ڕۆح و ڕاهێنان لەسەر پیشـەکان دەدات، بۆیە بەڕاستی پەروەردەی ئیسلامیی پەروەردەیـەکی تێروتەسـەلە، ئـەو کەسـەش بەهەڵەدا چووە کە وا دەزانێـت ئـەم پەروەردەیـە تـەنها خـەڵکی بـۆ دواڕۆژ ئامـادە دەکات.

٧- ئەم پەروەردەیە بنیات نراوە لەسەر کرانەوە و ڕەسەنێتی، کرانەوەش بە مانای ئازادی دێت، چونکە ئازادی دەرئەنجامی کرانەوەیە، بەم کرانەوەیش ئیسلام هەموو زانستەکانی شارستانیەتە دێرینەکانی لەخۆ گرت و فێری ڕۆڵەکانی خۆی کرد لەڕێی پەرتووك و مزگەوتەکان و ئەو دامەزراوە و پەیمانگایانەی کە لـەژێر سـێبەری ئیسلامدا بنیات نرابوون، هەروەها ئەم پەروەردەیە هەموو ئەو کەسانەی گرتە خۆی کـە توانـای بەخشـینی زانسـتیان هـەبووە و هـەلی بـۆ ڕەخسـاندوون بـۆ ئـەوەی هەرچییەکیان هەیە پێشکەشی بکەن، هەروەها ئەم پەروەردەیە توانیویەتی جوو و

مەسیحی و نەساتیرەکان و هەموو ئەوەی کە فیرعەونەکان و فارس و گریك و هیندییەکان بەرهەمیان هێناوە بگرێتە خۆی، بەڵام کاتێك موسوڵمانان پەیمانگاکانیان بە ڕووی ئەم شارستانیەتانەدا کردوونەتەوە، تەنها گوێگر و وەرگر نەبوون و بێهەڵوێست نەبوون لەبەرامبەریاندا، بەڵکو ئەو زانستانەیان بە ڕەنگێکی ئیسلامیی ڕەنگ کردووە و ملکەچیان کردووە بۆ ڕۆحی ئیسلام، کە لە کۆتاییدا ئەم زانستانە بوونەتە زانستێکی ئیسلامیی و بەشێکی جیانەبۆوە لە شارستانیەتی ئیسلامیی پرشنگدار.

٨- هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان ئامانج لە پەروەردەی ئیسلامیی بەدەستهێنانی بڕوانامە نەبووە، یاخود تەنها ڕاهێنانێکی پیشەیی بێت لەسەر پزیشکی و ئەندازیاری و کشتوکاڵ و پیشەسازی، یاخود تەنها توێژینەوەیەکی زانستی بێت کە تەنها لەبەر خودی توێژینەوەکە ئەنجام درابێت، بەڵکو ئامانج بە پلەی یەکەم بۆ پاڵفتەکردنی دەروون (تزكية النفس) بووە، پاشان بۆ خزمەتکردنی ژیانێکی ئیسلامیی و ئیسلام و موسوڵمانان بووە. بەهۆی ئەوەی ئامانجە پاڵنەرەکە پاك و بەرز بووە، هەر بۆیە هەمیشە بەرهەمەکەشی بەرهەمێکی باش و پاك و پیرۆز بووە.

٩- پەروەردەی ئیسلامیی پەیڕەوی لە هیچ چوارچێوەیەکی دیاریکراو نەکردووە، چ لەڕووی کات و شوێنەوە، یاخود لەڕووی بەرنامە و پرۆگرامەوە، بۆیە هیچ تەمەنێك دیاری نەکرابوو بۆ دەستپێکردن بە خوێندن و هیچ تەمەنێکیش بۆ کۆتاییهاتن بە خوێندن دیاری نەکرابوو، هەروەها هیچ کۆت و بەندێك دانەنرابوو لەسەر ئەوەی کە فێرخواز پەرتووك لەگەڵ خۆیدا بهێنێت، یاخود خوێندنی لە قوتابخانە، یاخود مزگەوت دەست پێ بکات، یاخود بۆ خوێندن بەتەواوەتی پشت بە خۆی ببەستێت، بە هەمان شێوە سەبارەت بە پرۆگرامی خوێندن ئەوا خوێندکار

ئازاد بوو لە هەڵبژاردنی ئەو بابەتەی کە دەیەوێت بیخوێنێت و چۆن بیخوێنێت و هەروەها لەسەر دەستی کام مامۆستایە ئەو وانانە بخوێنێت[1].

١٠- پەروەردەی ئیسلامیی وەك پەروەردەکانی تر پشتی بە (تلقین) نەبەستووە، بەڵکو بەند بووە لەسەر خوێندنەوەی تایبەت، بە درێژایی مێژوو هیچ شارستانیەتێك نەبووە هاوشێوەی ئیسلام پەرتووکی پیرۆز ڕایگرتبێت، یان پشتی بەستبێت بە گەشتکردن لەپێناو داواکردنی زانستدا، هەروەها گفتوگۆکردن لەنێوان قوتابییان خۆیان و لەنێوان قوتابی و مامۆستادا، بە هەمان شێوە پشتی بەستبێت بە ئەنجامدانی دیبەیت و پێشەنگی باش. تۆمەتبارکردنی پەروەردەی ئیسلامیی بەوەی تەنها پشتی بەستبێت بە لەبەرکردن و تەلقین تۆمەتێکی نادروست و ناڕەوایە و هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ تێکەڵکردن لەنێوان پێویستیی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) لەگەڵ شێوازەکانی تری پەروەردەی ئیسلامیی، یاخود ڕەنگە هۆکاری ئەم تۆمەتە بگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمانەی کە ناوزەند دەکرێن بە سەردەمەکانی هەڵوەشانەوە (عصور الانحلال) کە تێیدا دەرگای ئیجتیهادکردن داخرا و کار بە چاولێکردن و لاساییکردنەوە (تقليد) کرا.

١١- پەروەردەی ئیسلامیی پشتی نەبەستووە بە تاقیکردنەوەکان (الامتحانات) کە وەك دێوێك بۆتە ڕاوەنەری قوتابییان لە گشت کات و شوێنێکدا، بەڵکو پشتی بەستووە بە ڕێپێدانی مامۆستا بۆ قوتابییەکەی و هەروەها لێهاتوویی خودی

---

[1]- د. عبدالغني عبود: (التعليم مدى الحياة في الإسلام)، من كتاب: في التربية المعاصرة، د. إبراهيم عصمت مطاوع، د. عبد الغني عبود، دار الفكر العربي، القاهرة، (١٩٧٧م). دەربارەی فرەچەشنیی دامەزراوە فێرکارییەکان لە ئیسلامدا، بڕوانە سەر: د. أحمد شلبي: تأريخ التربية الإسلامية، النهضة المصرية، القاهرة، (١٩٧٣م)، (ص ٤١-٢٠٥).

قوتابییەکە و توانای بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو پرسیارانەی کە ئاڕاستەی دەکرێت لەلایەن مامۆستا و قوتابییەکانی ترەوە، ئەگەر بێین لەم ڕووەوە لە پەروەردەی ئیسلامیی بکۆڵینەوە، ئەوا کۆمەڵێك سوود وەدەست دەخەین.

١٢– پەروەردەی ئیسلامیی بابەتە مرۆییەکان و پراکتیکییەکان، یاخود بابەتە تیۆری و زانستییەکانی لەیەك جیا نەکردۆتەوە، بۆیە هیچ زانایەکی ئایینیمان نەبووە کە زانیاریی دەربارەی زانستە عەقڵییەکان نەبووبێت، وە هیچ زانایەکی بواری پزیشکی یاخود فەلسەفەمان نییە کە بێئاگا بووبێت لە کۆی زانستە شەرعییەکان. کاتێك لە پێشەوایەکی وەکو پێشەوا غەزالی دەڕوانین، دەبینین زانستی شەرعی و زانستی عەقڵیی لەلا کۆ بۆتەوە و ئاوێتەی کردوون، بە هەمان شێوە کاتێك لە زانستی پزیشك و فەیلەسووفێکی وەك ئیبن سینا دەڕوانین، هەمان سەرنج دەدەین، ئاوێتەکردنی عەقلّ بە نەقلّ.

١٣– پەورەردەی ئیسلامیی ڕێژەیەکی زۆر پێشەوا و پێشەنگی باشی لەخۆ گرتووە، بۆیە بەڕاستی زانایانی ئیسلام پێشەنگێکی ناوازەن لەڕووی دانایی و زانست و چاوکراوەیی و باشی و بەردەوامی و پاکێتییەوە و نموونەی بالاّ بوون بۆ قوتابییەکانیان، زۆر بەکەمی ئەگەر هەندێك دیاردەی نەشیاو لەناویاندا بەدی بکرێت، هەر وەکو چۆن لە پەروەردەکانی تردا بەدی دەکرێت، وەکو بالاّدەستبوونی هەندێك نەزان و بێتوانا لەڕووی زانستی و کارگێڕییەوە، بەڵکو زانایانی ئیسلام خاوەن ڕێز و پایە بوون و ڕەچاوی پلەوپایەیان کراوە، چ لەلایەن دەسەڵاتەوە، چ لەلایەن خەڵکییەوە.[١]

---

[١]– ڕەوشتەکانی زانا و خوێندکار لە کەلەپووری پەروەردەییماندا زیاترە لەوەی بژمێردرێن، بڕوانە: د. محمد ناصر: الفكر التربوي العربي الإسلامي، وكالة المطبوعات، الكويت، (١٩٧٧م)، كتاب ابن الجوزي: نقد العلم والعلماء أو تلبيس إبليس، المطبعة المنيرية، القاهرة، بدون، د. عبدالفتاح أبو غدة: صفحات من

١٤- پـەورەردەی ئیسـلامیی گرنگیـی بـە زمـانی عـەرەبی داوە، چـونکە زمـانی قورئـانی پـیرۆز و فـەرموودەکانی پێغەمبــەرە (دروودی خـوای لەسـەر)، ئیسـلام پاڵنەرێکی بەهێز بووە بۆ ئەوەی خەڵکی ڕوو بکەنە زمانی عەرەبی و فێری ببن و تا ئەو ڕادەیەی زۆربەی موسوڵمانان توانیویانە بـەم زمانـە بدوێن، جا چ عـەرەب بـن یـاخود نـا، تـا کـار گەیشـتە ئـەوەی وەك زمـانی زانسـت لەسـەر ئاسـتی جیهـان ناسێنرا، کە موسـوڵمانان نووسـین و لێکتێگەیشـتنیان پـێ ئـەنجام داوە. هـەروەها بایەخدان بە زمانی عەرەبی بە خاڵێکی گرنگ لە خاڵـە درەوشـاوەکانی پـەروەردەی ئیسلامیی لە هەموو سەردەمەکان برەوی پێ دراوە.

١٥- لەگەڵ هەموو ئەمانەی باس کرا پـەورەردەی ئیسـلامیی گرنگییـەکی زۆری بە پەروەردەی ئەخلاقی داوە کـە بەرهەمەکەشـی بـریتی بـوو لـە چـەند نەوەیـەکی ڕەوشـتبەرز و کۆمەڵـە پێشـەنگێکی نموونـەیی بـۆ مرۆڤایـەتی بـەرزتر لـە ڕەگـەز و نەتەوەپەرستی و خاك و نیشـتیمان، بـە درێـژایی مێـژوو بەکـەمی هەنـدێك دیـاردە بینـــراون لـــەنێوان قوتابییـــە موســـوڵمانەکان بـــەراورد بـــەوەی لـــە قوتابییـــە ناموسوڵمانەکان بەدی دەکرێت لە شۆڕش و توندوتیژی و ڕەوشتنزمی[١].

ئەم خاڵانەی باسمـان لێـوە کـردن هەنـدێك لـە تایبەتمەندییـەکانی پـەروەردەی ئیسلامیی بوون لە چاخەکانی گەشانەوەیدا. پاشان ئەم پەروەردەیە لە چاخەکانی

---

صبر العلماء على شدائد العلم والتحصيل، مكتب المطبوعات الإسلامية، حلب، (١٩٧٤م).

[١]- ئەوەی دەربارەی ئاسانکاریی موسڵمانان نووسـراوە لـە بەرەوپێشچـوونی زانسـتدا زۆرە، بـۆ نموونـە بڕوانە: زيغريد هونكة: شمس العرب تسـطع علـى الغـرب، ترجمـة د. فـاروق بيضـون، كمـال دسـوقي، دار الآفاق الجديـدة، بـيروت، (١٩٧٩م)، عمـر فـروخ: تـأريخ العلـوم عنـد العـرب، دار العلـم للملايـين، بـيروت، عبدالحليم منتصر: تأريخ العلم ودور العلماء العرب في تقدمه، دار المعارف، القاهرة، (١٩٦٩م).

دەربارەی تایبەتمەندییەکانی ژیاری عەرەبیی ئیسلامیی و ئاراستە مرۆڤایەتییەکانی، بـۆ نموونـە بڕوانـە: د. ناجي معروف: أصالة الحضارة العربية، دار الثقافة، بيروت، (١٩٧٥م)، (ص ١٦١-٣٨٤).

لاوازبوونیدا لەم تایبەتمەندییانـە لای دا. ڕەنگـە سـوود وەر بگـرین لـە ئەنجامـدانی لێکۆڵینەوە لـە دەرئەنجامـەکانی ئـەم لادانـە لـە پـەروەردەی ئیسـلامیی، هـەروەها هـەوڵ دەدەیـن سـوود وەر بگـرین لـە شـیکارکردنی ئـەو تایبەتمەندییانـەی پێشـتر باسمان لێوە کرد لەپێناو سەرلەنوێ داڕشتنەوەی هزرێکی پـەروەردەیی ئیسـلامیی تایبەت بە خۆمان کەوا سوودی بۆ خۆمان و هەموو جیهان هەبێت.

ئەگەر پەروەردەی ئیسلامیی، بەو تایبەتمەندییانەی کـە باسمـان لـە هەنـدێکی کرد، ئامرازێکمان بێت بۆ پەرەپێدان بە مانا ئیسلامییە فراوانەکەی، لە هەمان کاتدا ئامرازێکی کارایە بۆ پەرەپێدان و پاراستنی سامانە ژینگەییەکان. هـەر وەك ڕوونـە ئەمڕۆ هەموو وڵاتـانی جیهـان ڕووبـەڕووی کێشـە ژینگـەییکان دەبنـەوە بـە ڕێـژەی جیاواز و بەردەوامیش ئەم کێشانە لە زیادبووندان و بوونەتە مەترسی بۆ سەر ژیانی زۆرێك لە زیندەوەران، بە مرۆڤیشەوە.

**ئەو کێشانەی کە هەڕەشە لە سامانە ژینگەییەکان دەکەن، پۆلێن دەکرێن بۆ:**

**أ- کێشە سروشتییە ژینگەییەکان، وەك پیسبوون:** پیسبوونی ئاووهەوا و خاك بەهۆی ئەو زبڵ و خاشاکانەی مـرۆڤ لـە هـەموو شـوێنێکدا فڕێـی دەدات بـە هـەموو جۆرەکانیەوە، وەکو غاز و شل و ڕەق و نیمچەڕەق، کـە دەبنـە هەڕەشـە بـۆ سـەر سامانە سروشتییەکان، هەروەها بەکارهێنانی ناعاقڵانەی سامانەکانی ئـاو و کـانزا و ناکانزا و ئاژەڵ و ڕووەکەکان بە شێوەیەك دەبێتە هۆی بەفیڕۆدان و لەناوبردنی ئەم سامانانە، کە لە کۆتاییدا هەڕەشە لە ژیانی مرۆڤ دەکات لەسەر گۆی زەوی، چونکە سامانە سروشتییەکان هەڕەشەیان لەسەرە، چ لەڕووی پیسبوونەوە یاخود لـەڕووی خراپبەکارهێنان و بەهەدەردان و بەفیڕۆدانیانەوە.

**ب- کێشەکانی ژینگەی کۆمەڵایەتی:** لەپاڵ خراپبوون و تێکچـوونی ژینگـەی سروشتیدا، بە هەمان شـێوە بـارودۆخی ژینگـەی کۆمەڵایـەتییش بـەرەو داڕووخـان

دەڕوات لـە هـەردوو کۆمـەڵگا پیشەسـازی و تـازە گەشەسـەندووەکان، کـە خـۆی دەبینێتەوە لەو دڵەڕاوکێ و نالەبارێتیەی باڵی بەسـەر هـەموو جیهانـدا کێشـاوە بـە پلـەی جیـاواز، ئەمــەش لـە دەرئـەنجامی پـەرتبوون و هەڵوەشـانەوەی خێـزان و کۆمــەڵگادا، هــەروەها بــەهۆی لاوازیــی دامــەزراوە نیشــتیمانی و جیهانییــەکان و دەستەوسانبوونیان لە دابینکردنی ژینگەیەك کەوا بە شێوەیەکی هاوسەنگ لە یـەك کاتدا پـەرە بە هەردوو لایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی بدات. ئەمەش لە هەمان کاتـدا هەڕەشە لە کۆمەڵگە پیشکەوتوو و کۆمەڵگە تازە گەشەسەندووەکان دەکات بەوەی ناوزەند دەکرێت بە ((پەرەپێدانی ناهاوسەنگ)).

بۆ پێشگرتن لەو مەترسییانەی کـە لـە هـەمان کاتـدا ڕووبـەڕووی مـرۆڤ و ژینگـە دەبنـــەوە، لـــەم ســـالآنەی دواییـــدا چـــاوپێکەوتن و کـــۆنگرە نێودەوڵەتییـــەکان و وێرکشۆپەکان لەسەر ئاستی جیهان بە ڕێژەیەکی بەرچـاو زیادیـان کـردووە، ئەگـەر لێرەدا باس لە هەموو بڕیار و ڕاسپاردەکانیان بکرێت سەبارەت بە پاراستنی ژینگـە و پەرەپێدانی. یەکەمین کۆنگرەی لەم شێوە لەسەر ئاسـتی جیهـان بـریتی بـوو لـە کۆنگرەی نیڤادا لە سـاڵی (١٩٧٠ز) پاشـان کـۆنگرەی سویسـڕا لـە سـاڵی (١٩٧١ز) هەروەها کۆبوونەوەی فینلەندا لـە هـەمان سـاڵدا، پاشـان کـۆنگرەی سـتۆکهۆڵم لـە ساڵی (١٩٧٢ز)، هەروەها یەکەم کۆنگرە لەسـەر ئاسـتی نەتـەوەیی بـریتی بـوو لـە بازنەی لێکۆڵینەوە خەرتووم لە ساڵی (١٩٧٢ز) هـەروەها لەسـەر ئاسـتی نـاوخۆیی یەکەمین کۆنگرە کۆنگرەی مامۆستایان بوو لە قاهیرە، لە ساڵی (١٩٧٣ز)، پاشـان ئەم کۆنگرە و کۆڕ و لێکۆڵینەوە و توێژینەوانەی تایبەت بە پەروەردەی ژینگەیی و پاراستنی سامانەکانی ژینگە بەدوای یەکدا بەردەوامییان هەبوو[1].

سەرەڕای ئەم گرینگیدانە بە پەرەپێدان و پاراستنی سـامانەکانی ژینگـە، بـەلآم

---

[1]– عبد الرحمن النقيب: بحوث في التربية الإسلامية، الكتاب الأول، دار الفكر العربي، (١٨٨١م)، (ص ١٥–١٩).

هێشتا ئەو توێژینەوانەی جەخت لەسەر گرنگیی ژینگە لە ڕوانگەی بیروباوەڕ دەکەنەوە بەپێی پێویست نین، چونکە لایەنی بیروباوەڕ یەکێکە لە گرنگترین و کاراترین فاکتەرەکان لەم بوارەدا، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندیی بە ئیسلام و ڕێنماییەکانیەوە هەیە، **چونکە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) زۆرێك لە بنەما و ڕێنماییان لەخۆ گرتووە کە دەشێت بەکار بهێنرێن و سوودیان لێ ببینرێت بۆ پەرەپێدان بە ژینگە و پاراستنی، لەوانەش:**

١- بەپیرۆزڕاگرتنی هەستی بەرپرسیارەتی سەر شانی مرۆڤ و لێکەوتە و دەرەنجامە کردارییەکانی کە پێویستە پێیانەوە پابەند بێت، کە بریتییە لە بەرپرسیارێتی جێنشینیی خودای گەورە لەسەر زەوی لەلایەن مرۆڤەوە بۆ ئەوەی هەستێت بە ئاوەدانکردنەوەی زەوی و هەڵگرتنی ئەو ئەمانەتە (ئاوەدانکردنەوە) و شارستانێتی بوون بە ویستی خود... خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَآئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾{البقرة:٣٠} واتە: ((بیریان بێنەوە کاتێك پەروەردگاری تۆ بە فریشتەکانی گوت: بەڕاستی من جێنشینێك دروست دەکەم لەسەر زەوی و فریشتەکان گوتیان: ئایا کەسێکی وای تێدا دروست دەکەی کە خراپە و بەدی تێدا بکات و خوێنی تێدا بڕێژێت؟ لە کاتێکدا ئێمە ستاییشت دەکەین و لەو شتانەت بەدوور دەگرین کە شایستەی تۆ نین، لە وەڵامیاندا خودی گەورە فەرمووی: بێگومان ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن)). ئەم بەرپرسیارێتییە پێویستی دەکات لەسەر مرۆڤ لە لایەك خراپەکاری لە زەویدا نەکات و لە لایەکی تر پێویستیی ئەنجامدانی چاکسازی و ئاوەدانکردنەوەی زەوی دووپات دەکاتەوە.

٢- بیرخستنەوەی مرۆڤ بە شێوەیەکی بەردەوام بەوەی خودای گەورە چاودێریی هەموو کردار و گوفتارەکانیانە و لەو بارەوە لێیان دەپرسێتەوە، هەر کردارێکیش بەرامبەر ژینگە ئەنجام بدرێت ئەوا دەچێتە بازنەی ئەو چاودێرییەوە. هەر وەکو خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾ {الزلزلة:٧،٨} واتە: ((جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێر و چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە، ئەوەش کە بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خراپەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە)) هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلًا عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الْأَبْصَارُ﴾ {إبراهيم: ٤٢} واتە: ((وا مەزانە کە خودای گەورە بێئاگایە لەو کارانەی ستەمکاران دەیکەن، بێگومان ئەو دوایان دەخات بۆ ڕۆژێك کە چاوەکان تێیدا ئەبلەق دەبن لە ترسدا)) گومان لەوەدا نییە ئەم چاودێرییە ڕێگر دەبێت لەوەی مرۆڤ سامانە ژینگەییەکان تێك بدات.

٣- بانگەشە بۆ کارکردن و ئاوەدانکردنەوەی زەوی و زیندووکردنەوەی هەر وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِنْ رِزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾ {الملك:١٥} واتە: ((خودا ئەو زاتەیە کە زەوی بۆ ڕام کردوون، بگەڕێن بە هەموو گۆشە و کەنارێکیدا و لە ڕۆزیی خودای گەورە بخۆن و دڵنیاش بن کە سەرەنجام گەڕانەوەتان بۆ لای ئەوە)) هەروەها پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: ((إلتمسوا الرزق في خبايا الأرض))[١] واتە: ((بەدوای ڕۆزیدا بگەڕێن لە نهێنی و شاراوەکانی زەویدا)). هەروەها دەفەرموێت: ((من كانت له أرض ثمّ تركها ثلاث

---

[١]- السيد سابق: فقه السنة، القاهرة، مكتبة التراث، بدون، (١٩١/٣).

سنين ولم يعمرها ثمّ عمّرها قومٌ آخرون فهم أحق بها)) [1] واته: ((هەرکەسێك زەویەکی هەبێت و بۆ ماوەی سێ ساڵ جێی بهێڵێت بێ ئەوەی ئاوەدانی بکاتەوە، ئەوا هەرکاتێك کەسانێکی تر هاتن و ئاوەدانیان کردەوە ئەو زەوییە زیاتر شایستەی ئەوان دەبێت)).

٤- سەبارەت بە پێویستیی پەرەدان بە سامانی ئاژەڵ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلُوا وَارْعَوْا أَنْعامَكُمْ إِنَّ فِي ذلِكَ لآياتٍ لِأُولِي النُّهى﴾ {طه: ٥٤} واتە: ((ئەی خەڵکینە بخۆن و ماڵاتەکانیشتان بلەوەڕێنن، بەڕاستی لەوەدا نیشانەی زۆر هەیە بۆ ئەوانەی ژیر و هۆشمەندن)) بەڵکو بەزەییهاتنەوە بە ئاژەڵدا هۆکارێکە بۆ چوونەبەهەشت، هەر وەك چۆن پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: ((بينما رجلٌ يمشي بطريق اشتد به العطش فوجد بئرًا فنزل فيها فشرب منها ثمّ خرج، فإذا هو بكلب يلهث الثرى من العطش، فقال: لقد بلغ هذا الكلب من العطش مثل الذي بلغ بي، فنزل البئر فملأخفه ماءًا ثمّ أمسك بفيه ثمّ رقي فسقى الكلب فشكر الله فغفر لك)) واتە: ((پیاوێك بە ڕێیەکدا دەڕۆشت و تینوێتی زۆری بۆ دەهێنێت، تا چاوی بە بیرێك دەکەوێت، دادەبەزێت نێو بیرەکە و تێر ئاو دەخواتەوە تا تینوێتیی دەشکێت و پاشان کە دێتە دەرەوە چاوی بە سەگێك دەکەوێت لە تینوێتیدا زمان بە زەویدا دەخشێنێت، پیاوەکەش دەڵێت تینوێتیی زۆری بۆ ئەم سەگە هێناوە هەر وەك چۆن زۆری بۆ من هێنابوو، بۆیە دادەبەزێتەوە نێو بیرەکە و پێڵاوەکەی پڕ ئاو دەکات و بە دەمی هەڵی دەگرێت و دێتە دەرەوە و سەگەکە تێرئاو دەکات و دواتریش سوپاسی خوای گەورەی لەسەر دەکات، بۆیە بەهۆی ئەم هەڵوێستەوە خودای گەورە لە تاوانەکانی ئەم پیاوە خۆش دەبێت)) پاشان پرسییان ئەی پێغەمبەری خودا ئایا لە ئاژەڵاندا خێرما پێ دەگات؟

[1]- هەمان سەرچاوەی پێشوو، (ص ١٩٤).

پێغەمبەریش فەرموی: ((في كل ذات كبد رطبة أجـر)) [1] واتـە: ((لـە هـەموو خـاوەن جگەرێكدا خێر هەیە)). هەر بۆیە پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسـەر) نـەهیی كـردووە لـەوەی ئـاژەڵان ئـازار بـدرێن و مامەڵـەی خراپیـان لەگەڵـدا بكرێـت، دەفەرموێت: ((دخلت إمرأة النار في هرّة ربطتها فلم تطعمها، ولم تدعها تأكل خشاش الأرض حتى ماتت)) [2] واتە: ((ئافرەتێك خرایە دۆزەخەوە بەهۆی ئەوەی پشیلەیەكی بەستبۆوە و نـانی پـێ نـەدەدا و لـێش نەدەگـەڕا لـە خـاش و خـۆڵی زەوی بخـوات هەتاكو مردار بوویـەوە)). هـەر لـەم بارەیـەوە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر) دەفەرموێت: ((أفلا تتقي الله في هذه البهيمة التي ملكك الله إياها)) [3] واتـە: ((ئایـا لـە خودا ناترسی و گوێڕایەڵی خودا ناكەی لەم ئاژەڵەی كـە خـودا پێـی بەخشـیوی)). هەروەها سەبارەت بە بەكارهێنانی ئاژەڵ بۆ كارێك كە لەگەڵ سروشـتی ئاژەڵەكـەدا نەگونجێت دەفەرموێت: ((لا تتخذوا شيئا فيه الروح غرضًـا)) [4] واتـە: ((هـەر شـتێك ڕوحی تێدا بێت جگە بۆ مەبەستی خـۆی بـۆ هـیچ شـتێكی تـری بـەكار مـەهێنن)). هەروەها دەفەرموێت: ((الإبل عزٌ لأهلها والغنم بركة، والخير معقود في نواصي الخيـل إلى يـوم القيامـة)) [5] واتـە: ((حوشـتر سـەربەرزییە بـۆ خاوەنەكـەی، مـەڕوماڵاتیش بەرەكەتن، هەروەها خێـر و چاكەش بـە نێوچـەوانی ئەسـپ و ماینەوەیـە تـا ڕۆژی پەسلان)).

---

[1]– محمد ناصر الدين الألباني: صحيح الجامع الصغير وزيادته الفتح الكبير، (الطبعـة ٢)، بـيروت، دمشـق، المكتب الإسلامي، (١٤٠٦هـ/١٩٨٦م)، (١/٥٥٥) حديث رقم (٢٨٧٣).

[2]– هەمان سەرچاوەی پێشوو، (١/٦٣٦) حديث رقم (٣٣٧٤).

[3]– أبو سليمان البستي: معالم السنن، (الطبعة ٢)، بيروت، المكتبة العلمية، (١٩٨١م)، (٢/٢٤٨).

[4]– مسلم بن الحجاج: صحيح مسلم، (الطبعة ٢)، تحقيق محمد فؤاد عبدالباقي، بـيروت، دار إحيـاء الـتراث العربي، (١٩٧٢م)، (٣/ ١١٧٦).

[5]– محمد ناصرالدين الألباني: صحيح الجامع، مرجع سابق، (١/٥٣٥) حديث رقم (٢٧٦٠).

٥- دەربارەی پێویستیی پاراستن و چاودێریکردنی سامانی ڕوەکی، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّاتٍ مِنْ نَخِيلٍ وَأَعْنَابٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ الْعُيُونِ (٣٤) لِيَأْكُلُوا مِنْ ثَمَرِهِ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ أَفَلاَ يَشْكُرُونَ﴾{يس: ٣٤و٣٥} واتە: ((هەروەها لەو زەوییەدا چەندەها باخاتی خورما و ترێمان بەدی هێناوە و چەندەها کانیاویشمان تێدا هەڵقوڵاندووە، بۆ ئەوەی لە بەروبوومەکەی بخۆن و لەوەش کە بە دەستی خۆیان لەو بەروبوومانە دروستی دەکەن، ئایا لەبەرامبەر ئەو هەمووە ناز و نیعمەتانەوە سوپاسگوزاری ناکەن)). هەروەها پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: ((من كانت له أرض فليزرعها))[١] واتە: ((هەرکەسێك زەوییەکی هەبێت با دایبچێنێت)). هەروەها دەفەرموێت: ((من غرس غرسًا لم يأكل منه آدميٌّ ولا خلقٌ من خلق الله إلا كان له صدقة))[٢] واتە: ((هەرکەسێك شتێك بچێنێت و پاشان مرۆڤ یاخود هەر بەدیهێنراوێکی خودا لێی بخوات، ئەوا بە چاکە بۆی دەنووسرێت)). بە هەمان شێوە ئیسلام پێویستی کردووە لەسەر مرۆڤ کە بەردەوام بێت لەسەر کشتوکاڵکردن، هەتا ئەگە ڕۆژی دواییش هات، لەم بارەیەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: ((إن قامت الساعة وفي يد أحدكم فسيلة، فإن استطاع أن لا تقوم حتى يغرسها فليغرسها))[٣] واتە: ((ئەگەر ڕۆژی دوایی هات و یەکێك لە ئێوە نەمامێکی بەدەستەوە بوو، ئەگەر توانیی بیچێنێت پێش ئەوەی هەستێت، ئەوا با بیچێنێت)). بە هەمان شێوە ئیسلام ڕێگری دەکات لە لەناوبردنی ڕوەکەکان و بڕینی دارەکان، هەر وەکو خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللَّهُ لا يُحِبُّ الْفَسَادَ﴾{البقرة:٢٠٥}. واتە: ((کاتێك

---

[١]- مسلم بن الحجاج: صحيح مسلم، هەمان سەرچاوەی پێشوو ولەهەمان شوێندا.

[٢]- صحيح الجامع، (١٠٩٣/٢) حديث رقم (٦٤٠٠).

[٣]- هەمان سەرچاوەی پێشوو، (٣٠٠/١) حديث رقم (١٤٢٤).

پشتی هەڵکرد هەوڵ دەدات بۆ ئەوەی لە زەویدا خراپە بکات و کشتوکاڵ و وەچە و نەوە لەناو ببات بێگومان خوداش خراپە و تاوانی خۆش ناوێت)). هەروەها پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: ((من قطع سدرة صوّب الله رأسه في النّار))[1] واتە: ((هەرکەسێك دارێکی سیدر ببڕێت خودای گەورە سەراوسەر دەیخاتە نێو ئاگری دۆزەخەوە))[2].

٦- هەروەها لەبارەی پاراستن و چاودێریکردنی سامانی ئاو و چۆنیەتیی بەکارهێنانی، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلاَ يُؤْمِنُونَ﴾ {الأنبياء:٣٠} واتە: ((لە ئاویش هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێناوە، ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن)). هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنْزَلْنا مِنَ السَّماءِ ماءً فَأَسْقَيْناكُمُوهُ وَما أَنْتُمْ لَهُ بِخازِنِينَ﴾ {الحجر:٢٢} واتە: ((ئێمە شنەبامان ناردووە کە پیتێنەری ڕووەك و دار و درەختە، هەروەها لە ئاسمانەوە بارانمان باراندووە و ئێوەی پێ تێرئاو دەکەین لە کاتێکدا ئێوە نەتانتوانیوە ئەو ئاوانە زەخیرە بکەن)). هەروەها پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: ((لا تسرف في الماء و إن كنت على نهر جار))[3] واتە: ((زیادەڕۆیی لە بەکارهێنانی ئاودا مەکە هەتا ئەگەر لەسەر ڕوبارێکی لەبەرڕۆیشتووش بیت)). لەبارەی هاندانی خەڵك بۆ ئەوەی ئاو پیس نەکەن پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: ((غطوا الإناء و أوكئوا السقاء))[4] واتە: ((سەری دەفرەکانتان داپۆشن و دەمی

---

[1]- سنن أبي داود: سەرچاوەیەکی پێشوو، (٣٦١/٤).

[2] – بە شێوەیەکی گشتی مەبەست لەم فەرموودەیە بڕینی دارێکە بەبێ هیچ هۆیەك، لە کاتێکدا مرۆڤ یاخود گیانەوەران سوود لەم دارە دەبینن.

[3]- السيد سابق: فقه السنة، (١٤٤/١).

[4]- صحيح الجامع، (٧٦٣/٢) حديث رقم (٤١٦٠).

تووره‌گه‌ ئاوه‌كانی گرێ بده‌ن)). هه‌روه‌ها ده‌فه‌رموێت: ((لا يبولن أحدكم في الماء الراكد))[1] واته‌: ((كه‌س له‌ ئێوه‌ میز نه‌كاته‌ نێو ئاوی وه‌ستاو)).

٧- له‌باره‌ی پێویستیی پاراستنی سامانه‌ كانزایی و ناكانزاییه‌كان، خودای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێت:

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ {الحديد:٢٥} واته‌: ((سوێند به‌ خودا ئێمه‌ پێغه‌مبه‌رانی خۆمانمان ڕه‌وانه‌ كردووه‌ به‌ به‌ڵگه‌ و موعجیزه‌ی ڕوونه‌وه‌ و هه‌روه‌ها كتێب و ته‌رازووی دادمان له‌گه‌ڵ ناردوون بۆ ئه‌وه‌ی خه‌ڵكی به‌دادگه‌ری ڕه‌فتار بكه‌ن، هه‌روه‌ها ئاسنیشمان دروست كردووه‌ كه‌ هێزێكی به‌تینی جه‌نگی هه‌یه‌ و سوودیشی بۆ خه‌ڵكی زۆره‌ تا خودای گه‌وره‌ ده‌ری ده‌خات چ كه‌سێك پشتگیر و لایه‌نگری خودا و پێغه‌مبه‌ره‌كانیه‌تی، له‌ كاتێكدا ئه‌و زاته‌ په‌نهانه‌ و بێگومان خودای گه‌روه‌ به‌هێز و خاوه‌ن ده‌سه‌ڵاته‌)). هه‌روه‌ها ده‌فه‌رموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُوا مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ {النحل:١٤} واته‌: ((هه‌ر ئه‌و زاته‌یه‌ كه‌ ده‌ریای بۆ بار هێناون تا گۆشتی ته‌ڕ و تازه‌ی لێ بخۆن، تا له‌ ناویدا جۆره‌ها گه‌وهه‌ر و مرواریی لێ ده‌ر بهێنن و له‌ ده‌ست و ملی بكه‌ن، هه‌روه‌ها كه‌شتییه‌كان ده‌بینن ده‌ریا له‌ت ده‌كه‌ن تا فه‌زڵ و به‌خششی تری په‌روه‌ردگار به‌ده‌ست بهێنن بۆ ئه‌وه‌ی سوپاسگوزاریش بكه‌ن)). هه‌وره‌ه ده‌فه‌رموێت: ﴿يَخْرُجُ مِنْهُمَا اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَانُ﴾ {الرحمن:٢٢} واته‌: ((له‌و دوو جۆره‌ ده‌ریایه‌ مرواری و مه‌رجان ده‌ر ده‌چن)). هه‌روه‌ها خودای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێت: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ

---

[1]- هه‌مان سه‌رچاوه‌، (١٢٥٩/٢) حديث رقم (٧٥٩٦).

وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّـهِ وَعَـدُوَّكُمْ وَآخَـرِينَ مِـنْ دُونِهِـمْ لاَ تَعْلَمُـونَهُمُ اللَّـهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنْتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ﴾{الأنفال:٦٠}
واته: ((ئەی ئیمانداران ئەوەی لە تواناتانداییە لـە هێـز و ئەسـپی دابەسـتراو بۆیـان ئامادە بکەن، تاکو دوژمنی خودا و دوژمنی خۆتان و هـەروەها کەسانێك کـە ئێـوە نایانناسن و خودا دەیانناسێت پێ بترسێنن، وە هەر شتێك لەپێناو خودادا ببەخشن ئەوا پاداشتەکەیتان بەتەواوی پێ دەدرێتەوە هیچ ستەمێکیشتان لێ ناکرێت)).

٨- هەروەها دەربارەی پێویستیی پاراستنی سامانە مرۆییەکان و گرنگیدان بە مـرۆڤ لـەڕووی عـەقڵ و ڕۆح و جەسـتەوە، پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر) دەفـەرموێت: ((المـؤمن القـوي خـير و أحـب الى الله مـن المـؤمن الضـعيف))[١] واتـە: ((ئیمانـداری بـەهێز و بـەتوانا لـەلای خـودای گـەورە باشـتر و خۆشەویسـتترە لـە ئیمانداری بێهێز و بێتوانـا)). هـەروەها دەفـەرموێت: ((تـداووا عبـاد الله فـإن الله لم يضع داءً إلا وضع له دواءً غـير داء واحـد: الهـرم))[٢] واتـە: ((ئـەی بەنـدەکانی خـودا خۆتان چارەسەر و تیمار بکەن، چونکە خودای گەورە هیچ نەخۆشییەکی دانەناوە، گەر لەپاڵیدا چارەسەرێکی بۆ دانەنابێت، تـەنها یـەك نەخۆشـی نـەبێت کـە ئـەویش پیریە)). دەربارەی گرنگیی هێزی عەقڵ و جەستەوە خـودای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا قَـالُوا أَنَّـى يَكُـونُ لَـهُ الْمُلْـكُ عَلَيْنَـا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِنَ الْمَالِ قَـالَ إِنَّ اللَّـهَ اصْـطَفَاهُ عَلَـيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَنْ يَشَـاءُ وَاللَّـهُ وَاسِـعٌ عَلِـيمٌ﴾{البقره:٢٤٧}
واتـە: ((پێغەمبەرەکـەیان پێـی گـوتن: بێگومـان خـودای گـەورە تـالوتی بـۆ ئێـوە ناردوون بە پادشا، وتیان ئەو چۆن بەسەر ئێمـەوە دەبێـت بـە پادشـا، لـە کاتێکدا

---

[١]- هەمان سەرچاوە، (١١٢٩/٢) حديث رقم (٦٦٥١).
[٢]- هەمان سەرچاوە، (١/ ٥٦٥) حديث رقم (٢٩٣٠).

ئێمە لەو شایستەترین بۆ پادشـایەتی و ئـەو داراییـەکی زۆری نـەدراوەتیٚ، ئـەویش فـەرمووی بەڕاسـتی خـودا ئـەوی هەڵبـژاردووە بەسـەر ئێـوەدا، هـەروەها زانسـت و توانای جەستەیی زیاتری لـە ئێـوە پـیٚ داوە و خـوداش پادشـایی خـۆی دەدات بـە هەرکەسێك خۆی بیەوێت و خوداش (بەهرە) فراوان و زانایە)).

٩- هەروەها لەبارەی پێوستیی پاراستن و دابینکردنی کەشێکی هـێمن و دوور لە ژاوەژاو، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُـوَ الَّـذِي جَعَـلَ لَكُـمُ اللَّيْـلَ لِتَسْـكُنُوا فِيـهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾{يونس:٦٧} واتـە: ((هەر زاتی خودایە کە شەوی بـۆ دانـاون تـا تێیـدا بحەسـێنەوە و ڕۆژیشـی دانـاوە بـە ڕووناککـەرەوە، بەڕاستی لەوەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسـانێك کـە ببیسـتن و تێبگـەن)). هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَاغْضُضْ مِـن صَـوْتِكَ إِنَّ أَنكَـرَ الْأَصْـوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ﴾{لقمان:١٩} واتە: ((هەوڵ بـدە لـە ڕۆشـتندا مامنداوەندیانـە بـڕۆ (نـە هێواش نە پەلە) و بە دەنگی هێواش و لەبار گفتوگۆ بکە و بدویٚ، چونکە بەڕاسـتی ناخۆشترین و بێزارترینی دەنگەکان دەنگی گوێدرێژەکانە)). هەروەها سائبی کوڕی یەزید دەگێڕێتەوە و دەڵێت: **(( لە مزگەوت ڕاوەستابووم و پیاوێك بـانگی کـردم، دیتم عومەری کوڕی خەتتابە و پێی گوتم: بڕۆ ئەو دوو کەسەم بۆ بهێنە، منیش ئەوانم هێنا. پاشان عومەری کوڕی خەتتاب لێی پرسین: ئێوە کێن یاخود خەڵکی کوێن؟ ئەوانیش گوتیان: خەڵکی تائیفین، ئەویش پێی فەرموون ئەگەر ئێوە لە ئامادەبووانی بەدر بوونایە ئازارم پیٚ دەگەیاندن، چونکە دەنگتان لە مزگـەوتی پێغەمبەری خودادا (دروودی خوای لەسەر) بەرز دەکەنەوە)).**[١] بەم شێوەیە ئیسلام

[١]- ابن حجر العسقلاني: فتح الباري بشرح صحيح البخاري، (طبعة ١)، القاهرة، دار الريان للتراث، (١٤٠٧هـ/١٩٨٦م)، (١٥٧/٦).

کاری بۆ نەهێشتنی ژاوەژاو کردووە و هەوڵی داوە هێمنی و ئارامی لە هەموو کات و شوێنێکدا بەرقەرار بکات.

١٠– لەبارەی پێویستیی ڕاگرتنی هاوسەنگی لە بەکارهێنان و بەفیڕۆنەدانی سامانەکاندا خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا﴾{البقرە:١٤٣} واتە: ((بەم شێوەیەش ئێوەمان گێڕاوە بە گەلێکی میانڕەو لە هەموو ڕوویەکەوە)). هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلاَ تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا﴾{الإسراء:٢٩} واتە: ((وە دەستت مەکە کۆت لە گەردنتدا و بەڕەڵاشی مەکە بەتەواوی تا نەبیتە کەسێکی لۆمەکراوی هیچبەدەستەوەنەماو)). هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلاَ تُسْرِفُوا إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾{الأعراف:٣١} واتە: ((ئەی نەوەی ئادەم پۆشاکی جوان ڕازاوەتان بپۆشن لە کاتی هەموو نوێژێکدا و بخۆن و بخۆنەوە و زیادەڕەوی مەکەن، بێگومان خودا زیادەڕەوانی خۆش ناوێت)). هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَامًا﴾{الفرقان:٦٧} واتە: ((هەروەها بەندەکانی خودای میهرەبان کەسانێکن کاتێك ماڵ و سامان خەرج دەکەن نە زیادەڕۆیی و تێدا دەکەن و بەزایەی دەدەن و نە دەستنووقاو و ڕەزیلیشن، بەڵکو لەو نێوەندەدا مامناوەندن)). بەکورتی و بەپوختی مرۆڤ پرسیاری لێ دەکرێت دەربارەی چۆنیەتیی بەکارهێنانی ئەو بەخششانەی کە خودای گەورە پێی بەخشیون، هەر وەکو دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ﴾{التكاثر:٨} واتە: ((پاشان سوێند بە خودا لەو ڕۆژەدا پرسیاری هەموو نازونیعمەتەکانی دونیاتان لێ دەکرێت)).

١١– لەبارەی پێویستیی پاراستنی پاکوخاوێنی و جوانیی سروشتەوە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ﴾{الحج:٢٦}

واتە: ((ماڵی من پاك بكەرەوە بۆ ئەوانەی بەدەوریدا دەسووڕێنەوە یاخود بەپێوەن (نوێژكەران) یان لە كڕنووش و سوجدەبردندان)). هەروەها پێغەمبەری خودا دەفەرموێت: ((إن هذه المساجد لا تصلح لشيء من القذارة و البول و الخلاء، إنما هي لقراءة القرآن و ذكر الله والصلاة))[1] واتە: ((ئەم مزگەوتانە بۆ ئەوە ناشێن خاشاك و پیسیی و تێیاندا فڕێ بدرێت و میز و پیسایی تێدا بكرێت، بەڵكو شوێنی قورئانخوێندن و یادی خودا و نوێژن)). هەروەها دەفەرموێت: ((طهروا أفنيتكم فإنّ اليهود لا تطهر أفنيتها))[2] واتە: ((حەوشی ماڵەكانتان خاوێن بكەنەوە چونكە جووەكان حەوشی ماڵەكانیان خاوێن ناكەنەوە)). خودای گەورەش دەفەرموێت: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ﴾{ق:٦} واتە: ((ئایا وردنەبوونەتەوە لەو ئاسمانەی كە بەڕاسەریانەوەیە چۆنمان دروست كردووە و ڕازاندوومانەتەوە بە جۆرێك هیچ كەموكووڕی و كەلێنێكی تێدا نییە)). هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَالْأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ (٥) وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ (٦) وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَى بَلَدٍ لَمْ تَكُونُوا بَالِغِيهِ إِلاَّ بِشِقِّ الْأَنْفُسِ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ (٧) وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ﴾{النحل:٥-٨} واتە: ((ماڵاتیشی بۆ ئێوە دروست كردووە كە گەرمایی و كەڵكیان تێدایە و لە گۆشتەكەشی دەخۆن، بۆ ئێوە هەیە لەو ماڵاتانەدا دیمەنی جوان، كاتێك دەیانهێننەوە لە لەوەڕگا و كاتێكیش دەیانبەن بۆ لەوەڕگا، هەندێك لەو ماڵاتانە بارەكانتان هەڵدەگرن بۆ وڵات و شوێنێك كە ئێوە پێی نەدەگەیشتن مەگەر زۆر بەناڕەحەتی نەبێت، بەڕاستی پەروەدگارتان زۆر بەسۆز و بەبەزەییە،

---

[1]- صحيح الجامع، (٤٥٠/١) حديث رقم (٢٢٦٨).

[2]- هەمان سەرچاوە، (٧٣٠/٢) حديث رقم (٢٩٣٥).

ئەسپ و ماین و ئێستر و گوێدرێژی بۆ دروست کردوون تا سواریان بن و هۆی ڕازانەوەش بن بۆ ئێوە و خواش شتی وا دروست دەکات کە ئێوە ئێستا نایزانن)).

١٢–لەبارەی ڕێگریکردن لە تێکدانی ژینگە و لەناوبردنی سامانە سروشتییەکانی خودای گەورەوە دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيُشْهِدُ اللَّهَ عَلَى مَا فِي قَلْبِهِ وَهُوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ (٢٠٤) وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللَّهُ لاَ يُحِبُّ الْفَسَادَ﴾{البقره:٢٠٤–٢٠٥} واتە: ((وە هی وا هەیە لە خەڵکی کە بە قسە سەرسامت دەکات لەم ژیانی دونیایەدا و خودا دەکات بە شاهید لەسەر ڕاستیی ئەوەی لە دڵیایەتی، کەچی ئەو دوژمنێکی سەرسەختە و کاتێك پشتی هەڵکرد هەوڵ دەدات لە زەویدا خراپە بکات و کشتوکاڵ و وەچە و نەوە لەناو ببات و خودا خراپەکاری خۆش ناوێت)). هەورەها دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ﴾{الأعراف:٥٦} واتە: ((خراپەکاری مەکەن لە زەویدا پاش ئەوەی کە خودا چاکی کردووە وە هاوار و نزا ببەن بۆ خودا بە ترس و ئومێدەوە، بەڕاستی میهرەبانیی خودا لە چاکەکارانەوە نزیکە)). لە کۆتاییدا دەڵێین لەبەر ئەوەی ئەم ئوممەتە جێنشینکراوە لە زەویدا بۆیە پێویستە لەسەری زەوی ئاوەدان بکاتەوە و سامانەکانی بەباشی بەکار بهێنێت و هەروەها پێویستە لەسەری فەرمان بە چاکە بکات و نەهی لە خراپە بکات لە بواری پاراستنی ژینگە و سامانەکانیدا و کار بە فەرمانی خودای گەورە بکات، کە دەفەرموێت: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾{آل عمران:١٠٤} واتە: ((دەبێت لەناو ئێوەدا کۆمەڵێك پێك بێت بانگەواز بکەن بۆ هەموو خێر و چاکەیەك و فەرمان بە چاکە بکەن و ڕێگری لە هەموو خراپەیەك بکەن بەڕاستی ئا ئەوانە سەرفرازن)).

# کۆتایی

لـە هـەموو ئەوانـەی پێشـتر باسمـان لێـوە کـرد بۆمـان ڕوون دەبێتـەوە کـەوا پـەروەردەی ئیسـلامیی پێویسـتە ببێتـە ئـامرازی ئـەم ئوممەتـە بـۆ بـەدیهێنانی پەرەپێـدانێك بـە مانـا گشـتگیرە ئیسـلامییەکەی لەگـەڵ پاراسـتنی سروشـت بـەو شێوەی کە ئیسلام داوای کردووە، هەر وەك چۆن لە دەستپێکی قسەکانمدا هەوڵمدا بەرپرسیارێتیی قەیرانی ئەم ئوممەتە دیاری بکەم، بە هـەمان شـێوە قسـەکانم بـەم پرسیارە کۆتایی پێ دەهێنم کە ڕووبەڕووی کۆنگرەکە دەبێتەوە: کێ بەرپرسـە لـە گێڕانەوەی پەروەردەی ئیسـلامیی بـۆ جیهـانیی ئیسـلامیمان لـەم ڕۆژگـارەدا: ئایـا زانایانی پەروەردەی ئیسلامیی کـە پێویسـتە لەسـەریان سیسـتمێکی پـەروەردەیی ڕاستەقینە پێشـکەش بکـەن بـۆ گـەل و وڵاتیـان کـە توانـای بەرهـەمهێنانی مرۆڤـی قورئان و سوننەتیان هەبێت بەو شێوەی خودای گـەورە دەیـەوێت؟ ئەگـەر ئـەمان لەم کارەدا دەستەوەسـان بـووبن یـاخود کەمتەرخـەمییان کردبێـت، ئایـا دەکرێـت لۆمەی حکومەتەکان بکرێـت ئەگـەر لێـرە و لـەوێ سیسـتمی پـەروەردەیی هـاوردە بکەن؟ یاخود پێویستە لۆمەی ئەو فەرمانڕەوایانە بکرێت کە نەیانتوانیوە سوود لـە پەروەردەناسـەکان وەر بگـرن و بـەکاریان بهێـنن بـۆ دامەزرانـدنی سیسـتمێکی پـەروەردەیی ئیسـلامیی، کـە توانـای ڕزگـارکردنی ئـەم ئوممەتـەی هـەبێت لـەو دواکەوتوویی و لاوازییەی تێیدایەتی؟

بەڵكو پەند وەر بگرین لەوانەی پێش خۆمان و لەو دوژمنەش گەڕێن كە خاكمانی داگیر كردووە — ئیسرائیل — ئایا تەنها بە هەوڵی ڕۆشنبیرەكانیان سەركەوتنیان بەدەست هێناوە، یاخود هەموو هۆكارەكانی پێشكەوتن و پەرەپێدانیان لەژێر سێبەر و چاودێریی ولاتدا بووە؟ ڕاستترینی ئەو بژاردانەی بە پێشكەوتنمان دەگەیەنن پێش هەموو شتێك بریتییە لە تواناداری لەهەمبەر ئامادەكردنی كۆمەڵگە و بڕبەندكردنی ئیرادە و ویستی گەل و ڕۆشنبیران. ئەگەر هاتو ئەو شێوازە ناشەرعییانەی ولاتە پێشكەوتووەكان گرتوویانەتە بەر بۆ پێشكەوتن وەلا بنێین، ئەوا ناتوانین نكوڵی لە ڕۆڵی هاوكاری نێوان ڕۆشنبیران و دەوڵەت بكەین لە بەدیهێنانی ئەو پێشكەوتن و پەرەپێدانەدا.

***

# چاكسازیی هزریی لەنێوان قوتابخانەی مەنار و قوتابخانەی ئیسلامێتی مەعریفەدا[1]

## پێشەكی:

زۆرن ئەو نووسراوانەی باسیان لە قوتابخانەی مەنار و كەسایەتییە دیارەكانی ئەو قوتابخانەیە كردووە: ئەفغانی و محەمەد عەبدە و ڕەشید ڕەزا، هەندێكیشیان حەسەن بەننایان بۆ زیاد كردووە، بەتایبەتی لە قۆناغی یەكەمی ژیانیدا ئەو كاتەی كە بەردەوامییدا بە دەركردنی گۆڤاری مەنار لەپاش مردنی خاوەنەكەی ڕەشید ڕەزا[2]. بەڵام ئەو نووسینانەی باسیان لە قوتابخانەی ئیسلامێتی مەعریفە كردووە،

---

[1]– كۆڕبەندێكی نێودەوڵەتیی دەربارەی: ((مدرسة المنار ودورها في الإصلاح الإسلامي الحديث)) (القاهرة – ٩ من أكتوبر ٢٠٠٢م).

[2]– لێرە باس لە قوتابخانەی ((الإخوان المسلمين)) و ئەو ڕۆڵە ناكەین كە بینیویەتی لە چاكسازیی فیكرییدا، چونكە ئەوە بابەتێكی سەربەخۆیە و پێویستیی بە لێكۆڵینەوەی سەربەخۆی تر هەیە. وە لەوانەیە لە گرنگترین نووسینەكان لەبارەی قوتابخانەی (المنار)ەوە كە لە پەراوێزی لێكۆڵینەوەكەدا نەهاتووە ئەمانە بن:

١- محمد عمارة: جمال الدين الأفغاني موقظ الشرق وفيلسوف الإسلام، دار الشروق، (١٩٨٨م).

تـا ڕادەیـەك ژمارەیـان کەمـە، لـە کاتێکـدا ئـەم قوتابخانەیـە بـە قۆنـاغی پـاش قوتابخانەی مەنار دادەنرێت، ئەگەرچـی ئـەم قوتابخانەیـە نوێیـە و بـە شـێوەیەکی فـراوان ناوبـانگی پەیـدا نـەکردووە لـەنێو ڕۆشـنبیران و بیرمەندانـدا. هـەروەها قوتابخانـەی مـەنار بـە پێشـەنگە جیاوازەکانیـەوە: بـە ڕۆحـی شۆڕشـگێڕانە و جـەماوەرییبوونی ئـەفغانی و بـە عـەقلانیبوونی محەمـەد عەبـدە و ڕەشـید ڕەزا، هەروەها حەسەن بەننا لـە قۆنـاغی دەرکردنـی گۆڤـاری مـەناردا و گفتوگۆکردنیـان لەگەڵ پێشەنگەکاندا، دەڵێم: ئەم قوتابخانەیە بەو ئەزمونانـەی هەیـەتی لـە بـواری چاکسازیی هزری ئوممەتدا سەرەتایەکی پێویست بوو بـۆ دەرکـەوتنی قوتابخانـەی ئیسلامێتی مەعریفە، بەڵکو قوتابخانەی مـەنار بـە ئاڕاسـتە جیاوازەکانیـەوە و بـەو ئەزموونانەی هەیەتی وەك کێڵگەیـەکی تاقیکردنـەوە وایـە بـۆ هـزری چاکسـازی لـە ئوممەتدا سەبارەت بـە قوتابخانـەی ئیسـلامێتی مەعریفـە، کـە لـەو ڕێگەیـەوە ئـەم قوتابخانەیە ڕاستیی ئەو کێشانەی بۆ دەر دەکەوێت کـە ڕووبـەڕووی ئـەم ئوممەتـە دەبنەوە، لە دەرئەنجامیشدا ئەم قوتابخانەیە گەیشت بەوەی پێویسـتە چاکسـازی لـە میتۆدەکـانی هـزردا بکرێـت و عـەقڵ و ئـاوەزی مرۆڤـی موسـوڵمان بەئیسـلامی بکرێت، بۆ ئەوەی بتوانێت ڕووبەڕووی گرفتەکانی ئەم ئوممەتە ببێتەوە لـە ڕێگـەی چارەسەری ئیسلامیی دروستەوە.

وا چاوەڕوان دەکرێت لێکۆڵینەوەکانی ئەم کۆڕبەندە بـە شـێوەیەکی دوورودرێـژ

---

٢- محمد ثابت المخزومي: خاطرات جمال الدين الأفغاني الحسيني، طبعة بيروت، (١٩٣١م).

٣- شكيب أرسلان: السيد رشيد رضا وإخاء أربعين عامًا، دمشق، (١٩٣٧م).

٤- عثمان أمين: رائد الفكر المصري: للإمام محمد عبده، الأنجلو المصرية، (طبعة ٢)، (١٩٦٥م).

٥- عبدالرحمن الرافعي: جمال الدين الأفغاني باعث نهضة الشرق، طبعة القاهرة، سلسلة أعلام العرب.

٦- إبراهيم غرابية (تحرير): جمال الدين الأفغاني عطاؤه الفكري ومنهجه في الإصلاح، حلقة دراسية، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، المنظمة الإسلامية للتربية والعلوم والثقافة، عمان، (١٩٩٩م).

باس لە قوتابخانەی مەنار بکەن، بەڵام بە باشترم زانی باس لـەوە بکـەم چۆن ئـەم قوتابخانەیە بەو پەیامە جیاوازانەی هەڵی گرتبـوو بووەتـە سـەرەتایەکی گـرنگ بـۆ پەیدابوونی قوتابخانەی ئیسلامێتی مەعریفە. چۆن ئەو ئەزموونەی کە قوتابخانەی مەناری پێدا تێپەڕ بووە بۆتە قۆناغی پـێش دروسـتبوونی قوتابخانـەی ئیسـلامێتی مەعریفە. هەروەها باس لەوە دەکەم چۆن هەندێك کەس بە ڕەوای نـابینن ئـەم دوو قوتابخانەیـە بـە یـەکتر بـەراورد یـان وابەسـتە بکـرێن، چـونکە قوتابخانـەی مـەنار هەتاوەکو ئەمڕۆش کاریگەریی زۆرترە و شوێنکەوتوانی زیاترە، بـەڵام قوتابخانـەی ئیسلامێتی مەعریفە تـەنها ژمارەیـەکی کـەم لـە ڕۆشـنبیران گرنگیـی پـێ دەدەن و شوێنکەوتووانی بەو ڕادەیە نین کە بتوانن پەیامەکانی پشتڕاست و بڵاو بکەنەوە.

لە سەرەتادا دەمەوێت ئەوەتان بۆ ڕوون بکەمەوە کە ئامانج لەم لێکۆڵینەوەیـە تـەنها پیاهەڵـدانی ئـەم دوو قوتابخانەیـە نییـە، چـونکە زۆرێـك لـەو پەرتووکانـەی دەربارەی کەسایەتییە ناودارەکانمان نووسراون زیاتر پیاهەڵدانی ئەو کەسایەتییانە بووە، نەك ڕەخنەگرتن لێیـان، لـە کاتێکدا ڕەخنـەگرتن دەبێتـە هـۆی باشـکردن و جوانکردنی کارە هزریەکانمان لەپێناو چاکسازیدا لە ئێسـتا و ئاییندەدا. (السـلمی) لە پەرتووکەکەیدا (*طبقات الصـوفیة*) ئەوانـەی وانـەیان پێیـان گوتـوە بـەم شـێوەیە هـەژماریان دەکـات: ((پیاوچـاکان و پاکـەکان و خـاوەن ڕاسـتی و زانسـتەکان)). هەروەها زۆرێك لەوانەی پاش ئەم هاتوون هەمان شێوازی ئـەمیان پـەیڕەو کـردووە هـەر وەکـو: ئـیبن حـەزم لـە پـەرتووکی (*جمهـرة أنسـاب العـرب*) و ئـیبن خەلـەکان و سەبوکی و صەفەدی و ئیبن وەفا لە (*طبقـات الحنفیـة*) ئـیبن فـەرحوون و زەهـەبی و ئیبن حەجەر و سەخاوی و غەززی و... هتد، ئەم کەلتوورەش بەردەوام و بەربڵاوە و لـە پـەرتووکی زۆربـەی کەسـایەتییە ناودارەکانمـان و قوتابخانـە هزرییـەکانمادا. گومان لەوەدا نییە ئەگەر بمانـەوێت بـاس لـە ژیـانی ئـەم کەسـایەتییانە بکـەین بـە

شێوەیەکی ئـەکادیمی، ئـەوا پێویسـت دەکـات خـاڵی بـەهێز و لاوازی ئـەو کەسـانە هەمووی بخەینە ڕوو بۆ ئەوەی نـەوەکانی داهـاتووش سـوودی لـێ ببیـنن. ئەمـەش سوودوەرگرتنی ڕاستەقینەیە لە لێکۆڵینەوەی ژیانی ئەم کەسایەتییانە.

## قوتابخانەی مەنار:

### ١- جەمالەدینی ئەفغانی (١٨٣٨ز-١٨٩٨ز/١٢٥٤ك-١٣١٤ك):

لە ڕاستیدا جەمالەدینی ئـەفغانی بـە بـاوکی ڕۆحیـی قوتابخانـەی مـەنار هـەژمار دەکرێت، کە ئالأی چاکسازی هـزری ئـەم ئوممەتـەی بـەرز کردبوویـەوە، ڕۆژنامـەی (العروة الـوثقی) و ١٨ ژمارەکـەی بریتـی بـوو لـە بزوێنـەری ئـەم قوتابخانەیـە، ئـەم ڕۆژنامەیە لـە پاریسـەوە لـە (١٣ی ئـازاری ١٨٨٤ز) بـۆ (١٧ی ئۆکتۆبـەری ١٨٨٤ز) دەرچوو. بە ڕادەیەك ڕەشید ڕەزا هەستابوو بە کۆپیکردنی هەموو ژمارەکـانی ئـەم ڕۆژنامەیە و دووبارە و چەندبارە دەگەڕایەوە سـەری بـۆ ئـەوەی سـوودیان لـێ وەر بگرێت لە کاروانی چاکسـازییەکەیدا[1]. هـەر وەك دەزانـین ئـەم ڕۆژنامەیـە بەرهـەمی هاوکـاریی نێـوان جەمالـەدینی ئـەفغانی و محەمـەد عەبدەیـە لـە قۆنـاغی هاوبەشیکردنیان لە هزری ڕۆژنامەکەدا، هەر بۆیە ئەم ڕۆژنامەیە کۆلکەی هاوبەشـی هزری قوتابخانەی مەنارە: جەمالەدین ئەفغانی و محەمەد عەبدە و ڕەشید ڕەزا.

**هەروەها دەکرێت ئەم کۆلکە هاوبەشە لـە ژمـارە یـەکی ڕۆژنامەکـەدا کـورت بکرێتەوە، ئەو ئامانجانەی کە ڕۆژنامەکە لەپێناویدا دامەزراوە پوخت بکرێتەوە لە[2]:**

---

[1]- إبراهيم أحمد العدوي: رشيد رضا الإمام المجاهد، سلسلة أعلام العرب، (عدد ٣٣)، المؤسسة المصرية العامة للتأليف والنشر، القاهرة، (ص ٧٦).

[2]- الأفغاني: العروة الوثقى، المجلد الذي ضم مقالاتها، طبعة القاهرة، (١٩٢٧م).

١. باسـكردن و ڕوونكردنـەوەی ئـەركی ڕۆژهەڵاتییـەكان، چـۆن كەمتەرخـەمیكردنیان بەرامبـەر بـە ئەركـەكانیان بـووە هـۆی لاوازكردنیـان و لەدەستدانی سـەروەرییەكانیان، هـەورەها باسـكردن لـەو ڕێگایانـەی كـە پێویسـتە بگیرێنە بەر بۆ گێڕانەوەی ئەوەی لەدەستیان دابوو.

٢. چاندنی ئومێدی سەركەوتن لە ناخی خەڵكدا، هەروەها كۆتاییهێنان بـەو بێئومێدییەی باڵی بەسەریاندا كێشابوو.

٣. بانگەشەكردن بۆ دەستگرتن بـەو بنەمایانـەی باپیرانی ڕۆژهەڵاتییـەكان و نـەوەكانیان لەسـەری بـوون، هـەمان ئـەوەی كـە وڵاتـە بیانییـەكان لـە خۆیانـدا پەیڕەویان كرد و پێی گەیشتن بە هێز و دەسەڵات.

٤. ڕەواندنـەوەی ئـەو گومانانـەی لەلایـەن داگیركەرانـەوە هەڵبەسـترابوو بـۆ ڕۆژهەڵاتییەكان بەتایبەتی موسوڵمانان.

٥. پێدانی زانیارییە پەیوەندیدارەكان بە ڕۆژهەڵاتییەكانەوە لەبارەی ڕووداوە ڕامیارییە گشتی و تایبەتییەكان.

٦. ڕوونكردنـەوەی گرنگیـی پتـەوكردنی پەیوەنـدیی نێـوان نەتـەوە ئیسلامییەكان و لێكنزیككردنەوەی تاكەكانیان.

هەروەها جەمالەدینی ئەفغانی لە ڕۆژنامەی (عروة الـوثقى)دا بانگەشـەی دەكـرد بۆ شۆڕش لە دژی داگیركەر و دەسەڵاتی بیانی لە وڵاتـە ئیسـلامییەكاندا، هـەروەها گـەلانی وڵاتـە ئیسـلامییەكانی دڵنیـا كـردەوە لـە توانـای ڕووبەڕووبوونـەوەی داگیركەران. بە هەمان شێوە دژایەتیی دیكتاتۆریەتی فەرمانڕەوایانی موسـوڵمانانی دەكرد و بانگەشەی دەكرد بۆ چوارچێوەیەكی دەستووری و سیسـتمی ڕاوێـژكاری، هەروەها زۆر باسی لـە پێویسـتیی یـەكگرتنی موسـوڵمانان دەكـرد لـەژێر سـێبەری پـڕۆژەی كۆمكـاری ئیسـلامیدا و ئەمەشـی وەك ئـامرازێكی كـارا دەبـینی بـۆ

ڕووبەڕووبوونەوەی داگیرکەران و دەسەڵاتی بیانییەکان، بە هەمان شێوە ئیسلامیی ڕاستەقینەی پاکی دوور لەو خڵتە و ئەفسانانەی کە پێوەی لکێنرابوون، وەك ئامرازێك دەبینی بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەی باسیان لێوە کرا، پاشان گرنگیی دەدا بە گێڕانەوەی تێگەیشتنی دروستی موسوڵمانان بۆ ئایینەکەیان و گەڕانەوەی ئیسلام بەو شێوەی کە سەرەتا دەستی پێ کردووە وەك هێمایەك بۆ ڕێزی عەقڵ و هەروەها وەك هاندەرێك بۆ موسوڵمانان کە پاڵیان پێوە دەنێت بۆ داواکردنی ئازادی و سەربەخۆیی و ڕێز و سەروەری.

ئەو دیبەیتە بەناوبانگەی کە جەمالەدینی ئەفغانی لەگەڵ (ئێرنێست ڕێنان)دا ئەنجامی دا، نموونەیەکە لەبارەی بەرگریکردنی لە ئیسلام و موسوڵمانان و دووپاتکرنەوەی ئەوەی کە ئیسلام ئایینی عەقڵ و هزرە و عەقڵی ئیسلامیی شارستانیەتێکی مەزنی بەرهەم هێناوە و هەروەها عەرەب و موسوڵمانان شایەنی هەموو پێشکەوتنێکن[1]، هەروەها لە بەرامبەر هزرە خاپوورکارەکان، کە لە ڕۆژئاواوە هاوردەی جیهانی ئیسلامی دەکران و لە ڕێگەیانەوە هزری ماددی و خوانەناسی بڵاو دەکرایەوە و هەوڵی لەناوبردنی بەها ئیسلامییە نەمرەکان دەدرا، ئەفغانی لە ڕێگەی ئەو پەیامەی کە بە فارسی نووسیبووی ڕووبەڕووی ئەو بیر و ڕەوتانە دەبێتەوە، کە دواتر محەمەد عەبدە لە ڕێگەی وەرگێڕ (عارف أبو تراب)ەوە وەری گێڕایە سەر زمانی عەرەبی[2]. سەرەڕای ئەم هەموو هەوڵە عەقڵی و هزریە، جەمالەدینی ئەفغانی وەکو کەسایەتییەك کاریگەرییەکی زۆری هەبووە لەسەر ئەو کەسانەی لە سەردەمی خۆیدا پەیوەندییان پێوە کردووە و سەرسام بوون بەم فۆڕمە نوێیە لە پیاوی زانست کە زانستەکانی سرووش (الوحي) و زانستەکانی ڕۆژئاوا تێکهەڵکێش دەکات،

---

[1]– محمد عبده: الإسلام والرد على منتقديه، المطبعة الرحمانية، القاهرة، (١٩٢٨م).

[2]– السيد جمال الدين الأفغاني: الرد على الدهريين، القاهرة، (١٩٤٧م).

گوتار و کرداری ئیسلامیی بزووتنەوەیی لەگەڵ یەك کۆ دەکاتەوە بەو مانا فراوانەی کە بەدی نەدەکرا لە هیچکامێك لـە پیـاوانی ئـاییني ئـەو سـەردەمەدا یـاخود ئـەو پیـاوە ئایینییانــەی دامــەزراوە فێرکارییــە جیاوازەکــان بەرهــەمیان دەهێنــان، چ دامەزراوە ئیسلامییەکان یاخود سیکۆلارەکان کە لەسەر شێوازی ڕۆژئـاوایی کاریـان دەکـرد، ئەمــەش خــۆی لەخۆیــدا ڕووبەڕووبوونــەوەی نــەریتی بـاوی پــەروەردە و فێرکردنــی ئــەو ســەردەمە بــووە. هــەروەها ڕێخۆشــکەر بــوو بـۆ ئــەو دەنگانــەی بانگەشەیان دەکرد بۆ ئیسلامێتی مەعریفە.

جەمالەدینی ئەفغانی تەنها بە دەرکردنی ڕۆژنامەی (*العروة الوثقى*)وە نەوەسـتا، بــەڵکو کــاری ڕێکخراوەییشــی ئــەنجام دەدا، هــەر بۆیــە پەیوەنــدیی بــە یانــەی ماسـۆنییەکانەوە کـرد بـۆ ئـەوەی بـەکاریان بهێنێـت لـە هێنانـەدیی هەنـدێك لـە ئامانجەکانی خۆی، هەروەها لە میسریشـدا بەشـداریی کـرد لـە دامەزرانـدنی پـارتی نیشتیمانی بۆ ئەوەی بەرەنگاری ئینگلیزی داگیرکەر و دەسەڵاتی خدێوی ببێتەوە، هەروەها ئەو شۆڕشەی بەرپای کردبوو لە دژی ئەو فەرمانڕەوایانەی میللەتی خۆیان دەچەوساندەوە و ملکەچ و ڕیسوای داگیرکەران بوون، گەیشتە ڕادەیەك کە پلان دژ بە خدێوی ئیسماعیل دابنێت لە میسر و دژ بە شای ئێرانیش: ناسرەدین شا، کە لە ساڵی (١٨٩٦م)دا غـافڵگیر کـرا، هـەروەها لـە کۆتـا ڕۆژەکـانی ژیانیـدا پەیوەنـدیی لەگەڵ سوڵتان عەبدولحەمید تێك چووبوو[١]، بەڵکو زۆرێك لە توێژەران جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ڕۆژنامەی (*العروة الوثقى*) تـەنیا ڕۆژنامەیـەکی ئاسـایی نـەبووە، بەڵکو زمانحاڵی کۆمەڵەیەکی خەمخۆری ئیسلام بووە لـە ناوچـە جیاوازەکـانی وەك هیندستان و میسر و... هتد. ئەم کۆمەڵەیە لە مەککەی پیرۆز و لە وەرزی حەجـدا

---

[١] – عبد الباسط محمد حسن: جمال الدين الأفغاني وأثره على العالم الإسلامي، مطبعة وهبة، (١٩٨٢م).

دروست بوو و سوێندیان خواردبوو كار بكەن لەپێناوی ئیسلام و موسوڵماناندا[1].

یەكێك لەو بەڵگانەی ئەمە دەسەلمێنن ئەوەیە ئەم ڕۆژنامەیە بەخۆڕایی دەنێردرا بۆ زۆرێك لە بەشداربووانی لە میسر و عێراق و سوریا و تونس و مەغریب و جەزائر، كە ئەمەش ببووە هۆی ئەوەی فەرمانڕەوا و داگیركەران لە دژی بووەستن.

جەمالەدینی ئەفغانی هەموو ژیانی خۆی تەرخان كردبوو لەپێناو بەرگریكردن لە هەموو ئەو پرنسیپانەی كە باوەڕی پێیان هەبووە، لەپاش خۆی شوێنكەوتوو و قوتابییەكی زۆری بەجێ هێشتووە و هەریەكێك لەوانە بەپێی توانای خۆی بەشێك لە كار و هزری ئیسلامیی، یاخود كاری سیاسیی لێ وەر گرتووە، هەر وەك چۆن ئەم پیاوە خاڵی بەهێزی هەبووە، بە هەمان شێوە چەند خاڵێكی لاوازیشی هەبووە، چونكە كەسێك بوو زوو هەڵدەچوو و پەلەی دەكرد لە چاكسازیدا و ئەمەش وای لێ كرد هانی كوشتنی فەرمانڕەوا ستەمكارەكان بدات، ئەگەر ئەو هەوڵانەش لە ڕووبەڕووبوونەوەی داگیركەراندا چڕ بكرایەتەوە باشتر دەبوو، هەروەها لە ماوەی تێكۆشانیدا دژ بە داگیركەران، پشتی بە چەند وڵاتێكی بیانیی بەستووە: ڕووسیا و ئینگلتەرا و فەڕەنسا، ئەمەش وەك هەوڵێك بۆ ئەوەی گرژی لەنێوان ئەو وڵاتانەدا دروست بكات لەپێناو بەرژەوەندیی موسوڵمانان، نەیزانی كە ئەم وڵاتانە لە كۆتاییدا كەسیان قایل نابن بە گێڕانەوەی سەروەری بۆ ئیسلام و موسوڵمانان[2].

هەروەها بەهۆی سەرقاڵبوونی بە لایەنی سیاسییەوە بواری زۆری بۆ نەڕەخساوە خەڵك پەروەردە بكات و هزری چاكسازیی خۆی زیاتر پێبگەیەنێت،

---

[1]– محمد عمارة في تقديمه للأعمال الكاملة للأفغاني، نشر وتحقيق محمد عمارة، المؤسسة العربية، بيروت، (١٩٧٩م).

[2]– عبد الباسط محمد حسن: جمال الدين الأفغاني وأثره على العالم الإسلامي، سەرچاوەیەكی پێشوو، (ص ٢٥٧–٢٦٤).

هەر بۆیە زۆربەی کات بیری بەلای سۆز و ویژداندا دەشکایەوە تا عەقڵ و لۆژیك و زانست. ئەگەر زیاتر کاتی تەرخان بکردایە بۆ ئەو بیر و هزرە چاکسازییانەی کە لای گەلاڵە بووبوون، ئەوا زیاتر پێیدەگەیاندن و زانستیتر دەر دەچوون. لەپاش خۆی محەمەد عەبدە و ڕەشید ڕەزا هەوڵیان داوە ئەم کارە ئەنجام بدەن. ئەوەی کە ((قوتابخانەی ئیسلامێتی مەعریفە)) توانیویەتی پێی بگات، زیاتر ئەم بابەتە ڕوون دەکاتەوە.

**٢- محەمەد عەبدە (١٨٤٩ز-١٩٠٥ز/١٢٦٦ك-١٣٢٣ك):**

محەمەد عەبدە هاوڕێی خەبات و تێکۆشانی جەمالەدینی ئەفغانی بووە، بەلام نەفەسی درێژ نەبووە لە بواری خەباتی سیاسیدا. بە چاوی خۆی ڕووخانی بزووتنەوەی عەرابی بینیوە لەبەردەم هاوپەیمانی نێوان خدێوی تۆفیق و هێزە داگیرکارییەکانی ئینگلیزدا، هەروەها لە ولات دوور خرایەوە و فشارێکی زۆری خرایە سەر، هەر بۆیە هەستی کرد چاکسازی لەڕێی سیاسەتەوە هەرچەندە نزیکتر و خێراترە (هەر وەك چۆن پێشتر جەمالەدینی ئەفغانی و خۆشی باوەڕیان وا بوو) بەلام چاکسازی لەڕێی پەروەردە و فێرکردنەوە بەردەوامتر و جێگیرترە، هەر بۆیە داوای لە مامۆستاکەی کرد دەست بە خەبات بکەن لە بواری پەروەردەدا و واز لە خەباتی سیاسی بهێنن، هەروەها پێکەوە قوتابخانەیەك دابمەزرێنن بۆ پێگەیاندن و ڕاهێنانی سەرکردە، دوور لە پلانەکانی فەرمانڕەواکان و داگیرکەران، بۆ ئەوەی دواتر ئەم سەرکردانە ئالای چاکسازی لەناو نەتەوەی ئیسلامیدا هەڵبگرن. بەلام دواتر جەمالەدین ئەفغانی ئەم بیرۆکەیە ڕەت دەکاتەوە گوتە بەناوبانگەکەی پێ دەڵێت: (تۆ تەنها ورەڕوخێنەریت).

محەمەد عەبدە کاروانی چاکسازیی خۆی بە ئامرازە پەروەردەیی و فێرکارییەکان دەست پێ دەکات، لە دەستپێکدا دەرکردنی ڕۆژنامە، تا دەگاتە

هــەوڵی چاکســازی لــە ئەزهــەر و خانــەی زانســتەکان (دار العلــوم) و قوتابخانــەی دادوەریــی شــەرعی و هــەوڵی زیندووکردنــەوەی زمــانی عــەرەبی و گەشــەپێدانی، هەروەها قوتابییەکەی – ڕەشـید ڕەزا – هاوکـاری بـووە بـە هـەموو شـێوەیەك لـە ماوەی ئەو قۆناغە دوورودرێژەدا. ئەوەی ئاگاداری هەموو کارەکانی محەمەد عەبدە بێت دەرك بەو گۆڕانکارییە گەورەیە دەکات کە بەسـەریدا هـاتووە لـەپاش ئـەوەی سەربەخۆ دەبێت و لە ئەفغانی جیا دەبێتەوە[١]، لەگـەڵ ئـەوەی باسـە گشـتییەکانی ڕۆژنامەی (*عروة الوثقى*) زۆربەی لە محەمەد عەبدەدا مـابۆوە، بـەڵام زمـانی گوتـاری تەواو گۆڕانکاریی بەسەردا هاتبوو، چـونکە گوتـاری چاکسـازی لای محمـەد عەبـدە زیاتر ئارەزووی نەرمینواندنی دەکرد لەگەڵ فەرمانڕەواکاندا، بەڵکو هاوکاریی لەگەڵ داگیرکەراندا کردووە بۆ ئـەوەی چاکسـازی لـەناو دامـەزراوەکانی فێرکردنـدا بکـات. هەروەها محمەد عەبدە بەلای کرۆمەردا لای داوەتەوە و کەوتۆتە تەڵەی هاوڕێیـەتی لەگەڵیدا، ئەمەش لەسەر حسابی دۆستایەتیی لەگەڵ مەلا و زانایان و کۆی ئەزهەردا بووە، کە دەیویست چاکسازییان لەنێودا ئەنجام بدات، پاش ئەمە شـێخ و مـەلاکان ڕووبەڕووی دەبوونەوە لە بەرامبەر ئەو چاکسـازییانەی کـە دەیویسـت لـە ئەزهـەردا ئـەنجامی بـدات. هــەروەها چــەند تونــد بــوو بەرامبــەر بــە شــێخەکانی ئەزهــەر و لایەنگرانیان، ئەوەندەش لاواز بوو لەبەرامبەر دەسەڵاتی داگیرکەردا. ئەگەر محەمەد عەبـدە لــە نــاو ئەزهــەردا خاســیەتەکانی پاڵــەوانی ڕێنیشــاندەر و ســەرکردەیەکی خۆشەویستی هەبووایە کە خەڵك بەگوێی دەکەن و لە فـەرمانی دەر ناچـن، ئەگـەر دەستی لەگەڵ داگیرکەر تێکەڵ نەکردایە و متمانەی شێخەکانی ئەزهەری بەدەسـت بهێنایە، ئەوا ڕێڕەوی چاکسازی زۆر خێراتر دەبوو، بـەڵکو زۆر گشـتگیرتر دەبـوو و

[١]– محمد رشيد رضا: تأريخ الأستاذ الإمام، مطبعة المنار، جزءان، القاهرة، (١٩٣١م).

خەڵك زیاتر بەدەمیەوە دەهاتن[1].

بە پێچەوانەی ئەفغانییەوە کە باوەڕی بە توانای گەل هەبوو بۆ دروستکردنی گۆڕانکاری و بەتەواوەتی بەلای گەلاندا لای دابۆوە دژ بە فەرمانڕەوایان و داگیرکەران، ئەوا محەمەد عەبدە لە قۆناغی دووەمی ژیانیدا باوەڕی وا بوو گەل ئامادەیی تێدا نییە بۆ ئەوەی سەربەخۆیی وەر بگرێت و خۆی خۆی بەڕێوە ببات، هەروەها چینە میللییەکان ئامادەییان تێدا نییە تەنها بۆ جۆرێکی دیاریکراو لە زانست و پلەیەکی کۆمەڵایەتی و ئەرکێکی دیاریکراو لە دەوڵەتدا نەبێت، هەروەها باوەڕی وا بوو هاوکاریکردن لەگەڵ داگیرکەردا پێویستە بۆ خزمەتکردنی وڵات و بەرزڕاگرتنی ئوممەت[2]، هەر بۆیە گوتاری محەمەد عەبدە چەند توند بووە لەبەرامبەر شێخەکان و خەڵك و ڕەخنەگرتن لە خود، بە هەمان ڕادە نەرمیی نواندووە بەرامبەر بە گەندەڵیی فەرمانڕەواکان و ستەمی داگیرکەران.

### ٣- محەمەد ڕەشید ڕەزا (١٨٦٥ز-١٩٣٥ز/١٢٨٢ك-١٣٥٤ك):

شێخ محەمەد ڕەشید ڕەزا لە قۆناغی ژیانی چاکسازی مامۆستاکەیدا (محەمەد عەبدە) هاوڕێی بووە و لەگەڵیدا بووە، شێخ محەمەد عەبدە بە هەڵگری هزری چاکسازی خۆی دادەنا لە ماوەی ژیانیدا، هەروەها بووە میراتگری ئەم هزرەش لەپاش مردنی محەمەد عەبدە، ئەمەش لە ڕێگەی دەرکردنی گۆڤاری *مەنار*، کە محەمەد ڕەشید ڕەزا دایمەزراند و تێیدا هزری مامۆستاکەی – محەمەد عەبدە-ی بڵاو دەکردەوە، هەروەها محەمەد عەبدە لە ستاییشێکیدا بۆ محەمەد ڕەشید ڕەزا دەڵێت: ((خودای گەورە ئەم گەنجەی بۆ من ناردووە بۆ ئەوەی ببێتە هاوکارم لە

---

[1]- علي زيغور: الخطاب التربوي والفلسفس عند محمد عبده، دار الطليعة، بيروت، (١٩٨٨م)، (ص ٢٨).

[2]- علي زيغور: الخطاب التربوي والفلسفي عند محمد عبده، دار الطليعة، بيروت، (١٩٨٨م)، (ص ٢٨).

ماوەی ژیانمدا و ببێتە هۆی درێژکردنەوەی تەمەنم. کۆمەڵێك بابەتی زۆر هەن دەمەوێت باسیان بکەم یاخود بیاننووسمەوە بۆ ئوممەتەکەم، بەڵام چەند شتێکی تر سەرقاڵیان کردووم لەوەی بە ئەنجامیان بگەیەنم و ئەم گەنجە هەڵدەستێت بە ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتانە بەو شێوەی من باوەڕم پێیەتی و دەمەوێت ئەنجامی بدەم... و لەم گەشتەمدا ئەوەی بینیم لە زانست و کاریگەری ئەم گەنجە بە هیچ شێوەیەك پێشبینیم نەدەکرد و گومانم بۆی نەدەچوو، چونکە ئەو بۆ من هەستا بە دامەزراندنی چەندین پارت و هاوەڵ و خوێندکارێکی زۆری بۆ پەیدا کردم)).[1]

یەکەم ژمارەی گۆڤاری *مەنار* لە (٢٢ی شەوالی ساڵی ١٣١٥ك/ ١٧-٣-١٨٩٨ز) دەر چوو، محەمەد ڕەشید ڕەزا بەردەوام بوو لە دەرکردنی ئەم گۆڤارە بۆ ماوەی چل ساڵ بەبێ ئەوەی ماندوو یاخود وەڕس بێت، دوایین بەش کە لە گۆڤاری *مەنار* چاپ کرا بریتی بوو لە بەشی دووەم لە بەرگی سیوپێنجەمین لە (٢٩ی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ١٣٥٤ك) کە لەپاش مردنی خۆی بڵاو کرایەوە. ئەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری *مەنار* دەخوێنێتەوە هەست بەو غەمە هاوبەشە دەکات کە قوتابخانەی مەنار هەڵی گرتووە لەگەڵ ئەو جیاوازییە ڕوونەی دەر دەکەوێت لە دوورکەوتنەوە لە کاری سیاسی و گرنگیدان تەنها بە کاری پەروەردەیی و هزری و ئەمەش بەتایبەتی لە ژیانی محەمەد عەبدەدا بەدی دەکرێت، کە ئامۆژگاریی خوێنکارەکەی محەمەد ڕەشید ڕەزای دەکرد بۆ دوورکەتنەوە لە کاری سیاسی و گرنگیدان تەنها بە چاکسازیی ئایینی و کۆمەڵایەتی[2].

گۆڤاری *مەنار* هزرێکی چاکسازیی تایبەت بە خۆی هەڵگرتبوو و زۆرێك لەو پرسانەی چارەسەر دەکرد کە پێشتر هەریەك لە ئەفغانی و محەمەد عەبدە

---

[1]- محمد رشيد رضا: تأريخ الأستاذ الإمام، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ١٠١٨).

[2]- إبراهيم أحمد العدوي: رشيد رضا الإمام المجاه، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ١٣٩).

وروژاندبوویان، بەلأم بە شێوەیەكی زانستیانەتر، هـەروەها گوتـاری گۆڤـاری مـەنار زیاتر ڕووی لە چـینی بـژاردە (نوخبـە) بـوو و هـەموو خـەڵك لێـی تێنەدەگەیشـتن، سەرەڕای ئەوەی محەمەد عەبـدە لەگـەڵ ئـەوەی زۆر سەرسـامی شـێوازی محەمـەد ڕەشید بوو لە چارەسەركردنی پرسەكان و بەتایبەتی بەكارهێنانی شێوازی دیبەیت، بەلأم چەند جار بـە محەمـەد ڕەشـیدی گوتـووە: ((گۆڤـاری مـەنار تـەنها كۆمـەڵێك كەسی تایبەت لە زمان و بابەتەكانی تێدەگـەن، هـەر بۆیـە پێویسـتە دەسـتەواژەی ئاسان لەخۆ بگرێت و زمانی نامۆی كەمتر تێدا بـەكار بهێنرێـت، بـۆ ئـەوەی هـەموو چینەكانی خەڵكی بتوانن لێی تێبگەن، تەنانەت خەڵكی ئاساییش)).[1]

گۆڤـاری مـە*نار* لەسـەر ڕێبـازی خـۆی بـەردەوام بـوو، بـەلأم كۆمـەڵێك نامـە دەگەیشتنە خاوەنەكەی كە سكالأی مەترسی بـوونی مژدەبەخشـەكان (مبشـرین) و داگیركـەرانیان دەكـرد، لـە ناوچـە ئیسـلامییە دوورەكـانی وەك جـاوە و سـوودان، هـەروەها نـەبوونی بـانگخوازانی ئیسـلامیی بـۆ ئـەوەی ڕووبـەڕووی ئـەم مەترسـییە ببنەوە، ئەمەش بووە هۆی زیندووكردنەوەی بیرۆكەیەكی محەمەد عەبدە، كە كاتی خـۆی بـۆ ئـەفغانیی خسـتبووە ڕوو دەربـارەی دامەزرانـدنی قوتابخانەیـەك بـۆ پێگەیانـدنی سـەركردە، محەمـەد ڕەشـید هـات و كـردی بـە دەسـتەی بانگـەواز و ڕێنموونیكردن بۆ پێگەیاندنی بانگخوازان (جمعیـة الـدعوة و الإرشـاد لتخـریج الـدعاة) و ئەم قوتابخانەیەش لە ساڵی (١٣٣٠ك/١٩١٢ز)دا دەمەزرا، لـە پـرۆژەی دامەزرانـدنی ئەم قوتابخانەیەدا باس لەم خالأنەی خوارەوە كرابوو[2]:

---

[1]- إبراهیم أحمد العدوي: رشید رضا الإمام المجاهد، سەرچاوەیەكی پێشوو، (ص ١٣٩)

[2]- هەمان سەرچاوە، (ص ١٨٤-١٨٦).

١. خوێندکارەکانی ئەم قوتابخانەیە هەڵدەبـژێردرێن لـە قوتابییـە موسـوڵمانە باشەکان لە هەموو ناوچەکاندا، بەڵام خوێندکارەکانی ئەو ناوچانە پێش دەخرێن کە زیاتر پێویستیان بە زانستە، وەکو جاوە و چین و بەشی باکووری ئەفریقا.

٢. قوتابخانەکە هەموو پێداویستییەکانیان بۆ دابین دەکات لە خەو و خـۆراك و پەرتووك.

٣. گرنگیی دەدات بە ڕاهێنانی ئەو خوێندکارانە لەسەر پـەروەردە و ڕەوشـت و پەرستشەکانی ئیسلام، بە شێوەیەك ئەگـەر هـاتو هەرکەسـێك درۆکـردن، یـاخود ڕەگەزپەرستیی نەتەوەیی، یاخود مەزهەبی، یاخود هەر تاوانێکی لێ ببینرێت، ئەوا لە قوتابخانەکە دەر دەکرێت.

٤. خوێندکارەکان فێری هەموو ئەو زانستە ئایینییانە دەکرێن کـە بـانگخوازان پێویستییان پێیەتی هەر لە بیروبـاوەڕ و تەفسـیر و فـەرموودە و ئەحکامـەکان، بـە شێوەیەك بتوانن بەڵگەیان پێ بهێننەوە و گومانیان پێ بڕەوێننەوە، هەروەها هـەر زانسـتێکی تریـان فێـر دەکـەن کـە پێویسـتیان پـێ بێـت بـۆ ئـەو مەبەسـتە وەك زانستەکانی بیرکاری و زمان.

٥. نە قوتابخانەکە و نە دەستەی بەڕێوەبردنی قوتابخانەکە خۆیـان سـەرقاڵ ناکەن بە سیاسەتی میسری یاخود سیاسەتی عوسمانی.

٦. ئەو بانگخواز و ڕابەرانەی لە قوتابخانەکەدا پێدەگـەن دەنێـردرێن بـۆ ئـەو وڵاتە ئیسلامییانەی زۆرترین پێویستییان پێیانە، وەکو چین و جاوە و پاشان گەلـە بتپەرستەکان و دواتریش ئەمریکا.

٧. دامەزرێنـەرانی ئـەم قوتابخانەیـە هەڵدەسـتن بـە کۆکردنـەوەی هاوکـاریی پێویست بۆ ئەنجامدانی ئەم کـارە، پاشـان دەرگـای بەشـداریکردن بـە شـێوەیەکی هەمیشەیی دەکەنەوە بۆ بەردەوامبوونی ئەم پڕۆژەیە، هەروەها هیوای سەرکەوتنی

ئەم هەولآنە دەخوازن لە ڕێگەی چاکە و بەخشین و دیاری و ئەو وەقفانەی لەسەر ئەم پڕۆژەیە وەقف دەکرێن لەلایەن چاکەکاران و خێرخوازانەوە.

لە شەوی ئاهەنگگێڕان بەبۆنەی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر) لە ساڵی (١٣٣٠ك/١٩١٢ز)دا و لە دورگەی ڕەوزە لە قاهیرە بەفەرمی ئەم قوتابخانەیە کرایەوە، هەروەها پەیڕەوی ناوخۆی قوتابخانەکە دەر کرا. گرنگترین خاڵ لەم پەیڕەوەدا باسی لێ کرابێت بریتی بوو لە: ((قوتابخانەی بانگەواز و ڕێنمونیکردن قوتابخانەیەکی ئیسلامیی گشتیە و هەموو ئەو زانست و هونەرانەی تێدا دەخوێندرێت کە لە کۆلێژەکانی تردا دەخوێندران سەرەڕای خوێندنی پەروەردەیەکی ئایینی، هەروەها گرنگییەکی زۆر بە زانستە ئیسلامییەکان دەدات، بەشەکانی ئەم قوتابخانەیە لەسەر بنەمای پلەبەندی دامەزراوە، کە سەرەتا بە پلەیەکی بەرز دەست پێ دەکات بۆ پێگەیاندنی بانگخوازانی ئیسلام)). ڕاستەوخۆ لەپاش ڕۆژی ئاهەنگگێڕانەکە دەست بە خوێندن کرا. قوتابخانەکە ئەو خوێندکارە گەنجانەی وەر دەگرت کە تەمەنیان لەنێوان (٢٠–٢٥) ساڵ دەبوو، بەو مەرجەی پێشتر بایی ئەوەندە زانست فێر بووبێتن وایان لێ بکات توانای خوێندنیان هەبێت لەم قوتابخانەیەدا.

خوێندکار بڕوانامەی ڕابەرایەتیی وەر دەگرت ئەگەر بۆ ماوەی سێ ساڵ لەو قوتابخانەیەدا بیخوێندایە و لە وانەکانیدا سەرکەوتوو ببووایە، بەمەش خوێندکارەکە ئامادە دەبوو بە کاری بانگەواز و ڕێنموونیکردنی موسوڵمانان هەستێت و بە وانەوتنەوە لە قوتابخانەکانی ئەم دامەزراوەیەدا. بەڵام ئەگەر خوێندکار لەپاش ئەم سێ ساڵە ویستی بەردەوام بێت لە خوێندن بۆ ماوەی سێ ساڵی تر، ئەوا دەبێت بە بانگخوازێك لە بانگخوازەکانی ئیسلام، واتە دەبێت بە یەکێك لەوانەی خەڵکی ناموسوڵمان بانگ دەکەن بۆ ناو ئیسلام، دەبووایە خوێندکارەکە بەڵێنیی بدایە

بەوەی ئامادەیە بڕوات بۆ هەر وڵاتێك كە بۆی دیاری دەكرێت.

محەمەد ڕەشید ڕەزا نەیتوانی خۆی دوور بگرێت لە سیاسەت، چونكە كۆمەڵـەی ئیتیحاد و تەرەقی دەبـینی چۆن دەسـتیان بەسـەر دەوڵـتی عوسمانیـدا گرتـووە و داوای بەتوركركردنی ناوچە عەرەبییەكان دەكەن و خۆیان بـە ڕەگـەزێكی باشـتر لـە عەرەبەكان دەزانن و هەوڵی بڵاوكردنـەوەی زمـانی تـوركی دەدەن لـە جێـی زمـانی عەرەبی. لە هەمان كاتدا چاودێریی جووڵەی عەرەبە نەتەوەپەرسـتەكان و شـەریف حسێنی دەكرد و دەیبینی چۆن ئینگلیـز بەباشـی لەگەڵیانـدا دەجووڵێتـەوە و ڕای گشتیی عەرەبەكان بەلای خۆیدا ڕادەكێشێت بۆ ئەوەی ببنە پاڵپشتی ئینگلیز دژ بە وڵاتی عوسمانی ئەگـەر هـاتوو عوسمانییـەكان بڕیاریـان دا بڕۆنـە پـاڵ ئـەڵمانیا لـە جەنگی جیهانیی یەكەمدا. هەر بۆیە محەمەد ڕەشید لە نووسین و پەیوەندییەكانیدا هـەوڵی دەدا لـە لایـەك سیاسـەتی كۆمەڵـەی ئیتیحـاد و تـەرەقی جیـا بكاتـەوە لـە ڕەگەزپەرستی و لە لایەكی تـر هـەوڵی دەدا عەرەبـە نەتەوەپەرسـتەكان و شـەریف حسـێن لـە بەڵێنـە بێناوەڕۆكـەكانی ئینگلیـز ئاگـادار بكاتـەوە، بـەڵام ڕووداوەكـان هـەمووی بـە پێچـەوانەی ویسـتی ئـەو ڕوویـان دا و بـە ڕێكـەوتنی (سـایكس بیكـۆ) كۆتاییان هات بۆ دابەشكردنی وڵاتە عەرەبییەكان لەپاش جەنگی جیهانیی یەكەم.

لێرەدا گرنگە باس لەوە بكـەین كـە ئینگلیـز پەیوەنـدییان بـە محەمـەد ڕەشـید ڕەزاوە كــردووە و هــەوڵیان داوە بــەلای خۆیانــدا ڕایكێشــن بــۆ ئــەوەی لــە هەڵوێستەكانیدا لەپاڵ ئینگلیزدا بووەستێت، بەڵام ئەو ڕەتی كردوونەتـەوە و داوای لێ كردوون لێدوانێكی ڕوون بدەن: ((كە هیچ لێكدانەوەیەك لـەخۆ نـەگرێت و بـەڵێن بـدەن بـە سـەربەخۆبوونی ئـەم وڵاتانـە و هـەروەها بـەوەی هـیچ شـتێك لـەم وڵاتـە عەرەبییانە بۆ خۆیان نەبەن لەژێر نـاوی ڕزگـاركردن، یـاخود خاوەنـدارێتی، یـاخود داگیركاری، یاخود پاراستن، یاخود لەژێر هەر ناوێكی تردا)). چونكە لێدوانێكی بەم

شێوەیە عـەرەب دڵنیـا دەکاتـەوە و وایـان لـێ دەکـات لـەپاڵ ئینگلیـزدا بوەسـتن. پاشـان بـەریتانیا بـەدەم داواکـەی محەمـەد ڕەشـیدەوە هـاتن بـۆ ئـەوەی ئامانجـە داگیرکارییەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن.

بـەم شـێوەیە محەمـەد ڕەشـید ڕەزا کەوتـە تەڵـەی ئینگلیـزەوە و ئامۆژگـاریی پێشـکەش کـردن لـەو پرسـە چارەنووسسـازە گرنگـەدا. بـەم شـێوەیە مێـژوو ئـەم هەڵەیەی لەسەر تۆمار کرد کە پێشکەشکردنی ئامۆژگاری بوو بۆ دوژمنی ڕاستەقینە و داگیرکەری وڵات، بەم کارەش هەنگاوێك زیاتر لە مامۆستاکەی نزیك بوویەوە، کـە باوەڕی وا بوو چاکسازی لەڕێگەی هاوکاری کردنی کرۆمەرەوە ئەنجامدەدرێت، بۆیە ئەم دوو چاکسـازە گەورەیـە بـە نییـەتی باشـی خۆیـان بێئاگـا بـوون لـە سروشـتی داگیرکەران و دەرکیان بەوە نەکرد کە چاکسازی لەڕێی ڕمی داگیرکەرانەوە ئـەنجام نادرێت، گۆڕانکاریی ڕاسـتەقینەش بـەدی نایـەت هـەتاوەکو بەتـەواوەتی پاڵپشـتی گەل نەبیت دژ بەو لایەنە دەرەکییـەی کـە هـەردەم چـاوی تـەماحی لـە خێروبێـری وڵاتـانی ئیسـلامییە. ئەمـەش وانەیـەکی مێـژوویی گرنگـە کـە پێویسـتە لەسـەر بانگخوازان باش لێی تێبگەن و پەندی لێ وەر بگرن بۆ هەستانەوەی ئـەم ئوممەتـە لە ئێستا و ئاییندەدا.

لە هەموو ئەوانەی پێشتر باسمان کرد دەتـوانین ئـەو کۆلکـە هاوبەشـانە پوخـت بکەینەوە کە قوتابخانەی *مەنار* لێوەی سەریان هەڵدا، کـە خۆیـان دەبینییـەوە لـە جەمالـەدینی ئـەفغانی و محەمـەد عەبـدە و محەمـەد ڕەشـید ڕەزادا، سـەرەڕای جیاوازیی زمانی گوتاری هەریەك لەمانە، کە بە شێوەیەکی گشـتی بـریتی بـوون لـە پێویستیی زیندووکردنەوەی هزری ئیسلامیی ڕاست و دروست، سوودوەرگرتن لـەو کەلەپووره زانستییەی هەمانـە و لـەو ئاسـانکارییانەی کـە موسـوڵمانان ئـەنجامیان داوە لە بوارە زانستییەکاندا، بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی ئیسلامیی و چاکسازیکردن

له دامەزراوەکانی خوێندن و فێرکردنـدا، بـەرگریکردن لـە ئیسـلام و موسـوڵمانان، هـەروەها سـوودوەرگرتن لـە شارسـتانیەتیی ڕۆژئـاوا پـاش ئـەوەی بـە پێودانگـە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییە ئیسلامییەکان دەپێورێن. هـەموو ئـەم پێکهاتـە هزریانـە بناغـەی سـەرەکیی دەسـتپێکردنی قوتابخانـەی ئیسـلامێتی مەعریفـە بـوون بـەو شێوەیەی کە لە لاپەڕەکانی داهاتوودا دەربارەی دەدوێین.

## قوتابخانەی ئیسلامێتی مەعریفە لە (١٩٨١ز/١٤٠١ك)ەوە هەتاکو ئێستا:

لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکادا کە مرۆڤ تێیدا گەیشتۆتە لووتکەی زانست و تەکنەلۆژیا، کەشوهەوایەك ڕەخسێنراوە بۆ ئەوەی مرۆڤ چۆنی بوێت بـەو شـێوە بـیر بکاتــەوە، بــەبێ هــیچ کـۆت و بەنـدێك –ئەمــەش لــە پــێش ڕووداوەکــانی (٢٠٠١/٩/١١ز) بە نزیکەی بیست ساڵ– کۆمەڵێك گەنجی موسوڵمان کۆ بوونەوە کە خوێندکاری قۆناغی دکتۆرا بوون، لە پسپۆرییە جیاوازەکانی زانکۆکانی ئـەمریکادا، ئــەوەی کـۆی کردنــەوە بریتیــی بــوو لــە بیرکردنــەوەی هاوبــەش ســەبارەت بــەو بارودۆخەی کە ئوممـەتی ئیسـلامیی پێـی گەیشـتبوو، لـە لاوازیـی بـاری ڕامیـاری و کۆمەڵایــەتی و ئـابووری و... هتـد[١]. هــەروەها دەیـانزانی ئوممەتەکـەیان خـاوەنی توانایەکی زۆری مـاددی و ڕۆحیـە، کـە ڕێـی بـۆ خـۆش دەکـات سـەرلەنوێ زینـدوو ببێتــەوە، هــەروەها پێداچــوونەوەیان بــە هــەموو ئــەو بزووتنــەوە چاکســازییە ئیسلامییانەی پێش خۆیان کرد، کـە گرنگییـان بـە دووبارەهەستانەوەی ئوممـەتی ئیسـلامیی داوە، سـەرەڕای ئـەو هـەمووە هـەوڵ و ماندووبوونـەی ئـەو بزووتنـەوە

---

[١]– بۆ زانـینی هەسـتیان دەربـارەی ئـەو قەیرانـە، بگـەڕێرەوە سـەر: عبدالحميـد أبـو سـليمان (تحريـر وإضافات): إسلامية المعرفة المبـادئ العامـة، خطـة العمـل، الإنجـازات، المعهـد العـالمي للفكـر الإسـلامي، هيرندن، فيرجينيا، الولايات المتحدة الأمريكية، (١٩٨٦م)، (ص ٢٣–٣١).

چاکسـازییانە بەخـەرجیان داوە، بـەڵام نـەیانتوانیوە ئـەوەی مەبەسـتیانە بـەدیی بهێنن، ئوممەتی ئیسلامییش وەکو خۆی ماوەتـەوە لـە لاوازی و هەڵوەشـانەوە و بێئومێدیی خەڵکیدا.

نزیکترین ئەو بزووتنەوە چاکسازییانەی لە هۆشیاندا ئامادە بوون، بـریتی بـوون لە بزووتنەوەکانی وەهابیەت و مەهدیە و سەنوسـیە و مـەنار و ئیخـوان موسـلمین و هـەموو ئـەو بزووتنەوانـەی کـە هـەوڵی چاکسـازی و نوێگـەرییان داوە. هـەروەها پرسیارە گرنگەکە ئەمە بوو: بۆچی ئەم بزووتنەوانە بـە ئامانجـە چاکسـازییەکانیان نەگەیشتن؟ چ کێشەیەك لە پرۆگرامی چاکسـازییەکانیاندا هـەبووە؟ چـۆن دەکرێـت ئەم کێشانە چارەسەر بکرێن؟ وەڵامەکەش بریتی بوو لەوەی کە کێشە لـە نـەبوونی یاخود لە کەمیی توانـا مـاددی و مرۆیـی و ڕۆحییەکانـدا نـەبووە، بـەڵکو کێشـە لـە میتـۆدی بیرکردنـەوە و شـێوازی ڕووبەڕووبوونـەوەی کێشـەکانی ئوممەتـدا بـووە و عەقڵی موسوڵمان کەوتۆتە یەکێك لەم هەڵانـەوە: یـان ئـەوەتا سەرسـامی ڕۆژئـاوا و ژیاریی ڕۆژئاواییەکان بووە، بە شێوەیەك وا بیر دەکاتەوە کە هۆکاری پێشـکەوتن و هەستانەوەی تەنها لە ڕێی شوێنکەوتنی تەواوی ڕۆژئاواوە دەبێت، پاشـان دەسـت دەکـات بـە هـاوردەکردنی ژیارسـتانیەت و شـێوازی ژیـان و سیسـتمە ڕامیـاری و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی ڕۆژئاوا. هەروەها لەسەر دەسـتی ئـەم نەوەیـە عـەقڵی موسوڵمانانیان وەك ڕۆژئاواییەکان لـێ کـرد، بـە شـێوەیەك وەك ڕۆژئاواییـەکان بـیر بکەنەوە، لەبیریان کرد کە ناتوانن بەم شێوازە گۆڕانکاری ئەنجام بدەن و ئوممەت زیندوو بکەنەوە، چونکە ئەمان ژیارییەك و ڕۆحێك بەسەر ئوممەتدا دەسـەپێنن کـە هـی خـۆی نییـە، ئەمـەش بـووە هـۆی لـێکترازان و جیابوونـەوەی گـەلان و سەرکردەکانیان، هەر بۆیە سەرکردەکان توانای جووڵاندنی گەلەکانیان لەدەست دا، گـەلیش چـیتر متمانـەیان بـە سـەرکردەکان نـەما، چـونکە ئـەم سـەرکردانە جۆش

کرابوون بە ڕۆح و ڕۆشنبیریی ڕۆژئاوایی.

لەبەرامبەر ئەم کێشمەکێشمەی ڕۆژئاوا لەناو عەقڵی موسوڵماندا، هەڵوێستی کۆمەڵەی دووەم خۆی دەبینییەوە لە چەقبەستوویی عەقڵی موسوڵمان بەرامبەر بە کەلەپوور و ژیارستانیەتی ئیسلامی. لەباتی ئەوەی ئەم عەقڵە بتوانێت بە شێوازێك مامەڵە لەگەڵ کەلەپوور و ژیارستانیەتی ئیسلامیدا بکات کە بیکاتە خاڵی دەستپێك و هەنگاوی لەسەر بنێت بەرەو ژیارستانیەتێکی هاوچەرخ، دەبینین تووشی چەقبەستن هاتووە لە هەمبەر بەرهەمی پێشینان، بە هۆکاری فەرامۆشکردنی فاکتەرەکانی کات و شوێن و گۆڕانی بارودۆخ لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو بەرهەمە. هەر بۆیە ئەم شێوازە مامەڵەکردنە لەگەڵ کەلەپوور و ژیارستانیەتی ئیسلامیدا بۆتە کۆتێك لەبەردەم پێشکەوتنی ئوممەت و گەیشتن بەوەی نەتەوەکانی تر پێی گەیشتوون لە هۆکار و یاساکانی پێشکەوتن و هەستانەوە.

بۆیە ئەو دەستە گەنجە بۆیان دەرکەوت کە قەیرانی عەقڵیی تاکی موسوڵمان ئاڵۆز بووە، لە لایەك بە هۆی ڕۆچوون لە شارستانیەتی ڕۆژئاوا و سەرسامبوون پێی لەلایەن سیستمە فەرمییەکانی خوێندن و زۆرێك لە ڕۆشنبیرانی ئوممەت، لە لایەکی ترەوە بەهۆی مامەڵەیەکی چەقبەستووانە لەگەڵ ڕۆشنبیریی ئیسلامیدا لەلایەن سیستمی خوێندنە ئایینییەکانەوە[١]. هەروەها چارەسەریش تەنها لە ڕێگەی نەهێشتنی ئەو دووڕیانەیە لە فێرکردندا بە شێوەیەك عەقڵێکی موسوڵمانی یەکتاپەرستمان هەبێت کە زانستە نوێیەکان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە و زانستە شەرعییەکانیش لە چوارچێوەیەکی ژیارستانیدا وەر بگرێت.

بوونی ئەو دەستە گەنجە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دوو تایبەتمەندیی پێ بەخشیبوون بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ قەیرانە هزرییەکانی ئوممەتدا:

---

[١]- لەو بارەیەوە بڕوانە: إسلامية المعرفة، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ٣٢-٥٥).

تایبەتمەندیی یەکەم، ئەوەیە شوێنی ئەم گەنجانە لە ناوجەرگەی ویلایەتە یەککگرتووەکاندایە، کە لەڕووی زانستییەوە پێشکەوتووترین وڵاتە لەم سەردەمەدا، هەروەها دەتوانێت ئەوەی بیانەوێت لە زانستی سەردەم بەپێی توانا دەستی بخەن، هەروەها دەتوانن لەنزیکەوە دەرك بە باشی و خراپی و تایبەتمەندییەکانی ئەو زانستانە بکەن.

تایبەتمەندیی دووەم، لەبەر ئەوەی لە ناوجەرگەی ئەم ژیارستانیەتەدا دەژین، بۆیە توانیویانە دەرك بە لایەنە باشەکانی ئەم ژیارستانیەتە ماددیە بکەن و هەروەها ئاگاداری کەموکورتییە ڕۆحی و هزرییەکانی ببن، هەر بۆیە بە شێوەیەکی تەواو سەرسامی ژیارستانیەتی ڕۆژئاوا نەبوون، هەروەها ترسی توانەوەشیان نەبووە لەناویدا، هەر بۆیە ژیان لەنزیکەوە لەگەڵ ژیارستانیەتی ڕۆژئاوادا لە بەرژەوەندیی ئەم قوتابخانەیەدا بووە، چونکە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە ئیسلام شیاوە بۆ ئەوەی تەکان بە ئوممەت بدات و تەنانەت مرۆڤایەتییش ڕزگار بکات.

زانستە کۆمەڵایەتییەکان گرفتی سەرەکیی ئوممەت بوون، چونکە ئەو زانستە کۆمەڵایەتییانەی کە لە سەرتاسەری جیهانیی ئیسلامیدا دەخوێندران هەمووی زانستی ڕۆژئاوایی بوون: ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵناسی و پەروەردە و دەروونناسی و مێژوو. ئەم زانستانەش کەسایەتیی مرۆڤ بنیات دەنێن و ناسنامەکەی دیاری دەکەن. هەر بۆیە کۆمەڵەی ئیسلامێتی مەعریفە زوو دەرکیان بەوە کرد کە دەبێ لە ئیسلامێتی ئەم زانستانەوە دەست پێ بکەن. بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجەش دەستەی زانا کۆمەڵناسە موسوڵمانەکان لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا و لە ساڵی (١٣٩٢ك/١٩٧٢ز) دامەزرا، ئەمەش بە ئامانجی سەرلەنوێ داڕشتنەوەی ئەم زانستە کۆمەڵایەتییانە بە داڕشتنێکی ئیسلامییانە و هەروەها

گۆڤاری ئەمریکی بۆ زانستە کۆمەڵایەتییە ئیسلامییەکان (American Journal Of Islamic Social sciences - AJISS ) زمانحاڵی ئەم ئاراستەیە بوو و هەروەها ئامرازێك بوو بۆ دروستکردنی پەیوەندیی لەنێوان ئەو زانا کۆمەڵناسە موسوڵمانانەدا کە بایەخیان بەم بوارە دەدا.

بە هەمان شێوە گۆڤاری ئیسلامێتی مەعریفە (*إسلامية المعرفة*) بە زمانی عەرەبی دەر دەچوو بۆ ڕوونکردنەوەی بۆچوون و ئاراستەی ئەم قوتابخانەیە. هەروەها ساڵی (١٩٧٧ز) دوو شاکاری دیاری لە مێژووی قوتابخانەکەدا بەخۆوە بینی: چونکە لەم ساڵەدا یەکەم کۆنگرەی جیهانیی بەسترا سەبارەت بە پەروەردەی ئیسلامیی لە مەککەی پیرۆزدا و لەسەر بانگهێشتی زانکۆی مەلیك عەبدولعەزیز لە جیددە. هەروەها زانایان لە زۆربەی جیهانیی ئیسلامیی و ئەو ناوچانەی موسوڵمان تێیاندا کەمینەن لەم کۆنگرەیەدا ئامادە بوون. لە ڕێگەی ئەم کۆنگرەیە و هەروەها ئەو توێژینەوانەی تێیدا پێشکەش کران هێڵە هزرییەکانی قوتابخانەی ئیسلامێتی مەعریفە تەواو ڕوون کرانەوە لە بواری یەکێك لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا، کە ئەویش پەروەردەیە: بە شێوەیەك زۆربەی توێژینەوەکان ئاماژەیان بەوە دەکرد کە قەیرانی ئەم ئوممەتە قەیرانێکی هزری و پەروەردەییە، هەورەها پەروەدە لە جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیماندا بە هەردوو سیستمی نوێی ڕۆژئاوایی و کۆنی ئیسلامیی ناتوانن ئوممەت هەستێننەوە. هەر بۆیە کۆنگرەکە بە پێویستی زانی سیستمێکی پەروەردەیی ئیسلامیی دابنرێت، کە شوێنی ئەم سیستمە پەروەردەییە تێکەڵە بگرێتەوە، هەروەها داوای دامەزراندنی سەنتەرێکی جیهانیی لە مەککەدا کرد، بۆ ئەوەی چاودێریی جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کۆنگرەکە بکات. ئەم کارەش وەك خۆی جێبەجێ کرا، بەڵام دواتر چالاکییەکانی وەستا، لەبەر ئەوەی ئەم سەنتەرە پشتی بە حکومەتەکان دەبەست، نەك بە گەلان، کە ئەمەش وانەیەك بوو

دواتر قوتابخانەی ئیسلامێتی مەعریفە پەندی لێ وەر گرت.

شاكاری دووەم، كە مێژووی ئەم قوتابخانەیە بەخۆیەوە بینی لە ساڵی (١٩٧٧م)دا، بریتی بوو لە بانگهێشتكردنی زاناكانی ئوممەتی ئیسلامیی لەلایەن كۆمەڵەی ئیسلامێتی مەعریفەوە بۆ كۆڕبەندێكی جیهانیی بۆ لۆجانۆ لە سویسرادا. وە نزیكەی سی زانا و بیرمەندی ئیسلامیی لە سەرتاسەری جیهانەوە ئامادە بوون، بە مەبەستی ڕاوێژكردن سەبارەت بە قەیرانی ئوممەتی ئیسلامیی و دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەك بۆ تێپەڕكردنی ئەو قەیرانە. وە هەر سی زانا ئیسلامییەكە هەمان بۆچوونی ئەندامانی ئەم قوتابخانەیان هەبوو، لەوەی قەیرانی ئوممەتی ئیسلامیی پێش هەموو شتێك قەیرانێكی هزرییە و ئەم قەیرانەش هۆی بوونی كەموكورتییە لە هەموو بوارەكانی تردا. هەروەها هاوڕابوون لەسەر پێویستیی هەبوونی دامەزراوەیەكی تایبەت، كە ئەركی چارەسەركردنی قەیرانی هزریی ئەم ئوممەتە بگرێتە ئەستۆ. بۆ ئەم مەبەستەش پەیمانگای جیهانیی فكری ئیسلامیی دامەزرا و لە ئەمریكادا لە ساڵی (١٤٠١ك/١٩٨١ز) بەفەرمی تۆمار كرا.

كۆمەڵەی ئیسلامێتی مەعریفە هەر لە سەرەتاوە دەركیان بەوە كرد كە ناتوانن ئەم پڕۆژەیە لەژێر چاودێریی لایەنی فەرمیی هیچ وڵاتیكی دیاریكراودا ئەنجام بدەن، هەروەها ناتوانن لەڕووی داراییەوە پشت بە وڵاتیكی دیاریكراو ببەستن، هەر بۆیە سوور بوون لەسەر دامەزراندنی وەقفێكی ئیسلامیی لەسەر ئەركی خۆیان و هەروەها پشت ببەستن بەو سامانەی كە لە وڵاتانی خلیجی عەرەبییەوە پەیدایان كردووە و لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكادا خستوویانەتە پڕۆژەكانی وەبەرهێنانەوە، ئەمە جگە لەو بەخششانەی كە بەبێ مەرج وەریان گرتووە. چونكە سەربەخۆیی لە ڕووی داراییەوە مەرجێكی گرنگیی سەربەخۆبوونی هزرە. بە هەمان شێوە هەر لە سەرەتاوە وایان دەبینی كە ناكرێت پڕۆژەیەكی هزریی گەورەی لەم

شێوەیە تەنها لەسەر خۆیان کورت بکەنەوە، بەڵکو دەبێت پشت بە ڕاوێژکردن ببەستن بۆ ئاڕاستەکردنی هەنگاوەکانیان لە داهاتوودا، بۆیە کەلتووری پەیمانگای جیهانیی فکری ئیسلامیی بریتییە لە ڕاوێژ بە کۆمەڵێك ڕاوێژکارەوە لە زۆربەی پڕۆژە هزرییەکانیدا و بەم کلتوورەشەوە پابەند بووە. پاش ئەمە، دووەم کۆڕبەندی جیهانیی بەسترا لەژێر ناونیشانی (ئیسلامێتیی مەعریفە)ـــدا کە تێیدا زانا موسوڵمانەکان کۆ بوونەوە لە زانکۆی ئیسلامیی لە ئیسلامئابادی پایتەختی پاکستان و لەساڵی (١٤٠٢ك/١٩٨٢ز) و گفتوگۆیان ئەنجام دا دەربارەی چۆنیەتیی داڕشتنی پلانێکی کار بۆ ئیسلامێتی مەعریفە بەو شێوەیەی کە توێژینەوەکان ئاماژەیان پێ کردبوو و ڕوونیان کردبوویەوە. لە دەرئەنجامی ئەم کۆڕبەندە و ئەو توێژینەوانەی تێیدا پێشکەش کران ڕێك کەوتن لەسەر پلانێکی کار کە لە هەمان ساڵدا بە زمانی ئینگلیزی بلاۆ کرایەوە لەژێر ناونیشانی:

(Islamization of Knowledge, Principles and Workplain )

پاشان وەرگێردرایە سەر زمانی عەرەبی و دواتر دکتۆر عەبدولحەمید ئەبو سلێمان بلاۆی کردەوە لەژێر ناونیشانی: ((المبادئ العامة، خطة عمل، الإنجازات)) لە ساڵی (١٤٠٦ك/١٩٨٦ز)دا.

هەروەها پلانی کاری داڕێژراو بریتی بوو لە چۆنیەتیی تێپەڕاندنی قەیرانی ئوممەت لە ڕێگەی دووبارە پێکهێنانەوەی عەقڵیەتی موسوڵمان بۆ ئەوەی سەرلەنوێ ببێتە عەقڵێکی ئیسلامیی کە توانای دروستکردنی ژیارستانیەتێکی ئیسلامیی ڕاستەقینەی هەبێت. ئەمەش لە ڕێگەی شارەزابوونی تەواو لە زانستە هاوچەرخەکان و هەروەها شارەزابوون لە دواین زانست و زانیاری کە عەقڵی مرۆڤ پێی گەیشتبێت. پاشان لە ڕێگەی ئاشنابوونەوە بە کەلەپوری ئیسلامیی و هەروەها سوودوەرگرتن لە لایەنە باشەکانی و تێپەڕاندنی کەموکورتییەکانی، هەروەها مامەڵەکردنێکی دروست لەگەڵ بنەما سەرەکییەکانی ئیسلام لە قورئانی پیرۆز و

سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر)، هەروەها سوودوەرگرتن لە هەموو ئەمانە بۆ دامەزراندنی زانست و زانیاریی ئیسلامیی کە توانای ڕووبەڕووبوونەوەی لەمپەر و کێشەکانی ئوممەتی ئیسلامیی هەبێت و بتوانێت ژیارستانیەتی ئیسلامیی زیندوو بکاتەوە و بۆ جاری دووەم بەجیهانیبوونی ئیسلام بەدی بهێنێت.

بە مەبەستی زاڵبوون بەسەر زانستەکانی سەردەمدا پلانێك داندرا بۆ نووسینی کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی و گشتگیر بۆ زانستە نوێیەکان و هەروەها بۆ شارستانیەتی هاوچەرخ، ئەمەش بۆ زاڵبوونی زانا و ڕۆشنبیرە موسوڵمانەکانە بەسەر زانست و ژیارستانیەتی هاوچەرخدا، هەروەها بۆ بەدیهێنانی سەربەخۆیی هزری و دەروونی لەبەرامبەر ئەو زانستانەدا، ئەمەش لە ڕێگەی ئاشنابوون بە ڕۆحی ئەو زانستانە و زانینی فاکتەرەکانی هێز و لاوازی تێیاندا. خاڵی جیاوازیش لەنێوان فەلسەفەی ئەو زانستە ماددیانە و فەلسەفەی ئیسلامیی یەکتاپەرستی بریتییە لەوەی فەلسەفەی ئیسلامیی وا لە زانست و زانیارییەکان دەکات مرۆڤ بە خودا بگەیەنن و ببنە هۆی ئاوادانکردنەوەی زەوی.

بە هەمان شێوە لەپاڵ ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانەدا پێویستمان بە کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی گشتگیر هەیە بۆ کەلەپوری زانستی و ئەدەبیمان، ئەمەش وەك ڕێخۆشکەرێك بۆ پسپۆڕانی بوارە زانستییە جیاوازەکان، بۆ ئەوەی شارەزایی پەیدا بکەن دەربارەی ئەوەی ژیارستانیەتی ئیسلامیی بەخشیویەتی لە هەموو بوارەکاندا، هەروەها بۆ ئەوەی بتوانن جیاوازیی بکەن لەنێوان ڕۆحی یەکتاپەرستی لەم کەلەپوورەدا لەگەڵ ئەو پۆخڵەوات و زیادانەی بە تێپەڕبوونی کات پێوەی لکێنراوە. هەروەها چۆن بتوانین سوود لە ئەزموونی ئەم ژیارستانیەتە وەر بگرین بۆ بەرهەمهێنانی زانستگەلێك کە هەڵقوڵاوی یەکتاپەرستی بن و دوور بن لە زیادە و پۆخڵەوات.

لەپاڵ ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانەشدا پێویستمان بە شێوازێکی نوێ لە مامەڵەکردن هەیە لەگەڵ بنەما چەسپاوەکانی ئیسلامدا: قورئانی پیرۆز و فـەرموودەی صـحیحی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) بە شێوەیەك بۆ تێگەیشتن لێیان بگەڕێینـەوە بـۆ ئەو ڕۆحیەتە ئیسلامییە سازگارەی کە دەق لە عەقڵ جیا ناکاتەوە، ئاین و دونیا و هەروەها فیقھ و واقعی زینـدووش لەیـەك دانابڕێـت. وە لـە ئـەنجامی لێکۆڵینـەوەی ڕەخنەیی گشتگیر لە هەرسێ بواری: زانستە هاوچەرخەکان و زانستەکانی کەلـەپور و هەروەها تێگەیشتنی دروست دەربارەی بنەما جێگیرەکانی ئیسلام، ئـەوا چـینێك لە زانا و بیرمەندمان بۆ دروست دەبێـت کـە خـاوەن میتـۆدێکی زانسـتی ئیسـلامیی دەبن و توانای داهێنانیان دەبێـت و سـەربەخۆ دەبـن لـەڕووی هـزرەوە و هـەروەها توانای بەخشینیان دەبێت لە بواری ئیسلامێتی مەعریفەدا.

بانگـەوازکردن بـۆ ئیسـلامێتی مەعریفـە بەرهـەمی گفتوگـۆی بـەردەوامی نێـوان دەستەی پەیمانگاکە بوو لەگەڵ ئەو زانا و بیرمەندانـەی باوەڕیـان بـە گرنگیـی ئـەم بانگەوازە هەبوو. خۆشبەختانە تا ئێستا سێ کەسایەتیی گرنگ پێشەوایەتیی ئەم بانگەوازەیان کردووە، لە هەمووی بەپەرۆشتر بۆ ئـەم بانگـەوازە دکتـۆر ئیسـماعیل فاروقی بوو، کە بە ڕەچەڵەك فەڵەستینی بوو، لـە زانکـۆی ئـەمریکی لـە بـەیرووت خوێندوویەتی پاشان لە زانکۆی ئیندیانا بەردەوامیی بە خوێندنەکەی داوە و پسپۆڕ بووە لـە بـواری لێکۆڵینـەوە لـە ئایینـە جیهانییـەکان و لـە زۆر زانکـۆی عـەرەبی و ئیسلامیی و جیهانیدا وانەی داوەتەوە، هەر وەك زانکۆی هارڤارد و زانکـۆی ئەزهـەر و پاشان زاکۆی ماکجیل لـە کەنـەدا و پاشـان لـە پـەیمانگای سـەنتەری توێژینـەوە ئیسلامییەکان لە کراچی و پاشان لە زانکۆی شیکاگۆ و هەروەها لە زانکۆی سیراکۆز و دواتر لە زانکۆی تێمپڵ لە فیلادلفیا بەردەوام بوو لە وانەگوتنەوە تـا ئـەو کاتـەی

گیانی به خودای گەورە سپارد[1]. ئیسماعیل فاروقی لە جۆری ئەو پیاوە نوێیانە بوو کـە ڕۆشـنبیریی عــەرەبی و ڕۆشـنبیریی ئیسـلامییان پێکـەوە گـرێ دابـوو بـۆ دروسـتکردنی پێکهاتەیـەکی تـەواو تـاکو توانـای دابینکردنـی پێداویسـتییەکانی ئوممەتی ئیسلامیی هەبێت[2].

دووەمیـان دکتـۆر تـەها جـابر عەلوانییـە، کـە دەرچـووی کۆلێـژی (الشـریعة والقانون)ـــە و هـەروەها دکتـۆرای لـە بـواری (أصـول فقـك)دا لـە زانکـۆی ئەزهـەر بەدەسـت هێنـاوە، ئـەمیش یـەکێك بـوو لـەو پیاوانـەی نوێگـەرییان لـە زانسـتە ئایینییەکانـدا دەکـرد و لـە چوارچـێوە نەریتییەکـەی دەریـان دەهێنـا بـۆ ئـەوەی خزمەتی پڕۆسە ڕامیاری و ئـابووری و کۆمەڵایەتییـەکانی ئوممـەتی ئیسـلامیی پـێ بکـەن، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش سـوودی لـە خوێندنـەوەی زانسـتە کۆمەڵایەتییـەکانی ڕۆژئـاوا و زانسـتەکانی کەلـەپووری ئیسـلامیی وەر گرتـووە، بەمـەش دکتـۆر تـەها نموونەیەکی زیندووی قوتابخانەی ئیسلامێتی مەعریفە پێشکەش دەکـات لـە بـواری

---

[1]– هشام الطالب: مقدمة أطلس الحضارة الإسلامية، للدكتور إسماعيل راجـي الفـاروقي، الـدكتورة لـويس لمياء الفاروقي، ترجمة عبد الواحد لؤلـؤة، المعهـد العـالمي للفكـر الإسـلامي، مكتبـة العبيكـان، الريـاض، (١٤١٩هـ/١٩٩٨م).

[2]– بۆ زانیاری دەربارەی ڕۆشنبیریی یەکتاپەرستییانە کە (الفاروقي) نوێنەرایەتیی دەکـات، بـۆ نموونـە بگـەڕێرەوە سـەر هـەردوو کتـێبی: أطلـس الحضـارة الإسـلامية، سەرچـاوەیەکی پێشـوو، Tawhid Principles And Implication. کـە هـەردووکیان لـە چـاپکراوەکانی پـەیمانگای جیهـانیین بـۆ فیکری ئیسلامیی.

هەروەها خودی لێکۆڵەر لەگەڵ دکتـۆر فـارووقی بەیـەك گەیشـتن لـە سـاڵی (١٩٨٤/١٩٨٥ز) لـە زانکـۆی ئیمارات، کاتێك بە گەڕانێك هات بۆ ناساندنی پەیمانگا و پەیامـەکانی، بەیەکگەیشـتنێکی ڕۆحیـی گـەورە لەنێوانیانـدا ڕووی دا، بەتایبـەت لـە کاتێکـدا کـە لێکۆڵـەر سـەرەتاکانی هەسـتکردنی بـەو ئاڕاسـتەیە بـۆ دروست ببوو. لەوەدا بگەڕێرەوە سەر: د. عبد الـرحمن النقيـب: بحـوث في التربيـة الإسـلامية، (ج ١)، دار الفكر العربي، (١٩٨١م).

زانستە شەرعییەکاندا[1]. هەروەها زانکۆی زانستە ئیسلامیی و کۆمەڵایەتییەکان (SISS) کە دەکەوێتە لیزبێرگ –ڤێرجینیا– لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە دکتۆر تەها سەرۆکایەتیی دەکرد، بە هەوڵێکی تر دادەنرێت بۆ بەرجەستەکردنی ئیسلامێتیی مەعریفە لە بواری زانستە ئیسلامیی و کۆمەڵایەتییەکاندا. لەگەڵ ئەوەی ئەم ئەزموونە تا ڕادەیەك نوێیە، بەڵام توێژەر جەخت دەکاتەوە لەسەر گرنگیی ئاوڕدانەوە لەم ئەزموونە و هەروەها پێویستیی بەدواداچوون بۆی لە ڕێی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە و ڕاستکردنەوەی زیاتری ئەم ئەزموونە[2].

لەپاش ئەمان دکتۆر عەبدولحەمید ئەبو سلێمان دێت کە لە ئێستادا سەرۆکی (پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامی)ە و بڕوانامەی بەکالۆریۆس و ماستەری لە بازرگانیدا بەدەست هێناوە لە زانکۆی قاهیرە لە ساڵانی (١٩٥٩ز،١٩٦٣ز)، هەروەها بڕوانامەی دکتۆرای لە بواری پەیوەندییە نێودەڵەتییەکاندا بەدەست هێناوە لە زانکۆی پێنسلڤانیا لە ساڵی (١٩٧٣ز) و بەڕێوەبەر و دامەزرێنەری زانکۆی

---

[1]– بۆ زانینی چەشنی بیرکردنەوەی نوێگەرانەی شەرعیی دکتۆر (طه)، بۆ نموونە بگەڕێرەوە بۆ: الإجتهاد والتقليد في الإسلام، أدب الإختلاف في الإسلام، أصول الفقه الإسلامي: منهج بحث ومعرفة، إصلاح الفكر الإسلامي بين القدرات والعقبات، هەمووشیان لە بڵاوکراوەکانی پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامین. بە خۆی و خوێندنەوەیەوە بۆ زۆرێك لە بڵاوکراوەکانی پەیمانگا، بڕیاری دا سەفەر بکات بۆ ئەمریکا بۆ سەردانکردنی لەسەر زەویی واقیع، وە پێشڕەوەکانی بناسێت، وە هەلی بەستنی کۆنگرەی ساڵانەی هەژدەهەمی قۆستەوەکە کە لەلایەن ڕێکخراوی زانایانی زانستەکۆمەڵایەتییە موسڵمانەکان لە زانکۆی (Prock Port) لە نیویۆرك –ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا– لە ماوەی (٢٧–٢٩ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٩م)، بەشداریی کرد بە لێکۆڵینەوەیەك تێیدا تاکو لەگەڵ دکتۆر تەها جابیر عەلوانی بەیەك بگەن و تاووتوێی لەگەڵدا بکات لەبارەی پەیمانگا و پەیامەکەی و هۆکاری بوونیەوە لە ئەمریکا. بڕوانە: د. عبد الرحمن النقيب: التربية الإسلامية رسالة ومسيرة، دار الفكر العربي، (١٩٩٠م)، (ص ٧٩–١٠٥).

[2]– بۆ وەرگرتنی بیرکردنەوەیەکی تەواو لەبارەی گرنگیی ئەو زانکۆیەوە، بڕوانە: ڕێبەری خوێندنی باڵای ئەو زانکۆیانە، (١٩٩٧/١٩٩٨م).

ئیسلامیی جیهانییه له مالیزیا لـه سـالآنی (١٩٨٨ز–١٩٩٩ن) بەڕێوەبـەری زانکۆکـه بووه، هەروەها جێدەستی دیار بووه له کاری دامەزراوەیی له هەردوو ڕووی تیـۆری و کردارییەوه له بواری ئیسلامێتی مەعریفەدا[1]. بەتایبەتی هەوڵەکانی بۆ دامەزراندنی یەکـەم زانکـۆی ئیسـلامیی جیهـانیی بـوو لـه مالیزیـادا، بـۆ ئـەوەی کـار بـۆ بەئیسلامێتیکردنی مەعریفه بکات و پەرەی پـێ بـدات وەك شـێوازێکی خوێنـدن لـه شوێنی ئەو دووفاقیەی که له پڕۆگرامەکانی خوێندندا بوونی هەبوو، هەروەها هەوڵی پێگەیاندنی خوێندکاران دەدات به شێوەیەك بتوانن هەردوو ڕۆشنبیریی ئیسلامیی و ڕۆشنبیریی ڕۆژئاوایی پێکەوه گرێ بدەن و له یەك بەرگدا پێشکەشـیان بکـەن، کـه ئەویش بەرگێکی یەکتاپەرستیی ئیسلامییانەیه. بـه هـەمان شـێوه قوتابخانەیـەکی ئیسـلامیی دامەزرانـد کـه سـەر بـه زانکۆکەیـه بـۆ ئـەوەی منـداڵی کارمەنـد و مامۆستاکانی ئەو زانکۆیه تێیدا بخوێنن ئەمەش به مەبەستی نەهێشتنی دووفاقی له خوێندندا و دانانی ئیسلامێتی مەعریفه وەك جێگرەوەیەك بۆ ئەو شێوازه خوێندنـه و لـــه کۆتاییـــدا دامـــەزراوەی پەرەپێـــدانی منـــداڵی دامەزرانـــد ( Child Development Foundation) چـونکه بـاوەڕی وا بـوو پـەروەردەی منـداڵ

---

[1]– بـۆ ناسـینی چەشـنی بیرکردنـەوەی نوێگەرانـەی قوتابخانـەی ئیسـلامێتی مەعریفـه، بگـەڕێرەوه بـۆ کۆششـەکانی دکتـۆر عەبدولحەمیـد ئـەبو سـلێمان وەك: نظريـة الإسـلام الإقتصـادية: الفلسـفة والوسـائل المعاصرة، (١٩٦٠م)، والنظرية الإسلامية للعلاقات الدوليـة: اتجاهـات جديـدة للفكـر والمنهجيـة الإسـلامية، (١٩٧٣م)، أزمة العقل المسلم، (١٩٨٦م)، والعنف وإدارة الصراع السياسـي في الفكـر الإسـلامي، (٢٠٠٢م)، هەمووشی له بڵاوکراوەکانی پەیمانگان.

خودی نووسەر پێخۆشحاڵ بوو به ناسینی دکتۆر عەبدولحەمیـد ئـەبو سـلێمان لەنزیکـەوه ئـەویش کـاتی کارکردنی لەگەڵیدا له زانکۆی ئیسلامیی له مالیزیـا لـه مـاوەی دوو کۆرسـی خوێنـدنی هاوینـەدا هـەردوو ساڵی (١٩٩١، ١٩٩٢م) لەپێناو ئاسانکاریی له پەرەپێدانی خوێندنی باڵا له بەشی پەروەردەی ئیسلامیی له کۆلێژی پەروەردەی ئەوێ، لێکۆڵەر زۆر دڵخۆش بوو ئاسـانکاریی بکـات هـەر ئاسـانکارییەك بێـت لـەم دامەزراوه ئەزموونییه زەبەلاحەدا له ماوەی ئەو ماوه زۆر کورتەدا.

ڕۆڵێکی گرنگیی هەیە لە بواری چاکسازیی ژیارستانیی ئوممەتی ئیسلامیدا[١].

کۆمەڵەی ((ئیسلامێتیی مەعریفە)) ئەم بانگەوازەیان بڵاو کردۆتەوە لە ڕێگەی دامەزراندنی لق بۆ ئەم قوتابخانەیە لە زۆربەی وڵاتانی جیهانیی ئیسلامیی و ناوچە کەمایەتییەکانی تری وەك: شانشینی عەرەبی سعوودیە و شانشینی ئەردەن و مەغریب و میسر و مالیزیا و تورکیا و ئێران و پاکستان و بەریتانیا و فەرەنسا و هیندستان و سودان و بەنگلادیش و ئەندۆنیسیا و جەزائیر و لوبنان و نێجیریا و مۆریتانیا. هەموو ئەم لقانەش هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئەم بانگەوازە دەدەن لەنێو ڕۆشنبیراندا، هەروەها هەوڵی پێگەیاندنی کادیری داهێنەر دەدەن لە بواری ئیسلامێتی مەعریفەدا.

لەپێناو ئەم مەبەستەشدا پەیمانگاکە هەستاوە بە ڕێکخستنی سەدان کۆڕ و کۆنگرە و سیمینار لە ناوەندە ئەکادیمییەکان لە وڵاتە جۆراوجۆرەکانی جیهاندا، بە ئامانجی گەیاندنی پەیامی پەیمانگاکە. هەروەها لە ماوەی کارکردنیدا هەتاکو ئێستا و لە ڕوانگەی ئیسلامێتی مەعریفەوە زیاتر لە سێ سەد و پەنجا پەرتووکی دەر کردووە لە بوارە زانستییە جیاوازەکانی ئایینی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و پەروەردەییدا[٢]. هەروەها بۆ ئەنجامدانی هەموو ئەم پرۆژانەش پشتیان بەستووە بە ڕاوێژی ڕاوێژکارانیان لە هەموو پسپۆرییەکاندا و لە زۆربەی وڵاتانی جیهانیی ئیسلامیی و کەمایەتییە ئیسلامییەکانەوە.

ئەگەر بەدواداچوون بۆ بیرۆکەی ئیسلامێتی مەعریفە بکرێت، دەبینرێت کە

---

[١]– بۆ وەرگرتنی بیرۆکەیەك لەبارەی کۆششە زانستییە دامەزراوەییەکانی پەیمانگای جیهانیی بۆ فیکری ئیسلامیی (زانکۆی ئیسلامیی لە مالیزیا – خوێندنگەی ئیسلامیی پاشکۆ پێوەی – دامەزراوەی گەشەپێدان منداڵیی) بگەڕێرەوە بۆ بەشی شەشەم لە کتێبەکەی د. عبدالحمید أبو سليمان: الطفولة البعد الغائب في مشروع إصلاح الأمة، مؤسسة تنمية الطفولة، لەژێر چاپدایە.

[٢]– بڕوانە لیستی بڵاوکراوە عەرەبیی و بیانییەکانی پەیمانگا.

بیرۆکەیـــەکی نـــویێ نییـــە، ئایـــا پێشـــتر قوتابخانـــەی *مـــەنار* بانگەشـــەی بـــۆ زیندووکردنەوەی کەلەپور نـەکردووە و بـە هـەمان شـێوە داوای وەرگـرتنی زانسـتە بەسوودەکانی ڕۆژئاوای نەکردووە؟ ئایا قوتابخانەی ئیخوان موسـلمین و بزووتنـەوە ئیسلامییە چاکسازییەکان هەمان کاریان ئەنجام نـەداوە؟ ئاشـکرایە ئـەم بیرۆکەیـە نەك تەنها لە پەیمانگای جیهانیی فکری ئیسلامیی بەڵکو لەژێر چەندین ناونیشـان و لە چەندین دامەزراوەی جیاجیادا دووپات کراوەتەوە، هەر وەکو بانگەشە کراوە بـۆ بەئیسلامیکردنی زانستە کۆمەڵایەتییەکان و سەرلەنویێ داڕشتنەوەی ئـەم زانسـتانە لە ڕوانگەیەکی ئیسلامییەوە، وهەروەها بنیاتنانی زانستە کۆمەڵایەتییـەکان لەسـەر میتۆدێکی ئیسلامیی و دامەزرانـدنی زانسـتە کۆمەڵایەتییـەکان لەسـەر بنچینەکانی ئیسلام و... هتد، هەموو ئەم ناونیشانانەش لـە زانکـۆی ئیمـام محمـد بـن سـعودی ئیســلامیی و زانکــۆی ئەزهــەر و کۆمــەڵێك زانکــۆی تــر پێشــکەش کــراون[١]، ئــەم هەوڵانەش هەمووی لە جێی خۆیەتی و دروستن. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەم هەوڵانەشدا هێشتا قوتابخانەی ئیسلامێتی مەعریفە لە هەموویان بەهێزتر و کاریگەرترە، چونکە

[١]– بۆ وەرگرتنی بیرۆکەیـەك لـەبارەی ئـەو بانگـەواز و دامەزراوانـە بـۆ هـەمان بیرۆکـەی ئیسـلامییبوونی مەعریفە بانگ دەکەن لەگەڵ جیاوازیی لە ڕوونیـی بیرۆکەکـە و بـەردەوامییان لـە کـارکردن لـەم بـوارەدا، بگەڕێرەوە بۆ:

١- جامعة الإمام محمد بـن سـعود الإسـلامية، عمـادة البحـث العلمـي: التأصـيل الإسـلامي للعلـوم الإجتماعية، المشروع، برنامج العمل، الإنجاز، الرياض، د.ت.

٢- جامعة الإمام محمد بن سـعود الإسـلامية، نـدوة التأصـيل الإسـلامي للعلـوم الإجتماعيـة، أوراق العمل المقدمة للندوة من (٥-٦/٦/١٤٠٧هـ).

٣- إبراهيم عبد الرحمن رجب: التأصيل الإسلامي للعلوم الإجتماعيـة، المفهـوم، المـنهج، المراحـل، التطبيقات، عالم الكتب، الرياض، (١٤١٦هـ/١٩٩٦م).

٤- مقداد يالجن: أساسيات التأصيل والتوجيه الإسلامي للعلوم والمعـارف، سلسـلة كتـاب تراثنـا، رقم (١٠)، عالم الكتب، الرياض، (١٤١٦هـ/١٩٩٦م).

بەرهەمی زۆرە و بەردەوامە لە بەجێگەیاندنی کارەکانیدا. هەروەها قووڵتر تاوتوێی ڕەهەندی کێشە و گرفتەکانی ئوممەتی ئیسلامیی دەکات و میتۆدی چاکسازی هزری پێشکەش دەکات، ئەمە جگە لەو هەوڵانەی کە داویەتی لە دامەزراندنی زانکۆیەکی ئیسلامیی و قوتابخانەیەکی ئیسلامیی و هەروەها دامەزراوەیەك بۆ پەرەپێدانی منداڵان ئەمەش بۆ ئەوەی لە قۆناغی تیۆری و پلاندانانەوە باز بدەن بەرەو قۆناغی کرداری و جێبەجێکردن لە ئەرزی واقیعدا.

هەندێك کەس پێیان وایە قوتابخانەی ئیسلامێتی مەعریفە پەلەیان کردووە لە دابەزینیان بۆ سەر ئەرزی واقیع و زوو بازیان داوەتە بواری کرداریەوە پێش ئەوەی خۆیان بەتەواوەتی ئامادە بکەن لەڕووی وێناندن (تیۆری) و پلاندانانەوە، هەروەها نەیانتوانیوە ئەو بەرهەمە زانستییە ئامادە بکەن کە مەبەستیانە بەکاری بهێنن لە دامەزراوە پەروەردەییەکانیاندا (هەر وەك: زانکۆی ئیسلامیی و قوتابخانەی ئیسلامیی و زانکۆی زانستە ئیسلامیی و کۆمەڵایەتییەکان "siss" هەروەها دامەزراوەی پەرەپێدانی منداڵ)[1]. بەڵکو باشتر وا بوو قوتابخانەی ئیسلامێتی مەعریفە زیاتر تیشکی بخستایەتە سەر ئەو بەرهەمە زانستییانەی کە پەیمانگای جیهانیی فکری ئیسلامیی لە کارنامەکەیدا پلانی بۆ بەرهەمهێنانیان دارشتبوو، هەروەها دەبووایە ئەم میتۆدە زانستییە ئیسلامییە تەواو ئامادە بکەن بۆ ئەوەی بتوانن بیگوازنەوە نێو بواری کرداری و دواتریش ئەو دامەزراوە پەروەردەییانە دابمەزرێنن کە توانای جێبەجێکردنی ئەم میتۆدە زانستییانەی هەبێت، لەم

[1]– ئەم چوار دامەزراوەیە سەرەڕای ئەوەی نوێن بەڵام بە کاری نایاب دادەنرێن کە شایەنی لێکۆڵینەوەی زیاتر و هەڵسەنگاندنن، بەتایبەت زانکۆی ئیسلامی لە مالیزیا، وە قوتابخانەی ئیسلامیی پاشکۆ پێوەی، وە زانکۆی زانستە ئیسلامی و کۆمەڵایەتییەکان (Siss)، بەڵام دامەزراوەی گەشەپێدانی منداڵ هێشتا لەو قۆناغی کۆرپەییەدایە کە هێشتا سیماکانی دەر نەکوتوون.

ڕێیەشەوە دەتوانن زیاتر پەرە بەم میتۆدە بدەن.

بە هەمان شێوە هەندێکی تر گومانیان هەیە لە تواناداریی قوتابخانەکە، چونکە پاش تێپەڕبوونی نزیکەی بیست ساڵ بەسەر دەرکەوتنیدا هێشتا نەیتوانیوە زۆرێك لە بەڵێنەکانی بەجێ بگەیەنێت، چ لە بواری پێشکەشکردنی زانستە هاوچەرخەکاندا بێت بە ڕۆحێکی ئیسلامییەوە، یاخود ئەنجامدانی خوێندنەوەیەکی نوێ بۆ کەلەپووری ئیسلامیی یاخود لە چۆنیەتیی سوودوەرگرتن لە زانستە شەرعی و ئیسلامییەکان بۆ بارودۆخە هاوچەرخەکانی ئەمڕۆی مرۆڤایەتی، سەرەڕای هەموو ئەمانەش تا ئێستا زۆربەی ئەو هەوڵانەی لەم بوارانەدا بەخەرج دراون بەرهەمی کاری ڕابەرەکانی سەرەتای قوتابخانەکە بوون، بەڵام نەوە نوێکانی ئەم قوتابخانەیە لەڕووی زانستییەوە ئاستی پێویستیان نییە تا بتوانن زاڵ ببن بەسەر زانستەکانی سەردەم و زانستە شەرعی و زانستەکانی کەلەپوور و هەروەها ناتوانن بەرەنگاری لەمپەر و ئاڵنگاریە هاوچەرخەکان ببنەوە، هەر بۆیە ئەو هەوڵانەی لە بواری بە ئیسلامێتی مەعریفەدا بەخەرجیان داوە هەوڵگەلێکی ناکام و تا ڕادەیەك لاوازن و ئەمانەش بوونەتە هۆی دروستبوونی مەترسی لەسەر کۆتاییهاتنی ژیانی ئەم قوتابخانەیە بە کۆتاییهاتنی تەمەنی ڕابەرەکانی –خودای گەورە تەمەنیان درێژ بکات– هەر بۆ نموونە: شەهیدبوونی ئیسماعیل فاروقی خۆی لەخۆیدا لەدەستدانێکی زۆر گەورە بوو بۆ قوتابخانەکە، هەروەها بۆشاییەکی زانستیی زۆری لەپاش خۆی بەجێ هێشت، ئەمەش لە کاتێکدا هێشتا ئەم قوتابخانەیە بەتەواوەتی بناغەی دانەکوتابوو، وە هیوامان وایە قوتابخانەی ئیسلامێتی مەعریفە لە داهاتوویەکی نزیکدا و لە ڕێگەی ڕاوێژکردنەوە پێداچوونەوە بۆ ئەو بیست ساڵەی تەمەنی بکات کە گوزەری کرد، وە هەڵسەنگاندنێك بۆ ئەو دەستکەوتانە بکات کە هەتاکو ئێستا بەدەستی هێناون، هەروەها بە خاڵە لاوازەکانی ئاشنا بێت کە لەم

کاروانە تووشی هاتوون[١]، لە ڕێی ئەنجامدانی ڕاوێژەوە کارنامەی دووەم بـۆ قۆنـاغی داهاتوو دابنێت، وە لە پلانە نوێیەکەدا پێشینە دابنێت بۆ ئەو کارانەی کە پێویستە بە ئەنجامیان بگەیەنێت، هەروەها بۆ ئەو هەنگاوانەی پێویستە بیاننێـت. بەڕاسـتی ئەو بارودۆخەی لە سایەییدا کارنامەی یەکەمی ساڵی ١٩٨٢ز دارێژرا ئێسـتا گـۆڕانی بەسەردا هاتووە، هەر بۆیە پێویستە پێداچوونەوە بۆ ئـەو کارنامەیـە بکرێـت لـەژێر ڕۆشنایی ئەو گۆڕانکارییە نوێیانەدا، بە شێوەیەك بێت کە زیاتر کار بۆ ئامادەکردنی نـەوەی نـوێ بکرێـت بـۆ ئـەوەی توانـای هـەڵگرتنی ئـاڵا و دروشمـی ئیسـلامێتی مەعریفەیان هەبێت، وە بۆ ئـەوەی بتـوانن ئـەم قوتابخانەیـە لـە قۆنـاغی داڕشـتنی پلانەوە بگوازنەوە بۆ قۆناغی پڕاکتیزەکردن و هەروەها لە قۆناغی جێبەجێکردن بە شێوەیەکی ئەزموونی و سنوردار بیگوازنەوە بۆ قۆناغی جێبەجێکردنی بەرفراوان.

لە کۆتاییدا هەرگیز ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە بەراوردکردنی قوتابخانەی *مـەنار* نەبووە بە قوتابخانەی ئیسلامێتی مەعریفـە، بـەڵکو ئامـانج لێـی دەرخسـتنی خاڵـە هاوبەشەکانی نێوان ئـەم دوو قوتابخانەیـە بـوو لـە بـواری چاکسـازیی هـزری لـەنێو ئوممەتی ئیسـلامیدا، هـەروەها ئامـانجی دەرخسـتنی ئـەوە بـووە کـە قوتابخانـەی ئیسلامێتی مەعریفە لە هەندێك ڕووەوە درێژکراوەی قوتابخانەی *مەنارە*، هەرچەندە جیـاوازیش بـن لـەڕووی زمـانی گوتـار و کـات و شـوێن و هـەروەها ئـەو ئەزموونـە مێژووییەی کە هەریەك لەم دوو قوتابخانەیە پێیدا تێپـەڕیون و یـاخود لـەڕووی ئـەو قوتـابی و شـوێنکەوتووانەی کـە هـەتاکو ئـەمڕۆش درێـژە بـە ڕێبـازی ئـەم دوو

---

[١]– پرۆژەیەك هەیە کە ئێستا جێبەجێ دەکرێت لە لقی پەیمانگا لە قاهیرە بـۆ ڕاسـتکردنەوەی ڕێچـکەی ئیسلامیبوونی مەعریفە لە قۆناغی پێشوودا، بەڵام ڕاستکردنەوە شتێکە و هەڵدان بۆ دانانی پلانی کـاری نوێ بۆ پەیمانگا لـە ڕێـی ڕاوێژکردنـەوە بـە زانایـانی ئوممـەت شـتێکی تـرە. بـەڵکو براکـانی کارکـەر لـە پەیمانگادا ئاوڕ بدەنەوە بۆ گرنگیی ئەم کارە لەم قۆناغەی ئێستادا.

قوتابخانەیە دەدەن.

بەڕاستی قوتابخانەی ئیسلامێتی مەعریفە هەتاکو ئێستاش بەزیندوویی ماوەتەوە، ئەوەش بەهۆی هەوڵ و ماندووبوونی ڕابەرە یەك لەدوا یەکەکانی ئەم قوتابخانەیە و بوونی لق و دامەزراوەی پەیوەست بە قوتابخانەکە لە ناوچە جیاوازەکانی جیهاندا و بوونی پەیوەندیی بەهێز لەگەڵ زۆربەی زانکۆ عەرەبی و ئیسلامییەکاندا، هەروەها لە ڕێی بوونی ئەو دەستە و دامەزراوانەی کە لە مەیدانی هەستانەوەی شارستانیەتیی ئیسلامیدا کار دەکەن. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانەش پێویستە لەسەریان کاری زیاتر ئەنجام بدەن و هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆرتر خەرج بکەن، چونکە هێشتا ڕێگایەکی دوورودرێژیان لەپێشە و هەروەها بە زۆرێك لە ئامانجەکانیان نەگەیشتوون.

لێرەدا باسی بەشێك لەو پڕۆژانە دەکەین کە توێژەر پێشنیاری کردوون بۆ پەیمانگای جیهانیی فکری ئیسلامیی بۆ ئەوەی بە هاوکاری لەگەڵ دامەزراوەی (ئیسیسکۆ) لە ماوەی سێ ساڵی داهاتوودا ئەنجامی بدات، گومان لەوەدا نییە کە کەسانێك هاوشێوەی من لەو جۆرە پێشنیارانەیان پێشکەشی پەیمانگا کردووە و بەردەوامیشن لە پێشکەشکردنی بۆ زیاتر کاراکردنی قوتابخانەی ئیسلامێتی مەعریفە، ئەمانەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەم قوتابخانەیە بەردەوامە لە پێشکەشکردنی کار و پڕۆژە چاکسازیخوازەکانیدا. لە ڕێککەوتی (٢٠٠٢/٨/٢٥) توێژەر لە پەیامێکیدا بۆ برای بەڕێز د.فەتحی مەلکاوی –بەڕێوەبەری جێبەجێکاری پەیمانگاکە– ئەم پێشنیارانەی نووسیوە:

سەبارەت بەو پڕۆژانەی پێشنیار کراون و دەکرێت ئەنجام بدرێن بە هاوکاری لەگەڵ (ئیسیسکۆ) لە چەند ساڵی داهاتوودا، هەروەها لە پاش ڕاوێژکردن لەگەڵ برایانمان و ڕێکەوتنمان لەگەڵ د.عەبدولحەمید ئەبو سلێمان سەرۆکی ئێستایی

پـەیمانگا لەسـەر گرنگیـی ئـەو پرۆژانـە و شـیاوییان بـۆ جێبـەجێکردن، بـاس لـەم پرۆژانە دەکەین:

١- ئیسلامێتی **مەعریفە**: چەمك، خواست، بەربەستەکان، ڕوانین بۆ داهـاتوو، ئەم پرۆژەیەش لە ئێستادا لەلایەن د.نادیە و تیمەکەی بە ئەنجام دەگەن.

٢- **ڕۆشنبیریی و پەرەپێدان**: ئەمەش پرۆژەیەکە کـە لەسـەری کـۆ بوونـەوە لەگەڵ د.عەبدولحەمید ئەبو سلێمان ئەنجام درا و کۆمەڵەیەکی بچووك دروسـت کـرا بۆ گەشەپێدان و پێشکەشـکردنی ئـەم پرۆژەیـە، کـە پێـك هـاتووە لـە: پ.د.عـەلی جومعـە و پ.د.عەبـدولرەحمان نـەقیب و پ.د. رفعـەت عـەوەزی و پ.د. ئەحمـەد شەمسەددین حەجاجی.

٣- **پەروەردەی ئابووری**: سـەبارەت بـەم پرۆژەیـەش کۆبوونـەوە لەگـەڵ د. عەبدولحەمید ئەبو سلێمان ئەنجام درا، ڕاستەوخۆ لـەپاش کـۆنگرەی (پـەروەردەی ئابووری و پەرەسەندن لە ئیسلامدا) بۆ ئەوەی بیر لە پلانێك بکەنەوە بۆ کاراکردنی پەروەردەی ئابووری لەناو خەڵکدا. بۆ ئەم مەبەستەش کۆمەڵەیەکی بچووك دروست کرا بۆ کارکردن لەسەر ئەم پرۆژەیە، کە پێك هاتبوو لە: پ.د.عەلی جومعە و پ.د. عەبولرەحمان نەقیب و پ.د. رفعەت عەوەزی و پ.د. محەمەد عەبدولحەلیم عومەر.

٤- **پـەروەردەی ڕامیـاریی لـە ئیسـلامدا**، بـیردۆز و پراکتیزەکـردن: ئـەم پرۆژەیـەش تـاوتوێی بنـەمادۆزیی ئیسـلامیی دەکـات بـۆ بابەتـە ڕامیارییـەکان لـە ئیسلامدا لەگـەڵ چـۆنیەتیی پراکتیزەکردنـی ئـەم جـۆرە پەروەردەیـە لـە دونیـایی هاوچەرخدا، میسر وەك نموونە، وە ئەم پرۆژەیـەش لەلایـەن پ.د. سـەید عومـەر و پ.د. سـەعید ئـەبو عـامودەوە پێشـکەش کـراوە و لەلایـەن د. عەبدولحەمیـد ئـەبو سلێمانەوە ڕەزامەندیی سەرەتایی لەسەر دراوە.

٥- **کەسایەتی ئیسلامیی،** بنەما دەروونییەکان بۆ پەرەپێدانی کەسایەتیی ئیسلامیی ئەرێنی (پۆزەتیڤ): ئەم پرۆژەیە لەلایەن هەردوو دکتۆر عەبدولحەلیم مەحمود و تەریف شەوقییەوە پێشکەش کراوە و لەلایەن د. عەبدولحەمید ئەبو سلێمان ڕەزامەندیی سەرەتایی لەسەر دراوە.

٦- لەپاش تەواوکردنی پەرتووکی (*أصول التربية الإسلامية*) کە پ.د. سەعید ئیسماعیل ئامادەی کردبوو، وای بە باش دەزانم پەیمانگای جیهانیی فکری ئیسلامیی بەردەوام بێت لە دەرکردنی زنجیرەی: ئیسلامێتی زانستە پەروەردەییەکان، ئەمەش لەبەر گرنگیی ئەم ئاڕاستەیە، هەروەها پێشنیاری پرۆژەیەك دەکەم بۆ بنەمادۆزیی ڕێبازی فەلسەفەی پەروەردەیی، ئەمەش لەبەر گرنگیی بابەتەکە و هەروەها گرنگیدان بە خوێندنی ئەم بابەتە لە زانکۆ عەرەبی و ئیسلامییەکاندا.

٧- دایەنگەی ئیسلامیی لە جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیدا، لێکۆڵینەوەیەکی وەسفی و ڕاستکەرەوە (تقويمية): لەبەر ئەوەی دایەنگەیەکی زۆر بوونی هەیە لە جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیدا، بۆیە پێویستە لێکۆڵینەوەی لەم جۆرەیان لەسەر ئەنجام بدرێت.

٨- خوێندنگە ئیسلامییەکان لە جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیدا، لێکۆڵینەوەیەکی وەسفیی ڕاستکەرەوە: خوێندنگەیەکی زۆری لەم شێوەیە هەیە لە ناوەوە و دەرەوەی جیهانیی ئیسلامیدا، بۆیە پێویستە لێکۆڵینەوەی لەم شێوەیە لەسەر ئەم جۆرە ئەزموونانە ئەنجام بدرێت.

٩- زانکۆ ئیسلامییەکان لە جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیدا، لێکۆڵینەوەیەکی وەسفیی ڕاستکەرەوە: هەر وەك زانکۆ تەقلیدییەکانی هاوشێوەی زانکۆی ئەزهەر و هەروەها ئەو زانکۆ پێشکەوتووانەی کە خاوەن ئاڕاستەیەکی ئیسلامین،

هاوشێوەی ئەم زانکۆیانەش زۆرن لە ناوەوە و دەرەوەی جیهانیی ئیسلامیدا، بۆیە پێویستە لێکۆڵینەوەی لەم شێوەیان لەسەر ئەنجام بدرێت.

١٠- وێنەکردنی پێشنیارێك (تەصەورێك) سەبارەت بە دایەنگە ئیسلامییەکان بەو شێوەی کە دەبێت بوونیان هەبێت: پێویستە چالاکوانانی بواری ئیسلامێتی مەعریفەی پەروەردەیی توانادار بن لەسەر پێشکەشکردنی ئەم وێنەیە (تەصەورە) بۆ ئەم جۆرە دایەنگانە، بە پێچەوانەوە ئەگەر نەیانتوانی ئەو وێنەیە پێشکەش بکەن نابێت لۆمەی ئەو کەسانە بکەن کە دەست بەسەر دایەنگە بەردەستە نائیسلامیەکاندا دەگرن.

١١- وێناکردنی پێشنیارێك سەبارەت بە خوێندنگە ئیسلامییەکان بەو شێوەی پێویستە بوونیان هەبێت: ئەمە ئەرکی ئەو کەسانەیە کە لە بواری ئیسلامێتی مەعریفەی پەروەردەییدا کار دەکەن و ئەگەریش نەیانتوانی بەم ئەرکە هەستن، ئەوا مافی ئەوەیان نییە لۆمەی ئەو کەسانە بکەن کە چاو لە جۆری خوێندنگە نائیسلامییەکان دەکەن.

١٢- وێناکردنی پێشنیارێك سەبارەت بە زانکۆ ئیسلامییەکان بەو شێوەی کە پێویستە بوونیان هەبێت: ئەمەش ئەرکی ئەو کەسانەیە کە لە بواری ئیسلامێتی مەعریفەی پەروەردەییدا کار دەکەن و ئەگەریش نەیانتوانی بەم ئەرکە هەستن، ئەوا مافی ئەوەیان نییە لۆمەی ئەو کەسانە بکەن ئەگەر هاتو لەسەر مۆدێلی کۆنی زانکۆکانیان بەردەوام بوون.

١٣- وێناکردنی پێشنیارێك سەبارەت بە پرۆگرامەکانی پەروەردەی ئیسلامیی بۆ ئەو کەمایەتییە ئیسلامییانەی کە بە زمانی عەرەبی نادوێن لە جیهاندا.

١٤- وێناکردنی پێشنیارێك سەبارەت بە پرۆگرامەکانی مێژووی ئیسلامیی بۆ ئەو کەمایەتییە ئیسلامییانەی کە بە زمانی عەرەبی نادوێن لە جیهاندا.

١٥- گوتنەوەی کۆمەڵێك وانـە دەربـارەی جـودایزم و کریسـتیانێتی لـە دونیـای هاوچـەرخدا (لـە خوێنـدنی زانکـۆ و پـێش زانکۆشـدا): ئەمـەش بـە مەبەسـتی سوودوەرگرتن لەو وانانە لە خوێندنی پەروەردەی ئیسلامیی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا.

١٦- ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە دەربارەی چالاکی و جموجووڵی موژدەبەخشە جوو و کریستیانەکان لە سەردەمی ئێسـتاماندا، هـەروەها چـۆنیەتیی ئامـادەکردنی ئـەو موژدەبەخشـانە: ئەمـەش بـە مەبەسـتی سـوودوەرگرتن لێیـان لـە ئامـادەکردنی بانگخوازی ئیسلامیی لە هەموو جیهاندا.

١٧- دانانی لێڤەگەری (المرجع)ی زانستە شەرعییەکان بۆ خوێندکارانی زانسـتە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکان: ئەمەش بە مەبەستی زیـاتر لێکنزیککردنـەوەی ئـەم دوو ڕۆشنبیریەتییە لە یەکتر.

١٨- دانـانی لێڤەگـەری (المرجـع)ی زانسـتە مرۆیـی و کۆمەڵایەتییـەکان بـۆ خوێندکارانی زانستە شەرعییەکان: ئەمەش بـە مەبەسـتی زیـاتر لێکنزیککردنـەوەی ئەم دوو ڕۆشنبیرێتییە لە یەکتر.

١٩- دانـانی لێڤەگـەری (المرجـع)ی زانسـتە سروشـتی و گەردوونییـەکان بـۆ خوێنکارانی زانستە شەرعی و مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکان، ئەمەش بە مەبەستی زیاتر لێکنزیککردنەوەی ئەم ڕۆشنبیرییانە لە یەکتر.

٢٠- لێڤەگەریدانان (المرجع) بۆ هـزری هاوچـەرخی ئـەورووپی بـۆ خوێنـدکارانی زانکۆ عەرەبی و ئیسلامییەکان: بۆ ناساندنی ئـەم هـزرە بـە شـێوەیەکی دروسـت و هەروەها چۆنیەتیی تێگەیشتن و مامەڵەکردن لەگەڵیدا.

٢١- هـزری ئیسـلامیی لـە سـەدەی بیسـتەمدا، لێکۆڵینەوەیـەکی ڕاسـتکەرەوە: دەستکەوتەکان، شکستەکان، ئەگەرەکان لە داهاتوودا.

٢٢– ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی داهاتووی ئیسلام لە بیست ساڵی داهاتوودا.

٢٣– ڕێبەری پەروەردەیی لە ڕوانگەیەکی ئیسلامییەوە تایبەت بە دایکان و باوکان.

٢٤– ڕێبەری پەروەردەیی تایبەت بە مامۆستایان لە ڕوانگەیەکی ئیسلامییەوە.

٢٥– بەستنی کۆنگرەی سەرکردە و شارەزایانی بزووتنەوە ئیسلامییە هاوچەرخەکان، بە مەبەستی ئاڵوگۆڕکردنی شارەزایی و بیروڕا لەم بارەیەوە، هەروەها دەرکردنی ڕوونکردنەوەیەك کە ئەرکەکانی ئوممەتی ئیسلامی تێدا دەستنیشان بکرێت بۆ قۆناغەکانی داهاتووی ئوممەت.

٢٦– دەرکردنی زنجیرەی: (کوڕی خۆم ئەمەیە جیهانیی ئیسلامیت) بۆ ئاشنابوون بە وڵاتەکانی جیهانیی ئیسلامیی و کەمایەتییە موسوڵمانەکان.

٢٧–زنجیرەی چیرۆکە ئەدەبییەکان: باشتر وایە ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکانە لەنێو جیهانیی ئیسلامیی و کەمایەتیەکانیدا بسووڕێنەوە بۆ ئەوەی ناساندن و ڕەنگدانەوەی بارودۆخی جیهانیی ئیسلامیی و کەمایەتییەکانی بێت.

٢٨–زنجیرەی: (خوێندن لە جیهانیی ئیسلامیی و کەمایەتییەکانیدا) ئەمەش بە مەبەستی ئاشنابوون بە سیستمەکانی خوێندن و هەروەها کێشەکانی و چۆنیەتیی چارەسەرکردنیان.

٢٩– بەرەو سیستمێکی فێرکاریی ئیسلامیی نێودەوڵەتی: تواناکان و ئامرازەکانی.

٣٠– کەلەپووری پەروەردەیی: پلانێك بۆ کۆکردنەوە و پۆلێنکردن و سوودوەرگرتن لە کەلەپووری پەروەردەیی.

# دەروازەیەك بۆ بنەماسازیی چەمکەکانی
# ( ئوممەت، ڕۆشنبیری، گەشە پێدان )[١]

## پێشەکی:

توێژینـــەوە و گفتوگـــۆ و لێکۆڵینـــەوەکانی ئـــەم بابەتـــە لـــەدەوری ســـێ چـــەمکی سەرەکی (ئوممەت، ڕۆشنبیری، گەشەپێدان) دەخولێنەوە. چەمکەکانیش بریتین لە کۆمەڵـە بیرۆکـە و دەسـتەواژەیەکی ڕووت، کـە پشـت بـە تایبەتمەنـدی و سـیفاتە هاوبەشـەکانی کۆمەڵـە شـتێك یـاخود ڕووداوگـەلێك دەبەسـتێت، کـاتێکیش ئـەم چەمکانە دەخرێنـە پـاڵ یـەك بـۆ ڕوونکردنـەوەی دیاردەیـەکی دیـاریکراو، ئـەوا بـە بـیردۆز نـاوزەد دەکرێـت[٢]. هەنـدێك توێـژەر جیـاوازی دەکـەن لـەنێوان چـەمك و پێناسەدا، دەڵێن چەمك بریتییـە لـە دەسـتەواژەیەك یـاخود هێمایـەك کـە زانایـانی

---

[١]– کۆنگرەی ئوممەت و قەیرانی ڕۆشنبیری و گەشەپێدان، بە هاوکاری لەگەڵ کۆلێژی ئابووری و زانسـتە سیاسییەکانی زانکۆی قاهیرە، پرۆگرامی گفتوگۆ لەنێوان ژیارەکاندا، قاهیرە (٦–٩ ی ئەیلولی ٢٠٠٤م).

[٢]– أركان أونجل: أساليب البحث العلمي، دراسة مفاهيم البحث لأخصائي العلوم الإجتماعيـة، ثريـة حسـن ياسين، محمد نجيب، معهد الإدارة العامة، إدارة البحوث، القاهرة، (١٩٨٣م)، (ص ١٧).

لۆجیك بەکاری دەهێنن بۆ ئاماژەکردن بەو مانایەی کە شتێك دەیگەیەنێت، لە کاتێکدا پێناسە بریتییە لە شیکردنەوەی پێکهاتە و تایبەتمەندی و یەکەکانی ئەو شتە، بەڵام هەندێکی تر لە توێژەران جیاوازی لەنێوان چەمك و پێناسەدا ناکەن و بە دوو ڕووی یەك دراوی دەزانن[1].

هەروەها چەمك و پێناسە ئەو دەستەواژانەن کە بەکار دەهێنرێن لە داڕشتنی گریمانە بیردۆزەییەکاندا بە شێوەیەکی ڕاسەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ، پاشان ئاراستەی توێژینەوە دیاری دەکەن، ڕەنگە زۆرێك لەو جیاوازییانەی کە لە میتۆدەکانی توێژینەوەکاندا (Paradigms) بەدی دەکرێن هۆکارەکەی بگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی ئەو چەمکانەی کە تێیدا بەکار هێنراون، هەر بۆیە زۆرێك لە توێژەران هۆشداری دەدەن سەبارەت بە بەکارهێنانی ئەو چەمکانەی کە لە دەرەوە بۆمان هەنارده دەکرێن پێش ئەوەی بەباشی دڵنیا ببینەوە لە دروستی و سەلامەتیی ئەو چەمکانە لە ڕوانگەی ئیسلامیی پیرۆزەوە.

هەروەها زۆرێك لە توێژەران سەرنجمان ڕادەکێشن بەلای ئەو مەترسییە زۆرەی لە بەکارهێنانی چەمکە هەناردەکراوەکاندا هەن، چونکە ئەگەر هەوڵی شیکردنەوەی ئەو بیرۆکە و فەلسەفە نامۆ و ناتەواوانە بدەین کە خۆیان لە ناوەڕۆکی ئەو چەمکانەدا مەڵاس داوە، دەبینین کەم تا زۆر دژیەکن لەگەڵ فەلسەفەی ڕەسەنی ئیسلامیدا، هەروەها ئەگەر بزانین ئەم چەمکانە بەو هەموو واتا نامۆیانەوە چۆن کاریگەری لەسەر توێژینەوە مرۆییەکانمان دروست دەکەن، ئەوکاتە دەرکمان دەکرد بەو مەترسییانەی کە خۆیان دەبیننەوە لە باڵکێشانی ئەم چەمکانە بەسەر توێژینەوە زانستییەکانماندا.

---

[1]– علي ليلة: ((المفاهيم ومشكلة التعريف)) في تصميم البحوث في العلوم الإجتماعية، مركز الدراسات والبحوث السياسية، جامعة القاهرة، (١٩٩٢م)، (ص ٢٢–٣٠).

ئەگەر سەیری هەڵوێستی توێژەرانمان بکەین لەمەڕ ئەم چەمکانەوە، دەبینین بوون بە سێ بەشەوە: بەشێکیان ورد و درشتیی ئەم چەمکانە ڕەت دەکەنەوە و بە گومڕاکەری دەزانن و تەنها چەمك و دەستەواژە ئیسلامیی و کەلەپوورییەکان بەکار دەهێنن. بەشێکی تریان ئەم چەمکە ڕۆژئاواییانە وەر دەگرن، بەڵام بە ناوەڕۆکێکی ئیسلامییەوە بەکاریان دێنن. بەشی سێیەمیان ئەم چەمکە هەناردەکراوانە بەکار دەهێنن بێ ئەوەی لەگەڵ چەمکە ئیسلامییەکاندا تێکەڵیان بکەن، ئەمەش بە مەبەستی دروستکردنی پردێك بۆ گفتوگۆ لەگەڵ ئەو ڕۆشنبیرانەی کە لەگەڵ بەکارهێنانی ئەو چەمکانەدا ڕاهاتوون. ئامانجیش لەم کارەیان بەکارهێنانی چەمکە ئیسلامییەکانە و وردە وردە دوورکەوتنەوەیە لە چەمکە بیانییەکان[1].

بە هەر جۆرێك بێت دانان و دیاریکردنی چەمکی گونجاو بۆ هەموو بوارەکانی زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکان کارێکی زۆر پێویستە هەم لەڕووی زانستییەوە و هەم لەڕووی ئیسلامییەوە، پێویستییەکی زانستییە بۆ ئەوەی بتوانین ئەو چەمکانە بە شێوەیەکی زانستی و گونجاو بەکار بهێنین و بتوانین زانستە کۆمەڵایەتییەکانمانی لەسەر بنیات بنێین، هەروەها پێویستییەکی ئیسلامییە بۆ ئەوەی ئەو چەمکانە لە ڕێڕەوی کەلەپووری ئایینی و ژیاریمان لا نەدەن، هەروەها د. سەیف دەڵێت: پێویستە لە کاتی دانانی بناغەی چەمکە کۆمەڵایەتییەکانماندا ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەین:

- گرنگیدان بە زیندووکردنەوەی ئەو چەمکانەی کە لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر) هاتوون، هەروەها هەوڵی ئەوە بدرێت

[1]– سيف الدين عبد الفتاح إسماعيل: في النظرية السياسية من منظور إسلامي، منهجية التجديد السياسي وخبرة الواقع العربي المعاصر، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، القاهرة، سلسلة الرسائل الجامعية (٢٥) (١٩٩٨م)، (ص ١٥٩).

زۆرتــرین چــەمکیان لێــوە هــەڵبهێنجرێن، هــەر وەکــو چــەمکەکانی: ڕاوێــژکردن و فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری لە خراپە.

- بایەخدان بە بەکارهێنانی زمانی عەرەبی لە کاتی داڕشتنی ئەو چەمکانەدا.
- هــەوڵ بــدرێت ســوود لــە ئــەزموونی مێــژووی ئیســلام وەر بگیرێــت لــە دیاریکردنی چەمکەکاندا.
- نابێت ئەو چەمکانە دژ بن لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامیدا[١].

گومـان لـەوەدا نییـە ئـەو هەوڵانـەی بەخـەرج دراون لـەپێناو دانـانی میتـۆدێکی زانستی تـا بتـوانین لەڕێیـەوە بنـەمادۆزی بـۆ چـەمکە کۆمەڵایەتییـەکانمان بکـەین، هەمووی دەرئەنجامی خەمخۆری و بایەخدان بـووە بـە بنـەمادۆزیی ئـەم چـەمکانە، ئەم میتۆدەش دەوەستێتە سەر ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانەی خوارەوە:

١- پێناسەکردنی چەمك لە زماندا (بەپێی فەرهەنگەکان).

٢- پێناسەکردنی چەمك لە قورئانی پیرۆزدا.

٣- پێناسەکردنی چەمك لە سوننەتی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر).

٤- پێناسەکردنی چەمك لە ئەزموونی ئیسلامیی و پراکتیزەکانی لە سەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر).

٥- پێناسەکردنی چەمك لە پەرتووکەکانی کەلـەپووری ئیسـلامیی و هـەروەها بەو شێوەی کە زانایانی ئیسلام پێشتر بەکاریان هێناوە.

٦- پێناسەکردنی چەمك لە پەرتووکی عەرەبی و ڕۆژئاوایی هاوچەرخدا.

٧- بەدواداچوونی مێژووی چەمك و پەرەسەندنی واتاداریی چـەمك و هـەروەها دیاریکردنی واتاکەی و پێگەکـەی لـە (منظومـة)ی ئـەو چـەمکانەی تـر کـە پێـوەی پەیوەستن[١].

---

[١]- هەمان سەرچاوە (ص ١٥٢-٢٢٠).

بەڕاستی بەهۆی پەیدابوونی کۆمپیوتەرەوە ئاسانکاریی زۆر بۆ توێژەران کراوە، تاوەکو بتوانن بنەمادۆزی بۆ چەمکە کۆمەڵایەتییەکان بکەن، کە ئەمەش خزمەتێکی زۆری کردووە بەو لێکۆڵینەوانەی لە قورئان و سوننەتدا ئەنجام دەدرێن. چونکە توێژەر لەڕێی دیسکێکەوە دەربارەی قورئان و ڕاڤەکانی دەتوانێت هەموو ئەو ئایەتانە دیاری بکات کە ئەو چەمکەی تێدا هاتووە کە توێژەر لەبارەیەوەی دەکۆڵێتەوە، هەروەها دەتوانێت هەموو ئەو چەمکە لاوەکییانەش دەستنیشان بکات کە بە بابەتەکەیەوە پەیوەستن، هەروەها دەتوانێت ڕاڤەی ئەو ئایەتانەش بەئاسانی دەست بخات لە (تفسیر ابن كثیر، القرطبي، الجلالین... هتد) و هەموو ئەمانەش تەنها لەڕێی دیسکێکەوە، هەمان شت سەبارەت بە فەرموودە کە توێژەر لەڕێی دیسکێکەوە لەسەر زانیارینامەی فەرموودە دەتوانێت ئەو چەمکەی کە مەبەستیەتی و ئەوەشی پێوەی پەیوەستە لە هەموو پەرتووکەکانی فەرموودەدا دەستنیشان بکات، هەر وەك (صحیح البخاري، صحیح مسلم، سنن أبي داود، سنن الترمذي، سنن النسائي، سنن ابن ماجە، سنن الدارمي، موطأ مالك، مسند أحمد) هەروەها ڕاڤەی فەرموودەکانیش دەست بخات.

بە هەمان شێوە کەلەپووری ئیسلامییش لەم بوارەدا پێویستی بەم خزمەتە هەیە بۆ ئەوەی توێژەران زانیاری پەیدا بکەن دەربارەی چۆنیەتیی بەکارهێنانی ئەو چەمکانە بەپێی سەردەمە جیاوازەکان و هەروەها لە پەرتووکە ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابووری و پەروەردەییەکان و... هتد لە پەرتووکەکانی کەلەپووری ئیسلامیدا، هەروەها بە گرنگیی دەزانم ئاماژە بە چەند هەوڵێك بدەم کە لەم

[١]– سەبارەت بەو هەنگاوانە و جێبەجێکردنەکانیان بگەڕێرەوە بۆ لێکۆڵینەوەکەی بدریة صالح المیمان: نحو تأصیل إسلامي لمفهوم التربية وأهدافها، دراسة في التأصيل الإسلامي للمفاهيم، رسالة ماجستير، كلية التربية، جامعة الملك عبد العزيز بالمدينة المنورة، منشورة، دار عالم الكتب، الرياض، السعودية، (٢٠٠٢م).

مەیدانەدا دراون، یەکێکیان ئەو لێکۆڵینەوە بوو کە پەیمانگای جیهانیی فکری ئیسلامیی لە دوو بەرگدا بڵاوی کردەوە لەژێر ناونیشانی ((بناء المفاهيم دراسة معرفية و نماذج تطبيقية))[1]. ئەم کارەش چاوەڕوانیی ئەوەی لێ دەکرا ئەڵقەی یەکەم بێت لە چوارچێوەی پڕۆژەیەکی گەورەدا بۆ دانانی بناغەی چەمکە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، بەلام بەداخەوە ئەم پڕۆژەیە نەتوانرا درێژەی پێ بدرێت و کۆتایی پێ هێنرا. یەکێکی تر لەو هەولانە لێکۆڵینەوەی خوێندکار (بدرية صالح الميمان) بوو لەژێر ناونیشانی ((نحو تأصيل إسلامي لمفهوم التربية و أهدافها، دراسة في التأصيل الإسلامي للمفاهيم))[2]، ئەمانە و چەند لێکۆڵینەوەیەکی تریش کە گرنگییان بە بنەمادۆزیی چەمکە کۆمەڵایەتییەکان داوە[3].

شتێکی سروشتییە ئەگەر لێرەدا هەوڵی جێبەجێکردنی میتۆدی بنەمادۆزی بۆ چەمکەکان نەدەین بە ڕەچاوکردنی هەموو ئەو حەوت خاڵەی کە باسمان لێوە کرد لە چوارچێوەی ئەم توێژینەوە کورت و سنووردارەدا، بەلام بە لایەنی کەمەوە ئاماژە بە گرنگترین ئەو واتایانە دەدەین کە پێویستە لەو چەمکانەدا و لە هۆشی

---

[1]– إبراهيم العيسوي غانم وآخرون: بناء المفاهيم: دراسة معرفية و نماذجة تطبيقية، جزءان، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، القاهرة، (١٩٩٨م).

[2]– بدرية صالح الميمان: نحو تأصيل إسلامي لمفهوم التربية وأهدافها: دراسة في التأصيل الإسلامي للمفاهيم، سەرچاوەیەکی پێشوو.

[3]– زكي ميلاد: الجامع والجامعة والجماعة، دراسة في المكونات المفاهيمية والتكامل المعرفي، سلسلة المفاهيم والمصطلحات (٥)، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، القاهرة، (١٩٩٨م).

– عوض زيد الكيلاني: مفاهيم الحق والحرية في الإسلام والفقه الوضعي: دراسة مقارنة دار النشر عمان، الأردن، (١٩٨٨م)، محمد عزيز الحبابي: مفاهيم منهجية في الفكر العربي المعاصر، دار المعارف، (١٩٩٠م). لێکۆڵینەوەی تریش.

موسـولمانانـدا ئامـادە بـن، كـە زۆر جيـاوازن لـەو واتاداريانـەی كـە لـە چـەمكە ڕۆژئاواييەكاندا بوونيان هەيە، چونكە واتاداريی ئيسلاميی لـە كەلـەپووری ڕەسـەنی ئيسلاميی و هەروەها فەلسەفەی ئيسلاميی سەبارەت بە مرۆڤ و گەردوون و مەعريفە و ڕەوشـتەوە سەرچـاوە دەگرێـت، ئەمـەش بەدڵنياييـەوە جيـاوازيی زۆرە لەگـەڵ فەلسەفەی ڕۆژئاواييدا.

## يەكەم: چەمكی ئوممەت:

سەرەتا بە چەمكی ئوممەت دەست پێ دەكەين، چـونكە گـرنگترين چـەمكە بـۆ ئـەوەی لـەم كۆنگرەيـەدا باسـی لـێ بكريـت، دەسـتەواژەی (الأمّـة) لـەڕووی زمانەوانييەوە واتە: سەدەيەك لە خەڵكی، هەر وەك دەگوترێت: چـەند ئوممەتيـەك تێپەڕين، واتە چەند سەدەيەك تێپەڕين، هەروەها ئوممـەتی هـەر پێغەمبـەرێك ئـەو خەڵكـە دەگرێتـەوە كـە ئـەو پێغەمبـەرەيان بـۆ ڕەوانـە كـراوە بـە بـڕوادار و بێباوەڕيانـەوە، هـەروەها وتـراوە ئوممـەت بـە مانـای نەوەيـەك يـاخود ڕەگـەزێكی دياريكراو دێت لەناو جۆرەكانی زيندەوەراندا.

لـەڕووی زاراوەوە: كۆمەڵـە كەسـێكی ديـاريكراون كـە لـە چـەند خاسـيەتێكی بۆماوەييـدا و هـەروەها بەرژەوەنـدی و هيـوا و ئاواتـدا هاوبەشـن، يـاخود خـاڵێكی هاوبەشی وەك ئاين ياخود شوێن ياخود كات كۆيان دەكاتەوە، جا گرنگ نييـە ئـەو خاڵە هابەشە بە ويست و هەڵبژاردنی خۆيان بێت ياخود نا[1]. دەگوترێت ئوممـەتی ئەمريكی و ئوممـەتی ئـەڵمانی يـاخود دەگوترێت ئوممـەتی ئيسـلاميی و ئوممـەتی يەهودی. مەبەستمان لە نموونەی يەكەم ئەو پێكهاتانەن كە لەسەر بنـەمای ڕەگـەز

---

[1]– علي جمعة محمد (محرر): الموسوعة الإسلامية العامـة، المجلـس الأعلـى للشـؤون الإسـلامية، القـاهرة، (٢٠٠١م).

یـاخود بەرژەوەنـدی یـاخود هیـوا و ئـاواتی هاوبـەش دامـەزراون، هـەروەها مەبەستیشـمان لـە نموونـەی دووەم ئـەو پێکهاتانـەن کـە لەسـەر بنـەمای ئـایین و بیروبـاوەڕی هاوبـەش دامـەزراون، کـە ئـەم نموونەیـە ڕێگـری ناکـات لـە بـوونی خاسیەتەکانی ڕەگەز و بەرژەوەندی و هیوا و ئاواتی هاوبەش لەنێو پێکهاتەکەیدا.

بەڵام ئیسلام بانگەواز بۆ کۆمەڵێك پەیوەندی دەکـات تـاکو خـەڵك لەسـەری کـۆ ببێتـەوە، کـە زۆر گشـتگیرترن، هـەروەها سـەرنجمان بـەلای کۆمـەڵێك بازنـەدا ڕادەکێشێت کە زۆر لەوانی تـر فـراوانترن، کـە بازنـەی یەکـەم فـراوانترین بازنەیـە و هەموو مرۆڤایەتی لەخۆ دەگرێت، ئەویش بریتییـە لـە بازنـەی یـەکبوونی ئوممـەتی مرۆڤایەتی، کە خۆی لە بوونی ڕەچەڵەکیکی هاوبەشدا دەبینێتەوە و بە نێر و مێوە تێیـدا هاوبەشـن هـەر وەکـو خـودای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً﴾{البقرە ٢١٣} واتـە: ((لـە سـەرەتادا خـەڵکی یـەك ئوممـەت بـوون)). ئـەم ئایەتەش باس لەوە دەکات کە مرۆڤایەتی لە بنەڕەتدا هەمووی یەك ئوممەت بوون، لەسەر ڕاستی کۆك بوون، پاشان جیا بوونەوە و جیاوازی کەوتۆتە نێوانیان بـەهۆی ئیرەییبردن بە یەکتر و ستەمکردن لەیەکدی، لێرەوە گرنگیی پەیامە ئاسمانییـەکان و پێغەمبـەران دەر دەکـەوێت کـە خـۆی دەبینێتـەوە لـە ڕێنـوێنیکردنی خـەڵك و هەروەها جیاکردنەوەی باش و خراپی کردار و گوفتارەکان لەیەکدی.

لەپاش ناردنی پێغەمبەران، قورئانی پیرۆز باس لە ئوممەتی ئیمانـداران دەکـات لەبەرامبـەر ئوممـەتی کافرانـدا، قورئـانی پیرۆزیـش زۆر تیشـك دەخاتـە سـەر ئـەو ئوممەتەی کە بە ئوممەتێکی یـەکبوو وەسـف دەکرێـت، یـەکبووە لـە گوێڕایـەڵی و پـەرستنی خودا، هەر وەکو خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ﴾{الأنبياء ٩٢} واتە: ((بەڕاستی ئا ئەمەیـە ئـایینی ئێـوە کـە یـەك ئایینـە (ئـایینی هـەموو پێغەمبـەران) منـیش پـەروەردگارتانم، کەواتـە تـەنها مـن

ببپەرستن)). هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ هَـٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ﴾{المؤمنون ٥٢} واتە: ((هەر ئەمەشە ئایین و بەرنامەی تاك و تەنهای ئێوە و من پەروەردگارتانم بۆیە پارێزگار بن و خۆتان لە نافەرمانیی من بپارێزن)) لێرەدا مەبەست لە یەك ئوممەت: ئوممەتی پێغەمبەرانە، ئوممەتی باوەڕدار بە خودا بەرامبەرەکەی ئوممەتی بێباوەڕانە، کە دژ بە بەرنامەی خودا کار دەکەن و ملکەچ و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی نابن.

پاش کۆتاییهاتنی زنجیرەی پێغەمبەران بە پێغەمبەری ئازیزمان محمد (دروودی خوای لەسەر)، زاراوەی ئوممەتی ئیسلامیی سەری هەڵدا، ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە باوەڕیان بە الله هێناوە وەك خودای خۆیان و باوەڕیان بە پێغەمبەر محەمەد هێناوە وەك پێغەمبەر و دوایین نێردراو و هەروەها باوەڕیان بە قورئانی پیرۆز هێناوە وەك سرووشی خودا و ڕێنیشاندەری هەموو مرۆڤایەتی[١].

ئەم ئوممەتەش یەك یەکە دەنوێنێت و نادرێتە پاڵ هیچ نازناو یاخود شوێنێك، بەڵکو تەنها دەدرێتە پاڵ بیروباوەڕێکی ئیلاهی و بانگەواز بۆ تێکڕای مرۆڤایەتی، هەر بۆیە لەڕووی شەرعەوە وا پێویست دەکات لەسەر موسوڵمانان هاوشێوەی بینایەکی پتەو بن و یەکتر بەهێز بکەن، هەروەها پێویستە هاوشێوەی ئەو جەستەیە بن کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) لەبارەیەوە دەفەرموێت: ((مثل المسلمين في توادهم وتراحمهم كمثل الجسد الواحد إذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الأعضاء بالحمى والسهر))[٢]، واتە: (نموونەی موسوڵمانان لەڕووی هاوسۆزی خۆشەویستییان بۆ یەکتری، وەکو نموونەی ئەو جەستەیە وایە ئەگەر هاتو

---

[١]– لەوەدا بڕوانە: أحمد حسين: الأمة الإنسانية، المطبعة العالمية، القاهرة، (١٩٦٦م)، محمد فتحي عثمان: دولة الفكرة التي أقامها رسول الإسلام عقب الهجرة، مكتبة وهبة، القاهرة، بدون.

[٢]– أخرجه الشيخان.

ئەندامێکی ئازار بچێژێت ئەوا تێکڕای ئەندامەکانی ئەو جەستەیە لەگەڵیدا تایان لێدێت و تووشی شەونخوونی دەبن).

بۆیە لەڕووی شەرعەوە پێویست کراوە لەسەر ئوممەتی ئیسلامیی ئیسلام وەك خۆی جێبەجێ بکات و بە دانایی و گوتەی جوان بانگەوازی بۆ بکەن، بەو شێوازەی خودای گەورە داوامان لێ دەکات و بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزانە: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾{الأنبياء: ١٠٧} واتە: ((ئەی موحەمەد تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردووە تا ببیتە ڕەحمەت بۆ جیهانیان)). هەروەها ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ كَافَّةً لِلنَّاسِ﴾{سبأ: ٢٨} واتە: ((ئێمە تۆمان بۆ هەموو خەڵکی ناردووە)) و ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾{الصف: ٩} واتە: ((خودا ئەو زاتەیە کە پێغەمبەری خۆی ناردووە بە ڕێنموونی و ئایینێکی ڕاست و دروستەوە، تا بەسەر هەموو ئایینێکدا سەری بخات، هەرچەندە هاوبەشپەیداکەرانیش پێیان ناخۆش بێت)). هەروەها ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمْ الإِسْلامَ دِينًا﴾{المائدة: ٣} واتە: ((ئەمڕۆ ئایینەکەتانم تەواو کردووە بۆتان و چاکە و بەهرەی خۆم بەتەواوی ڕشتووە بەسەرتاندا و ڕازی بووم کە ئیسلام ئایینتان بێت)). وە هەروەها ﴿مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ﴾{الأحزاب: ٤٠} واتە: ((موحەمەد باوکی هیچ یەك لە پیاوەکانتان نییە، بەڵکو ئەو نێردراوی خودا و کۆتاهەمینی پێغەمبەرانە)).

لەمیانەی کۆتا پەیامدا –لە بەرجەستەکردن و بانگەوازدا– ئوممەتی ئیسلامیی سەری هەڵدا کە ئیسلام وەك خۆی جێبەجێ دەکەن و بانگەوازەکەی بە هەموو جیهان دەگەیەنن، بەمەش ئوممەتی ئیسلامیی دەبێتە ئوممەتی مامناوەند و پێشەنگ و هەروەها گەواهیدەر لەسەر هەموو مرۆڤایەتی، هەر وەکو خودای گەورە

دەفەرمویت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾{البقرة: ١٤٣} واتە: ((بەو شێوەش ئێوەمان بە گەلێکی میانڕەو گێڕاوە تا ببنە شایەت بەسەر خەڵکییەوە و پێغەمبەریش لەسەر ئێوە شایەتی بدات)). وە لەبارەی مامناوەندبوونی ئوممەتی ئیسلامییەوە، دکتۆرە مونی ئەبولفەزل دەڵێت: "ئوممەتی ئیسلامیی ئوممەتێکی مامناوەندە لەبەر ئەم هۆکارانە:

یەکەم: چونکە ئەم ئوممەتە چەقی کۆکردنەوە و ڕاکێشانی موسوڵمانانی هەموو جیهانە بەلای خۆیدا و هەروەها سەرچاوەی گونجان و هاوسەنگی نێو گرۆی مرۆڤایەتییە.

دووەم: ئوممەتێکی ناوەندە، چونکە هاوسەنگی لەنێوان زیادەڕۆیی و کەمتەرخەمیدا ڕادەگرێت (الإفراط والتفريط).

سێیەم: ئوممەتێکی مامناوەندە بەهۆی ئەو بەها و سیستمانەی لەسەری بەندە.

چوارەم: ئوممەتیەکی ناوەندە بەهۆی ئەو پێگە جوگرافییەی لە جیهاندا هەیەتی"[١].

لەبەر ئەوەی ئیسلام دواپەیامە و کۆکەرەوەی زانست و شارەزایی پەیامەکانی پێش خۆیەتی، هەر بۆیە خودای گەورە کتێبەکەی لە هەموو گۆڕانکاری و دەستکاریکردنێك پاراستووە، بە شێوەیەك قورئانی پیرۆز هەم لەڕووی جێگیربوونیەوە و هەم لەڕووی ڕاستگۆییەوە چ لە ئێستادا یاخود لە سەردەمانی پێش خۆماندا هیچ گومانێك هەڵناگرێت و بەڕاستی و بەو شێوەی کە یەکەم جار بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دابەزی ماوەتەوە، بە پێچەوانەی

[١]– منى عبد المنعم أبو الفضل: الأمة القطب نحو تأصيل منهاجي لمفهوم الأمة في الإسلام، سلسلة قضايا الفكر الإسلامي (١٤)، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، القاهرة، (١٩٦٦م)، (ص ٤٥، ٤٦).

پەیامەکانی پێش خۆی کە هـەموویان دەسـتکاری کـراون و گۆڕانکارییـان بەسـەردا هاتووە، هەر بۆیە فەرمان بە کۆتا ئوممەت، کە ئوممەتی ئیسلامە، کراوە، تـا ببنـە هەڵگری بانگەوازی ئیسلام و هەروەها فەرمان بە چـاکە بکـەن و ڕێگـری لـە خراپـە بکەن و باوەڕ بـە خـودای گـەورە بهێـنن، هـەر وەکـو خـودای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾{آل عمران: ١١٠} واتە: ((بەڕاستی ئێـوە چـاکترین ئوممـەتێکن کـە بـۆ خـەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بە چاکە دەدەن و قەدەغەی خراپە دەکەن و باوەڕ دەهێنن بە خودا)).

مێژوو گەواهیدەرە لەسـەر ئـەوەی ئوممـەتی ئیسـلامیی توانیویـەتی بـە ئـەرکی خۆی هەڵبسـتێت لـە هـەڵگرتنی ئـەم سـپاردەیە لـە هـەردوو ڕووی جێبـەجێکردن و بانگەوازکردن بۆی، هەروەها توانیویەتی ژیارێکی درەوشاوە بنیات بنێت کە هەموو مرۆڤایەتی لە بەها جوانەکانی وەك: (دادپەروەریی و یەکسانیی و ئازادیی و زانسـت و ڕەوشـتی بـەرز) سـوودمەند بـن، ئەمـەش تـەواو پێچـەوانەی ژیـاریی هاوچـەرخی ڕۆژئاوایە، کە هەموو مرۆڤایەتی بەدەست هێـز و ملـهوڕی و نایەکسـانی و ڕووخـانی بەها و ڕەوشتەکانی ئەم ژیارەوە دەناڵێنن. ئـەم ژیـارەش ئێسـتا ئەوپـەڕی هێـز و ملهوڕی و هەروەها دووفاقێتی بەخۆوە دەبینێت لە پێوەرەکانیدا، لەگەڵ جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیشدا بەم ملهوڕی و دووفاقیی و خۆسەپێنییە مامەڵە دەکات.

کاتێك باس لە یەکبوونی ئوممەتی ئیسلامیی دەکرێت، بەو مانایە نایەت کە ئـەو گەلانەی ئوممەتی ئیسلامییان پێك هێناوە تەواو لـەناو ئـەم ئوممەتـەدا بتوێنـەوە و تایبەتمەندی و سیفەتە جیاکـەرەوەکانی تایبـەت بـە خۆیـان لەدەسـت بـدەن، ئـەو جیاوازیانەشـی کـە لـەنێوان گـەلانی ئوممـەتی ئیسـلامیدا بوونیـان هەیـە پێویسـتە جیاوازیی هەمەجۆری بێت نەك دژیـەکی، ئـەم جـۆرە جیاوازییانـەش هێـز و جـوانی

دەبەخشنە ئوممەتی ئیسلامیی لە چوارچێوەی بنەما گشتییەکانی ئیسلامدا، بەڵکو ئەم جیاوازییە ڕۆڵی مێژوویی بە هەریەك لەو گەلانە دەبەخشێت کە ئوممەتی ئیسلامییان پێك هێناوە، بۆ ئەوەی بەشدار بن لە هەستانەوەی ژیاریی ئیسلامیدا، بە جۆرێك دەتوانین باس لە ڕۆڵی عەرەب و تورك و فارس و... هتد بکەین لە هەستانەوەی ئوممەتدا.

لە ئێستادا سەرەڕای ئەو سات و بارودۆخە سەختانەی کە ئوممەتی ئیسلامیی پێدا تێپەڕ دەبێت، سەرەڕای تووشبونی بە نەهامەتی و لاوازی و نەمانی یەکڕیزیی موسوڵمانان و پاشکۆیەتیی ئابووری و ڕۆشنبیری، سەرەڕای دەستدرێژییە تراژیدیاکانی زلهێزترین وڵات و هاوپەیمانەکەی لە جیهاندا (ئەمریکا و ئیسرائیل)، کەچی هێشتا ئوممەتی ئیسلامیی وەك کۆمەڵەیەکی ژیاریی توانای خۆگونجاندن و بەردەوامبوونی لەدەست نەداوە، بۆ سەلماندنی ئەمەش تەنیا ئاماژەکردن بۆ یەکبوونی بیروباوەڕ و پەرستش و سیستم و ڕەوشت بەسە، ئەگەر چەوساندنەوەی هێزە نێوخۆیی و پلانگێڕییە دەرەکییەکان نەبوونایە دژ بە فراوانبوونی میللی ئیسلامی، پەیوەندییەکان بەهێزتر دەبوون، سەرەڕای هەبوونی ئەم پاڵەپەستۆ نێوخۆیی و دەرەکییانە، تا ئێستاش گەلانی ئوممەتی ئیسلامیی توانیویانە پەیوەندیی نێوانیان بپارێزن، زۆر بەهێزتر لەو هەموو پلانگێڕییانەی لە بەرامبەریان ئەنجام دەدرێت، بە هەمان شێوە فاکتەرەکانی گونجان و لێکنزیکبوونەوە لەنێویاندا بپارێزن و پەرەی پێ بدەن[1]. ئەگەر وا نەبێت چۆن دەتوانین لێکدانەوە بۆ تووڕەبوون و کاردانەوەی گەلانی موسوڵمانان بکەین لەبەرامبەر ئەو تاوان و ستەمکاریانەی کە ئەمریکا و ئیسرائیل دژ بە موسوڵمانانی فەلەستین و عێراق و ئەفغانستان ئەنجامی دەدەن؟

---

[1]- منی عبد المنعم أبو الفضل: الأمة القطب، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ١٦-٢٢).

مانەوەی ئەو پەیوەندییە بە شێوەیەکی بەردەوام لەنێوان گەلانی ئوممەتی ئیسلامیی سەرەڕای جیاوازییان لەڕووی ڕەگەز و زمانەوە بە دیاردەیەکی ژیاریی و ڕۆشنبری و ڕامیاری هەژمار دەکرێت، هەروەها تاکی موسوڵمان لە دڵسۆزیدا بۆ ئوممەتی ئیسلامیی بەردەوامە لەپاڵ ئەو دڵسۆزییەی کە بۆ نیشتیمان و خەڵکی خۆی و هەندێك جار بۆ جیهانگەریی ڕۆژئاواشدا هەیەتی، هەر بۆیە ئەرکی زانا و بیرمەندەکانی بوارەکانی زانستە مرۆیی و ڕامیاری و پەروەردەییەکانە هەستن بە لێکۆڵینەوە لەم دیاردەیە: دیاردەی دڵسۆزبوون بۆ ئوممەتی ئیسلامیی، هەروەهافاکتەرەکانی بەهێزی و لاوازیی ئەم دڵسۆزییە، هەروەها چۆن دەتوانرێت وا بکرێت پەیوەندیی تاکەکانی ئوممەتی ئیسلامیی بەهێزتر و پتەوتر بکرێت[1]. چۆن دەتوانرێت ئەم دیاردە ئیسلامییە کارا بکرێت بەرامبەر بە ستەمکاریی ئەمریکیی ئیسرائیلی، هەروەها چۆن بتوانرێت ئەم دیاردەیە لە بەرژەوەندیی عەرەب و موسوڵمانان و بەڵکو هەموو مرۆڤایەتیدا بەکار بهێنرێت بۆ ئەوەی بیانپارێزیت لە هێزی ڕووخێنەری ئەمریکیی ئیسرائیلی[2].

کۆتایی ئەم بەشە بە وتەیەکی (طارق البشري) دەهێنین، کە تێیدا باس لەو مەودا فراوانە دەکات لەنێوان هەستکردن بە یەکبوونی ئوممەتی ئیسلامیی و ئەو ڕەفتارەی کە پێویستە وەر بگێڕدرێتە سەری و چەندە پێویستمان بە ڕەنگدانەوەی ئەم هەستەیە لە ئاکارەکانماندا، دەڵێت: "لەگەڵ ئەوەی ئێمەی گەلانی موسوڵمان دەزانین کە خاوەن یەك بیروباوەڕ و ژیار و مێژوو و پێکهاتەی دەروونیی لێکچووین

---

[1]– لەوەدا بگەڕێرەوە بۆ: عبد الرحمن النقيب: تعارض الولاء في التعليم المصري في الفترة من (١٨٨٢–١٩٧٠م) دراسة حالة، في بحوث التربية الإسلامية، (٣/٨٩–١١٠)، دار الفكر العربي، (١٩٨٧م).

[2]– لەوەدا بگەڕێرەوە بۆ: عبد الرحمن النقيب: ((التربية الإسلامية والنظام العالمي الجديد)) عودة إلى البحث في التربية الإسلامية والنظام العالمي الجديد في ((التربية الإسلامية المعاصرة في مواجهة النظام العالمي الجديد))، دار الفكر العربي، (١٩٧٧م)، (ص ٩–٤٤).

و هەروەها دەزانین خاڵێکی گشتیی هاوبەش کۆمان دەکاتەوە، کە بریتییە لە ڕیشەکێشکردن و داگیرکاریی جیهانی لەسەر دەستی وڵاتە زلهێزەکان، هەروەها ڕق و کینەی هاوبەش دژ بە داگیرکاریی ڕۆژئاوا و سیاسەتەکانی و هەستکردنمان بە چارەنووسی هاوبەش، سەرەڕای هەموو ئەم خاڵە هاوبەشانەش تا ئێستا بەوردی لامان ڕوون نییە چۆن و لەسەر چ بنەمایەك دەبێت لەنێو یەكدا مامەڵە بکەین و ئەو چالاکی و ئەرکانە چین کە پێویستە ئەنجامیان بدەین لەپێناو هەستانەوە و بەرگری"[1]. پرسیارەکەش لێرەدا ئەوەیە ئایا بیرمەند و زانایانی ئوممەتی ئیسلامیی دەتوانن بمانگەیەنن بەو ڕێگا و ئامرازانەی لەڕێیانەوە بتوانین ئەم پەیوەندییە ئیسلامییە تاقانەیە بەهێزتر بکەین؟

## دووەم: چەمکی ڕۆشنبیری:

لەڕووی زمانەوانییەوە (ثقافة) لە (ثقف الرجل)ەوە هاتووە، واتە: پیاوەکە بوو بە کەسێکی زیرەك و بیرتیژ، هەروەها (ثقافة) بە مانای ئەو زانست و هونەر و زانیارییانە دێت کە پێویستیان بە لێتێگەیشتن و کارامەیی هەیە، هەر وەك لە فەرهەنگی (الوسیط)دا ئاماژەی پێ کراوە[2]. بەڵام لەڕووی زاراوەوە جیاوازییەکی زۆر هەیە لە پێناسەکردنی ڕۆشنبیریدا (الثقافة) بە ڕادەیەك گەیشتە ئەوەی دوو زانای مرۆڤناسیی (ئەنترۆپۆلۆژیا) ئەمریکی لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا نزیکەی سەد و پەنجا پێناسە بۆ ڕۆشنبیریی کۆ بکەنەوە، هەریەك لەو پێناسانە لە گۆشەنیگایەکی جیاوازەوە تیشك دەخەنە سەر ئەم چەمکە، لە گرنگترین

---

[1]- طارق البشري: تقديم: أفتي في العالم، حولية قضايا العالم الإسلامي (١٤٢٣/١٤٢٤هـ - ٢٠٠١/٢٠٠٢م)، العدد الأول، مركز الحضارة للدراسات السياسية، مكتبة الشروق الدولية، (١١/٥).

[2]- مجمع اللغة العربية، المعجم الوسيط، دار المعارف، (ط ٣)، مادة: ((ثقف)) (١٠٢/١).

پێناسەکان:

ڕۆشنبیریی بریتییە لە ئاستبەرزیی عەقڵی یان هونەری کەسێك، یاخود کۆمەڵە کەسێك، مەبەست لەم پێناسەیە ڕۆشنبیریی کۆمەڵێك کەسی فێرخوازە لە ئاستێکی بەرزی خوێندندا و مەبەست پێی ڕۆشنبیریی هەموو کۆمەڵگاکە نییە، بەڵام ئەم زاراوەیە لەلای زانایانی ڕۆشنبیریی مرۆڤ و مرۆڤناسی و کۆمەڵناسەکاندا مانایەکی فراوانتر و گشتگیرتری هەیە، بۆ نموونە: ڕۆشنبیریی هەموو ئەو شتانەیە کە گەلێك یاخود ئوممەتێك بەرهەمی دەهێنێت لە سیستم و ژیانی کۆمەڵایەتی و هزر و ئامێر و بەرهەمە پیشەسازییەکان[1].

یاخود، ڕۆشنبیریی بریتییە لەو ڕێگا و ئامرازە هەمەجۆرانەی کە مرۆڤ بە درێژایی مێژوو پێی گەیشتووە، هەروەها ئەو ناوەڕۆکە عەقڵی و ناعەقڵییانەیە کە لە کاتێکی دیاریکراودا بوونیان هەبووە و ئامرازەکانی ڕێنیشاندان و ڕێنوێنیکردنی تاکی مرۆڤیان پێك هێناوە لە کۆمەڵگادا. بێگومان کاتێك زانایانی بواری پەروەردە دەڵێن: هەر کۆمەڵگەیەك ڕۆشنبیریی تایبەت بە خۆی هەیە، ئەوا مەبەستیان هەموو ئەو شتانەیە کە کۆمەڵگەکە پێی گەیشتووە لە هەریەکە لە (هزر و بیروباوەڕ و دابونەریت و ئاراستە و بەها و شێوازی بیرکردنەوە و کارکردن و جۆرەکانی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری جیاواز کە لە کۆمەڵگاکانی تر جودای دەکاتەوە). بۆ نموونە دەگوترێت ڕۆشنبیریی سۆڤیەتی و ڕۆشنبیریی ئەمریکی و ڕۆشنبیریی عەرەبی ئیسلامیی و... هتد[2].

مرۆڤ بە لەدایکبوونی لە بوونەوەرێکی بایالۆجییەوە دەگۆڕێت بۆ بوونەوەرێکی

---

[1]- محمد الهادي عفيفي: التربية والتغير الثقافي، الأنجلو المصرية، القاهرة، (١٩٧٥م)، (ص ١١٩).

[2]- عبد الرحمن النقيب، صلاح مراد: مقدمة في التربية وعلم النفس، منشورات المنظمة الإسلامية للتربية والعلوم والثقافة، الرباط، (١٩٨٧م)، (ص ٣٠).

ڕۆشنبیر، له دەرئەنجامی گوزەرکردنی له کۆمەڵگا و رۆشنبیرییەکی دیاریکراودا و هەروەها لەرێی پرۆسەی ئاشنابوون و پەیوەستبوونی کۆمەڵایەتیی ئەو مرۆڤە لەگەڵ کۆمەڵگەکەیدا. وە لە کتێبی (*دراسة الإنسان*)دا راڵف لینتۆن ناوەڕۆکی ڕۆشنبیریی دابەش دەکات بۆ خاڵە گشتی و خاڵە تایبەتییەکان، خاڵە گشتییەکان ئەو بەشەی ڕۆشنبیرییە کە هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا تێیدا هاوبەشن، وەك: زمان و ئایین و دا ونەریت و... هتد، ئەمەش هۆکاری پتەوی و یەکپارچەیی کۆمەڵگایە و خاڵە تایبەتەکانیش ئەو بەشەی ڕۆشنبیرییە کە تەنها کۆمەڵێکی دیاریکراو لە تاکەکانی کۆمەڵگایەکدا تێیدا هاوبەشن، جا ئەم کۆمەڵەیە کۆمەڵەیەکی پیشەیی بێت وەك کۆمەڵەی پزیشکان و پارێزەران و ئەندازیاران و مامۆستایان و... هتد، یاخود ڕۆشنبیریی تایبەت بە چینێکی دیاریکراوی کۆمەڵگا بێت، وەك چینی بۆرژوازی و چینی کرێکاران و... هتد، هەرکاتێك کۆمەڵگایەك دابەش ببێت بەسەر چەند چینێکدا، ئەوا هەر چینە و ڕۆشنبیریی و دابونەریتی تایبەت بە خۆی دەبێت. لەپاش ئەمانەش گۆڕانکارییە ڕۆشنبیرییەکان دێن، کە خۆیان لەو ڕەگەزە نوێیانەدا دەبیننەوە، کە لە دەرەنجامی داهێنان و دۆزینەوەی نوێوە، یاخود پەیوەندیکردن بە ڕۆشنبیریی ترەوە دەچنە نێو ڕۆشنبیرییەکی دیاریکراو. کۆمەڵگاش ئەو گۆڕانکارییانە وەر دەگرێت کە بە سوودبەخشیان دەبینێت، یاخود لەگەڵ خاڵە گشتییەکان و خاڵە تایبەتییەکانی ڕۆشنبیریەکەیدا دەگونجێن، ئەو گۆڕانکارییانەش ڕەت دەکاتەوە و لە ڕوویاندا دەوەستێتەوە کە لەگەڵیدا ناگونجێن و بە لادان و ئاڵنگارییان دەبینێت بۆ سەر ڕۆشنبیرییەکەی[1].

به هەمان شێوە توێژەرانی بواری ڕۆشنبیریی ئاماژە بە لایەنە ماددییەکەی

---

[1]– رالف لنتون (ترجمة عبد الملك الناشف): دراسة الإنسان، نشر بالإشتراك مع مؤسسة فرانكلين، بيروت، منشورات المكتبة العصرية، (١٩٦٤م)، (ص ٣٥٩–٣٦٣).

ڕۆشنبیریی دەکەن، کە خۆی دەبینێتەوە لە ئاوەدانکردنەوە و ئەو ئامێرانەی بەکار دەهێنـدرێن و ڕێگاوبانـەکان و خـواردن و جلوبـەرگ و... هتـد لـە دیاردەکـانی ڕۆشنبیریی مـاددی، لـەپاڵ ئەمەشـدا ئامـاژە بـە لایەنـە ڕۆحییەکـەی ڕۆشـنبیرییش دەدەن، کە خۆی دەبینێتەوە لە زانست و هونەر و ئەدەب و ئـایین و یاسـاکان و... هتـد لـە دیـاردە نامادییـەکانی ڕۆشـنبیری، هـەروەها بـاس لـە سـانایی و خێرایـی پێشکەوتنی لایەنە ماددییەکەی دەکەن و باسیش لە هێواشی و سەختیی گۆڕانکاری دەکەن لە لایەنـە ڕۆحیەکەیدا، دەرك بـەو جیاوازییـە زۆرەش دەکـەن کـە لـەنێوان پێشکەوتنی ماددیی مرۆڤدا هەیە لە سەردەمی ئێستاماندا، بە شـێوەیەك ڕێژەکـەی زۆر زیاترە بە بەراورد بە مرۆڤـی سـەردەمانی پێشـتر و چاخەکانی ناوەڕاسـت، بـە پێچەوانەشـەوە لـە سـەردەمی ئێسـتاماندا گەشـە و پێشـکەوتنی لایـەنی ڕۆحـی و ئـەخلاقی زۆر لاوازتـر و هێواشـترە بـەراورد بـە سـەردەمانی پـێش خـۆی، ئـەم دیاردەیەش بە دیاردەی دواکەوتنی ڕۆشنبیریی هـەژمار دەکرێـت، واتـە دواکـەوتنی لایەنی ڕۆحی و ئەخلاقی بەراورد بە لایەنی ماددی.

ئەوەی لێرەدا دەمانەوێت بەزەقی ئامـاژەی پـێ بـدەین: هـەوڵی ڕۆژئاواییەکانـە لەمەڕ زاراوەی ڕۆشـنبیریی (culture)، بـە شـێوەیەك وێنـای دەکـەن گوایـە ئـەم زاراوەیە لە بنەڕەتدا لە زاراوەی (cultura)ی لاتینییەوە وەر گیراوە، کە بە مانای پەرەپێدان یاخود ڕواندنی عەقڵ دێـت و لـە کتێبەکانیشـیاندا ڕەواجێکـی زۆری پـێ دەدەن و زۆرێك لە کتێبە عەرەبییەکانیش لەمانەوە دەیگوازنەوە، ئەم ڕایەش ورد و دروست نییـە، چـونکە ئـەوەی بـاو بـوو پـێش چـاخی ڕێنسـانس و شۆڕشـی دژ بـە کەنیسـە: وەرگێرانـی چـەمکەکە بـوو لـە وشـەی لاتینیـی (cults)، کـە بـە مانـای پەرستش دێت. ئێمەش لە خوارەوە ئامـاژە بـە ماناکـانی ئـەم وشـەیە دەکـەین لـە

یەکێك لە فەرهەنگە ئینگلیزییە متمانەپێکراوەکاندا[1]:

**وشەی (cult)، ناوە، بەکار دێت بە واتای:**

١- پەرستشێکی ئایینی، بەتایبەت ئەوەی پەیوەستە بە دروشم و تقوسەکانی ئەو ئایینەوە.

٢- سەرسامییەکی لەڕادەبەدەر بە کەسێك، شتێك، بیرۆکەیەك، یان پەرستشێك، لێرەدا ئەم فەرهەنگە باس لە هەردوو وشەی ( Devotion , Homage) دەکات وەك دوو وشەی هاومانای (cult) لە گەیاندنی ئەم مانایەدا، وشەی یەکەم (Devotion) واتا: دڵسۆزییەکی ویژدانیی قووڵ و جێگیر، وشەی دووەمیش (Homage) بە مانای ڕێزێکی زۆر دێت.

٣- کۆمەڵیك مرۆڤ کە پیادەی ئەم پەرستشە دەکەن.

٤- ئەو بابەتەی پەرستش یان سەرسامی لەهەمبەر ئەنجام دەدرێت.

٥- کۆمەڵێك یاخود دەستەیەك لە خەڵك کە بیروباوەڕەکەیان و پەیرەویکردنەکەیان گوزارشت لە جیاوازی لە بەها و گۆشەگیری لە بیروباوەڕە باوەکان دەکات.

٦- ڕێوڕەسمی پیادەکراو لەلایەن دەستەیەکی دیاریکراو، یان ئەو بیروباوەڕەی کە باوەڕیان پێیەتی.

ئایینی مەسیحی وەك سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی ڕۆشنبیریی ڕۆژئاوا مایەوە بە درێژایی سەدەکانی ناوەڕاست و سەرەتای چاخە نوێیەکان، هەتا ئەو کاتەی ململانێ لەنێوان کڵێسا و زانایاندا رووی دا، ئەم ململانێیەش لە ناونیشانی زۆرێك لە

---

١- The World Book Dictionary, Chicago, World Book, Inc, (1992), (P. 505). عن أحمد المهدي عبد الحليم: الثقافة الإسلامية محور لمناهج التعليم، الشروق الدولية، القاهرة، (٢٠٠٤م)، (ص ٧٩، ٨٠).

کتێبە دیارەکانی ڕۆشنبیریی ڕۆژئاواییدا باسی لێ کراوە، لەوانە کتێبەکەی درۆپەر (Droper) لەژێر ناونیشانی: *مێژووی ململانێی نێوان ئایین و زانست* ( *The history of the conflict between religion and science*) لە ساڵی ١٨٧٥م دا نووسراوە، هەروەها لە ساڵی ١٨٩٥م دا ئاندرۆ وایت ( Andraw White) کتێبێکی نووسی لەژێر ناونیشانی: *جەنگی نێوان زانست و لێکۆڵینەوە لاهوتییەکان لە ئایینی مەسیحیدا* ( *The warfare of science with theology in christianity*).

**دوو هۆکاری سەرەکی هەبوون بۆ هەڵگیرسانی ئەم ململانێیە لەنێوان کڵێسا و زانستدا:**

**هۆکاری یەکەم:** دەقە ئایینییەکانی مەسیحیەت نەیتوانی خۆی ڕابگرێت لەبەردەم ڕەخنە و شیکاری زانستیدا، چونکە لەڕووی زانستییەوە سەلمێنرا کە ئینجیلە جۆراوجۆرەکان زۆرێك لە دژیەکی و بەلاڕێدابردنی تێدایە و دەستکاری کراون، تەنانەت لەبری ئەوەی تەنها یەك ئینجیل هەبێت ژمارەیەکی زۆر ئینجیل بوونیان هەبوو، کە جگە لە چەند سەرگوزەشتە و چیرۆکێك دەربارەی مەسیح و هاوەڵانی شتێکی تر نەبوون. لە ناوەڕۆکی ئەم ئینجیلانەدا بابەتگەلێکی زۆر هەبوون کە پێچەوانەی زانست و ڕاستییە حاشاهەڵنەگرەکان بوون، دەکرا زانایان ئەمەیان لەو ڕوانگەیە لێك بدایەوە کە ئینجیلەکان بە شێوەیەکی هێمایی نووسراون یان پەرتووکی زانستی نین، بەڵکو تەنیا بریتین لە پەرتووکی ڕەوشتی. ئەمەش ئەو کاتە گونجاو دەبوو کە کەنیسە دژایەتیی زانستی نەکردایە و زانایانی نەچەوساندایەتەوە و هەروەها ڕێگریی لەو زانستانە نەکردایە کە لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامییەوە پێیان دەگەیشت.

**هۆکاری دووەم:** بڵاوبوونەوەی ئابڕوچوونەکانی کڵێسا وەك لادانی ڕەوشتی و

گەنــدەڵی، ســەرەڕایی چەوســاندنەوەی زانایــان و ئەشــکەنجەدانی جەســتەیی و دەروونییان[1].

هەر بۆیە لەژێر سێبەری ئەم بارودۆخە ناهەموارەی ڕۆئاژئاوادا زانایانیان هــەوڵی جیاکردنەوەی ڕۆشـنبیریی و ئایینیـان لەیـەکتردا. هـەروەها برەویانـدا بـە بنەڕەتـە عەقڵییەکەی ڕۆشنبیریی (cultura) نەوەك بنەڕەتە ئاینییەکـەی (cult)، ئەگـەر ئەم هەوڵە لەژێر ئەو بارودۆخە ناهـەموارەی ڕۆژئـاوادا تـا ڕادەیـەك سروشـتی بێـت، ســەیرە ئــەم چــەمکە بــە هــەمان پێکهاتــە و نــاوەڕۆك درزە بکاتــە نێــو کتێبــە عەرەبییەکان، بـێ ڕەخنـەکاری و دەرککـردن بـە جیـاوازیی بارودۆخـەکان. چـونکە دەقەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام (قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر)) بە ڕاستی و جێگیری جیا دەکرێنەوە، لە هەمان کاتیشدا بانگەواز بۆ زانست و فێربوون دەکەن، بە هیچ شێوەیەك هەڵوێسـتیان دژ بـە زانایـان نـەبووە، ئەمە سەرەڕای سروشتی تایبەتی ڕۆشنبیریی ئیسلامی.

ئێمــە کاتێــك ڕۆشــنبیریی دەدەینــە پــاڵ ئیســلام، مەبەســتمان ئەوەیــە ئــەم ڕۆشنبیرییە ڕێنوێنیکراوە بە دەقە جێگیرەکانی قورئان و فەرموودە، ڕۆشنبیرییەکە بـە پلەیـەك هـەلقوڵاوی ئیسـلامە، جیـاوازیی نییـە پەیوەندیـدار بێـت بـە سیسـتمی ڕامیــاری و ئــابووری و کۆمەڵایــەتی و هــەروەها بیروبــاوەڕ و پەرســتش و بــەها ڕەوشـتەکانی، هـەروەها ئـەو ڕۆشـنبیرییە بـە ڕۆحـە ئیسـلامییەکەی جیـاوازە لـە ڕۆشنبیرییەکانی تر، کـە بـە درێـژایی سـەدەکانی ڕابـردوو بـەناو پێکهاتـەکانی ئـەم ڕۆشنبیرییەدا ڕۆ چووە و ڕەگی داکوتیوە. لە پێش ئیسلامدا کۆمـەڵێك ڕۆشـنبیریی

---

[1]– بڕوانە موریس بوكاي: دراسة الكتب المقدسة في ضوء المعارف الحديثة، دار المعارف، (١٩٧٨م).

– عبد الرحمن عبد الرحمن النقيب: المنهجية الإسلامية في البحث التربوي نموذجا: النظريـة والتطبيـق، دار الفكر العربي، (٢٠٠٤م)، (ص ١١٦) ئەوەش کە لەدوای ئەوەوە دێت.

بوونیان هەبووە، وەك ڕۆشنبیریی فیرعەونی و یۆنانی و فارسی و ڕۆمانی، هاوشانی ئیسلامیش کۆمەڵێك ڕۆشنبیریی ئەورووپی ژیاون و هەندێکیش تا ئێستا لەگەڵیدا دەژین، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانەش ئایینی ئیسلام هەر خاوەنی مۆرکی مرۆیی و شارستانێتیی تایبەت بە خۆیەتی.

لەم بارەوە ئەحمەد مەهدی دەڵێت: "سەرهەڵدانی ڕۆشنبیریی ئیسلامیی دەرئەنجامێکی سروشتیی بنەماکانی ئایینی ئیسلام بوو، هەر ئەم بنەمایانەش بوونە مۆڵگەی ئەم ڕۆشنبیرییە و گرتیانە خۆ و پەرەیان پێ دا و لە جیهاندا بڵاویان کردەوە، بۆیە دەتوانین بڵێین: دیاردەی ڕۆشنبیریی ئیسلامیی دیاردەیەکی بێوێنەیە لەنێو ڕۆشنبیرییەکانی تردا، چونکە ڕاستەوخۆ هەڵقوڵاوی دەقەکانی کتێبێکی پیرۆز و سوننەتێکن کە خودای گەورە لە ڕێگەی پێغەمبەرەکەیەوە دایبەزاندوون، ئەم ڕۆشنبیرییەش تا ئێستا بە پلەی یەکەم پشت بەم دەقانە دەبەستێت، بۆیە پێم وایە ئەم ڕۆشنبیرییە لە دڵی موسوڵماناندا هەر بەزیندوویی دەمێنێتەوە، چونکە سەرەتا لە سەرچاوەیەکی خوداییەوە سەری هەڵداوە، کاتێك بە تێپەڕبوونی کات ئەم ڕۆشنبیرییە لاوازی یاخود بەهێزیی بەخۆیەوە ببینێت، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەڵگرانی ئەم ڕۆشنبیرییە، نەك خودی ڕۆشنبیرییەکە"[1].

بەهێزیی ئەم ڕۆشنبیرییە لە جێگیری و دروستی و جیهانیبوونی سەرچاوەکانیدایە، هەروەها ئەم ڕۆشنبیرییە توانای ڕووبەڕووبوونەوە و وەستانی هەیە لەبەردەم هەموو ڕۆشنبیرییەکانی تر، ئەمەش بەهۆی جیهانیبوونی و لە هەمان

---

[1]- أحمد المهدي عبد الحليم: الثقافة الإسلامية محور لمناهج التعليم، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ٩٣).

- نصر محمد عارف: ((الحضارة، الثقافة، المدنية: دراسة لسيرة المصطلح ودلالة المفهوم)) في بناء المفاهيم، دراسة معرفية ونماذج تطبيقية، سەرچاوەیەکی پێشوو، (١/ ٢٥٤-٢٦٦).

کاتدا هەبوونی سەرچاوەیەکی خودایی باڵا و مرۆڤدۆستەوە. ئەم ڕۆشنبیرییە لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ دەوروبەریدا ئەم ئایەتەی خودای گەورەی کردۆتە دروشمی خۆی و بەردەوام دووبارەی دەکاتەوە کە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾{الحجرات: ١٣} واتە: ((ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە لە نێر و مێیەك دروستمان کردوون و کردوومانن بە چەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتری بناسن، بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خودا پارێزگارترینتانن، بێگومان خودا زانای ئاگادارە)). ئەمەش بە پێچەوانەی ڕۆشنبیریی ڕۆژئاوایی هاوچەرخ، کە دوور لە ڕاستی و دادگەری بە خۆبەگەورەزانی و ملهوڕی و بەکەمسەیرکردنی ڕۆشنبیرییەکانی تر مامەڵە دەکات[١].

لەژێر ڕۆشنایی هەموو ئەمانەدا، پێویستە چاوێك بە بۆچوون و تێڕوانینماندا بخشێنینەوە سەبارەت بە ڕۆشنبیریی هاوچەرخمان لەپێناو دیاریکردنی دوور و نزیکییەکەی لە بنەما جێگیرە ڕۆشنبیرییەکانی قورئان و فەرموودە. هەروەها پێویستە لەسەرمان سەرجەم دامودەزگا پەروەردەییە فەرمی و نافەرمییەکان بخەینە گەڕ بۆ خزمەتکردن و پاراستن و بەهێزکردنی ئەو ڕۆشنبیرییە ئیسلامییە و نوێکردنەوەی لەپێناو بەرەنگاربوونەوەی ئاڵنگارییە سەردەمییەکان.

دەبێت لە هەموو قۆناغەکانی خوێندندا (سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی) خوێندکارەکانمان فێری بنەما سەرەکییەکانی ڕۆشنبیریی ئیسلامیی بکرێن، هەر لە قورئان و سوننەت و مێژووی ئیسلامیی و زمانی عەرەبی (زمانی قورئان) دابونەریت و بەها ئیسلامییەکان. بۆیە نابێت خوێندکار بەم قۆناغانەدا تێپەڕ ببێت پێش

[١]– عبد الحميد أبو سليمان: الأمة بين شريعتين، مجلة إسلامية المعرفة، عدد (٢٨)، (ص ١٣٣–١٤٨)، المعهد العالمي للفكر الإسلامي ، هرندن، فرجينيا، الولايات المتحدة الأمريكية.

ئـەوەی شـارەزاییەکی بـاش لـە ڕۆشـنبیریی ئیسـلامیدا پەیـدا بکـات. هـەموو ئـەو هەوڵانـەش کـە دەدرێـن بـۆ لاوازکـردن و نەهێشـتنی ئـاینی ئیسـلامیی و مێـژووی ئیسلامیی و زمانی عەرەبی، تەنها ئامانج لێیان جیاوازیخستنە نێو کۆمەڵگاکەمان و پارچەکردن و لاوازکردنیەتی، بۆ ئەوەی کەمترین توانای ڕووبەڕووبوونـەوەی شـالاوی ڕۆشنبیریی هەبێت.

بۆیـە پێویسـتە لەسـەرمان لـەڕێی خوێنـدنی بـالاوە بـە هـەموو قۆناغەکانیـەوە (بەکالۆریۆس و ماجستێر و دکتۆرا) ڕۆشنبیریی ئیسلامیی دەوڵەمەنـدتر بکـەین بـە ئەنجامـدانی لێکۆڵینـەوە و توێژینـەوەی زیـاتر، تـا بتـوانین پـەرەی پـێ بـدەین و زیـاتریش بـلاوی بکەینـــەوە و توانـــادارتری بکـــەین لەســـەر بەرەنگاربوونـــەوەی ئاڵنگارییەکانی سەردەم. بەڕاستی بیروبۆچونێکی هەناردەکراوی زۆر دزەیان کردۆتە نێو ڕۆشنبیریی ئیسلامیی و خەوش و پۆخڵەواتێکی زۆریش ڕوویـان تێکـردووە، کـە بوونەتـە ڕێگـر لەبـەردەم پێشـکەوتنیدا، تـەنها لـەڕێی زانکۆکـان و سـەنتەرەکانی توێژینەوەوە دەتوانین ئەم ڕۆشنبیرییە ئیسلامییە لەو هەموو خەوش و پۆخڵەواتانە خاوێن بکەینەوە، تاکو بتوانێت بەبەهێزی لەگەڵ ڕۆشنبیرییەکانی تردا بژی.

## سێیەم: چەمکی پەرەپێدان

لــەم چــەند ســاڵەی دواییــدا چــەمکی پەرەپێــدان بــە شــێوەیەکی بەرچــاو بلاوبووەتەوە زیاتر لە هەر چەمکێکی دیکـە، بـە ڕادەیـەك ئێسـتا زۆربـەی خـەڵکی جیهـان ئـەم چـەمکە دووبـارە دەکەنـەوە، وەك بڵێـی زۆر دووبارەکردنـەوەی ئـەم چـەمکە خـەونی پەرەپێـدان بـۆ ڕاسـتی بگۆڕێـت، ئەمـەش لـەڕووی بـەکارهێنانی زاراوەیی ئەم چەمکەوە، بەڵام لەڕووی واقیعەوە ئەم جیهانەی ئـەمڕۆ تێیـدا دەژیـن جیاوازییەکی زۆری ئابووری و ڕامیـاری و کۆمەڵایـەتیی تێـدا بـەدی دەکرێـت لـەنێو

ولأته جیاوازەکانیدا، بەتایبەتی ئەو ولأتانەی کە پێشکەوتنێکی گەورەیان بەدی هێناوە لە بوارەکانی ئابووری و ڕامیاری و کۆمەلأیەتیدا، هەر وەکو ولأتەکانی ئەورووپا و ئەمریکای باکوور و یەکێتیی سۆڤیەت و یابان، هەروەها جیاوازییەکە لە ولأتە دواکەوتووەکانی وەك ئەفریقا و ئاسیا و ئەمریکای لاتینیش بوونی هەیە ئەگەرچی تاوەکو ئێستا بەردەوامن لە گەڕان بەدوای کیان و پێگەی خۆیان لە جیهان.

ئەم جیاوازییەش زیاتر ڕوون بوویەوە لەپاش جەنگی دووەمی جیهانی، ئەمەش لە دەرئەنجامی پاشەکشەکردنی داگیرکاری و سەربەخۆبوونی زۆرێك لە ولأتانی جیهانیی سێیەم بە جۆرێك ئاشکرا بەدیار کەوت کە دوو جیهان بوونی هەیە: جیهانێکی پێشکەوتوو (Developed Countries) و جیهانێکی تری دواکەوتوو (Under Developed Countries)[1] پاشان زاراوەیەکی نوێ سەری هەلدا، ئەویش ولأتە تازە گەشەسەندووەکانە (Developing Countries) وەکو ئاماژەیەك بەو ولأتانەی کە سەربەخۆییان بەدەست هێناوە و نزمترین ئاستی گەشەی ئابووری و کۆمەلأیەتییان هەیە، ئەگەرچی چیتر بە ولأتی دواکەوتوو هەژمار ناکرێن، بەلأم نەشگەیشتوون بە ئاستی ولأتە پێشکەوتووەکان. ئەم چەمکە نوێیە لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا سەری هەلدا لەپێناو ڕوپامایی نەوەی ئەو ولأتانە کە توانیبوویان لە دەیەی شەشەمی ئەو سەدەیەدا سەربەخۆیی نیشتیمانی بەدەست بێنن، ڕەنگە لەپێناو ئارەزووی ئەو کەسانەش بێت کە لەم

---

[1]– بۆ دەستنیشانکردنی ((جیهانی دواکەوتوو)) و ((دەولەتە پێشکەوتووەکان))، بگەڕێرەوە بۆ: د. محمد لبيب النجيحي: دور التربية في التنمية الإجتماعية والإقتصادية للدول النامية، مكتبة الأنجلو، القاهرة، (١٩٧٦م)، (ص ٤٩–٦٥)، د. محمد نبيل نوفل: التعليم والتنمية الإقتصادية، مكتبة الأنجلو، القاهرة، (١٩٧٦م)، (ص ٧–٤٢).

بوارانەدا لێکۆڵینـەوە دەکـەن، ئەمـەش بـۆ ئـەوەی هەسـتی ڕۆڵـەکانی ئـەو وڵاتانـە نەوروژێنن بەو ناوانەی تر کە لە وڵاتە پاشکەوتووەکان دەنرێت. ئەوەی بووە هۆی زیاتر بڵاوبوونەوەی ئەم زاراوەیە (وڵاتە تازە گەشەسەندووەکان) کە گونجاوترە لـە زاراوەکانی تر بریتی بوو لە سەرقاڵبوونی ژمارەیەك لە زانایانی خودی ئەو وڵاتانە بە پرسەکانی پەرەپێدانەوە لە وڵاتەکانیاندا و هەروەها بەشداریکردنیان بە شێوەیەکی بەرچاو لە کۆنگرە و چالاکی توێژینـەوە نێودەوڵەتییـەکان لـەم بوارانـەدا، ئەمانـە بوونە هۆی زیاتر جێگیرکردنی ئەم زاراوە نوێیە[١].

هەروەها شەستەکانی سەدەی بیستەم دەرکەوتنی هەزاران پـەرتووك و گوتـار و لێکۆڵینـەوەی بەخۆیـەوە بـینی، کـە هـەوڵی دەستنیشـانکردنی گرفتـەکانی وڵاتـە دواکـەوتوو و تـازە گەشەسـەندووەکانیان دەدا و هـەروەها هـەوڵی دیـاریکردنی مەشخەڵی ڕێیان دەدا کە لـە ڕێگەیـەوە ئـەو وڵاتانـە بتـوانن پـێش بکـەون و شـوێن قافڵەی وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهان بکەون[٢]. هەروەها لـە شەسـتەکانی سـەدەی ڕابردوو و لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی بایەخێکی زۆر دراوە بە هاوکاریکردنی وڵاتـانی جیهانیی سێیەم بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی کێشـە ئـابووری و کۆمەڵایەتییـەکانیان کـە

---

[١]– د. محمد الجوهري: مقدمة علم اجتماع التنمية، سجل العرب، القاهرة، (١٩٧٩م)، (ص ١٤).

[٢]– تەوەری دیارییکراوی ئەم گوتارە بوار نادات ناوی گرنگترین کارەکـان بهێـنین لـەم بـوارەدا، خوێنـەر دەتوانێـت درك بـەوە بکـات ئەگـەر بگەڕێتـەوە بـۆ لیسـتی ئـەم سەرچـاوە عـەرەبیی و ڕۆژئاواییانـەی خوارەوە:

- د.السيد محمد الحسيني وآخرون: دراسات في التنميـة الإجماعيـة، دار المعـارف، القـاهرة، (١٩٧٩)، (ص ٤٥٩–٤٩٣)،

- د. محمد لبيب النجيحي: دور التربية في التنمية الإجتماعية والإقتصادية للـدول الناميـة، مكتبـة الأنجلـو، القاهرة، (١٩٧٦)، (ص ٢٧٥–٢٨٤).

- Ziauddin Sardar: Science, Technology And Development In The Muslim World, Croom Helmi, London, (1977), (pp, 189-210).

دەبنە ڕێگر لە پەرەپێدانی هەمەلایەنەی ئەو وڵاتانە و لە نیشانەکانی ئەو بایەخدانە جیهانییـە بـەو کێشـەیە ئـەوە بـوو نەتـەوە یـەکگرتووەکان نـاوی لـەو ماوەیـە نـا (سـەردەمی پەرەپێـدان) و زۆری نەخایانـد تـاوەکو بـە هـەمان شـێوە مـاوەی حەفتاکانی سەدەی ڕابردووی ناو نا (سەردەمێکی تری پەرەپێدان)[1].

**نزیکەی زۆربەی ئەو هـەوڵ و نووسینانەی لەسەر ئاستی جیهانـدا بـاس لـە کێشەکانی دواکەوتن و پەرەپێدان دەکەن، لە چەند بنەمایەکەوە هەنگاو دەنێن، کە توێژەر پێی وایە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:**

**یەکەم:** دیاریکردنی خەسڵەتەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکان، وەکو: بەرزیی ڕێژەی داهاتی ناوەندیی تاك، کەمی ڕێژەی ئەو دانیشتووانەی کە بە کشتوکاڵەوە خەریکن و زۆریی ڕێژەی ئەوانەی کە لـە بـواری پیشەسـازیدا کـار دەکـەن و بـەرزیی ڕێـژەی سەدیی ئەو دانیشتووانەی کە فێری خوێندنەوە و نووسین بـوون و هـەلی فێرکـاریی جیاوازیـان دەسـت دەکـەوێت و زۆریـی ژمـارەی دانیشـتووانی شـارەکان و زۆریـی ژمارەی پزیشك و خەستەخانەکان و هەروەها تێکڕای بەرزیی ڕێژەی بڵاوکردنـەوەی ڕۆژنامەکان و ژمارەی ئامێری ڕادیۆ و ئۆتۆمبێلەکان بـەپێی ژمـارەی تاکـەکان و... هتد.

**دووەم:** دیـاریکردنی خەسـڵەتی وڵاتـە دواکـەوتوو و تـازە گەشەسـەندووەکان: ئەمیش بە شێوەیەکی گشتی پێچەوانەی خەسڵەتەکانی خاڵی یەکەمە، کـە بریتییـە لە لاوازیی بـواری پیشەسـازی و پشتبەسـتنی ئـەم جـۆرە وڵاتانـە زیـاتر بـە بـواری کشتوکاڵی و کەمیی ڕێژەی داهاتی تاك، خراپیی باری تەندروستی، دابەزینی ئاستی فێرکردن و بڵاوبوونەوەی بێکاری و نەخۆشـی و بـەدخۆراکی و کـەمیی دەسـتمایە و شوێنکەوتەیی بۆ وڵاتە پێشکەوتووەکان لـە لایـەنی ئابوورییـەوە و ڕێـژەی بـەرزیی

---

[1]– د. السيد محمد الحسيني وآخرون: دراسات في التنمية الإجتماعية، سەرچاوەی پێشوو، (ص ١٤٩).

نەخوێندەواری و... هتد[1].

**سێیەم:** دیاریکردنی خەسڵەتەکانی مرۆڤی هاوچەرخ، کە پێشکەوتنی بەدی هێناوە لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، کە مرۆڤێکە تایبەتمەندیی جیاکەرەوەی خۆی هەیە وەکو ئامادەباشی بۆ پسپۆریەتە نوێکان و ڕازیبوون بە گۆڕانکاری و نوێکاری، عەقڵکراوەیی و لیبڕاڵیبوون و بوونی ئاڕاستەیەکی دیموکراسی و پاراستنی کات و ژوانەکان و کارکردن بە پلان و پێوەپابەندبوونی و هەروەها باوەڕبوون بە پێشکەوتن و زانست و تەکنەلۆژیا... هتد، پێچەوانەی ئەم خەسڵەتانەش مرۆڤی دواکەوتووە[2].

**چوارەم:** ڕێگەی پێشکەوتنی وڵاتە تازە گەشەسەندووەکان بریتییە لە دەستگرتن بە ناوەڕۆکی چەمکی (پەرەپێدان) وەکو ئامراز یان ڕێگا، کە لەڕێیەوە ئەم وڵاتانە دەتوانن ڕووبەڕووی دیاردە و هۆکارەکانی دواکەوتوویی ببنەوە، ئەمەش بە هێنانەدیی سیما و خەسڵەتەکانی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان، یان مرۆڤە هاوچەرخەکان[3]. پەرەپێدانیش هەر وەکو ئەمینداری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان پێناسەی دەکات لە یەکێك لە ڕاپۆرتەکاندا: ((گۆڕانکاری و پەرەپێدان لایەنی کۆمەڵایەتی و ئابووریش لەخۆ دەگرێت و ڕەهەندی چۆنێتی و چەندێتییشی هەیە))[4]. وڵاتە تازە گەشەسەندووەکان پەنا دەبەنە بەر پلاندانان بە شێوازە

---

[1]- سەرچاوەی پێشوو، (ص ٥٢-٦٤)، د. محمد نبيل نوفل: التعليم والتنمية الإقتصادية، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ٧-٤٢).

[2]- سەرچاوەی پێشوو، (ص ٢٢٩-٢٣٣)، د.السيد محمد الحسيني، وآخرون: دراسات في التنمية الإجتماعية، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ٩٣-١٠٣).

[3]- د. محمد نبيل نوفل: التعليم والتنمية الإقتصادية، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ١٣).

[4]- د. عبد الفتاح جلال، وآخرون: التنمية والتخطيط والتعليم الوظيفي في البلاد العربية، سرس الليان، (١٩٧٢م)، المقدمة (ص ط).

جیاوازەکانیەوە وەك میتۆدێك بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی پەرەپێدان و چەمکی پلاندانان بە شێوەیەکی گشتی بریتییە لە نەخشەکێشان و دیاریکردنی ئەو یەکانەی کە پێویستە پەیڕەوییان لێ بکرێت بۆ ئاڕاستەکردنی چالاکییە مرۆییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان بۆ بەدیهێنانی کۆمەڵێك ئامانجی دیاریکراو و لە ماوەیەکی دیاریکراودا[1]، واتە پلاندانان ئامرازی کۆمەڵگە تازە گەشەسەندووەکانە (دواکەوتووەکان) بۆ پەرەپێدان و بەرەوپێشچوون، پەرەپێدانیش بەرهەمی هەوڵی ئەو وڵاتانەیە کە هەوڵ دەدەن لەپێناو گەیشتن بە سیماکانی کۆمەڵگەی پێشکەوتوو و هەروەها سیمای مرۆڤی هاوچەرخ، کە پێشتر باسی لێوە کرا.

بۆ ئەم مەبەستەش وڵاتە تازە گەشەسەندووەکان بە شێوەیەکی گشتی پەنا دەبەنە بەر چەند ئامرازێك، لەوانە چاولێکردن و لاساییکردنەوەی وڵاتە پێشکەوتووەکان لە کارکردن بە ئاراستەی دروستکردن و وەبەرهێنانی ئامێری قورس، تەنانەت ئەگەر ئەم کارەش لەسەر ئۆباڵی کشتوکاڵ و دابینکردنی دەستی کار بێت[2]، هەروەها ئەم وڵاتانە زۆر جار دەرگایان واڵا دەکەن بە ڕووی وەبەرهێنەرە بیانییەکاندا و وەرگرتنی هاوکاری و قەرزی دەرەکی، ئەمەش بە مەبەستی خێراترکردنی پرۆسەی پەرەپێدان، بە هەمان شێوە زانست و تەکنەلۆژیای سەردەم هاوردە دەکەن و بەڵکو هەندێك جار دامەزراوە فێرکارییەکانیش لە وڵاتە پێشکەوتووەکانەوە هاوردە دەکەن[3]، لەوەش زیاتر

---

[1]– هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[2]– دەربارەی کاریگەریی خراپی ڕووکردنە پیشەسازیی لەجیاتیی کشتوکاڵ لە دەوڵەتەکانی جیهانی سێیەمدا، بگەڕێرەوە بۆ:

- Ziauddin Sardar: Science, Technology and Development in the Muslim World, op-cit. (105-121)

[3]– دەربارەی کاریگەریی خراپی وەبەرهێنانی بیانیی و قبوڵکردنی هاوکاری و قەرزە بیانییەکان،

هەندێك جار ئەم ولاَتانە زۆرێك لە دیاردەكانی خۆشگوزەرانی و جوانكاری هاوردە دەكەن، كە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ ئابووری ئەو ولاَتانەدا ناگونجێن.

لێرەدا كارمان گفتوگۆكردن نییە لەسەر سیاسەتە جیاوازەكانی پەرەپێدان بە شێوەیەكی گشتی و هەروەها كارمان هەڵسەنگاندنی ئەو سیاسەتانەش نییە، چونكە ئەمە لە ئامانجی لێكۆڵینەوەكە دوورمان دەخاتەوە و بۆ ئەو بابەتەش سەرچاوە و كەسانی پسپۆڕی تایبەت بە خۆی هەن، بەلاَم ئەوەی لەم لێكۆڵینەوانەدا بۆ ئێمە جێی بایەخە ڕەخنەگرتنە لەو بنەما و سەلمێنراوانەی كە پێشتر باسمان لێوە كرد و بیرۆكەی پەرەپێدانیان لەسەر بنیات نراوە، بەتایبەتی بۆ كۆمەڵگا ئیسلامییەكان، هەروەها هەوڵ دەدەین جێگرەوەیەكی ئیسلامیی پێشكەش بكەین سەبارەت بە پەرەپێدان، ئەویش لەڕێگەی پەروەردەی ئیسلامییەوە.

**ئەم بژاردە ئیسلامییە جێگرەوەیە لەسەر كۆمەڵێك سەلمێنراو ڕادەوەستێت، سەلمێنراوەكانی تری پەرەپێدان كە باس كران هەڵدەوەشێنێتەوە، گرنگترینیان ئەمانەن:**

١- ئەزموونی سەرمایەداری و كۆمۆنیستی تاكە ئەزموون نین بۆ پەرەپێدان بە شێوەیەك ولاَتە تازە گەشەسەندووەكان تەنها لەڕێگەی ئەو دوو ئەزموونەوە نەبێت نەتوانن پێش بكەون و هەڵبستنەوە، بەڵكو پێویستە كۆمەڵگە تازە گەشەسەندووەكان خۆیان ڕێگاچارەیەك بۆ خۆیان بدۆزنەوە بۆ ئەوەی پێش بكەون، ئەمەش چونكە ئەزموونی پێشكەوتن لە ولاَتە سەرمایەداریەكاندا لەسەر

---

بڕۆرەوە سەر: د. السيد محمد الحسيني وآخرين: دراسات في التنمية الإجتماعية، سەرچاوەیەكی پێشوو، (ص ٧٦-٩٢، ١٢١-١٢٦).

W.L. Thorp: The Reality Of Foreign Aid, Praeger, New York, (1971).

داگیرکردنی گەلانی تر بنیات نرابوو، بەمەش سەروەتە ماددی و مرۆییەکانی ئەو گەلانەیان بۆ بەرژەوەندیی خۆیان دەقۆستەوە، ئەم کارەش لە کاتی ئێستاماندا گونجاو نییە و لە هەمان کاتدا کارێکی بێزراو و نەخوازراوە. بە هەمان شێوە ئەزموونی پێشکەوتن لە ولاّتە کۆمۆنیستەکان بنیات نرابوو لەسەر چەوساندنەوە و قوربانیدان بە نەوەکانی ئێستا لەپێناو نەوەکانی داهاتوودا، ئەم شێوازانەش چیتر ناگونجێن لەگەڵ گەلانێکدا کە لە هەموو شتێك بێبەش کراون و چاویان لە ژیانێکی باشترە.

٢- ولاّتە پێشکەوتووەکان هەتاوەکو ئەمڕۆش گەلە تازە گەشەسەندووەکان بەکار دەهێنن بۆ پارێزگاریکردن لەو پێشکەوتنانەی کە بەدییان هێناوە، ئەو وەبەرهێنانانەی کە ولاّتە پێشکەوتوکان لە ولاّتە دواکەوتوو و تازە گەشەسەندووەکاندا ئەنجامی دەدەن ئامانجێکی دیاریکراویان لێی هەیە، ئەویش هێشتنەوەی ئەو ولاّتانەیە وەك سەرچاوەیەك بۆ ماددە سەرەتاییەکان و کارکردن بۆ ئەوەی پیشەسازیی نوێ نەچێتە ناو ئەو ولاّتانەوە، بۆ ئەوەی پەرەپێدانی ئابووری بەخۆیانەوە نەبینن. هەروەها ئەو قەرزانەی کە بە ولاّتە دواکەوتوو و تازە گەشەسەندووەکانی دەدەن زۆر کات بۆ خزمەتکردنی ئامانجی سیاسیی تایبەت بە خۆیانە، زۆربەی کات ئەو قەرزانە لەو بوارانەدا بەکار دەهێندرێن کە بەرهەمیان نییە وەکو ڕێگاوبان و خەستەخانە و فڕۆکەخانە و... هتد، هەروەها ئەم قەرزانە سوویەکی زۆریان لەسەرە و وابەستەی کۆمەڵێك مەرجی سەختن. سەرەڕایی ئەمەش جیاوازییەکی زۆر بەدی دەکرێت لەنێوان ئەو ماددە سەرەتاییانەی کە ولاّتە تازە گەشەسەندووەکان هەناردەی دەکەن، لەگەڵ ئەو کالاّیانەی کە لە ولاّتە پێشکەوتووەکانەوە هاوردەی دەکەن. سەبارەت بە هاوکارییە دەرەکییەکانیش تەنها لایەنی ئابووری لەخۆ ناگرن، بەڵکو کۆمەڵێك ئاماژەی سیاسیی زۆر گرنگ

لەخۆ دەگرن، بەتایبەت ملکەچکردنی وڵاتی قەرزوەرگر لەسەر ئاستی سیاسەتی ناوخۆیی و هەندێ جاریش لەسەر ئاستی سیاسەتی دەرەوەش [1].

٣- ئەزموونی سەرمایەداری و کۆمۆنیستی دوو بەرزترین نموونە و ئەزموون نین کە وا پێویست بکات لەسەر مرۆڤایەتی بیانکەن بە پێشەنگ و شوێنیان بکەون، بەڵکو دەستکەوتەکانی ئەم دوو ئەزموونە نابێت ڕووە ناشرینەکانیانمان لێ بشارنەوە، وەکو هەردوو جەنگی جیهانیی یەکەم و دووەم، پێشبڕکێی شێتانەی خۆپڕچەککردن و هەڵوەشانەوەی ڕەوشت و گاڵتەکردن بە بەها و پێشەنگەکان، بزووتنەوەکانی یاخیبونی گەنجان لە دەسەڵات و دابونەریتەکان و ڕۆچوونیان بە شێوەیەکی تەواو لە گاڵتەوگەپ و ڕابواردن و بێهۆشی و سێکس و هەروەها بەرزبوونەوەی ڕێژەی تاوانکاری و خۆکوشتن و نەخۆشییە دەروونییەکان و... هتد[2].

---

[1]- دەربارەی شوێنەواری خراپی خوێندنی ڕۆژئاوایی لەسەر جیهانی ئیسلامیی، بۆ نموونە بڕۆرەوە سەر:

- د.محمد فاضل الجمالي: آفاق التربية الحديثة في البلاد النامية، الدار التونسية للنشر، تونس، (١٩٦٨)، (ص ١٢٥-١٥٣)،

- د. أحمد صيداوي: ((الغزو التربوي الغربي))، من أبحاث مؤتمر التربية الإسلامية المنعقد في (١٥-٢١ آذار ١٩٨١م)، جمعية المقاصد الخيرية الإسلامية، بيروت، (١٩٨١م)،

- علي خليل مصطفى أبو العينين: الأصول الفلسفية للتربية في مصر الحديثة بين الفكر الإسلامي والفكر التغريبي، رسالة دكتوراه غير منشورة، تربية طنطا، (١٩٨١م).

-S.H. Alatas: The Sociology Of Corruption, Donald Moore, Singapare, (1968).

[2]- بۆ وردەکاریی بڕوانە:

W.L. Thorp: The Reality of Foreign Aid, Op, Cit.

باشترین شتێك كە كۆتایی ئەم برگەی پێ بهێنین وتەیەكی ((فرانتز فانون))ە Frantz Fanoon كە دەڵێت: "ئێمە –گەلانی جیهانیی سێیەم– پێویستمان بە پێشەنگە، بەلاّم زۆرێك لە ئێمە ئەزموونی ئەوروپی سەرنجی ڕادەكێشێت زیاد لە هەر ئەزموونێكی تر. بینیمان چۆن ئەم ڕكابەرایەتییە بەرەوە ڕووخانمان دەبات. پێویستە چیتر لەمەودوا فریوی پێ نەخۆین، هاوسەنگیمانی پێ لەدەست نەدەین، دەستكەوتە ئەوروپییەكان... من كاتێك بەدوای مرۆڤدا دەگەڕێم لە جیهانیی ئەورووپیدا تەنها لە زنجیرەیەك نكوڵیكردن لە مرۆڤ و تاوانی كوشتنی مرۆڤ زیاتر هیچی تر نابینم"[1]. ئەوەی كە فانون باسی دەكات سەبارەت بە ئەزموونی ئەورووپی هەمووی بەتەواوەتی بەسەر ئەزموونی كۆمۆنیستیدا جێبەجێ دەبێت كە لە كۆتاییدا بەسەر خاوەنەكانیدا ڕووخا.

٤– ئەگەر ڕەوا بێت بۆ وڵاتە پەرەسەندووە نا ئیسلامییەكان لە بواری پەرەپێدان چاو ببڕنە نموونەی ئەوروپی یان نموونەی كۆمۆنیستی و بە شێوەیەكی كاریكاتۆری شوێنپێیان هەڵگرن –لە كاتێكدا ئەم شێوازی چاوتێبڕینە هەرەسی هێناوە– ئەوا لە هەردوو ڕووی شەرع و ئاوەزەوە پێویستە لەسەر وڵاتە ئیسلامییەكان ڕێگایەكی ئیسلامیی بۆ پەرەپێدان دابهێنن و بدۆزنەوە بە شێوەیەك جیاواز بێت لە هەردوو نموونەی ئەوروپی و كۆمۆنیستی، ئەمەش لەپێناو ئەورووپا و

---

[1]– بۆ وردەكاریی ئەو داڕووخانە ڕەوشتییە، بڕۆرەوە سەر:
H.W. Armstrong: Modern Romans, The Decline of Western Civilization, Ambassador College Press , Pasarena, California, U.S.A, (1975) & Maryam Jameelah: Western Civilization Condemned By Itself, Sant Nagar, Lahor, Pakistan, (1976).
–Frantz Fanon: The Wretched of The Earth, Benguin Book, (1970)
بۆ وەرگێڕانی عەرەبیی كتێبەكە بە ناونیشانی: معذبوا الأرض، ترجمة د. سامي الدروبي، د. جمال الأتاسي، دار الآفاق الجديدة، بيروت، (١٩٧٢م)، (ص ٢٢١، ٢٢٢).

هـەموو وڵاتــانی جیهــانیی ئــازاد و لــەپێناو ڕووســیا و هــەموو وڵاتــانی جیهــانیی کۆمۆنیستی و لەپێناو جیهانیی ئیسلامیدا... هەروەها لەپێناو مرۆڤایەتیدا پێویستە لەسەرمان –ئێمەی موسوڵمانان– بەرگێکی ئیسلامیی بپۆشین و بگەین بە هزرێکـی ئیسلامیی نوێ، هەوڵ بدەین مرۆڤی موسوڵمانی هاوچەرخ و کۆمـەڵگای ئیسـلامیی ڕاستەقینە بنیات بنێین، بۆ ئەوەی ئەو کێشانە چارەسەر بکات کە هەموو ئـەورووپا و ئـەمریکا و ڕووسـیا نـەیانتوانی چارەســەری بکـەن... هـەروەها مرۆڤێکـی نـوێ پێبگەیەنین کە وڵاتە پێشکەوتووەکانی تر نەیانتوانی لەم جیهانەدا پێی بگەن.

جیهانی ئیسلامیی بەو هەمووە توانا و هێزی زۆری مرۆیی و سامانی سروشـتی و کەلـەپووری ڕۆشـنبیریی و ژیاریـەی کـە خاوەنیـەتی پـاڵێوراو دەبێـت بـۆ ئـەوەی ئەزموونێکی نوێ پێشکەش بکات بـۆ پەرەپێـدان لـە هـەموو بوارەکـانی ڕامیـاری و ئـابووری و کۆمەڵایەتیـدا[1]، لـە هــەموو خاسـیەتەکانی پەرەپێـدانی ئـەم نموونــە ئیسلامییە گرنگتر ئەوەیە لە ڕوانگەیەکی ئیسلامییەوە بۆ گـەردوون و ژیـان و مـرۆڤ دەڕوانێـت، هــەروەها هــەموو ئامــانج و مەبەســت و نموونەیــەکی بــاڵای ژیــان لــە شەریعەتی ئیسلامییەوە وەر دەگرێت[2]، **لەناو ئەم چوارچێوە ئیسلامییە گشتیەدا دەتوانین ئەم سیما سەرەکییانە بخەینە ڕوو:**

---

[1]– بۆ وەرگرتنی وێنەیەك لەبارەی توانا ماددیی و مرۆیی و ڕۆحییەکانی جیهـانی ئیسـلامی، کـە وای لـێ دەکات توانا بێت لەسەر بنیادنانی نەموزەجی ئیسلامیی گەشەسـەندن، بـڕۆڕەوە سـەر: يوسـف إبـراهيم يوسف: الأسلوب الإسلامي لتحقيق التنمية الإقتصادية، دراسة مقارنـة، رسـالة دكتـوراه في الإقتصـاد غـير منشورة، تجارة الأزهر، (١٩٨١م)، عبد العظيم مصـطفى فـودة: صـلاح المجتمـع في الإحتكـام إلى الشـريعة الإسلامية، رسالة دكتوراه غير منشورة، كلية دار العلوم، القاهرة، (١٩٧٩م).

[2] -Ziauddin Asrdar: Science, Technology And Development In The Muslim World, Op, Cit, (PP, 7, 51-63)

١- بوونی بیروباوەڕێکی بەهێزی دامەزراو کە کاریگەری دروست دەکات لەسەر ژیانی تاك و کۆمەڵ، کە خۆی دەبینێتەوە لە باوەڕهێنان بە خوای گەورە و فریشتەکانی و پەرتووکەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و قەزاوقەدەر.

٢- ئەو پەرستشە ئیسلامییانەی کە مرۆڤ بە خوداکەی دەبەستێتەوە، زیاتر توانادراری دەکات لە ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنەکانی ڕاستی (الحق) لە ناوەوە و دەرەوە[١].

٣- ڕەوشتە ئیسلامییە جوانەکان کە مرۆڤی موسوڵمان بەرز و ڕێزدار دەکات و هەروەها کۆمەڵگەی ئیسلامییش بەرز دەکاتەوە و دەیکاتە نموونەیەکی ئەخلاقی و پێشەنگ بۆ کۆمەڵگاکانی تر[٢].

٤- سیستمێکی سیاسی کە بنیات بنرێت لەسەر ملکەچبوونی دەسەڵات و گەل بۆ شەریعەتی خودای گەورە و لەسەر ڕێزگرتن لە تاك، هەروەها لەسەر کارکردن بە پرەنسیپەکانی دادپەروەریی و ڕاوێژی (شوری)ی ئیسلامیی[٣].

---

[١]- بۆ نموونە بڕۆرەوە سەر: أبو حامد الغزالي: إحياء علوم الدين، دار إحياء الكتب العربية، القاهرة، (١٩٥٧م)، (١/١٤٥-٢٧٢).

[٢]- بڕۆرەوە سەر ئەم لێکۆڵینەوە بەپێزانە:

- د. محمد عبد الله دراز: دستور الأخلاق في القرآن، وەرگێڕانی بۆ عەرەبیی: د. عبد الصبور شاهين، دار البحوث العلمية، الكويت، (١٩٨٠م)،

- د. مقداد يالجن: الإتجاه الأخلاقي في الإسلام، التربية الأخلاقية الإسلامية، رسالة ماجستير ودكتوراه، منشورتان، مكتبة الخانجي، القاهرة، (١٩٧٧م)،

- سعيد حوى: جند الله ثقافة وأخلاقا، بدون تأريخ، دار النشر، طبعة ثانية، (ص ١٦٥-٤١٧)

[٣]- دەربارەی سیستەمی سیاسی، بڕوانە ئەم لێکۆڵینەوە بەپێزانەی خوارەوە:

- د. عبدالحميد متولي: مبادئ نظام الحكم في الإسلام مع المقارنة بالمبادئ الدستورية الحديثة، دار المعارف، الإسكندرية، (١٩٦٦م)،

٥– بوونی سیستمێك له پەیوەندییە نێوولاتییەكان، كە بنیات نراوە لەسەر ڕێزگرتن لە مافەكانی مرۆڤ و هاوكاریكردن بۆ هەموو كارێكی چاكە و هەروەها دووركەوتنەوە لە كردەوە دوژمنكارییەكان، لەگەڵ ڕازینەبوون بە ملشۆڕی و نەرمینواندن و دەستبەرداربوون لە مافەكانمان و بانگەوازەكەمان[1].

٦– بوونی سیستمێكی ئابووری كە بنیات دەنرێت لەسەر ئەوەی ماڵ و سامان هەمووی هی خودایە و مرۆڤیش جێنشینە لەسەر ئەو سامانە، هەر بۆیە دەبێت ڕەچاوی سەرچاوەكانی داهات و سەرچاوەكانی خەرجی بكرێت و هەروەها زەكاتی لێ دەر بكرێت و مافی هەژارانی لێ بدرێت و دەستەبەری هەبێت لەنێوان تاكەكانی كۆمەڵگادا و هەروەها بەكارهێنانی هەموو سەرچاوەكانی سامان لە بەرژەوەندیی ئیسلام و موسوڵماناندا[2].

---

ـ د. محمد البهي: الفكر الإسلامي والمجتمع المعاصر، مشكلات الحكم والتوجيه، الدار القومية للطباعة والنشر، القاهرة، (١٩٦٥م)،

ـ د. عبدالقادر عودة: الإسلام وأوضاعنا السياسية، مؤسسة الرسالة، بيروت، بدون تأريخ، الإسلام وأوضاعنا القانونية، الإتحاد الإسلامي العالمي للمنظمات الطلابية، الكويت، بدون تأريخ،

ـ أبو الأعلى المودودي: نظرية الإسلام وهديه في السياسة والقانون والدستور، دار الفكر، بيروت (١٩٦٩م)، محمد الغزالي: الإسلام والإستبداد السياسي، دار الكتب الحديثة، (١٩٦١م).

- Dr. Muhammad Hamisullah The Muslim Conduct of State Sh. Muhammad Ashraf, Lahor, Pakistan, (1977) & Dr. Said Ramdan: Islamic Law Its Scope And Equity, Macmillan, London, (1961)

[1]– سيد قطب: السلام العالمي والإسلام، بدون دار نشر، (١٩٦٧م)، محمد الغزالي: حقوق الإنسان بين تعاليم الإسلام وإعلان الأمم المتحدة، دار الكتب الحديثة، (١٩٦٣م).

[2]– لەبارەی ئابووریی ئیسلامییەوە بڕۆرەوە سەر ئەم لێكۆڵینەوە بەپێزانەی خوارەوە:

– د. عيسى عبده: الإقتصاد الإسلامي مدخل ومنهاج، دار النهضة، مصر، (١٩٧٤م)،

– د. أحمد النجار: المدخل إلى النظرية الإقتصادية، دار الفكر، بيروت، (١٩٧٣م)،

– د. شوقي إسماعيل شحاتة: التطبيق المعاصر للزكاة، دار الشروق، جدة، (١٩٧٧م)،

٧- سیستمێکی کۆمەڵایەتی کە بنیات دەنرێت لەسەر یەکسانی و دادپەروەریی لەنێوان تاکەکاندا بەبێ جیاوازیکردن لەسەر بنەمای ڕەگەز یاخود ڕەنگ یاخود ئایین یاخود پێگەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و جەختکردنەوە لەسەر لایەنی ڕەوشت و برەودان بە خۆپارێزی (التقوى) و ملکەچنەبوونی مرۆڤ بۆ هیچ دروستکراوێکی تر، جا چ مرۆڤ بێت یاخود ئامێر یاخود سروشت بێت[١].

٨- سیستمێکی فێرکاری کە بنیات دەنرێت لەسەر پێویستیەتیی داواکردنی زانست لەلایەن هەموو موسوڵمانێکی نێر و مێ، زانست ڕێگای گەیشتنە بە خودا... هەروەها ڕێگای ڕێنوێنیکردنی مرۆڤ و ڕێزداربوونیەتی بۆ ئەوەی شیاو بێت جێنشینیی خودا بکات لەسەر زەوی، هەروەها داواکردنی زانستیش لە بێشکەوە بۆ ناو گۆڕ بەردەوام دەبێت. دواتر بەپوختی باس لەم خاڵە دەکەین، بە شێوەیەک

---

- البهى الخولي: الثروة في ظل الإسلام، دار الإعتصام، القاهرة، (١٩٧٨م)،

- السيد محمد باقر الصدر: اقتصادنا، دار التعارف للمطبوعات، بيروت، (١٩٧٩م)،

- البنك اللاربوي في الإسلام، دار التعارف للمطبوعات، بيروت، (١٩٧٨م)، هەروەها:

- M.A Mann: Islamic Economics Theory And Practice, A comparative Study, Sh-Muhammad Ashraf, Lahore, Pakistan iii Uois, Islamic Publications Ltd, Lahore, Pakistan, (1974 (

[١]- دەربارەی سیستەمی کۆمەڵایەتیی ئیسلامی، بڕۆرەوە سەر:

- د. مصطفى السباعي: اشتراكية الإسلام، الدار القومية للطباعة والنشر، القاهرة، (١٩٦٠م)،

- سيد قطب: العدالة الإجتماعية في الإسلام، بدون دار نشر، (١٩٦٧م).

- Prof. M. Raihan Sharie: Islamic Social Framework, Sh. Muhammad Ashraf, Lahore, Pakistan, (1970) & Ali Shariati: On The Sociology of Islam, Translated From The Persian By Hamid Algar, Mizan Press, Berkely, U.S.A, (1979) & Anwar Ahmad Qadri: Justice In Historical Islam, Sh. Muhammad Ashraf, Lahore, Pakistan, (1974)

- Ziauddin Sardar: Science, Technology And Development In The Muslim World, Op, Cit, (PP, 21-36) & Seyyed Hossein Nasr: Islamic Science an Illustrated Study. World of Islam Festefal Publishing Company Ltd, London, (1976), (PP, 1-24)

بگونجێت لەگەڵ سروشتی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا[1]. لەپاڵ ئەمەشدا باس لە سیستمێکی ئیسلامیی تایبەت بە سەربازی دەکەین، هەروەها باس لە سیستمی ئاڕاستەکردن و ڕاگەیانـدن دەکـەین[2] لـەپاڵ کۆمـەڵێك سـیمای تـردا، کـە پێویسـتە کۆمـەڵگا ئیسلامییەکان جیا بکاتەوە و بیانکاتە پێشەنگ لە پەرەپێدان و پێشکەوتندا.

ئەگەر سیسـتمە هاوچـەرخەکان دەرك بـە گرنگیـی ڕۆڵـی پـەروەردە بکـەن لـە بواری پەرەپێداندا، ئەوە پەنا دەبەنە بەر ئەوەی ناو دەبرێت بە پلانی پەروەردەیی بـۆ بەدەسـتهێنانی پێویسـتییەکانی لـە هێـزی مرۆیـی و یـەکبوونی نیشـتمانی بـۆ بەردەوامبوونیان لە پەرەپێدان[3] بێگومان لە ڕوانگەی ئێمەوە پەروەردەی ئیسلامیی باشترین و بەتواناترین جۆری پەروەردەیـە، بـەڵکو تاکـە پەروەردەیـە کـە بتوانێـت

---

[1]– بگەڕێوە بۆ:

Prof. M. Raihan Sharie: Islamic Social Framework, Sh. Muhammad Ashraf, Lahore, Pakistan, (1970) & Ali Shariati: On The Sociology of Islam, Translated From The Persian By Hamid Algar, Mizan Press, Berkely, U.S.A, (1979) & Anwar Ahmad Qadri: Justice In Historical Islam, Sh. Muhammad Ashraf, Lahore, Pakistan, (1974). Ziauddin Sardar: Science, Technology And Development In The Muslim World, Op, Cit, (PP, 21-36) & Seyyed Hossein Nasr: Islamic Science an Illustrated Study. World of Islam Festefal Publishing Company Ltd, London, (1976), (PP, 1-24).

[2]– بڕوانە: محيي الدين عبد الحليم: الإعلام الإسلامي وتطبيقاته العملية، مكتبة الخانجي، القاهرة، (١٩٨٠م).

[3]– لەبارەی ڕۆڵی زانست لە پێشکەوتندا، بڕوانە کتێبی بەپێز:

Science, Technology and Society Acroos Disciplinary Perspective, Edited By Inaspiegel Rosing And Derek De Salla Price, Sage Publication, London, .((1977

تێبینیـی ئـەوە دەکرێت کـە زۆربـەی ئـەوەی تـا ئێسـتا نووسـراوە لـەبارەی خوێنـدن و گەشـەپێدان و پلاندانانی پەروەردەییەوە لە جیهانی ئیسلامییدا زۆربـەی زۆریـی درك بـە جیـاوازیی نێـوان پـەروەردەی ئیسلامیی و پەروەردەکانی تر ناکەن، بۆ نموونە بڕوانە: د. عبد الله عبد الدايم: التخطيط التربوي: أصـوله وأساليبه الفنية وتطبيقاته في البلاد العربية، دار العلم للملايين، بيروت، (١٩٨٠)، هـ. ل. جفريت: التخطيط التربوي في البلاد النامية، ترجمة د. محمد نبيل نوفل، الأنجلو المصرية، (١٩٦٩م).

کۆمەڵگە ئیسلامییەکان بگەیەنێت بە مانای ئیسلامیی بۆ پەرەپێدان.

لەگەڵ ئەوەی پەروەردەیەکی ئیسلامیی ڕەسەن لە واقعی ئەمڕۆماندا بەدی ناکرێت، بە جۆرێك بووە بە زاراوەیەکی مێژوویی و ئەگەر توێژەر بیەوێت واتا و سیماکانی ئەم زاراوەیەی بۆ ڕوون بێتەوە، ئەوا پەنا دەباتە بەر پەرتووکەکانی کەلەپوور و مێژوو، سەرەڕای نائامادەیی پەروەردەی ئیسلامیی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، کە وای کردووە ئەو زاراوەیە لە بیری زۆر کەس و توێژەردا تێکەڵ ببێت بە پێکهاتە و بەشەکانی تری پەروەردەی ئیسلامیی: وەکو پەروەردەی ئایینی[1] هەروەها پەروەردەی ئایینی تایبەت بە بانگخوازی و هەندێ لە باسەکانی ڕەوشت و بەهاکان[2].

کەچی هێشتا مانای ڕاستەقینەی پەروەردەی ئیسلامیی لە توێژینەوەی هەندێك لە توێژەراندا ڕوون و ئاشکرایە بەوەی ئەم پەروەردەیە پەروەردەیەکی تایبەتمەندە و ((هاوڵاتیی موسوڵمان)) بەرهەم دەهێنێت، ئەو هاوڵاتییەی کە خاوەن پەیام و پرۆگرامێکی ڕوونە لە هەموو بوارە جیاوازەکانی ژیاندا: بیروباوەڕ، پەرستشەکان، ڕەوشت، سیستمەکان و هەروەها هەوڵی سەرخستنی بەرنامەی خودا دەدات لە زەویدا[3]، هەر بۆیە پەروەردەی ئیسلامیی خاوەن چەمکێکی ڕوونە کە پێویستە بە

---

[1]– تێبینیی دەکرێت کە زۆربەی وەزارەتەکانی پەروەردە و فێرکردن لە جیهاندا دەکەونە ئەم هەڵە زانستییە گەورەوە کاتێك ناوی پەروەردەی ئیسلامیی لە کتێبی مەنهەجی پەروەردەی ئایینیی دەنێن لە خوێندنگەکانیاندا.

[2]– نموونە لەسەر ئەوە کتێبێك کەبەم نزیکانە لە بازاڕدا دەرکەوت بە ناونیشانی: التربیة الإسلامیة من هدي خیر البریة، للشیخ عبد الله بن محمد الخلیفي، دار الأصفهاني، جدة، بدون تأریخ، کە لەوە دەر ناچێت کتێبێك بێت لەبارەی ڕەوشت و ئاکارە ئیسلامییەکانەوە.

[3]– لەو نووسینانەی کە بەئاگایی ڕاستەقینەی تێدا دەرکەوتووە لە واتای ڕاستەقینەی پەروەردەی

هەمان شێوەی چەمکی پەروەردەی ڕووسی و ئەمریکی و پەروەردەکانی تر لەلامان ڕوون بێت... و ئەم پەروەردەیەش ڕووکار و سیما و تایبەتمەندێتیی خۆی هەیە[1].

ئەم پەروەردەیە خاوەن فەلسەفەیەکی ڕوونە، کە لە قورئان و فەرموودەوە سەرچاوەی گرتووە[2]، هەروەها پەروەردەیەکە بە درێژایی تەمەنی مرۆڤ لەگەڵیدا

---

ئیسلامی، ئەم لێکۆڵینەوانە:

- د. محمد سعيد رمضان البوطي: تجربة التربية الإسلامية في ميدان البحث، المكتبة الأموية بدمشق، بدون،
- د. زغلول راغب النجار: أزمة التعليم المعاصر وحلولها الإسلامية، من أبحاث المؤتمر العالمي للتعليم الإسلامي المنعقد بجامعة الملك عبدالعزيز بمكة المكرمة، الفترة من (٣/٢١ حتى ١٩٧٧/٤/٨م)،
- د. أحمد فؤاد الأهواني: التربية في الإسلام، دار المعارف، القاهرة، (١٩٨٠م)،
- محمد قطب: منهج التربية الإسلامية، جزءان، دار الشروق، بيروت، (١٩٨٠م)،
- عبد الله علوان: تربية الأولاد في الإسلام، جزءان، دار السلام، القاهرة، (١٩٨١م)،

– هەروەها زۆربەی ئەو نامە زانستییەکانی ماجستێر ودکتۆرا کە (د. عبد الغني عبود) سەرپەرشتیی کردووە لەبواری پەروەردەی ئیسلامییدا.

[1]– دیارییکردنی واتای پەروەردەی ئیسلامیی و تایبەتمەندییەکانی و بوارەکانی لێکۆڵینەوە تێیدا لە مەسەلە گرنگەکانە، کە شایەنی ئەوەیە لێکۆڵینەوەی تێدا بکرێت.

– خودی لێکۆڵەریش لە ئێستادا خەریکی ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەیەکە لەم مەسەلەیەدا و، لەو لێکۆڵینەوانەی شتێکیان لەو بارەوە تێدا دەبینین لەپاڵ ئەو لێکۆڵینەوانەی لە پەراوێزی پێشوودا باسمان کرد.

– د. محمد منير مرسي: التربية الإسلامية: أصولها وتطورها في البلاد العربية، عالم الكتب، (١٩٧٧م)، (ص ٣٠، ٣١)،

– د. سعيد إسماعيل: أصول التربية الإسلامية، دار الثقافة، القاهرة، (١٩٧٦م).

– د. عبدالفتاح جلال: من الأصول التربوية في الإسلام، سرس الليان، (١٩٧٧م).

[2]– بۆ نموونە بڕوانە:

– علي خليل أبو العينين: فلسفة التربية الإسلامية في القرآن الكريم، دار الفكر العربي، (١٩٨٠م)،

بەردەوامــە و هــەموو تەمەنــەکان (بــە منــداڵ و گــەورەوە) و دامــەزراوە فــەرمی و نافەرمییەکانیش دەگرێتەوە[1]، هەروەها پەروەردەیەکی کامڵ و گشتگیرە و مرۆڤ لە هەموو ڕوویەکەوە پەروەردە دەکات، لەڕووی جەسـتە و عـەقڵ و ڕۆح و ویژدانـەوە، بە پێچەوانەوەی پەروەردەکانی ترەوە، کە گرنگیی بە یەکێك لەم لایەنانە دەدەن و لایەنــەکانی تــر پشــتگوێ دەخــەن، پــەروەردەی ئیسـلامیی بەرپرسـیارێتیی تـاك و کۆمەڵگایە و دەبێت پێی هەڵبستن و خاوەنی کۆمەڵێك سیستمی دارایی و کـارگێڕی ئاسـان و سـاکارە و پڕپـەتی لـە ڕاوێـژ و دیموکراسـیەت و ڕێزگـرتن لـە کەسـایەتی مامۆستا و خوێندکار. لـەم پەروەردەیـەدا گوفتـار وابەسـتەی کـردارە و بیردۆزیـش بەپراکتیزەکردنەوە، هەروەها کرانـەوە لەگـەڵ پاراسـتنی ڕەسـەنێتیدا پێکـەوە کـۆ دەکاتــەوە. ئــەم پەروەردەیــە نەبەســتراوەتەوە بــە چوارچــێوەیەکی دیــاریکراوەوە لەڕووی کـات و شـوێن و پرۆگرامـەوە، جیـا لـە پـەروەردەکانی تـر زیـاتر پشـت بـە ڕۆشــنبیرکردنی تــاك و گفتوگــۆ و دیبــەیت و گەشــتکردن دەبەســتێت لــەپێناو بەدەستهێنانی زانستدا، نەوەك تەنها پشت بـە گـوێگرتن و وەرگـرتن ببەسـتێت بـە هاوشـێوەی پــەروەردەکانی تــر. پشــت بــە تاقیکردنــەوەش نابەســتێت، بــەڵکو دەوەســتێتە ســەر ڕادەی خوێنــدن و وەرگــرتن و تێگەیشــتنی خوێنــدکارەکانی. هەروەها ئەم پەروەردەیە دەوڵەمەندە بە بـوونی پێشـەنگی بـاش، لـەپاڵ ئەمەشـدا

---

– عبدالجواد السيد بكر: التربية الإسلامية كما تبدو في ضوء الحديث الشريف، رسالة ماجستير غير منشورة، تربية طنطا، (١٩٨٠م)،

– د. عمر التومي الشيباني: فلسفة التربية الإسلامية، الشركة العامة للتوزيع والنشر، طرابلس، (١٩٧٨م).

[1]– د. عبدالغني عبود: ((التعليم مدى الحياة في الإسلام))، من كتاب: في التربية المعاصرة، د. إبراهيم عصمت مطاوع، د. عبد الغني عبود، دار الفكر العربي، القاهرة، (١٩٧٧م).

– دەربارەی فرەچەشنیی دامەزراوە فێرکارییەکان لە ئیسلامدا، بڕوانە سەر: د. أحمد شلبي: تأريخ التربية الإسلامية، النهضة المصرية، القاهرة، القاهرة، (١٩٧٣م)، (ص ٤١–٢٠٥).

بایەخ بە پەروەردەی ڕەوشتی خوێندکار دەدات[١].

ئەمەیە پەروەردەی ئیسلامیی، کە بەرهەمەکەی بریتیی بوو لە ژیارستانی ئیسلامیی پرشنگدار و زانستە جۆراوجۆرەکانی[٢] و هونەر و دابونەریت و سیستمە مرۆییە نایابەکانی[٣]. بە بۆچوونی توێژەر (پەروەردەی ئیسلامیی) بەو واتا و تایبەتمەندییانەی باسمان کرد، دەروازە و ڕێگاچارەیە بۆ سەرلەنوێ پەرەپێدانی کۆمەڵگا ئیسلامییەکان لە جیهانیی ئێستاماندا، هەر وەکو چۆن پێشتریش هۆکاری پێشکەوتن و ڕاپەڕین و پێشەنگایەتی بووە لە جیهاندا. بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە سەرەتاییە پێویست بە بەڵگە و توێژینەوەی زیاتر دەبێت پێش ئەوەی وەر بگیرێت و بڵاو بکرێتەوە و جێبەجێ بکرێت، یاخود بدرێتە بەر ڕەخنە و ڕەت بکرێتەوە.

---

[١]– ڕەوشتەکانی زانا و خوێندکار لە کەلەپووری پەروەردەییماندا زیاترە لەوەی بژمێردرێن، بڕوانە:

ـ د. محمد ناصر: الفكر التربوي العربي الإسلامي، وكالة المطبوعات، الكويت، (١٩٧٧م)،

ـ كتاب ابن الجوزي: نقد العلم والعلماء أو تلبيس إبليس، المطبعة المنيرية، القاهرة، بدون،

ـ د. عبدالفتاح أبو غدة: صفحات من صبر العلماء على شدائد العلم والتحصيل، مكتب المطبوعات الإسلامية، حلب، (١٩٧٤م).

[٢]– ئەوەی دەربارەی ئاسانکاریی موسڵمانان نووسراوە لە بەرەوپێشچوونی زانستدا زۆرە، بۆ نموونە بڕوانە:

ـ زيغريد هونكة: شمس العرب تسطع على الغرب، ترجمة د. فاروق بيضون، كمال دسوقي، دار الآفاق الجديدة، بيروت، (١٩٧٩م).

ـ عمر فروخ: تأريخ العلوم عند العرب، دار العلم للملايين، بيروت،

ـ عبدالحليم منتصر: تأريخ العلم ودور العلماء العرب في تقدمه، دار المعارف، القاهرة، (١٩٦٩م).

[٣]– دەربارەی تایبەتمەندییەکانی ژیاری عەرەبیی ئیسلامیی و ئاراستە مرۆڤایەتییەکانی، بۆ نموونە بڕوانە: د. ناجي معروف: أصالة الحضارة العربية، دار الثقافة، بيروت، (١٩٧٥م)، (ص ١٦١–٣٨٤).

# کۆتایی:

لەم بابەتەی پێشکەشمان کرد هەوڵمان دا بناغەیەك بۆ چەمکەکانی (ئوممەت و ڕۆشنبیریی و پەرەپێدان) دابنێین لە ڕوانگەی ڕۆشنبیریی و ژیاریی ئیسلامیمانەوە، ڕوونیشمان کردەوە چۆن ئەم چەمکانە لە هۆش و عەقڵی موسوڵمانانماندا ماناگەلێکی جیاواز لەخۆ دەگرن کە لە هەندێك شوێندا لە واتا ڕۆژئاواییەکانیان نزیك دەبنەوە و لە زۆر شوێنی دیکەدا جیاوازن و لێیان دوور دەکەونەوە، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەقە ئایینییە ڕاست و جێگیرانەی لە ناخی موسوڵماناندا ڕەگیان داکوتیوە و لێی جیا نابنەوە، بۆیە پێویستە وەك موسوڵمان فەرهەنگی چەمك و زاراوەی تایبەت بە خۆمان هەبێت تا لەو ڕێیەوە چارەسەری پرسە زانستیە جیاوازەکانی پێ بکەین، ئەم گەشتەی لەگەڵ ئەم سێ چەمکەدا ئەنجاممان دا نموونەیەکە پێمان دەڵێت پێویستە هەموو چەمکەکانمان بەم شێوەیە لەلامان ورد و ڕوون بن و بگونجێن لەگەڵ بنەما سەرەکییەکانی ئایینی ئیسلام لە قورئان و فەرموودە، بەمەش چەمکەکان تەواوکاری یەکتر دەبن لەنێوان پێدراوی ڕۆژئاوا و

سرووشی خودایی، کە دەکرێت ببێتە شۆڕشێکی ڕۆشنبیریی و هەموو جیهان لێی سوودمەند بێت بە ڕۆژهەلأت و ڕۆژئاواوە، بەمەش هەردوولا لە ئاسۆی تەسکی تاکڕەوی سەرچاوەی زانستی ڕزگاریان دەبێت: لە عەقلّ یاخود نەقلّەوە بۆ فراوانی تەواوکاری زانستە عەقلّی و نەقلّییەکان پێکەوە، پرسیارەکە لێرەدایە: ئایا زانایانی موسوڵمان توانادارن لەسەر پێشکەشکردنی ئەم بابەتە بەم پێکهاتە تەواوکارییە؟[1]

لە کۆتاییدا ئاماژە بەو خاڵە دەکەین کە هەرسێ چەمکەکە تێیدا هاوبەشن، ئەویش بریتییە لەوەی: ڕۆشنبیریی ئیسلامیی تواناداره لە بەدیهێنانی پەرەپێدانی هەمەلایەنەی ئیسلامیی لەنێو ئوممەتی ئیسلامیی یەکگرتوودا.

***

---

[1]– بۆ وردەکاریی زیاتر لەبارەی چەمکی تەواوکاریی مەعریفییەوە بڕوانە:

– أبو بكر أحمد محمد إبراهيم: مفهوم التكامل المعرفي وتطبيقاته في المناهج الجامعية، دراسة في تجربة كلية معارف الوحي الإسلامي والعلوم الإنسانية بالجامعة الإسلامية العالمية – ماليزيا (١٨٨٩م–٢٠٠٠م) رسالة دكتوراه، مقدمة إلى الجامعة الإسلامية بماليزيا، مايو (٢٠٠٤م).

# تەواوكاریی مەعریفیی
# وەك ئامرازێك بۆ چاكسازیی لە خوێندنی زانكۆدا:
# كۆلێژەكانی پەروەردە وەك نموونە[1]

## پێشەكی:

دەوڵەتانی جیهان كەم تا زۆر بایەخ بە چاكسازیی خوێندنی زانكۆ دەدەن، وەك ئامرازێك بۆ پێشكەوتن و پێشڕەویكردن لە كێبڕكێی جیهانیدا بۆ بەدەستهێنانی هێز و سامان و هەژموونی زیاتر، بۆیە شتێكی سەیر نییە ئەگەر میسر بایەخ بە پەرەپێدانی خوێندنی باڵا بدات. ئەوە بەسە باسی بكەین كە وەزارەتی پەروەردە و فێركردن بەم كۆتاییانە ٢٥ پڕۆژەی دانا، كە لە سێ قۆناغدا جێبەجێ دەكرێن، هەر قۆناغێكیان لەگەڵ پلانی پێنجساڵەی دەوڵەتدا ڕێك دەكەوێت لە (٢٠٠٢ز)ەوە بۆ (٢٠١٧ز)، هەروەها چەند بڕیارێكی وەزاری دەر كرا بۆ پێكهێنانی لیژنەی ئاسانكاری و یەكەی بەڕێوەبردنی پڕۆژەكانی پەرەپێدان بۆ دامەزراوەكانی خوێندن لە میسر. ڕێككەوتن كرا لەسەر تیشكخستنەسەر شەش پڕۆژە وەك سەرەتایەك لە

---

[1] - پێشەكییەك بۆ یانزەیەمین كۆنگرەی ساڵانەی عەرەبیی سێیەم -خوێندنی زانكۆی عەرەبی- ئاسۆكانی چاكسازیی و پەرەپێدان، بە هاوكاریی لەگەڵ ناوەندی خوێندنی زانكۆیی، زانكۆی (عین شمس)، وە ناوەندی لێكۆڵینەوە مەعریفییەكان لە (قاهرە)، لەنێوان (١٨-٢٢ كانوونی یەكەم ٢٠٠٤م)

ماوەی قۆناغی یەکەمدا، کە ئەمانەن:

- پڕۆژەی پەرەپێدانی کۆلێژەکانی پەروەردە (FOEP).
- پڕۆژەی پەرەپێدانی کۆلێژە ئەلیکترۆنییەکانی میسر (ETCP).
- پڕۆژەی پەرەپێدانی تواناکانی ئەندامانی دەستەی وانەوتنەوە و سەرکردایەتییەکان (FLDP).
- پڕۆژەی تەکنەلۆجیای زانیاریی و پەیوەندییەکان (ICTP).
- پڕۆژەی دڵنیایی لە کوالێتیی و ڕاپەڕموونی (QAAP).
- پڕۆژەی سندوقی گەشەدان بە خوێندنی باڵا (HEEPF).

لیژنە و بەڕێوەبەری جێبەجێکار بۆ بەدواداچوونی کاری هەریەك لە پڕۆژەکان دانران و پارەی پێویست بۆ هەرشەش پڕۆژەکە دابین کرا لەڕێی قەرزکردنی پەنجا ملیۆن دۆلاری ئەمریکی لە بانکی نێودەوڵەتی، هەروەها تێچووەکەیان لەلایەن حکومەتی میسر و چەند سەرچاوەیەکی ترەوە دابین دەکرا، وەك: دەستەی هاوکاریکردنی ئەمریکی و بەریتانی – سندوقی عەرەبیی کەنداو – یەکێتیی ئەوروپا، جگە لە ئابوونەیەك کە لە کۆمپانیای فۆردی ئەمریکییەوە دابین کرابوو بۆ ئامادەکردنی خوێندنی خودی بۆ کۆمەڵێك لە کۆلێژە تاقیگەییەکان و ئامادەکردن و پاڵپشتیکردنی ماددی بۆ لێکۆڵینەوەی جەدوای تەفسیلی پێکهێنانی دەستەیەکی نەتەوەیی بۆ دڵنیایی لە کوالێتی و ڕاپەڕموونی [١].

وە هەرکەسێك بڕوانێت لە ڕێبەری ڕاهێنان، کە لیژنەی نەتەوەیی بەڕێوەبردنی پڕۆژەی گەشەدان بە تواناکانی ئەندامانی دەستەی وانەوتنەوە و سەرکردایەتیەکان (پڕوژەی سێیەم) دەری کردووە، ئەو ماندووبوونە گەورەیە دەبینێت کە بەخەرج

[١]– مهنى ابراهيم غنايم: (قصة المعايير القومية للتعليم لماذا؟ وكيف؟) لە لێکۆڵینەوەکانی کۆنگرەی زانستیی ساڵانە لەکۆلێژی پەروەردە لە (منصورە)، (٢و٣ ی ئاب ٢٠٠٤ن)، (لا ٢٣٧– ٣٨٣).

دراوه لــەپێناو دەستنیشــانکردنی ئــەو لێهاتووییانــەی پێویســتە لــە دەســتەی وانەوتنــەوە و ســەرکردایەتییەکانی زانکــۆدا هــەبێت، هــەروەها کۆکردنــەوەی ئــەو لێهاتووییانە لە شازدە خولی ڕاهێناندا: ڕاهێنـانی کـارا، شـێوازەکانی لێکۆڵینـەوەی زانستی، زانکۆ و کۆمەڵگـە، پەرەپێدانی ڕێکخـراو، توانـای بڕیـاردان و چارەسـەری کێشەکان، لایەنـە یاسـاییەکان لـە زانکۆکانـدا، لایەنـە مادديیـەکان لـە زانکۆکانـدا، هونەرەکانی نمایشکردنی کارا، هونەرەکانی پەیوەندیی کارا، بـەڕێوەبردنی مـرۆڤ، هێـزە پاڵنــەرەکان بـۆ گرووپــی کــار، هونــەرەکانی بیرکردنــەوە، کارامەییــەکانی بەڕێوەبردن، بەڕێوەبردنی کات و پاڵەپەستۆی کار، ڕەوشت و ئادابەکانی پیشە، لە هـەر زانکۆیەکیشـدا ناوەنـدی ڕاهێنـان کرایـەوە[١]، لـە زۆربـەی زانکـۆ میسـرییەکاندا دەست کرا بە جێبەجێکردنی ئەو بەرنامانە.

سەرەڕای ڕێزی توێژەر و بەرزنرخاندنی ئەو کۆششـە گەورەیـە کـە هێشـتا کـات زووە بۆ بڕیاردان لەسەری و هەڵسەنگاندنی، بەشی هەرەزۆری بنەماکەی هاوردەیـە و زۆر کـەمی لـە کانیـاوی عـەرەبی و ئیسـلامیی ڕەسـەن سەرچـاوەی گرتـووە. بـە بۆچوونی توێژەر پێویستە تیشك بخرێتە سەر پـڕۆژەی گەشـەدان بـە کۆلێـژەکانی پەروەردە، نەك تەنها لەبەر ئەوەی خۆی ماوەی سیودوو ساڵە کاریان تێدا دەکـات، کە وا دەکات شارەزاتر بێت تێیدا، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە ژمارەی ئەو کۆلێژانە لـە میسر و تەواوی جیهانیی ئیسلامیدا بە ڕێژەیەکی بەرچاو بـەردەوام لـە زیادبوونـدان لــەپێناو دابینکردنــی خواســتە جۆراوجۆرەکــانی کۆمەڵگــە هــەروەها لــەپێناو فراوانکردنی خوێندندا بەهەم وو قۆناغ و جۆرەکانیەوە، بە هەمان شـێوە لـە چـەند

---

[١]- اللجنة القومية لإدارة مشروع تنمية قدرات أعضاء هيئة التدريس والقيادات: دليل برامج التدريب، وزارة التعليم العالي، وحدة تنفيذ المشروعات، (٢٠٠٣م).

سـاڵی داهـاتوودا ژمـارەی خوێنـدکاریش زیـاد دەکـات[1]. بـە زیـادبوونی ژمـارەی خوێندکارانی پەروەردە گرنگییان کەم ناکات، بەڵکو زیادیش دەکات، بەوەی ئەوان بەشێکی گرنگیی چینی گەنجان پێك دەهێنن کە هیوای ئەم ئوممەتەن لە ڕابـوون و پێشکەوتندا[2].

گرنگیی خوێندکارانی پەروەردە تـەنیا لـەوەدا خـۆی نابینێتـەوە کـە لـە چـینی گـەنجانن، بـەڵکو ئەمانـەتی پێگەیانـدن و ئامـادەکردنی نـەوەکانی داهاتویـان لـە ئەسـتۆدایە، تـاکو بتـوانن هـەڵگری بەرپرسـیارێتیی ئایینـدە و ئاڵنگاریـەکانی بـن، کارێکی قبوڵکراو و لۆژیکی نییە کـە ئـەو زانسـتانەی پێشکەشـی ئـەو خوێندکارانـە دەکرێت هەڵگری ڕۆح و ناوەڕۆکێکی ڕۆژئـاوایی بـن و تـەنیا لـە یـەك ڕوانگـەوە بـۆ مەعریفە و زانستە پەروەردەییەکان بڕوانن.

لەبەر ئەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەڕووی کات و شوێنەوە بواری ئـەوە نـادات دەسـت ببەین بۆ تێکڕای ئەو زانستانەی پێشکەش بە خوێنـدکارانمان دەکـرێن لـە کۆلێـژەکانی پـەروەردەدا، هـەروەها نـاتوانین بەدرێـژی ڕوونـی بکەینـەوە ئـەو زانسـتانە چـۆن لـە میتـۆدێکی مـەعریفی ڕۆژئاواییـەوە هەڵـدەقوڵێن کـە سـەرووش دوور دەخاتـەوە لـە سەرچـاوەکانی مەعریفـە، هۆکارەکـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەزموونی ڕۆژئـاوا لەگـەڵ کڵێسەدا، کە دەرەنجامەکەی گەیشت بە ڕیشەکێشکردنی ئایین لـە زانسـت، بـەڵکو ئـەم لێکۆڵینەوەیە تەنیا جەخت لەسەر نامۆیی زانسـتە پـەروەردەییاکان دەکـات کـە ئێسـتا خوێندکارەکانمان لە کۆلێـژەکانی پـەروەردەدا دەیـانخوێنن، هـەروەها کاریگـەریی ئـەو

---

[1]- بۆ زیاتر ئاگاداربوون لە گەشەسەندنی ساڵانەی ژمارەی خوێندکار و مامۆستا لە قۆناغە جیاوازەکانی خوێندندا، بڕوانە: محمد أحمد الشريف وآخرون: استراتيجية تطوير التربية العربية، المنظمة العربية للتربية والثقافة والعلوم، القاهرة، (١٩٧٦م)، الجدول من (١-١٠) (ص ٣٨٥-٣٩٣).

[2]- محمد محمد التومي الشيباني: الأسس النفسية والربوية لرعاية الشباب، بيروت، دار الثقافة، (١٩٧٥م)، (ص ٢٠-٣٠).

نامۆییــه لەســەر خوێنــدکارەکانمان، کــه هــەوڵی پــەروەردەکردنیان دەدات لەســەر شوێنکەوتوویی ڕۆشنبیریی و شانازینەکردن به شوناسی ژیارستانیی نایابمانەوە.

مەبەســتیش لــەو زانســتە پەروەردەییانــەی ئــەم لێکۆڵینەوەیــه گرنگیــی بــه دەرخســتنی ڕوانینــه یەکلابینیــه ڕۆژئاوایيیەکــەیان دەدات هــەموو ئــەو میتــۆدە پەروەردەییانەن که خوێندکارانی کۆلێژ و پەیمانگاکانی پــەروەردە دەیــانخوێنن لــه ماوەی ئامادەکردنی پەروەدەییانەدا، پێش خزمەتکردنیان بێت یان دوای خزمــەت، هەروەها ئەو خوێندکارانەی ئامادەکاری دەکەن بۆ بوون به مامۆستای قۆناغێك یان بابەتێك یان چــەند بابــەتێکی لەیــەکنزیك، یــاخود خوێنــدکارانی خوێنــدنی بــاڵا، لــه کاتێکدا زانستەکانی تر که خوێندکارانمان له کۆلێژەکانی پــەروەردەدا دەیخــوێنن و ڕێخۆشــکەرن بــۆ نــامۆبوونی زیاتریــان، لــەڕووی هزرییــەوە بــەجێی دەهــێڵم بــۆ شــارەزایانی تــر لــه بوارەکــانی بــەدەر لــه پــەروەردە، کــه هــەموویان لــه زۆربــەی ڕووەکانەوە به دارِشتنێکی یەکلابینیی ڕۆژئاواییانه دارێژراون.

## مەبەستمان چییه له تەواوکاریی مەعریفی؟

مەبەستمان له تەواوکاریی مەعریفی سەرکەوتنی عەقڵی موسڵمانه لــه ســەردەمه زێڕینەکانیدا لەوەی هەموو پێدراوەکانی هەست و عــەقڵ و ســرووش پێکــەوە گــرێ بدات، یەکانگیرییــەکی مــەعریفیی تــەواو، کــه هیچــکام لــه سەرچاوەکانی مەعریفــه فەرامۆش نەکات چەشنی مەعریفەی ڕۆژئاوایی هاوچەرخ، که تەنیا له یەك ڕوانگەوە بۆ دیاردەکان دەڕوانێت. که سرووشی دوور دەخاتەوە لەوەی سەرچاوەیەك بێت له سەرچــاوەکانی مەعریفــه[١]، جــا ئەگــەر ئــەوە تایبــەت بێــت بــه ڕۆژئــاواوە بــەهۆی

[١]– بۆ چوونەوە سەر وردەکاریی زیاتر دەربارەی ڕوانینی تەواوکاری ئیسلامیی بۆ مەعریفه بڕوانه:

ـ عبد الرحمن النقيب ((منهج المعرفة في القرآن والسنة)) دراسة تحليلية مقارنة في بحوث ((في التربية الإسلامية))، دار الفكر العربي، (١٩٨٧م)، (٣/٣٧–٦٤).

بارودۆخی مێژووییەوە کە کڵێسە زانست و زانایانی دەچەوساندەوە، هەروەها زیاد لە ئینجیلێك هەبوو کە بەشێکیان شێوێندرابوون و هەندێ لە دەقەکانی لەگەڵ بەشێك لە ڕاستییە زانستییەکان پێچەوانە بوو، ئەم دۆخە تەواو جیاوازە لە ڕاستیی و جێگیریی قورئانی پیرۆز و فەرموودە صەحیحەکان[1].

بە پێچەوانەی عەقڵی ڕۆژئاوایی هاوچەرخ، سرووش –قورئانی پیرۆز و فەرموودەی صەحیح– بە یەکێك لە سەرچاوەکانی مەعریفە دادەنرێت و خودای گەورە منەتی پێ کردووە بەسەر بەندەکانیدا و لەڕێی سرووشەوە مرۆڤ ئەو شتە فێر دەبێت کە پەی پێ نابردرێت، مەگەر لەڕێی سرووشەوە نەبێت، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندیی بە بیروباوەڕ و پەنهانەوە هەیە، سەرەڕای ئەوەی کە سرووش پاڵنەری عەقڵی موسڵمانە بۆ بیرکردنەوە و گەڕان لە بوارە جۆراوجۆرەکان، هەر وەك دەزانین سرووش سەرچاوەکەی خودایە، خوداش بەدیهێنی زانایە، ئا لێرەوە خاڵی بەهێزی ئەم سەرچاوە مەعریفییە سەرچاوە دەگرێت.

لە چەندین ئایەتی قورئانیدا سرووش وەك سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی مەعریفە ناسێنراوە، وەك: ﴿وَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيْكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُنْ تَعْلَمُ﴾{النساء: ١١٣} واتە: ((خودای گەورەش قورئان و دانایی بۆ دابەزاندوویت فێری

---

ـ فتحي حسن ملكاوي (محرر): نحو نظام معرفي إسلامي، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، الأردن، عمان، (٢٠٠٠م).

ـ عبد الرحمن الزينيدي: مصادر المعرفة في الفكر الديني والفلسفي، دراسة نقدية في ضوء الإسلام، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، الرياض، (١٩٩٢م).

[1]– بڕوانە:

ـ موريس بوكاي: دراسة الكتب المقدسة في ضوء المعارف الحديثة، دار المعارف، (١٩٧٨م).

ـ عبد الرحمن النقيب: المنهجي الإسلامية في البحث التربوي نموذجا: النظرية والتطبيق، دار الفكر العربي، (٢٠٠٤م)، (ص ١١٥–١١٧).

ئەو شتانەی دەکردی کە پێشتر نەتدەزانی)) ﴿حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلَاةِ الْوُسْطَى وَقُومُوا لِلَّهِ قَانِتِينَ (٢٣٨) فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا فَإِذَا أَمِنْتُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُمْ مَا لَمْ تَكُونُوا تَعْلَمُونَ﴾{البقرة: ٢٣٨، ٢٣٩} واتە: ((کەمتەرخەمی مەکەن و پارێزگاری لە ئەنجامدانی نوێژەکاندا بکەن، بەتایبەت نوێژی ناوەند (کە نوێژی عەسرە) هەمیشە و بەبەردەوامییش هەستن بە ئەنجامدانی فەرمانەکان بۆ خودا بە گەردنکەچییەوە (٢٣٩) ئینجا ئەگەر ترسان (نوێژ بکەن) بە پیادە یان بەسواری ئەنجامی بدەن کە ترستان نەما ئەوسا یادی خودا بکەن بەو شێوەیەی کە فێری کردوون و پێشتر نەتاندەزانی)). ﴿كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولاً مِنْكُمْ يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُمْ مَا لَمْ تَكُونُوا تَعْلَمُونَ﴾ {البقرة: ١٥١} واتە: ((هەر وەکو لەنێوتاندا پێغەمبەرێکم بۆ ڕەوانە کردوون کە ئایەتەکانی ئێمەتان بەسەردا دەخوێنێتەوە، دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ئاشکراتان خاوێن دەکاتەوە، فێری قورئان و داناییتان دەکات، ئەو شتانەتان فێر دەکات کە هەرگیز خۆتان نەتاندەزانی)). ﴿وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلَائِكَةِ فَقَالَ أَنْبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلَاءِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (٣١) قَالُوا سُبْحَانَكَ لَا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَا﴾{البقرة: ٣١،٣٢} واتە: ((خودا ناوی هەموو شتێکی فێری ئادەم کرد لەپاشان ئەو شتانەی نیشانی فریشتەکان دا و پێی فەرموون: ناوی ئەمانەم پێ بڵێن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن کە ئێوە لە ئادەمی باشترن. هەموویان وتیان: پاکی و بێگەردی تەنها شایستەی تۆیە، ئێمە هیچ زانستێکمان نییە تەنها ئەوە نەبێت کە تۆ فێرت کردووین)) ﴿الرَّحْمَنُ (١) عَلَّمَ الْقُرْآنَ (٢) خَلَقَ الْإِنْسَانَ (٣) عَلَّمَهُ الْبَيَانَ﴾{الرحمن: ١-٤} واتە: (( خودای میهرەبان، کانگای سۆز و ڕەحمەت. قورئانی فێری ئادەمیزاد کردووە. هەر خودا ئادەمیزادی دروست کردووە. هەر ئەویش فێری گوفتار و ئاخاوتنی کردووە)). ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤) عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى﴾{النجم: ٤،٥}

واتە: (( ئەمەی کە ڕای دەگەیەنێت تەنها سرووش و سرووشی خواییە. جوبرەئیلی فریشتە خاوەنی هێز و توانای زۆر، قورئانی فێر کردووە)). ﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِنْ أَنْفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾{آل عمران: ١٦٤} واتە: ((خودا منەتی ناوەتە سەر ئیمانداران کاتێك پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردوون لە خۆیان، ئایەتەکانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە، دڵ و دەروونیان پاڵفتە دەکات، هەروەها فێری قورئان و داناییان دەکات، بەڕاستی پێشتر لە گومڕاییەکی ئاشکرادا ڕۆ چووبوون)). ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ﴾ {المائدة: ٦٧} واتە: ((ئەی پێغەمبەر و فرستادە، هەرچی فەرمان و پەیامێکت بۆ دابەزیوە لەلایەن پەروەردگارتەوە ڕای بگەیەنە، خۆ ئەگەر بەو کارە هەڵنەستایت، ئەوە مانای وایە پەیامەکەت نەگەیاندووە)). ﴿وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾ {طه: ١١٤} واتە: ((بڵێ پەروەردگارا، بەردەوام زانست و زانیاریی زیاترم پێ ببەخشە)). ﴿نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَنْ نَشَاءُ وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾{یوسف: ٧٦} واتە: ((هەرکەس کە بمانەوێت بەرز و بڵندی دەکەینەوە و لە سەروو هەموو خاوەن زانست زانیارییەکەوە زانا و شارەزاتر هەیە))... هتد.

سرووش چەندین دەرگای زانست و زانیاریی لەبەردەم عەقڵی موسڵماندا کردنەوە، نەك تەنها لە بواری زانستە شەرعیی و زمانەوانییەکاندا، بەڵکو ئەوانەشی تێپەڕاند بۆ زانستەکانی پزیشکیی و جەدەل و ڕوخسارناسی و ئەندازیاری و جەبر و هاوکێشەزانی و ئەستێرەزانی و چەندانی تر. جا هەموو زانستەکانی نەحو و ڕەوانبێژیی و تەفسیر و بنەماکانی ئایین و مێژوو و بەسەرهاتەکان و ئامۆژگاری و پزیشکیی و هەندەسە لەدەوری قورئانەوە دەر کەوتن[١].

[١]– بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم گوتەیە بڕوانە: طاش کبری زادە: مفتاح السعادة ومصباح السیادة، دار الکتب

سرووش بابەتی سەرەکیی هەموو زانستەکانە، تەنانەت ژیارستانیەتی ئیسلامیی جگە لە هەولێك بۆ خستنەڕووی هزری و مەنهەجیی ئەم سرووشە هیچی تر نییە... ئەمەش لە خودی پێکهاتەی ئەو زانستانەدا بەڕوونی دەر دەکەوێت، ((زانستی بنەماکانی فیقه (أصول الفقه) بەو سرووشە دەست پێ دەکات کە لە قورئان و فەرموودەدا هەیە وەك بناغەیەك بۆ ئەو هەستە مێژووییەی بە ڕۆڵی خۆی هەڵدەستێت بە نەقڵکردن لەڕێگەی میتۆدەکانی ڕیوایەت و تەواتور و ئاحاد، زانستی کەلامیش بە سرووش دەست پێ دەکات کاتێك ئایەت و فەرموودەکانی شی دەکاتەوە لەپێناو وێناکردنی زاتی خودا و سیفات و کردارەکانی، سۆفیگەرییش بە سرووش دەست پێ دەکات کە فەرمان و ڕێگریکردنەکانی (الأمر و النهي) لە ڕەفتارەکاندا ڕەنگ دەدەنەوە، فەلسەفەش بە سرووش و تێگەیشتن لێی دەست پێ دەکات، بە شێوەیەك بتوانێت لەم ڕێیەوە هەموو ژینگە ڕۆشنبیرییە لێکنزیکەکان لەخۆ بگرێت))[1]، زانستە سروشتییەکانی فیزیا و کیمیا و فەلەك و زیندەزانی و بیرکارییەکان بە هەمان شێوە بە سرووش دەست پێ دەکەن، کە بریتین لە هەولێك بۆ تێگەیشتن لە یاسا خوداییەکان بە مرۆڤ و گەردوون و ژیانەوە و شیکردنەوەی ئەو یاسایانە بە شێوەیەك کە بتوانرێت لە بەرژەوەندیی مرۆڤدا بەکار بهێنرێن. ئەمە هۆکارە بۆ ئەوەی زانایەکی وەکو ئەبو حەسەن لە مزگەوتدا دابنیشێت و خەریکی خوێندنی فەلەك بێت لە ((المجسطى))دا و کۆمەڵێك زانایان دێن بەسەریدا و یەکیان لێی دەپرسێت: چی دەخوێنیت؟ ئەویش گوتی سەرقاڵی ڕاڤەکردنی ئایەتێکم لە ئایەتەکانی خودای گەورە، زاناکەش گوتی: کام ئایەت؟ ئەنباریش گوتی: ﴿أَفَلَمْ يَنْظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا﴾{ق: ٦} واتە: ((ئایا تا ئێستا نەیانڕوانیوە

---

الحديثة، (١٩٦٨م)، مرجع سابق، (٢/٥٣٠-٥٣٧).

[1]- حسن حنفي: التراث والتجديد، المركز العربي للبحث والنشر، القاهرة، (١٩٨٠م)، (ص ١٧٤-١٩٢).

لــه ئاسمــان بــه ڕاســەریانەوە چـۆن بنیاتمــان نــاوە)). جــا مــن ڕاڤــەی چـۆنیەتیی بیناکردنەکەی دەکەم. هـەمان واتـا لەلایـەن زانایـەکی تـر دەدۆزینـەوە کـە هـەمان پرسیاری لێ کرا، ئەویش لە وەڵامدا گوتی: سەرقاڵی ڕاڤەکردنی ئەم ئایەتەم: ﴿أَفَلاَ يَنْظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ (١٧) وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ (١٨) وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ (١٩) وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ﴾{الغاشية: ١٧-٢٠}[١] واتـە: ((ئایا نـاڕوانن بـۆ وشتر چـۆن بـەدی هێنـراوە و بـۆ ئاسمـان چـۆن بـەرز کراوەتـەوە و چیاکان چـۆن داکوتراون و بۆ زەویی چۆن تەخت کراوە)).

یەکێك لە لێکۆڵەرەکان ئامارێکی کرد بۆ ئەو ئایەتانەی لە قورئانـدا هـاتوون کـە باس لە زانستە سروشتییەکان دەکەن، بۆی دەر کەوت زیـاد لـە دە-یـەکی قورئـان پێك دەهێنن. لە کۆی (٦٢٥٧)[٢] ئایەت لە قورئانـدا بینیـی (٦٧٠) ئایـەت بـاس لـە بابەتە زانستییە جیاوازەکان دەکەن کە بەم شێوەیە دابەش بوون:

بیرکاریی (٦١)، فیزیـا (٦٤)، گەردیلـە (٥)، کیمیـا (٩)، ڕیـژەیی (٦٢)، فەلـەك (١٠٠)، کەشوهەوا (٢٠)، بیرکـاریی (٥٧)، ئـاو و دەریـا و ڕوبارەکـان (١٤)، زانسـتی بۆشــایی (١١)، زانســتی زینــدەوەران (١٢)، کشــتوکاڵ (٢١)، زینــدەزانیی (٢٦)، جوگرافیای گشتی (٧٣)، زانسـتی ڕەچـەڵەکە مرۆییـەکان (١٠)، چینەکانی زەویـی (٢٠)،گەردوون و مێژووی ڕووداوە گەردوونییەکان (٣٦)، باسـی زانسـت و زانایـان و هاندان لەسەر زانستدۆستیی (٦٤)[٣].

---

[١]- ظهير الدين البيهقي: تأريخ حكماء الإسلام، تحقيق: محمد كرد علي، مطبعة الترقي بدمشق، (١٩٤٦م)، (ص ١٠٣، ١٠٤).

[٢] ژمارەی ئایەتەکان بەپێی ئەو موصحەفەی ئێستا لەبەردەستە بەم شێوەیە نییە، پێشنیار دەکەم هاوتای ژمارەی ئەو موصحەفە بکرێت کە ئێستا لەبەردەستە بروانە لاپەرە ١٠٢ نوسخە عەرەبیەکەی ئەم کتابە.

[٣]- يوسف مروة: العلوم الطبيعية في القرآن، منشورات مروة العلمية، بيروت، (١٩٦٨م)، (ص ٧١).

جێی باسە زانستی و ئایینییەکان لای عەقڵی موسڵمان یەکیان گرت و ئەم ڕشتە مەعریفییە پتەوەی لێ بەرهەم هات کە سرووش لە عەقڵ و هەستەکان جیا ناکاتەوە، یان عەقڵ و هەستەوەرەکان لە تێگەیشتنی سرووش جیا بکاتەوە، ئەوەتا محمد بن موسی الخوارزمی، دانەری زانستی جەبر و هاوکێشەزانی، لە پێشەکیی کتێبەکەیدا (*الجبر والمقابلە*) جەخت لەوە دەکاتەوە کەوا ئەم کتێبەی بۆ ئاسانکاریی مامەڵەکانی میرات و وەسیەت و حوکم و بازرگانیی موسڵمانان نووسیوە. هەر بۆیە بەشی دووەمی کتێبەکەی تایبەت کردووە بە بابەتە فیقهییەکانەوە، لەژێر ناونیشانی (*کتاب الوصایا*) دوای ئەوەی لە بەشی یەکەمیدا بیردۆزە گشتییەکانی جەبری باس کردبوو لە ڕەگ و هاوکێشە و چەندانی تر. ئەمەش هەر بەڵگەیەکە بەو ئاڕاستەیەدا کاتێك خاوەنی کتێبی (*مفاتیح العلوم*) باسی زانستی جەبر و هاوکێشەزانی دەکات و دەڵێت: "پیشەسازییەکە لە پیشەسازییەکانی هەژمارکردن، سازاندنێکی باشە بۆ چارەسەری پرسیارە دژوارەکان لە وەسیەت و میرات و مامەڵە و لێکدەرکردنەکان."[1] ئیبن خەلدونیش زانستی میراتی بە لقێك لە زانستە ژمارەییەکان داناوە، کە دەڵێت: "لە لقەکانی – زانستە ژمارەییەکان – زانستی میراتە، کە پیشەسازییەکی ژمێرییارییە بۆ ڕاستکردنەوەی پشکی میراتگران ئەگەر زیاد لە یەکێك بوون."[2] بەم شێوەیە مەعریفە بە عەقڵ و زانستەوە لەگەڵ سرووشدا لەلای موسڵمانان پێکەوە گرێ درابوون.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ کتێبە نووسراوەکانی موسڵمان لە بواری زانستە سروشتییەکاندا دەبینین چەند پەیوەستن بە خودا و یەکتاپەرستییەوە و ئیمان بە

---

[1]– محمد عابد الجابري: تكوين العقل العربي، دار الطليعة، بيروت، (١٩٨٥م)، (ص ٩٩).

[2]– ابن خلدون: المقدمة، دار الفكر، بيروت، بدون. الباب السادس، الفصل الرابع عشر، (ص ٤٨٤، ٤٨٥).

توانا و مەزنی و دانایی خودا و ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ کتێبەکانیان لە زانستە ئایینییەکاندا، دەبینین لە هەمان کاتدا پشت بە بەڵگەکانی دەق و عەقڵ دەبەستێت، تەنانەت زانستی بنەماکانی ئایین تەنها پشت بە بەڵگەی نەقڵکراو نابەستێت وەك وا دەزانرێت، بەڵکو لەپاڵ ئەوەشدا پشت بە بیردۆزێکی تەواوکاریی مەعریفی دەبەستێت کە تاووتوێی خودی سەرچاوەکانی زانست دەکات لە هەستپێکراو و ڕووداوەکان و بینراو و بەراییەکان و بەدیهییات و موتەواتر و... هتد، تا لە کۆتاییدا دەگاتە یەکتاپەرستیی ئیسلامیی عەقڵی و نەقڵی بەیەکەوە، ئەمەش لە چەندین کتێبدا دەتوانین تێبینیی بکەین وەك: العقيدة النظامية للجويني (٤٧٨ك)، الإقتصاد في الإعتقاد للغزالي (٥٠٥ ك)، المحصل في علوم الدين للرازي (٦٠٦ ك)، طوالع الأنوار للبيضاوي (٦٨٥ك)، المواقف للإيجي (٧٥٦ك)، أشرف المقاصد للتفتازاني (٧٩١ك)[١].

ئا لێرەوە جیاوازیی سەرەکی دەر دەکەوێت لەنێوان وێناکردنی ئیسلامیی بۆ مەعریفە و وێناکردنی نوێ کە مەعریفە بەتەواویی دادەبڕێت لە سرووش و تەنانەت سرووش و زانستیش بە دژیەك دەزانێت، کە دوو ڕێی لێك جیا بن و خاڵی پێکگەیشتنیان نەبێت، ئەوەتا یەکێك لەو لێکۆڵەرانەی لە بارودۆخی زانکۆکانی کەنداو دەکۆڵێتەوە، وا دەبینێت کە یەکێك لە هۆکارەکانی دواکەوتوویی و گەندەڵی ئەو زانکۆیانە ئەوەیە کە لە مەعریفەدا زانست تێکەڵ بە میتۆدی سرووش دەکەن، ئەم زانکۆیانەش هەرگیز چاك نابن هەتا سرووش بەتەواوی ڕیشەکێش نەکەن[٢].

جێی باسە بۆچوونەکانی ئەم لێکۆڵەرە و هاوشێوەکانی ڕاست نین، لەوەی کە

---

[١]- حسن حنفي: دراسات إسلامية، دار التنوير للطباعة والنشر، بيروت، (١٩٨٢م)، (ص ١٣-١٦).

[٢]- محمد جواد رضا: الإصلاح الجامعي في الخليج العربي، شركة الربيعان للنشر والتوزيع، الكويت، (١٩٨٤م)، (ص ١٥-٢٦).

لۆژیکی زانست و لۆژیکی سرووش دژیەك بن و کۆکردنەوە لەنێوانیاندا ئەستەم بێت، لە کاتێکدا زانا موسڵمانەکان کە سەرقاڵی زانستەکان و پزیشکی و ئەندازیاری و.... هتد بوون، وەك ئیبن سینا و بەیرونی و خیام و نەصر ەددینی توسی و، جگە لەوانیش، هەستیان بە هیچ دژیەکی و کێشمەکێشمێك نەکردووە لەنێوان مرۆڤی موسڵمان و مرۆڤی زانستیدا، هەروەها گرتنەبەری میتۆدی ئایینیی بەربەست نەبووە لەبەردەم ئەوەی داهێنان بکەن لە بوارەکانی زانستە ئەزموونییەکاندا[1]، لە کاتێکدا زانست و زانیارییەکان، چ عەقڵییەکان یان نەقڵییەکان، لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بۆ مەعریفە بە زانستگەلێك دادەنرێن کە دەتگەیەنن بە خودا.

فوئاد زەکەرییا دەڵێت: "زانستی ئیسلامیی لە هەمان کاتدا هەردوو لایەنی دنیایی و ئەزەلی لەخۆ دەگرت، خزمەتکردنی ژیانی مرۆیی لەم جیهانە زەمینییەدا دەکاتە ئامانج لە چوارچێوەیەکدا کە بناغەکەی بریتییە لە ڕامان لە جیهانیی ئاسمان و زەمین، هەروەها پەندوەرگرتن بووە لەو سیستەمە ڕێکە و یاسا ئەزەلییانەی هەیەتی. بەم شێوەیە زانایان هەڵدەستان بە ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەکانیان، باوەڕدار بەوەی کە زانست پایەیەکە لە پایەکانی بیروباوەڕ، وە گومانی ئەوەی زانست و باوەڕ پێچەوانەی یەك بن بە خەیاڵی هیچکامێکیاندا نەدەهات، بەڵکو ئەوانەی ئەم بۆچوونەیان دەوروژاند زاناکان نەبوون، بچووکترین زانیارییشیان نەبوو لە سروشتی لێکۆڵینەوەی زانستی و ئامانجە مرۆڤایەتییە بەرزەکانی."[2]

ئەمەش زانایەکی ئیسلامیی هاوچەرخە، کە جەخت لەسەر هەمان واتای ڕاستودروستی ئیسلامیی دەکاتەوە و دەڵێت: "هەرجارێك یاسایەك لە یاسا

[1] –Sayyad Hessien Nasr: Islam and Plight of Modern Man ،Longman, London New York، (1975)، (PP 147-148)

[2]– فؤاد زكريا: التفكير العلمي، المجلس الوطني للثقافة والفنون والآداب، الكويت، (١٩٧٨م)، (ص ١٦٠).

زانستییەکان تێدەگەم باوەڕم زیاتر دەبێت بە توانا و مەزنی و دانای و بەهێزیی خودا، چونکە ئەوەی یاساکانی فیزیا و کیمیا و گەردووناسی و زیندەزانی و بیرکاری داناوە مرۆڤ نییە. ئەوەی زانایان کردوویانە جگە لە لادانی پەردە لەسەر ئەم یاسایانە و هەوڵی تێگەیشتن و شیکردنەوە و بەکارهێنانیان هیچی تر نەبووە، جا مرۆڤ بوونی هەبێت یان نا ئەم یاسایانە وەك خۆیان هەن، لە کاتی بەدیهێنانی ئەم گەردوونەوە بوونیان هەیە، لێرەوە تێدەگەم کە یاساکانی سروشت گوتە و سیستەمەکانی خودای گەورەن لە بەڕێوەبردنی گەردووندا هەر لە ساتەوەختی بەدیهێنانەوە، هەر یاسایەك کە دەیدۆزینەوە و لێی دەکۆڵینەوە و لێی تێدەگەین بەڵگەیەکی پرشنگدارە لەسەر بوون و مەزنی و دانایی و توانای خودای گەورە"[1].

کتێبەکانی پۆلێنکردنی زانستە ئیسلامییەکان ئەم زانستانەمان لە وێنەی درەختێکی فرە لق و چڵدا پێ نیشان دەدەن، ئەگەرچی هەموویان زانیاریی مرۆڤ دەربارەی خودا زیاد دەکەن و لە خودای نزیك دەکەنەوە. ئەم وێناکردنە ئیسلامییەش بۆ مەعریفە زۆر بەجوانی دەتوانین ببینین بە خوێندنی بەرهەمەکانی وەك: إحصاء العلوم للفارابي، رسائل إخوان الصفا، مفاتيح العلوم للخوارزمي، مفتاح السعادة ومصباح السيادة لطاش كبری زادە و بەرهەمی تریش لەم وێناکردنە ئیسلامییە کە هەموو پشتڕاستن بە دەقی ئیسلامیی وەك ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ﴾ {فصلت:٥٣} واتە: ((ئێمە لە ئاییندەدا بەڵگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بوونەوەردا و لە خودی خۆشیاندا))[2].

---

[1]- یوسف مروة: العلوم الطبيعية في القرآن، مرجع سابق، (ص ٧٠).

[2]- بۆ زیاتر بەدواداچوون بۆ ئەم وێناکردنە ئیسلامییە بۆ مەعریفە بڕوانە:

- Ziiauddin Sardar: Science ،Technology and Development in the Muslim World ،Creem Helm ،London، (1977)، (pp. 22-25(

جیاوازییەکی بنەڕەتی هەیە لەنێوان ڕوانینی ئیسلامیی بۆ زانست و ڕوانینی عەلمانی[1]، ڕوانینی ئیسلامیی بۆ زانست یەکانگیر و تۆکمەیە، بەڵام ڕوانینی عەلمانی ماددییە و زانست لە باوەڕ و سرووش دادەبڕێت. هەڵەیە ئەگەر وا بزانین ئەم زانستە عەلمانییە وێنەی تەواو و بێخەوشی زانستە، یان نموونەی باڵای زانستە، بەڵکو لۆژیکی تر ئەوەیە بڵێین: ڕوانینی ئیسلامیی بۆ زانست فراوانتر و ڕاستترە لە ڕوانینی عەلمانی، لە کاتێکدا بەرهەمی تیۆریی ئیسلامیی بۆ زانست زانایانێك بوون زانست و باوەڕیان بەیەکەوە گرێداوە و بەرهەمی تیۆریی عەلمانی بۆ زانست چەندین نەوەی بێباوەڕە لە زانایان کە زانستەکەیان لە خوانەناسی و بەلارێچووندا نەیپاراستوون.

تیۆری ئیسلامیی بۆ زانست، مرۆڤ و سروشتی تووشی داڕمان نەکرد و ژینگەی پیس نەکرد و جیهانیی نەخستە بەر هەڕەشەی وێرانی، وەك ئەوەی تیۆری عەلمانی کردی[2]، لێرەدا بەرپرسیارێتیی زانا موسڵمانەکان دەر دەکەوێت لە هەموو شوێنێك،

- Seyyad Hossein Nasr: Islamic Science ،World of Islam Festival Publishing ،Co. Ltd. ،London، (1976 (.
- :An Introduction to Islamic Cosmological Doctrines ،Cambridge ، London، (1976)

[1]– بۆ سروشتی مەعریفەی عەلمانیی بڕوانە:
- E.A. Bult: The metaphysical Foundation of Modern Science, Longman ،New York، (1954).
- H. Butterfield: The Origins of Modern Science, Wiley New York, (1931).

[2]– سەبارەت بە قەیرانی زانستی ماددیی و مەترسییەکانی لەسەر مرۆڤ بڕوانە:
- John D, Garcia: The Moral Society, A Rational Alternative to Death, Julian Press, New York, (1971).
- Ro'berto Vacca: The Coming Dark Age, Doubleday, Anchor Books, New York, (1973).

که دووباره هەیکەلی مەعریفەی مرۆیی بنیات بنێنەوە بەپێی دیدی ئیسلامیی، بە شێوەیەك ببێت بە ڕشتەیەکی عەقڵیی و هزریی و زانستیی تەواوکار کە بەدەوری سرووشدا دەسووڕێتەوە و هەموو ئەو زانست و زانیارییانە لەخۆ بگرێت کە مرۆڤی هاوچەرخ پێی گەیشتووە.

**زانستە پەروەردەییەکان لەنێوان تاکڕوانگەیی مەعریفی و تەواوکاریی مەعریفیدا:**

**تاکڕوانگەیی** مەعریفی لە زانستە پەروەردەییەکاندا میتۆدێکی ڕۆژئاواییە و مامەڵە لەگەڵ دیاردە پەروەردەییەکاندا دەکات دوور لە سرووش وەك سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی مەعریفە، تەواوکاریی مەعریفییش میتۆدێکی ئیسلامییە مامەڵە لەگەڵ دیاردە پەروەردەییەکاندا دەکات، لە کاتێکدا سرووش بە سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی مەعریفە دادەنێت. تەواوکاریی مەعریفی ئەو مانایە ناگەیەنێت کە هەرچی هزری پەروەردەییە بەوەش کە لەخۆی دەگرێت لە دەستکەوتی زانستیی و شیکردنەوەی بابەتییانەی پەیوەست بە بواری پەروەردەوە هەمووی ڕەت بکاتەوە، بەڵکو ئەرکی پەروەریاریی موسڵمان ئەوەیە بەڕووی هزردا بکرێتەوە بە شیکاری و ڕەخنەگرتنەوە، باشترین بەرهەمەکانی لێ پوختە بکات، ئەوەش کە ئەیگرێتە خۆ لە هەڵە و لادان بیخاتە ڕوو. لە هەموو ئەمانەشدا سەرچاوە لە هزرێکی ئیسلامیی ڕەسەنەوە بگرێت، قورئان و فەرموودە و ئەوەی پێشینی ئوممەتی لەسەر بووە بکات بە بناغەی خۆی لە پرۆسەی وەرگرتن و ڕەتکردنەوە و ڕەخنە و بنیاتناندا.

بەپێی ئەم وێناکردنە ئیسلامێتی تەواوکاریی مەعریفی مانای پشتگوێخستنی ناوەڕۆکی ئێستای زانستە پەروەردەییەکان نییە، یاخود ڕووکەشکردنی پێکهاتەی بەرهەمە زانستییەکان لە تیۆر و زانست و زانیاری، یاخود تەنها ئایەت و فەرموودە ڕیز

- Seyyed Hossien Nasr: Man and Nature, the Spiritnal Crisis of Modern Man, Amandala Books, Unwin, Ltd, (1976).

بکەین بۆ ئەوەی دەرک بە سروشتی ئەو بابەتە پەروەردەییە پسپۆڕییانە بکەین. بەڵکو ئەوەی پێویستە لەسەرمان ئەوەیە ئەو زانستانە لە سەرچاوە ڕەسەنەکانیانەوە وەر بگرین، هاوڕێ لەگەڵ دوایین گەشە و دەرکەوتنە جیهانییە هاوچەرخەکانیەوە، پاشان ڕێنوێنی وەر بگرین لە دەقە بنەڕەتییەکانی ئیسلام: قورئان و فەرموودە، هەروەها لەوەی لە پێشینی ئوممەتەوە بۆمان هاتووە، لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و ژیاننامە و بیر و میتۆدی کارکردنیان، جگە لەوەی بیری زانا و بیرمەند و سەرکردەکانی ئوممەت پێی گەیشتووە بە درێژایی مێژوو[١].

ئەرکی سەرەکیی زانایانی موسڵمانی بواری پەروەردە لەوەدا نییە کە هزری پەروەردەیی هاوچەرخ بە شێوەیەکی ڕەها ڕەت بکەنەوە، هەروەها ئەوەش نییە لە کۆتایی هەر پەرتووکێکی پەروەردەییدا پاشکۆیەك دابنێن بۆ باسکردنی پەروەردەی ئیسلامیی، یاخود باسکردنی تێڕوانینی ئیسلامیی لەسەر بابەتێك لە بابەتەکانی لێکۆڵینەوە و بەجێهێشتنی ناوەڕۆکی ئەوانی تر دوور لە ڕۆحی ئیسلام و ڕێنماییەکانی. ئەرکی سەرەکیی ئەو زانایانە بە بۆچوونی من: دووبارە داڕشتنەوەی ئەو زانستانەیە، داڕشتنەوەیەکی نوێ کە زانستەکانی سەردەمی تێدا تێکەڵ دەبێت بە بنەماکانی ئیسلام و تێڕوانینەکانی بۆ گەردوون و مرۆڤ و مەعریفە و ڕەوشت و کۆمەڵگە.

جا ئەگەر ئێمە وەرگرتن و ڕەتکردنەوەمان بۆ هزری پەروەردەیی هاوچەرخ لەژێر ڕۆشنایی ئەوەدا بێت تا چەند یەك دەگرێتەوە یاخود تا چەند دژە لەگەڵ بنەماکانی ئیسلام و تێڕوانینە بنەڕەتییە نەگۆڕەکانی، ئەوا بە هەمان شێوە دەبێت هەمان هەڵوێستمان هەبێت لەگەڵ کۆی کۆشش و بەرهەمی بیرمەند و پەروەریارە موسڵمانەکان بە درێژایی سەردەمە جیاوازەکان، چونکە ئەم کۆششانە پارێزراو نین

---

[١]– المعهد العالمي للفكر الإسلامي: إسلامية المعرفة، المبادئ العامة، خطة العمل، الإنجازات، المعهد العالمي لفكر الإسلامي، واشنطن، (١٩٨٦م)، (ص ١٢٩، ١٣٠).

له هەڵە، وە نابێت بە شێوەیەك لێیان بڕوانین وەك ئەوەی وێنەی نموونـەیی هـزری پەروەردەیی ئیسلامیی بن و بە پێویستی بزانین لەم سەردەمەدا شوێنپێیان هڵگرین و جێبەجێیان بکەین. دەمارگیری بۆ کەلەپووری پەروەردەی و بەرگریلێکردنی وەك ڕاسـتییەکی ڕەهـا و بێخـەوش بێـت، هـەروەها ڕووکەشـییانە بـە شـێوەیەك وێنـای نەکەین گوایە لـە هـەموو شـتێکدا پـێش هـزری پـەروەردەیی هاوچـەرخ کـەوتبێت، ئەمــەش کارێکــە نــە لــەڕووی زانســتییەوە و نــە لــەڕووی ئیســلامییەوە جێــی پەسەندکردن نییە، ئەرکە لەسەر زانای پەروەردەیی موسڵمان منـەی ڕاسـتی بکـات لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ هزری پەروەردەیی هاوچەرخ، هەروەها هزری پەروەردەیی ئیسلامیی، کە بە درێژایی سەردەمە ئیسلامییەکان لە نووسراوە پەروەردەییەکانـدا بەدی دەکرێن.

زانای پەروەردەیی هاوچەرخی موسڵمان کاتێك مامەڵە دەکـات لەگـەڵ زانسـتێك لە زانسـتە پەروەردەییـەکان، پێویسـتە خودگـەرایی و ڕۆشـنبیریی ئیسـلامیی تێـدا بخاتە ڕوو لەو بابەتەی کەوا لەم زانستەدا قسەی تێدا دەکـات، بـۆ نموونـە مێـژووی پەروەردە یان گەشەسەندنی هزری پەروەردەیی دەبێـت بۆچـوونی ئیسـلامیی تێـدا بخرێتە ڕوو دەربارەی هێزە سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکان، کە بە درێژایی مێژوو ئەم هزرەیـان بنیـات نـاوە، لەگـەڵ ڕادەی گونجـان و نـەگونجانی ئـەم هـزرە لەگـەڵ تێـڕوانینی ئیسـلامی. ڕاسـتە دەبێـت لـەو بـوارەی کـە تایبـەت کـراوە بـە لێکۆڵینەوە لـە سـەردەمانی ئیسـلامیی بـاس لـە گرنگیـی ئـەم سـەردەمانە بکرێـت لەڕووی شارستانیی و مرۆڤایەتییەوە بە شێوەیەکی گشتی، بەڵام ئەمـە بـەو واتایـە نایـەت بـە هـیچ شـێوەیەك بەرهـەمی فکـری و پـەروەردەیی ئـەو سـەردەمە لـەژێر ڕۆشنایی بنەما ئیسلامییە جێگیرەکاندا هەڵنەسەنگێنین لە قورئان و فەرموودەوە.

کاتێـك بـاس لـە شـێوازی بـەڕێوەبردنی پـەروەردەیی و پرۆسـە جیاوازەکـانی

دەكرێت، تەنها باسكردنی هەردوو شێوازی سەرەكیی بەڕێوەبردن بەس نییە، كە بریتیین لە شێوازەكانی دیكتاتۆریی و دیموكراسیی، بەڵكو دەبێت باس لە شێوازی سێیەمیش بكرێت، كە شێوازی ئیسلامییە، كە لەسەر پەیوەندیی بەڕێوەبەر و تاكەكان بە خوداوە بینا كراوە، كە چاودێریكراون لەسەر هەموو كارێكی بچووك و گەورە، هەروەها ئامانجی كارەكەشیان بریتییە لە ڕازیكردنی خودا. كاتی خستنەڕووی سیفەتەكانی سەركردە یاخود بەڕێوەبەری سەركەوتوو، باشتر وایە ئاماژە بۆ ئەوە بكرێت كە لە قورئان و فەرموودە و ڕەفتاری پێشیندا هاتووە سەبارەت بەو سیفەتانە. كاتی خستنەڕووی بیردۆزە زانستییە جیاوازەكان لە بەڕێوەبردندا: بیردۆزی زانستی، بیردۆزەكانی پەیوەندیی مرۆیی، بیردۆزی بیروكراتی، بیردۆزە ڕەفتارییە نوێیەكان، بیردۆزەی شیكردنەوەی سیستەمەكان — باشتر وایە ئاماژە بكرێت بە گشتگیرنەبوونی ئەو بیردۆزانە، هەروەها ئاماژە بكرێت بۆ چۆنیەتیی بەڕێوەبردن لە ئیسلامدا، كە زیاتر كار بۆ لەخۆگرتنی لایەنە كارگێڕییەكان دەكات بە شێوازێكی مرۆییانەی تەواوكاری. لەپاڵ ئەمەشدا باشتر وایە پەرتووكەكانی تایبەت بە بەڕێوەبردنی پەروەردەیی نموونەی كرداریی تێدا بێت بۆ بەڕێوەبردنی پەروەردەیی لە چاخە ئیسلامییەكاندا: چۆن خوێندنگەكان بەڕێوە دەبران، یاخود ئەو شوێنانەی وەقف كرابوون بۆ فێركردن و خانەكانی دانایان و بەناوبانگترین كەسایەتییە كارگێڕییە دیارەكان لە مێژووی پەروەردەی ئیسلامیدا.

هەروەها لە كاتی باسكردن لە فەلسەفەی پەروەردە، ئەوەندە بەس نییە قوتابخانە فەلسەفییە پەروەردەییەكان بخەینە ڕوو لە فەلسەفەكانی ئایدیالیزم و ڕیالیزم و سروشتیی و كردەیی و بوونگەرایی و شیكاریی و هتد... بەڵكو دەبێت ئەو قوتابخانە و فەلسەفانە لەژێر ڕۆشنایی بنەما ئیسلامییە ڕەسەنەكاندا

هەڵبسەنگێنرێن. هەر وەك چۆن لەگەڵ فەلسەفە و سەرانی فەلسەفە پەروەردەییە نائیسلامییەکاندا وا دەکەین، دەبێت لەگەڵ قوتابخانە فەلسەفییە ئیسلامییەکانیشدا بە هەمان شێوە ڕەفتار بکەین: ئاڕاستەی سۆفی و ئاڕاستەی فیقهی، ئاڕاستەی عەقلانیی و هتد... سەرانی ئەو قوتابخانانە وەك غەزالیی و قابسی و ئیبن سینا و هی تریش، پێویستە تەرازووی حوکمدان و ڕەخنە و شیکردنەوەی هزریی ئەوانە بریتی بێت لە ڕێککەوتن و ڕێکنەکەوتنیان لەگەڵ بنەما ئیسلامییە بنەڕەتییە جێگیرەکاندا.

به هیچ شێوەیەکیش ڕێ نادرێت و ماقوڵیش نابێت قسە لەسەر بابەتی وەك: سروشتی مرۆیی، مەعریفە، ڕەوشت، شارەزایی پەروەردەیی، ئامانجە پەروەردەییەکان، بیرکردنەوە، ئازادیی و جگە لەوانەش بکرێت، بەبێ ئەوەی تیشك بخرێتە سەر ئەو تەوەرە سەرەکییانەی کە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودە صەحیحەکانەوە وەرگیراون. بەم شێوەیە خوێندنی فەلسەفەی پەروەردەیی لە خوێندنێکی تیۆریی دوور لە عەقڵی عەرەبی و ئیسلامییەوە دەگۆڕێت بۆ خوێندنێك بەتەواویی لەگەڵ پێکهاتەی عەقڵی خوێندکاری فێرکراوی موسڵماندا بگونجێت[1].

---

[1]– بۆ وردەکاریی زیاتر بڕوانە:

ـ عبد الرحمن النقيب: إسلامية الكتاب الجامعي في الإدارة التربوية، في التربية الإسلامية، رسالة ومسيرة، دار الفكر العربي، (١٩٩٠م)، (ص ١٢٥–١٥٣).

ـ علي إبراهيم عبد الرحمن الزهراني: مبادئ مختارة للإدارة التربوية في ضوء مواقف من السيرة النبوية، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية التربية، جامعة أم القرى، (١٤٠٥هـ–١٤٠٦هـ).

ـ الشريف حسن محمد الحسيني القناوي: إدارة الفاروق عمر، دراسة تحليلية في الإدارة التربوية، مكة المكرمة، مطابع الصفا، (١٩٨١م).

ئەوەندەی لێکۆڵەر بزانێت تا ئێستا هیچ توێژینەوەیەك نییە لە بواری بەڕێوەبردنی پەروەردەیی بە درێژایی سەردەمە ئیسلامییە گەشاوەکان، ئەو بەڕێوەبردنە ببەستێتەوە بە بارودۆخ و سەردەمەکانییەوە و ڕادەی کاریگەربوونی بە ڕێنماییەکانی ئیسلام ودەستکەوتە بەڕێوەبەرایەتیی و پەروەردەییەکانی،

ئەوەی دەربارەی فەلسەفەی پەروەردە دەگوترێت، بە هەمان شێوە دەربارەی بنەما فەلسەفیی و کۆمەڵایەتییەکانیش دەگوترێت کە لەوە دەدوێت تا چەند و لە چ لایەنێکەوە ئەم بنەمایانە توانیویانە شوێندەستیان دیار بێت لە بواری پەروەردەدا[١]. بنەما و لایەنە گشتییەکانی ڕۆشنبیریی ئیسلامیی هەر دەبێت زەق بکرێنەوە، هەروەها ئەو تایبەتمەندییانەی کۆمەڵگەی ئیسلامیی پێویستیەتی بۆ ئەوەی بەردەوام نەبێت لە پشتبەستن بە کەسانی تر لە زۆربەی کاروبارەکانی ژیان. هەروەها ئەو گۆڕانکارییانەش کە ئەم کۆمەڵگەیە ڕووبەڕووی دەبێتەوە کە هەندێ هەڕەشە لەپێکهاتە ڕۆشنبیرییەکانی دەکات، یان دەستەوسانی دەکات لە بەدیهێنانی گۆڕانکارییە گرنگەکان بۆ گەشەدان بە ڕۆشنبیرییەکەی لەپێناو تواناداترتربوون لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئالنگارییەکانی سەردەم. بابەتگەلێکی وەك: ڕۆڵی مزگەوت، ڕاگەیاندنی ئیسلامیی، بزووتنەوەکانی بەڕۆژئاواییکردن و مژدەدەران، بزووتنەوەی ئیسلامیی، قەرز و یارمەتییە دەرەکییەکان و بابەتگەلێکی تری هاوشێوە هەر دەبێت شوێنی خۆیان بدۆزنەوە لە کرۆکی ئەو بنەمایانە" چونکە شوێنپەنجەی دیاریان لە واقیعی پەروەردەی جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیی هاوچەرخدا دەنەخشێنن.

---

بەڵام ئەمە ئەرکی سەرشانی لێکۆڵەرانی بواری بەڕێوەبردنی پەروەردەیی قورس ناکات، لە کاتێکدا دەتوانرێت ئەوە بە خوێندکارانی بەڕێوەبردنی پەروەردەیی بگوترێتەوە.

[١]– لەو توێژینەوە فەلسەفییە چاکانەی ئەم کارەیان کردووە:

- محمد فاضل الجمالي: تربية الإنسان الجديد، الشركة التونسية للتوزيع، تونس، (١٩٦٧م).
- سعيد إسماعيل علي: أصول التربية الإسلامية، دار الثقافة للطباعة النشر، القاهرة، (١٩٧٥ م)
- عنر محمد تومي الشيباني: فلسفة التربية الإسلامية، الشركة العامة للنشر والتوزيع والإعلان، طرابلس، ليبيا، (١٩٧٥م).
- سعيد إسماعيل علي: دراسات في الإصول الفلسفية للتربية، القاهرة، بدون، (١٩٨٤م)، (ص ٨٨).

شـتێکی سروشـتییه کـه لێکۆڵینـەوەی میتۆدەکـان لـەڕووی بنـەما و پێکهاتـە و شێوازەکانی ڕاستکردنەوە گۆڕانکارییـەکی گـەورە لـەڕووی شـێوازی چارەسـەرەوە بەخۆیـەوە ببینێـت[1]، وردە وردە دیـاردەی نـەقڵ و وەرگێـڕان لـە کەسـانی تـرەوە نامێنێت و دەگۆڕێت و شێوازەکانی ڕەخنەگرتن و شیکردنەوە شوێنیان دەگرنەوە، هەروەها خستنەڕووی ناوەڕۆکی مەعریفی بە شێوەیەکی ڕەسەن کە گوزارشت بکات لـە بلیمـەتیی عـەقڵی موسـڵمان، کـە توانـادارە لـە هونـەری ئاوێتـەکردنی تـەواوی پێدراوەکانی عەقڵ و سرووش، کە دەبێتە هۆکاری توانەوەی جیاوازییەکان لەنێوان ئەوەی مرۆییە و ئەوەی سروشتییە، هەروەها ئـەوەی عەقڵییـە و ئـەوەی نەقڵییـە. چونکە هەمووی بواری جیاوازی زانستن کە دەمانگەیـەنن بـە تێگەیشـتنی زیـاتر لـە توانا و یاساکانی خودا، هـەروەها ڕامکردنـی هـەموو ئەمانـە لـەپێناو بەرژەوەنـدیی مرۆڤ لە ژیانی دنیا و دواڕۆژیدا.

لەوانەیە بە باسکردنی ئەو نموونە کەمانەی پێشتر باسمان لێوە کردن بوەسـتین بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ئاڕاستەیەی ئەم لێکۆڵینەوەیە بانگەشەی بۆ دەکات کە خۆی لــە پێویســتیی دووبارەنووســینەوەی زانســتە پەروەردەییــەکان لــە ڕوانگەیــەکی ئیسلامییەوە دەبینێتـەوە، بـۆ ئـەوەی ئـەو زانسـتانە نـزیکتر بخەینـەوە لـە واقعـی خوێندکار و کاریگەرتر بن لە بنیاتنانی کەسایەتییەکەی، بە شێوەیەك ئەو زانستانە پارێزگاری بکەن لە پێکهاتەی زانستی ئەکادیمییان لە لایەك بـەبێ ڕووکەشـیکردن و فشـەڵکردنی هـاوڕێ لەگـەڵ ئاوێتەکردنیانـدا بـە بنـەما ئیسـلامییە بنەڕەتییـەکان و

---

[1]– لەو توێژینەوە باشانەی کە هەوڵی ئەوەیان داوە:

ـ عبد الرحمن صالح عبد الله: المنهاج الدراسي، أسسـه وصـلته بالنظريـة التربويـة الإسـلامية، مركـز ملـك لبحوث الدراسات الإسلامية، الرياض، (١٩٨٥م).

ـ علي أحمد مدكور: منهج التربية الإسلامية، أصوله وتطبيقاته، مكتبة الفلاح، الكويت، (١٩٨٧م).

ئەوەی ڕاستە لە هزری پێشین، هەموو ئەوانە لە ڕشتەیەکی گونجاو و تەواوکاردا بەو شێوەیەی کە پێشتر ڕوون کرایەوە.

**ئەزموونی بەشی پەروەردە لە زانکۆی ئیسلامیی جیهانیی لە مالیزیا لە بواری تەواوکاریی مەعریفیدا:**

ئەگەر عەقڵی موسڵمان لە سەردەمی بووژانەوەیدا زانستگەلێکی بەرهەم هێنابێت، هەموو سەرچاوەکانی مەعریفەی کۆ کردبێتەوە لە هەستەوەرەکان و عەقڵ و سرووش، ئەوا لە سەردەمانی لاوازییدا ئەو ڕوانینە تەواوکارییە مەعریفییەی لەدەست داوە و عەقڵێکی بەرهەم هێناوە کە تەنها پشتی بە سرووش (البيان) بەستووە، یاخود تەنها بە هەستەوەرەکان و عەقڵ (البرهان)، یاخود نەست (بەکارهێنانی وشەی نەست بۆ وشەی الحدس پێم وا نییە تەواو گونجاو بێت) و ئاشکراکردن (العرفان)، ڕوانگەی تەواوکاریی مەعریفی لەدەست داوە، سەرەنجام پێشڕەویی زانستی و پێگەیشتوویی ژیاریی لەدەست دا و کەوتە زەلکاوی بەڕۆژئاواییکردن و چاولێکردنی مەعریفیی ئوممەتانی دی.

نەدەبوو ئەم کەلێنە مەعریفییە لای عەقڵی موسڵمان بەردەوام بێت، بۆیە بانگەوازێکی بەتین دەر کەوت لەهەمبەر گرنگیی گەڕانەوە بۆ میتۆدی ئیسلامیمان لە زانست و فێرکردندا، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بەڕۆژئاواییکردنی عەقڵی عەرەبی و ئیسلامیی لە لایەك و چەقبەستوویی عەقڵی شەرعیی لە لایەکی تر[١]، لەپێناو

---

[١]- بۆ ئەم بابەتە بڕوانە:

ـ نادية مصطفى، سيف الدين عبد الفتاح (إعداد وإشراف): المنهجية الإسلامية في العلوم الإجتماعية، حقل العلوم السياسية نموذجا، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، القاهرة (٢٠٠٣م).

ـ عبد الرحمن النقيب: المنهجية الإسلامية في البحث التربوي نموذجا، النظرية والتطبيق، مرجع سابق.

هەوڵدان بۆ لەناوبردنی ئەو دووجەمسەرییەی خوێندن و جیاوازیی بنەڕەتی لەنێوان دەرچووانی خوێندنی نوێ کە سیستەم و پێکهاتە زانستییەکەی لە دەرەوە وەر دەگرێت، هەروەها خوێندنی شەرعیی ئایینی کە لە ڕۆحی سەردەم دوور کەوتووەتەوە، کۆنگرەی جیهانیی یەکەم سەبارەت بە پەروەردەی ئیسلامیی لە مەککە ساڵی (١٩٧٧ز) بەسترا. لەم کۆنگرەیەدا جەخت کرایەوە لەسەر پێویستیی ئوممەتی ئیسلامیی بە سیستمێکی نوێ، کە کۆتایی بێنێت بەم لێکترازانە نەشیاوە لەنێوان خوێندنی نوێ و خوێندنی شەرعیی ئایینیی، هەروەها بتوانێت یەکانگیری بۆ عەقڵی موسڵمان و بابەتە پەیوەستەکان پێیەوە بگێڕێتەوە کە زانستەکانی سرووش و زانستە گەردوونییەکان بەیەکەوە کۆ دەکەنەوە، هەروەها ئەو سیستەمە نوێیە توانادار بێت لە بەیەکبەستنەوەی عەقڵ و بابەتەکانی بە ڕۆحی سەردەم و ئاڵنگارییەکانی. خوێندنێکی نوێ کە زانستەکانی سرووش تەوەرێکی سەرەکی پێک بهێنن لە هەموو زانست و پسپۆڕییەکاندا، پەروەردەیەك سەرجەم لایەنەکانی کەسایەتیی خوێندکار بنیات بنێت وەك لایەنی عەقڵیی و ڕۆحی و جەستەیی لەژێر ڕۆشنایی بیروباوەڕ و شەریعەت و ڕەوشتە ئیسلامییەکاندا و بەرهەمی ئەم خوێندنە کەسانێك دەبن کە لە پیشەکەی خۆیان شارەزان و لە هەمان کاتدا پابەندی ئیسلام و ڕێنماییەکانیەوە دەبن[١].

---

[١]– کۆنگرەی جیهانیی یەکەم بۆ پەروەردەی ئیسلامییخاڵێکی وەرچەرخان بوو لە ژیانی ئوممەتدا، وە توێژینەوەکانی لەگەڵ توێژینەوەکانی سێ کۆنگرە جیهانییەکەی دوای ئەو لە گرنگترین نووسراوانێك بوون لە تاکرەویی مەعریفەدا، وە چاکسازیی پەروەردەیی ئیسلامیی وە ناگونجێت بۆ یەکێك کە دەستی داوەتە چاکسازیی پەروەردەیی ئەو لێکۆڵینەوانە نەخوێنێتەوە کە ئەمانەن:

ـ سید سجاد حسين، سيد أشرف علي: أزمة التعليم الإسلامي، ترجمة أمين حسين، الرباط، مكتبة عكاظ، و جامعة الملك عبدالعزيز، (١٩٨٣م).

وەك بەدەمەوەچوونێك بۆ كۆنگرەكە و كاریگەربوون بە داواكەی، هەروەها باوەڕبوون بە توانای عەقڵی موسڵمان لەسەر گێڕانەوەی یەكانگیرییە مەعریفییەكەی (مهاتیر محمد) سەرۆك وەزیرانی پێشووی مالیزیا داوا دامەزراندنی زانكۆی ئیسلامیی كرد لە مالیزیا، كە زانكۆیەكی ئیسلامیی جیهانیی بێت و خوێندكار لە هەموو وڵاتانی جیهانیی ئیسلامییەوە بگرێتە خۆ، هەروەها زانست و مەعریفەكانی تێدا بە شێوەی یەكانگیری مەعریفی پێشكەش بكرێت و لەلایەن ئەنجومەنی ئەمیندارانەوە بەڕێوە ببرێن بە شێوەیەك نوێنەرایەتی هەموو وڵاتانی جیهانیی ئیسلامیی بكەن، ئەوانەی بەپەرۆش بوون بۆ پرۆژەكە بریتی بوون لە: دورگەكانی مالدیف، بەنگلادش، پاكستان، توركیا، لیبیا، میسر و سعوودیە[1].

زانكۆكە ساڵی (١٩٨٣ز) تەنها بە دوو كۆلێژ دەستی پێ كرد ئەوانیش: كۆلێژی

---

ـ سيد علي أشرف: آفاق جديدة في التعليم الإسلامي، ترجمة أمين حسين، الرباط، مكتبة عكاظ، وجامعة الملك عبدالعزيز، (١٩٨٤م).

ـ محمد النقيب العطاس: التعليم الإسلامي وأهدافه ومقاصده، ترجمة عبد المجيد محمد الخريبي، مكتبة عكاظ وجامعة الملك عبدالعزيز، (١٩٨٤م).

ـ محمد وصي الله خان: التربية والمجتمع في العالم الإسلامي، ترجمة عبد الله الخريبي، مكتبة عكاظ وجامعة الملك عبدالعزيز، (١٩٨٤م).

ـ محمد حامد الأفندي، بني أحمد بالوتش: المنهج وإعداد المعلم، دار عكاظ وجامعة الملك عبدالعزيز، (١٩٨٤م).

ـ سيد حسين نصر: الفلسفة والأدب والفنون الجميلة من وجهة النظر الإسلامية، ترجمة عبدالمجيد الخريبي، مكتبة عكاظ و جامعة الملك عبدالعزيز، (١٩٨٤م).

ـ إسماعيل راجي الفاروقي، عبد الله نصيف: العلوم الطبيعية والإسلامية من وجهة نظر إسلامية، ترجمة عبد الحميد الخريبي، مكتبة عكاظ وجامعة الملك عبد العزيز، (١٩٨٤م).

[1]- International Islamic University Malaysia: Center For Fundamental Knowledge, Cammenoration Volume, (1990).

شەریعە و یاسا و کۆلێژی ئابووری و کارگێڕیی کار (Business Management) و دوو سەنتەر: سەنتەری مەعریفە ئیسلامییەکان و سەنتەری زمانەکان، هەروەها بە ژمارەیەکی سنووردار لە خوێندکار: سەد و هەشتا خوێندکار لە چەند وڵاتێکی ئیسلامییەوە لەگەڵ پێنج ئەندام لە دەستەی وانەگوتنەوە بە مەبەستی ئەوەی لە داهاتوودا زانکۆکە فراوانتر بێت. هەر لە سەرەتاوە زانکۆکە جەختی لەوە کردەوە لەسەر مۆرکی ئیسلامیی خۆی خوێندکار –هەر پسپۆڕییەك بێت– ئامادە دەکات لە بواری پسپۆڕییەکەی خۆی لەپاڵ ئامادەکردنی ئیسلامیدا. بۆ ئەمەش پەنای برد بۆ وانەدانی هەموو خوێندکاران لە زانستە شەرعییەکاندا تاکو وا لە خوێندکار بکات ئاشنا بێت بەو زانستانەی کە دەبنە چوارچێوەیەکی لێڤەگەر (مرجعی) بۆی کاتێك دەگەڕێتەوە سەر هەر زانست و مەعریفەیەکی تر.

هەر وەك چۆن زانکۆکە لەپاڵ پێدانی ئەو زانستە شەرعییانەدا بڕیاری دا خوێندنێکی ئیسلامیی و پەروەردەیەکی ئیسلامیی بدات بە خوێندکارەکان لە شێوەی چالاکیی نیمچەسەپێنراو هەموو خوێندکاران جێبەجێی دەکەن. ئەو چالاکییانەش لە دوو شێواز پێك دەهاتن: یەکیان لە شێوەی ئەڵقەی خوێندنی هەفتانە، هەر ئەڵقەیەك لە دە خوێندکاری کوڕ یان کچ پێك دێت و هەر ئەڵقەیەك بەرپرسی خۆی هەیە و لە خوێندکارەکان هەڵدەبژێردرێت، بەو مەرجەی لە هەموو ئەندامانی گرووپەکە زیاتر زانست و پابەندیی ئیسلامیی هەبێت. یەکێك لە مامۆستاکانی زانکۆش سەرپەرشتیی ئەڵقەکە دەکات و لەڕێی بەرپرسی ئەڵقەکەوە چاودێریی چالاکییەکانی دەکات. زۆر جاریش هەر مامۆستایەکی زانکۆ سەرپەرشتیی پێنج تاکو حەوت ئەڵقەی خوێندکاران دەکات، هەروەها هەفتانە بەرپرسی هەموو ئەو ئەڵقانە کۆ دەکاتەوە بۆ بەدواداچوونی زیاتر و ڕێنماییکردن. ئەرکی ئەو ئەڵقانەش بریتییە لە زیاتر شارەزاکردنی خوێندکاران دەربارەی

ڕێنماییەکانی ئیسلام و جێبەجێکردنیان. هەروەها لەپاڵ بەجێهێنانی نوێژ و سوننەتەکانیشدا، قورئان و فەرموودەیان فێر بکرێت و تاووتوێی گرنگترین بابەتەکانی سەردەم بکەن و کەشێکی لەبار فەراهەم بێنن بۆ گفتوگۆ و وتووێژ، بە جۆرێك ئادابی گفتوگۆی ئیسلامیی پەیڕەو بکرێت، ئەمەش وەك پاڵپشتێك بۆ خوێندکارەکان لەو بابەتانەی بە درێژایی ساڵی خوێندن وەری دەگرن.

بوار ڕەخسا بۆ توێژەر تاکو ئامادەی یەکێك لەو ئەڵقانە ببێت کە دکتۆر مەحمود رشدان سەرپەرشتیی دەکرد و لەلایەن بەرپرسی ئەڵقەکەوە بەڕێوە دەبرا، بە هەندێ زیکر و دوعا دەستی پێ کرد، پاشان خوێندنەوەی سورەتێکی کورت لەگەڵ کورتەڕاڤەیەکی ئاسان، پاشان فەرموودەیەکی پیرۆز، دواتر بابەتێکی فیقهیی و بە خوێندنی سورەتی (العصر) کۆتاییان پێ هێنا، کەشوهەوای ئەڵقەکەش کەشێکی زانستیی ئیسلامیی هەبوو، ڕۆحی برایەتی و خۆشەویستی باڵی بەسەردا کێشابوو. هەموو ئەمانە گرنگن بۆ دروستکردنی ژینگەیەکی فێرکاریی ئیسلامیی ڕاست و دروست. بەداخەوە بواری ئەوەم بۆ نەڕەخسا سەرپەرشتیی ئەڵقەکان یان بەشداریی کارایان تێدا بکەم بەهۆی کەمیی ئەو کاتەی لەوێ بەسەرم دەبرد، تەنها دوو مانگ لە وەرزی هاوین لە دوو ساڵی یەك لەدوای یەکدا (١٩٩٢ز، ١٩٩٣ز).

لەپاڵ ئەو ئەڵقانەشدا ((خێوەتگەی پەرستش)) هەبوو بەناچاری دەبوو ئامادە بن بۆ ماوەی دوو شەو و سێ ڕۆژ لە سەرەتای هەر وەرزێکی خوێندندا، بەگشتی دەبوو خوێندکار ئامادەی هەشت خێوەتگە ببێت بە درێژایی خوێندنەکەی. ئەم خێوەتگەیە ڕاهێنانێکی تیۆریی و کردەیی بوو لەسەر پابەندبوونیان بە ئیسلامەوە. خێوەتگەکە پێك دەهات لە وانەگوتنەوە و پەرستش و شەونوێژ و چەند چالاکییەك بۆ خزمەتی کۆمەڵگە، وەك: پاککردنەوەی مزگەوت و حەرەمی زانکۆ و قەبرسانەکان و خوێنبەخشین و خزمەتکردنی دامەزراوە پزیشکییەکان و سەردانی

ناوەندەکانی بێدایکوباوکان و خەڵوەتگەی پیران و پێشکەشکردنی یارمەتی بۆیان و گەشتی کۆمەڵایەتی بۆ لادێ و شوێنی هەڕەمەکی و کرێکاری کارگەکان و کێڵگەکان و دایەنی منـداڵ و پێشکەشـکردنی ئامۆژگـاریی ئـاییـنی و تەندروسـتی و ڕاوێـژکاری یاســایی و نەهێشــتنی نەخوێنــدەواری و کۆکردنــەوەی بەخشــش بــۆ پــڕۆژە خێرخوازییـەکان، بـەم شـێوەیە ئـەو خێوەتگانـە بەڕاسـتی ڕاهێنـان بـوون لەسـەر پابەندیی ئیسلامیی بە واتا فراوانەکەیەوە بە بیر و کردار. هـەروەها خوێنـدکارەکان ڕادەهێنران لەسەر پەیوەندیکردن بـە جـەماوەرەوە و بایەخـدان بـە کێشـەکانیان و هەوڵـدان بـۆ دۆزینـەوەی چارەسـەر، ئـەو خێوەتگانـە وەك ڕاهێنانێـك وا بـوون بـۆ پێگەیانـدنی سـەرکردەی بـەتوانا لەسـەر بەشـداریکردن لـە کـاری خۆبەخشـیی بەکۆمەڵ، بەتایبەت بەرپرسەکانی ئەڵقە و گرووپـە بەشـدارەکان لـە خێوەتگاکانـدا ڕادەهێنران لەسەر سەرکردایەتیی ئیسلامیی پێگەیشتوو و چۆنیەتیی بـەڕێوەبردنی کـار لـەناو ئەڵقـە و گرووپەکانـدا. هـەروەها چـۆنیەتیی بڵاوکردنـەوەی ڕۆحیـەت و برایەتیی ئیسلامیی لەلای تاکەکاندا. بەڵام بەشی من تـەنها بیسـتن بـوو دەربـارەی ئامادەکردن بۆ ئـەو خێوەتگانـە، یـان بیسـتنی هـەواڵی خێوەتگـەکان لەوانـەی کـە پێشتر بەشدارییان تێدا کردبوو. هیچکام لەو دوو جارەی سەردانی زانکۆکـەم تێـدا کردن بواری ئەوەم بۆ نەڕەخسا بەکردەیی بەشداری لەو خێوەتگایانەدا بکەم. ئـەم چالاکییانە و هاوشێوەکانیان بە سەرکەوتووترین چالاکی بۆ پێگەیاندنی سـەرکردە و بەجێهێنانی ڕۆڵی ئیسلامیی خوزراو دەبینم.

لــە ســاڵی (١٩٨٣ز–١٩٩٠ز) مامۆســتایانی ســەنتەری (المعــارف الإســلامیة) سەرپەرشتیی چالاکیی ئەڵقەکان و خێوەتگای خوێندکارانی گرتبووە ئەستۆ، بـەڵام دوای ئــەم سەرپەرشــتیکردنە گوازرایــەوە بــۆ بەشــی چــاودێریکردنی کاروبــاری

خوێنــدکاران لــە ڕیــزی چــالاکیی تــر کــە بــە بــاش زانــرا دابهێنــرێن[1]. لــەو تایبەتمەندییانــەی خوێنــدنی زانکــۆی ئیســلامیی جیــا دەکاتــەوە، ئەوەیــە دەبێــت خوێنــدکارەکانی هــەردوو زمــانی عــەرەبی و ئینگلیــزی شــارەزا بــن بــە ئاســتێکی پێویست، تاکو بتــوانن لــەو زانکۆیــەدا بخــوێنن، لــە کاتێکدا زۆربــەی کــات زانســتە ئیسلامییەکان بە زمانی عــەرەبی پێشــکەش دەکــرێن و زانســتەکانی تــر هــەموو بــە زمانی ئینگلیزی، بەم شێوەیە خوێندکاران دەتوانن سوود لە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی وەر بگرن. بۆ ئەوەی بوار بــۆ ئــەو خوێندکارانــە بڕەخســێت کــە زمــانی عەرەبی نازانن فێری بن، تاکو بتوانن گوێبیستی وانە ئیسلامییەکان بــبن، هــەروەها بوار بۆ ئەو خوێندکارانەش بڕەخسێت کە زمانی ئینگلیزی نــازانن فێــری بــن، تــاکو بتــوانن لەگــەڵ وانــەکانی تــردا بــڕۆن کــە بــە زمــانی ئینگلیــزی پێشــکەش دەکــرێن، ســەنتەری فێرکردنــی زمــان لــە زانکــۆ هەســتاوە بــە ئــەرکی خــۆی لــەم بــوارەدا بــە پشتبەستن بە نــوێترین شــێوازەکانی بەردەســت بــۆ فێربــوونی زمــان، بــەردەوام لــە هەوڵدایە بۆ پەرەدان بە ئاستی خۆی و باشترکردنی.

بیرم دێت کاتێك توێژەر وانەی دەگوتەوە بە خوێندکارانی خوێندنی بــاڵا بەشــی پەروەردە: دبلۆم و ماجستێر لە زانکۆکەدا، هاوینی ساڵی (١٩٩٢ز–١٩٩٣ز) هەردوو زمانی ئینگلیزی و عــەرەبیی لــە وانەکــەدا بــەکار دەهێنــا، خوێنــدکارانیش بــەوردی هەماهەنگ بوون لەگەڵ هەردوو زمانەکــە، ئەگــەر ئــەوە بهێنینــە پــێش چــاومان کــە زۆربەی خوێندکاران لە بنەڕەتدا عەرەبیزان نەبوون، ئەوا ئەو ڕۆڵە پــەروەردەییەمان بۆ دەر دەکەوێت کە زانکۆکە دەیگێڕێت لە بەعەرەبکردنی خوێندکاران و فێرکردنی زمانی قورئان و فەرموودە و زانستە ئیسلامییەکان، ئەمەش گەورەترین دەسکەوتە

---

[1]– بــۆ وردەکــاریی زیــاتر دەربــارەی پرۆگرامــە وردەکــانی ئــەو ئەڵقــە و موعەســکەرانە، بــڕۆرەوە ســەر: سەرچاوەی پێشوو (لا ١٢–٩٦).

له بنیاتنانی ئەوەی موسڵمانی تواناداربۆ ئەوەی بتوانن ڕاستەوخۆ سوود لە قورئان و فەرموودە و زانستە پەیوەندیدارەکانیان وەر بگرن. ڕۆڵی ئەو زانکۆیە لە بەعەرەبکردنی خوێندکارانیدا بە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەو زانکۆیە دادەنرێت و یەکێکە لە سیماکانی خوێندنی زانکۆیی ئیسلامیی ڕەسەن.

درەوشانەوەی ئەستێرەی بەختی ئەو زانکۆیە بریتی بوو لە پاڵپشتیی سیاسیی سەرۆك وەزیران (مەهاتیر محەمەد) و وەزیری دارایی (ئەنوەر ئیبراهیم)، هەردووکیان باوەڕیان بە پەیام و فەلسەفەی زانکۆکە هەبوو و پەیوەندییەکی بەهێزیان لەگەڵ پەیمانگای جیهانیی فکری ئیسلامیی هەبوو لەگەڵ باوەڕێکی بەهێز بە پەیامی پەیمانگاکە کە لە ((ئیسلامێتی مەعریفە))دا خۆی دەبینێتەوە. ئەو پەیوەندییە پتەوە لەنێوان پەیمانگا و حکومەتی مالیزیادا هاوکار بوو بۆ بەستنی کۆنگرەی ((ئیسلامێتی مەعریفە و چاکسازی سیستمی مەعریفی لە کوالالامپور)) ساڵی (١٩٨٤ز) کە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانی جەختیان لە گرنگیی ئیسلامێتی مەعریفە دەکردەوە لە هەموو لقێکدا وەك ئامرازێکی پێویست بۆ چاکسازیی مەعریفی، پاشان بۆ ڕابوونی شارستانیی ئوممەتی ئیسلامی.

گومانی تێدا نییە ئەم کۆنگرەیە باوەڕی بەرپرسەکانی زیاد کرد بە توانای ئەم بانگەوازە لەسەر دروستکردنی گواستنەوەیەکی مەعریفیی کە وڵاتی مالیزیا لەو کاتەدا پێویستی پێ بوو. هەموو ئەمانەش ڕێخۆشکەر بوون وەك پاڵپشتێکی ماددی و مەعنەوی بۆ زانکۆکە، تەنانەت لە ساڵی (١٩٨٨ز) داوا لە دکتۆر عەبدولحەمید ئەبو سلێمان) سەرۆکی پەیمانگا لەو کاتەدا کرا بێتە مالیزیا بۆ ئەوەی ببێتە سەرۆکی زانکۆی ئیسلامیی جیهانی. دکتۆر عەبدولحەمید ئەبو سلێمان بە هەلی زانی کە بیرۆکەی (ئیسلامێتی مەعریفە) لە جیهانیی هزر و تیۆرییەوە بگوازێتەوە بۆ جیهانیی واقع و پڕاکتیزەکردن.

دکتۆر عەبدولحەمید ئەبو سلێمان پەی بەوە برد پێدانی زانستە ئیسلامییەکان بە خوێندکارانی زانستە مرۆڤایەتییەکان هیچ کێشەیەك چارەسەر ناکات، لە کاتێکدا هێشتا ڕووباری زانستە ئیسلامییەکان دابڕاوە لە ڕووباری زانستە مرۆڤایەتییەکان، ئەمەش ئەوە نییە کە دەویسترێت. ئەوەی داوا کراوە تێکەڵکردنی ئەم دوو ڕووبارەیە بەیەك و نەهێشتنی ئەو دوو جەمسەریەیە، ئەوەش تەنها بەوە دەکرێت کۆلێژی زانستەکانی مەعاریفی ئیسلامیی و زانستە مرۆڤایەتییەکان دابمەزرێنرێن بۆ ئەوەی خۆی گوتەنی ببێتە: ((گەورەترین کۆلێژ کە هەموو پسپۆڕییە زانستییەکانی بواری زانستە ئیسلامییەکان و زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییەکان لەخۆ بگرێت))[١].

بەردی بناغەی سیستمی ئەکادیمیی ئەم کۆلێژە بۆ بەدیهێنانی یەکانگیریی مەعریفیی ئیسلامیی و چاکسازی میتۆدە هزرییەکان و دۆزینەوەی کادیری ڕۆشنبیریی سەرکردە و خاوەن پیشەی جێگرەوە –سیستمی جووتپسپۆڕیی تێکەڵ بوو (التخصص المزدوج) لەڕێی پشتبەستن بە سیستمی کاتژمێرییەوە، لەسەر بنەمای ئەم سیستمە جووتپسپۆڕیە هەر خوێندکارێك کە پسپۆڕییەکەی یەکێك لە زانستە ئیسلامییەکانە دەبێت پسۆڕییەکی لاوەکییش هەڵبژێرێت لە زانستە مرۆییەکان و بە پێچەوانەشەوە، واتە هەر خوێندکارێك پسپۆڕییە سەرەکییەکەی یەکێکە لە زانستە مرۆییەکان ئەوا پسپۆڕییە لاوەکییەکەی یەکێکە لە زانستە ئیسلامییەکان و هەر خوێندکارێکیش خوێندەکەی ساڵێك درێژ بکاتەوە بۆ تەواوکردنی پلە زانکۆییەکەی تری (بەکالۆریۆس) کە زانکۆ هانی خوێندکارانی دەدا

---

[١]– عبد الحميد أبو سليمان: إسلامية الجامعة وتفعيل التعليم العالي بين النظرية والتطبيق، الجامعة الإسلامية العالمية، ماليزيا، ندوة تفعيل التعليم العالي في خدمة الأمة، جامعة ابن الأزهر، مدينة أغادير، المملكة المغربية، (١٦، ١٧ من أبريل ٢٠٠١ م)، (ص ١٥، ١٦).

بۆ ئەم کارە، ئـەوا خوێندکارەکـە دەبێتـە خـاوەنی بڕوانامەیـەکی بـەکالۆریۆس لـە زاسـتە ئیسـلامییەکان و هـەروەها بـەکالۆریۆس لـە زانسـتە کۆمەڵایەتییـەکان لـەو بوارەی کە خوێندکارەکە لە بنەڕەتدا وەك پسپۆڕییەکی لاوەکی هەڵی بژاردبوو[1].

لە ماوەی ئەو ساڵانەی دکتۆر عەبدولحەمید ئەبو سلێمان سەرۆکایەتیی زانکـۆی گرتە دەست (١٩٨٨–١٩٩٩ز) لەگەڵ پشتگیری و هاوسۆزی سەرکردایەتی سیاسیی مالیزیـادا زانکـۆی ئیسـلامیی مـالیزی گەشـەی کـرد لـە هـەردوو ڕووی چـەندێتی و چۆنیەتییەوە و هەموو پسپۆڕییە زانکۆییەکانی گرتەوە و بـووە خـاوەنی جـوانترین بینای زانکۆیی کە ناوازەیی مۆدێلی ئیسلامیی لەپاڵ جوانیی تەلارسازیدا بەیەکـەوە کـۆ کردبوویـەوە و کۆششـی بێوێنـەیان کـرد لـەپێناو بەئیسـلامییکردنی هـەموو پرۆگرامـەکان و بڕیارەکـانی تایبـەت بـە خوێنـدن و چـەندین سـەنتەر کرایـەوە بـۆ لێکۆڵینـەوە و خوێنـدن لـە بـوارە جیاوازەکانـدا، گۆڤـاری زانسـتیی تایبـەت بـە پسپۆڕییەکان دەر کران و چەندین کۆنگرە و کۆڕی زانستیی بەستران[2].

توێژەر لـەو زانکۆیـەدا کـاری کـردووە وەك مامۆسـتایەکی سـەردانکەر، هـاوینی هەردوو ساڵی (١٩٩٢ز) و (١٩٩٣ز) و لە ماوەی ئەو دوو سەردانە کورتەدا بەشـداریم کرد لە گەشەپێدانی پرۆگرامـەکانی دبلـۆم و ماجسـتێر لـە پـەروەردەی ئیسـلامیدا، هەروەها وانەی هەندێك لە خوێندکارانی خوێنـدنی بـاڵای دا لـە هەنـدێك لـە زانسـتە پەروەردەییەکاندا لە ڕوانگەیەکی ئیسلامییەوە و زۆر دڵخـۆش بـووم بـەبینینی ئـەم ئەزموونە لە نزیکەوە و بەشداریکردن تێیدا بە کۆششـێکی کـەم لـە هـەڵگرتنی ئـەم

---

[1]– International Islamic University: Catalogue (1990-1991), (PP. 88, 89).

[2]– عبدالحميد أبو سليمان: إسلامية الجامعة وتفعيل التعليم العالي بين النظرية والتطبيق، سەرچـاوەیەکی پێشوو، (ص ١٦) ئەوەی دوای ئەوەش، عبد الحميد أبو سـليمان: أزمـة الإرادة والوجـدان المسـلم، البعـد الغائب في مشروع إصلاح الأمـة، في إصـلاح الثقافـة والتربيـة: رؤيـة إسـلامية معاصـرة، دار الفكـر، دمشـق، (٢٠٠٤م)، (ص ٢٢٧–٢٢٩).

کۆشکە زانستییە کە دەیەوێت مامۆستای موسڵمانی وا بێنێتە کایەوە زانستە ئیسلامییەکان و پسپۆڕییەکان پێکەوە کۆبکاتەوە، گرێی دابڕینی زانستەکانی دین و زانستەکانی دونیای لەلا کرابێتەوە، ئەمە ساڵی (١٩٩٢–١٩٩٣ز) بوو و لەژێر سەرکردایەتیی دکتۆر عبەدولحەمید ئەبو سلێماندا بوو و لەژێر سێبەری سەرکردایەتییەکی سیاسی هاوخەم و هاوسۆزدا و ئێستاش لە ساڵی (٢٠٠٣ز)داین و لەناو بارودۆخێکی جیاوازدا، جا چی کراوە لە ساڵی (١٩٩٣ز)وە تا ئێستا؟ ئەوە لە نزیکەوە پێویستیی بە گفتوگۆ و تاووتوێی زیاتر هەیە.

ئەوەی گرنگە بەلامانەوە لەو لێکۆڵینەوەیەدا پشکی ئامادەکردنی مامۆستایە لەو زانکۆیەدا، چونکە لە کاتی دامەزراندنیەوە هەتاکو ئێستا سەرپەرشتیارانی بیریان لە دامەزراندنی کۆلێژێکی پەروەردە نەکردووەتەوە کە پلەی بەکالۆریۆس و لیسانس بدات بە خوێندکارانی لە زانستە پەروەردەییەکاندا، تەنها بە خوێندنی باڵا لە پەروەردە و دەروونناسییدا وەستان و زانکۆکە لە بەشی پەروەردەی ئیسلامییدا لەوەدا وەستاوە کە تەنها دوو بڕوانامە دەبەخشێت: دبلۆم لە پەروەردە و ماجستێر لە پەروەردەی ئیسلامییدا، بەدیاریکراوی ماجستێر لە گوتنەوەی زمانی بۆ ناعەرەبەکان و ماجستێر لە گوتنەوەی زانستە ئیسلامییەکان و ماجستێر لە گوتنەوەی قورئانی پیرۆزدا.

ڕوون بوو کە ئامانج لە دبلۆمی گشتی لە پەروەردەدا، پێدانی زانستە پەروەردەیی و پیشەییەکانە لە ڕوانگەیەکی ئیسلامییەوە و بەدەسخستنی کەشێکی زانستی و ئیسلامیی کە یارمەتیی دروستکردنی مامۆستایەکی موسڵمانی پابەند دەدات لەپاڵ شارەزاییە پیشەییەکەیدا. ڕەنگە دانانی بەشی پەروەردە لەژێر چەتری کۆلێژی زانستەکانی سرووش و زانستە مرۆییەکان لەڕووی بەڕێوەبردنەوە ئاماژەیەك بێت بە فەلسەفەی فێرکردن لەناو ئەم بەشە پەروەردەییەدا کە

توێژینەوەکانی زانستە ئیسلامییەکان و زانستە پیشەییەکان پێکەوە کۆ دەکاتەوە.

**بۆیە پرۆگرامەکە سێ کۆمەڵە بابەتی خوێندن لەخۆ دەگرت:**

گرووپی یەکەم ئەو بابەتانەن کە خوێندکار فێری بنەما و بابەتە سەرەکییەکانی پەروەردەی ئیسلامیی دەکەن، کە ئەمانەن: بنەما گەشەپێدەرەکانی دیدی ئیسلامیی، بنەما مێژوویی و فەلسەفییەکانی پەروەردەی ئیسلامیی، گەشەسەندنی بنەماکانی خوێندنی ئیسلامیی، بنەما دەروونییەکانی خوێندنی ئیسلامیی، ئەم بابەتانەش وەك دیارە دیدی ئیسلامیی دەخاتە ڕوو لەبارەی مرۆڤ و گەردوون و ژیان و ڕەوشت و کۆمەڵگەوە، هەر وەك چۆن خوێندکار فێری زانستە پەیوەندیدارەکان بە مێژووی پەروەردەی ئیسلامیی و فەلسەفە و بنەما دەروونییەکانی دەکات، توێژەریش بەشداریی کرد بە گوتنەوەی بنەما مێژوویی و فەلسەفییەکانی پەروەردەی ئیسلامیی لە کاتی سەردانەکەیدا بۆ بەشی پەرەوەردە بە پشتبەستن بە هەندێك لە توێژینەوەکانی لەم بوارەدا، هەروەها هەندێك نووسراوی پەروەردەیی کە لە ڕوانگەیەکی ئیسلامییەوە نووسراون.

کۆمەڵەی دووەمیش لە بابەتەکان، هەندێك لە بنەما و بەکارخستنەکانی پەروەردەی لەخۆ گرت، کە ئەمانەن: کۆمەڵایەتی و پەروەردەی ئیسلامیی، دەروونناسیی پەروەردە و پەرەپێدان، گەشەپێدانی میتۆد و ڕێگاکانی وانەگوتنەوە، بابەتگەلێکی هاوچەرخ لە پەروەردەی ئیسلامییدا، هونەرەکانی پەیوەندی. ئەوەی کە گرنگ بوو لە پێشکەشکردنی ئەو بابەتانەدا، مامۆستاکان بەپێی توانایان لە ڕوانگەی ئیسلامییەوە تاووتوێیان دەکردن. توێژەریش لەڕێی هەندێك لە نووسینەکانیەوە بەشداریی لە پێشکەشکردنی وانەی (کۆمەڵایەتی و پەروەردەی ئیسلامی)دا کرد، لەگەڵ پێشنیازکردنی خوێندنەوەی هەندێ کتێب بۆ خوێندکاران بە هاوکاریی کتێبخانەی زانکۆ.

کۆمەڵـەی سـێیەمیش پـەروەردەی وەرزشـی لـەخۆ دەگـرت، لەگـەڵ ڕێگاکـانی وانەگوتنەوە و هەندێك بابەتی هەڵبژێردراو. لەپاڵ پـەروەردەی وەرزشـدا ڕێگاکـانی گوتنەوەی زمانی عەرەبی هەبوو و ڕێگاکانی گوتنـەوەی زمـانی مـالیزی، ڕێگاکـانی گوتنەوەی زمانی ئینگلیزی، ڕێگاکانی گوتنەوەی زانسته شـەرعییەکان و ڕێگاکـانی گوتنەوەی مێژوو، خوێندکاری دبلـۆمیش پێویسـت بـوو لەسـەری دوو پسـپۆڕی لـە ڕێگاکـانی وانەگوتنـــەوەدا هەڵبـــژێرێت. زانکـــۆ ئامـــاژەی بـــەوەش دا ڕێگاکـــانی وانەگوتنەوە لە بابەتی تریشدا زیاد دەکـەن ئەگـەر پێویسـتی هـەبێت و لـە توانـادا بێت. هەروەها پێویسته خوێندکار یەکێك لەم بابەتانە هەڵبـژێرێت: ئاڕاسـتەکردن و ڕێنـوێنیی پیشـەیی، چارەسـەری دەروونیـی، فێرکردنـی گـەوران، پـەروەردەی بـەراوردکاری، بـەڕێوەبردنی خوێندنگـە، فێرکـردن پـێش قوتابخانـە، پـەروەردە و پەرەپێدان، تەکنۆلۆجیای پەروەردە، پەروەردە و ژینگە.

لەپاڵ ئەو بابەتانەدا کە خوێندکاران لەسەریان بـوو تێیانـدا سـەرکەوتوو بـن بـۆ بەدەستهێنانی دبلۆم، داوایان لـێ کرابـوو چـەند لێکۆڵینەوەیـەك پێشـکەش بکـەن، هەروەها هەندێك نووسراوی دیاریکراو، هەر وەك چۆن داوام لەو خوێندکارانە کرد کە وانەم پێ دەگوتنەوە چەند نووسراوێك بنووسن و لێکۆڵینەوە لە بابەتەکانی مێژوو و فەلسـەفەی پـەروەردەی ئیسـلامییدا بکـەن و لـە کۆمەڵایـەتی و پـەروەردەی ئیسلامییدا. لەبەر ئەوەی زۆربەی خوێندکاران دەرچووی زانکۆی ئیسلامیی بـوون، زۆربـەی کـات ئاسـتێکی بـەرزیان هـەبوو و جـددیی بـوون و لەگـەڵ مامۆسـتادا پەیوەندییـەکی گـەرم و پتـەویان هـەبوو، ئەمـەش یەکێکـە لـە تایبەتمەندییـەکانی خوێندکارانی ئەو زانکۆیە بەتایبەت هەردوو تایبەتمەندیی بەڕێوەبردن و فەلسـەفەی فێرکردن[1].

---

[1]– International Islamic University: Catalogue (1990-1999), (PP. 103-107)

ئامـانجی قۆنـاغی ماسـتەریش لـە بەشـی پـەرەوەردەی ئیسـلامیدا بریتییـە لـە دروستکردنی شارەزایانی پەروەردەیی–لـە ڕوانگەیـەکی ئیسـلامییەوە– تـا بتـوانن کاریگەری لەسەر ئەو دامەزراوانە دروست بکەن کە لە داهاتوودا کاری تێدا دەکـەن، ئەوانەی بەرپرسیارێتیی ئەوەیان دەکەوێتـە سەرشـان بەشـدار بـن و کـار بکـەن لـە دامەزراندنی زانستەکانی پەروەردە لە ڕوانگەیەکی ئیسـلامییەوە، ئـەویش لـەو سـێ بوارەدا کە باس کران، خوێندنی بالآش ئەمانە لـەخۆ دەگرێـت: زمـانی عـەرەبی بـۆ قسـەپێنەکەرانی، خوێنـدنی زانسـتە شـەرعییەکان، خوێنـدنی قورئـانی پـیرۆز، خوێندکارانی ماستەریش لە هەرسێ بەشەکەدا بەشدارییان دەکرد لـە چـوار بابـەتی گشتیدا، کە سێ–یەکی پانتایی مەرجەکانی تەواوکردنی قۆناغەکە لـەخۆ دەگرێـت، ئـەوانیش: دەروونناسـیی پـەروەردەیی پێشـکەوتوو، میتۆدەکـانی توێژینـەوە، پێوەرەکـان و ئامـاری پـەروەردەیی، مێـژوو و فەلسـەفەی خوێنـدنی ئیسـلامیی پێشکەوتوو، پاشان وەرگرتنی چەند بابەتێکی تری پێویست (مواد إجبارية)، دواتـر کۆمەڵێك بابەت خوێندکار خۆی هەڵیان دەبژێرێت.

خوێنـدکارانی ماسـتەر –بەشـی عـەرەبی بـۆ قسـەپێنەکەرەکانی– لـەپاڵ وانـە ناچارییە گشتییەکاندا ئەم وانە ناچارییە پسپۆڕییانەیان دەخوێنـد: بابەتگـەلێك لـە (النحو العربي)، بابەتگەلێك لە ڕێگەکانی خوێندنی زمانی عەرەبی، ئەدەبی عەرەبی و شیکردنەوەی تاقیکردنەوەکان و سەرەتایەك لە زانستی زمان، لەپاڵ چوار بابەتدا لـەم دوو گرووپـەی خـوارەوەدا (کـە خوێنـدکار لـە هـەر گرووپێـك دوو بابـەت هەڵدەبژێرێت)

گرووپی یەکەم: وتاردان و ڕەخنە – بابەتەدەروونییە زمانەوانییەکان – ئـەدەبی مالیزیی ئیسلامیی –ڕۆشنبیری و ژیارستانییەتی ئیسلامی.

گرووپی دووەم: تەکنەلۆجیای فێرکردن لە خوێندنی زمانی عەرەبیدا – ئـامرازە

زانستییەکان لە گوتنەوەی زمانی عەرەبیدا – پەرەسەندنی پەرتووکی قوتابخانەیی لە زمانی عەرەبیدا – شیکردنەوەی گرێ و هەڵە زمانەوانییەکان.

خوێندکارانی ماستەریش –بەشی پەروەردەی ئیسلامیی– لەپاڵ بابەتە ناچارییە گشتییەکاندا ئەم بابەتە ناچارییە پسپۆڕییانە دەخوێنن: بابەتگەلێك لە ڕێگەکانی خوێندنی زانستە شەرعییەکاندا، بنەما دەروونییەکانی پەروەردەی ئیسلامیی پێشکەوتوو، بنەما کۆمەڵایەتییەکانی پەروەردەی ئیسلامیی پێشکەوتوو، میتۆدەکانی پەروەردەی ئیسلامیی، لەپاڵ چوار بابەت لەم گرووپانەی خوارەوەدا (کە خوێندکار لە گرووپی یەکەم دوو بابەت و لە گرووپی دووەم و سێیەم یەکی یەك بابەت هەڵدەبژێرێت).

- گرووپی یەکەم: تەکنەلۆجیای فێرکردن لە خوێندنی زانستە شەرعییەکاندا – ئامرازە فێرکارییەکان لە خوێندنی زانستە شەرعییەکاندا – پەرەسەندنی پەرتووکی قوتابخانەیی لە زانستە شەرعییەکاندا – ئامادەکردنی مامۆستای زانستە شەرعییەکان.

- گرووپی دووەم: پەرەسەندنی پرۆگرامە پێشکەوتووەکان – بابەتگەلێکی پەروەردەیی لە قورئان و فەرموودەوە – بنەماکانی بەڕێوەبردن لە پەروەردەی ئیسلامیی – بابەتگەلێکی بەراوردکاری لە پەروەردەی ئیسلامییدا – ڕێنمایکردن لە پەروەردەی ئیسلامییدا.

- گرووپی سێیەم: بنەما ئابوورییەکان لە پەروەردەی ئیسلامییدا – بنەماکانی پەیوەندی لە پەروەردەی ئیسلامییدا – ئامرازەکانی ڕاگەیاندن لە پەروەردەی ئیسلامییدا – ئاڕاستەکانی فێرکردنی ناسیستماتیك لە پەروەردەی ئیسلامییدا.

خوێندکارەکانی ماستەر لە بەشی خوێندنی قورئانی پیرۆز لەپاڵ بابەتە ناچارییە

گشتییەکاندا ئەم بابەتە ناچارییە پسپۆڕییانە دەخوێنن: بابەتگەلێك لە ڕێگاکانی فێرکردنی قورئانی پیرۆز – بنەما پەروەردەییەکانی قورئان – چەند ئاڕاستەیەکی نوێ لە فێرکردنی قورئانی پیرۆزدا – ئیعجازی زانستیی لە قورئانی پیرۆزدا. لەپاڵ چوار بابەتی هەڵبژێردراو لەم دوو گرووپەی خوارەوەدا (کە خوێندکار لە هەر گرووپێك دوو بابەت هەڵدەبژێرێت)

- گرووپی یەکەم: پەرەسەندنی پرۆگرامە پێشکەوتووەکان – مێژووی نووسینی قورئانی پیرۆز – قورئان وەك هێزێکی پاڵنەری زیندوو – زانستی تەفسیر.
- گرووپی دووەم: ئامادەکردنی مامۆستای پەروەردەیی و قورئانی – تەکنەلۆجیای فێرکردن و فێرکردنی قورئان – ئامرازەکانی فێرکردن و فێرکردنی قورئانی پیرۆز[١].

لەپاڵ دەرچوون لە هەموو بابەتە ناچاری و هەڵبژێردراوەکاندا، خوێندکار لەسەریەتی توێژینەوەیەك پێشکەش بکات لە بابەتێکی پەیوەندیدار بەپسپۆڕێتییەکەیەوە، لەژێر سەرپەرشتیی یەکێك لە مامۆستایانی بەشدا، پاشان لەلایەن لیژنەیەکەوە کە بۆ ئەو مەبەستە پێك هێنراوە تاقی دەکرێتەوە. توێژەریش دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخسا لە هەندێك بابەتی گشتیدا وانە بە خوێندکارانی ماستەر بدات، کە ئەمانەن: میتۆدەکانی توێژینەوە، مێژوو و فەلسەفەی خوێندنی ئیسلامیی، خوێندکارانیش داوالێکراو بوون بە لێکۆڵینەوە لەو بابەتانەدا، لەگەڵ ئامادەکردنی ڕاپۆرتدا. لە بابەتی میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەدا لەپاڵ میتۆدە بەربڵاوەکانی توێژینەوەی پەروەردەییدا میتۆدی لێکۆڵینەوەی دەستنووسی پەروەردەیی و میتۆدی ئوسولیم پێ دان، هەر وەك چۆن وانەم پێ دان لەبارەی میتۆدی ئیسلامییەوە، کە هەموو میتۆدە بەکارهێنراوەکان ئاڕاستە دەکات.

---

[١]- Ibid, (PP. 108-113).

هەروەها زیاد لە سەد نامەی ماستەر و دکتۆرام لە زانکۆ میسری و سعوودییەکانەوە هێنا بۆ کتێبخانەی زانکۆ، کە ئەو نامانە گرنگ بوون بۆ ئامادەکردنی بناغەیەکی زانستی بەهێز بۆ دەستکردن بە لێکۆڵینەوەی چڕوپڕ لە بەشەکەدا. بەڵام بەداخەوە توێژەر بواری ئەوەی نەبوو سەرپەرشتیی هیچکام لە نامەکان بکات، یان چاودێریی بکات، بەهۆی کەمی ئەو ماوەیەی لە بەش بەسەری برد کە تەنها دوو هاوین بوو.

تێکڕای ژینگەی بەش پاڵنەری مرۆڤ بوون بوو بۆ کێبڕکێ، ئەندامانی بەش هەوڵ دەدەن شتێك پێشکەش بکەن، خوێندکارانیش ئامادەییان تێدایە. کەشێکی زانستی ڕاستەقینە باڵی کێشابوو بەسەر بەش و کۆلێژدا، کە هێزەکەی لە ڕۆحی زانکۆکە و فەلسەفەکەی وەر دەگرت، هەروەها هێزی لە دەستەی بەڕێوەبەرایەتیی زانکۆ وەردەگرت، کە باوەڕدار بوو بە ئامانج و فەلسەفەکەی. هەر بەشێك هەوڵی ئەوەی دەدا خۆی پەرە پێ بدات، لەڕێی وانەی گشتییەوە بۆ ئەندامانی دەستەی وانەگوتنەوە کە لە شێوەی سیمیناردا بوو لەسەر ئاستی بەشەکان، تەنانەت وانەی گشتیی لەسەر ئاستی هەموو کۆلێژ یان زانکۆکە، ئەندامانی دەستەی وانەگوتنەوە هەوڵیان دەدا ئاستی خۆیان بەرز بکەنەوە لە بواری ئیسلامێتی زانست و مەعریفەدا. هێشتاش ئەو سێ وانە و سیمینارەم لەیادە کە لە ماوەی سەردانەکەمدا پێشکەشم کرد لە زانکۆکەدا.

سیمینارێکیان لەسەر ئاستی بەش، بە ناونیشانی ((میتۆدی ئیسلامیی لە لێکۆڵینەوەی پەروەردەیی و ئەو گفتوگۆ و مشتومڕانەی دەربارەی دەکرێت)). پاشان وانە و گفتوگۆیەکی تر لەسەر ئاستی کۆلێژ، بە ناونیشانی ((مێژووی پەروەردەی ئیسلامیی بۆچی و چۆن؟)) و وانە و گفتوگۆیەکی تر لەسەر ئاستی زانکۆ، بە ناوی ((پەرەپێدانی خوێندن لە زانکۆی ئەزهەردا لە ساڵی (١٩٦١ز– یاسای پەرەپێدانی ئەزهەر)ەوە تا ئێستا)) و چۆن یاسای پەرەپێدانی ئەزهەر

جیاواز بوو لەوەی کە ئێستا لە زانکۆی ئیسلامییدا ڕوو دەدات. زۆر کەم بوو هەفتەیەك بەسەر زانکۆدا بڕوات بەبێ وانە یان گفتوگۆیەك لەسەر ئاستی بەش یان کۆلێژ یان زانکۆ. هەمووشی لەدەوری یەك ئامانج دەسووڕێتەوە: چۆن ئیسلامیەتیی مەعریفە لەناو زانکۆدا بەدەست بێنین لەناو هەموو بەش و کۆلێژەکانیەوە.

هەروەها بەشی پەروەردە لە زانکۆی ئیسلامیی پەیوەندییەکی پتەوی هەبوو لەگەڵ وەزارەتی پەروەردەی مالیزی، بەشەکە ببووە جێی متمانەی وەزارەت، بۆیە بەشداریی کردبوو لە ڕاهێنانی کارمەندانی وەزارەتدا و لەگەڵ کورتی ئەو ماوەیەی بەسەرم برد بەشداریم کرد لە یەکێك لە خولەکانی ڕاهێنان بە وانەیەك بە ناوی ((فەلسەفەی پەروەردەی ئیسلامیی... بۆچی و چۆن؟)) تەنانەت وەزارەتی ئەوقافیش یارمەتیی لە بەش وەر دەگرت لە خولەکانی پێگەیاندنی بانگخوازدا. هەروەها خوێندکارانی بەش چ دبلۆم یاخود ماجستەر چالاکییان هەبوو لە بواری بانگەوازی ئیسلامی و چاودێریی نوێ مسوڵمانەکان. ئێستاش زیاد لە یەك چاوپێکەوتنم لەیادە کە ئەو خوێندکارانە بۆیان ڕێك خستم لەگەڵ هەندێك لەو ڕێکخراوە چالاکانە لەم بوارەدا، چ لە مالیزیا بێت یان ئەندۆنیسیا یان سەنگافوورە کە یەکیی جارێك سەردانم کردن (ئەندۆنیسیا و سەنگافوورە) بۆ بینینی دامەزراوەکانی خوێندنی ئیسلامیی و چالاکی بانگەوازی ئیسلامیی تێیاندا. ئەمانە چالاکیی خوێندکاریین کە خوێندکاران پێی ڕاهاتوون، بەڵام هەرچییەك بێت هێشتا ڕازیبوونی تەواو لەوەی تا ئێستا بەجێ گەیەندراوە لەناو بەش و کۆلێژدا دوورە، چونکە ڕێگا هێشتا دووورودرێژە لەبەردەم بەجێگەیاندنی هەموو ئامانجەکانی بەش و کۆلێژدا، لەوانەشە هۆکاری ئەوە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سەرەتای دامەزراندنی خوێندنی باڵا بوو لە بەشی پەروەردە و هەمیشەش سەرەتاکان بەسادەیی دێنە کایەوە. بەڵام ئەوەی بۆچی بەش بە هەردوو پلە لیسانس و بەکالۆریۆس دەستی

پێ نەکرد لە ئامادەکردنی مامۆستادا، لەوانەیە هۆکارەکانی هۆکاری هونەریی بن و پەیوەندیی بەوەوە هەبێت کە کۆلێژەکانی پەروەردە بە مامۆستا دادەنرێت لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا، بۆیە ئامادەکردنی مامۆستا بەجێبهێڵرێت بۆ ئەوەی بابەتێکی نەتەوەی تایبەت بێت بە وڵاتان خۆیان لە ئاستی لیسانس و بەکالۆریۆسدا و زانکۆی ئیسلامیی بە خوێندنی باڵاوە وەستا کە هاوبەشێکی ئیسلامیی پێشکەش بە هەمووان دەکات، بەڵام تەنانەت ئەم هاوبەشەش تەنها لە سێ پسپۆڕیدا خۆی دەبینییەوە: گوتنەوەی زمانی عەرەبی بە قسەپێنەکەرانی، خوێندنی زانستە ئیسلامییەکان، خوێندنی قورئانی پیرۆز، ئەی پسپۆڕییە پەروەردەییەکانی تر لەکوێن: میتۆدەکان، دەروونناسی، بەڕێوەبردن و بنەماکان و... هتد؟ هەروەرها خوێندنی باڵا تەنها لە ماجستێردا وەستا و درێژنەبوویەوە بۆ دکتۆرا لەپێناو خستنەمەیدانی کادیری زانستی پێویست بۆ کارکردن لە بواری ئیسلامێتی زانستە پەروەردەییەکاندا؟

ڕەنگە کاتێک ئێمە ئەو ئەزموونە پێشەنگە لە ئامادەکردنی مامۆستادا دەهێنینەوە پێشچاوی خۆمان، پەنجە بخەینە سەر هۆکارەکانی تایبەتمەندبوونی ئەو ئەزموونە و ئاستەنگەکانی بەردەم گەیشتنی بە ئامانجەکانی، چونکە هەر لە سەرەتاوە بەڕوونیی دەرکەوت کە زانکۆ —بە بەشی پەروەردەشەوە— ئامانجە پەروەردەییەکانی دیاری کردبوو، کە ئامانجانێکن تەنها لەسەر لایەنی زانستی یان هونەریی پسپۆڕی نەوەستا، بەڵکو جەختی لە گرنگیی پابەندبوونی ئیسلامیی خوێندکاران و دەستەی وانەگوتنەوەش دەکردەوە. ئەو ئامانجە دیاریکراوە ڕوونانەش بزوێنەری هەموو پێکهاتە زانستییە فێرکاریی و پەروەردەییەکان بوون لەناو زانکۆ و بەشدا.

هەوڵی بەردەوامم دا بۆ بەئیسلامیکردنی پرۆگرامەکان و کەشێکی پەروەردەیی

ئیسلامیی بۆ زانکۆ و بەش ڕەخسا بوو، کە جگە لە ئەنجامدانی نوێژەکان بەکۆمەڵ لە مزگەوتی زانکۆدا، چالاکیی خوێندکارییانەشی تێدا ئەنجام دەدرا، کە خۆی دەبینییەوە لە چالاکییە وەرزشی و هونەری و ڕۆشنبیریی و گەشتەکان، هەروەها چالاکیی ئیسلامیی ناوازەشی تێدا ئەنجام دەدرا، وەك: بەستنی ئەڵقە و خێوەتگە و پەرستش و چالاکیی بانگەوازی تر.

هەروەها زانکۆ و بەش کارگێڕییەکی بۆ ڕەخسابوو، کە دکتۆر عەبدولحەمید ئەبو سلێمان سەرۆکایەتیی دەکرد، بەو هەمووە مێژووە زانستی و سەرکردایەتییەوە کە هەیبوو لە بواری ئیسلامێتی مەعریفەدا، ئەم دەستە کارگێڕییەش تا دواسنوور باوەڕی بە ئامانجەکانی خۆی هەبوو. هەولّی دەدا پەرۆشی و باوەڕەکەی بگوازێتەوە بۆ زۆربەی ئەوانەی کاریان لەگەڵدا دەکرد، یاخود لێی نزیك دەبوونەوە بەهۆی ئەو کۆششە زۆرەی دەیخستە گەڕ. نووسینگەی سەرۆکی زانکۆ زۆر سادە و خاکی بوو، زۆر بەدەگمەن دەتبینی دەستی بەتاڵ بێت، بەردەوام لە چاوپێکەوتندا بوو لەگەڵ خوێندکار و بەشەکاندا و بە کاتی دەوامە فەرمییەکەیەوە نەدەوەستا، بەڵکو درێژ دەبوویەوە بۆ ماڵەوەشی. زیاد لە جارێك لە ماڵیاندا ئامادەی دانیشتن دەبووم لەدەوری ئەو خوانەی بۆی ئامادە دەکردین، لەگەڵ قسەوباس و بابەتی زانکۆیی و ئیسلامیی، کە پێویستی بە کەشێکی نافەرمی هەبوو بۆ تاووتوێکردنی، زۆریی بەپەرۆشبوونی خۆی و ئەوانەشی کە لەدەورین تەواو ماندووی کردبوو، چونکە خەونەکان فراوانن و تەمەنەکانیش کورتن، هەر وەك بڵێیت پێشبڕکێ لەگەڵ کاتدا بکات بۆ بەدیهێنانی هیواکانی لە بەئیسلامیکردنی زانکۆ و بەڕێوەبەرایەتیی زانکۆ و کۆلێژەکاندا و زیادکردنی توانای ئەم بەڕێوەبەرایەتییە بۆ گەیشتن بە ئامانجە ژیارییە ئیسلامییەکانی و هەروەها دروستکردنی کەشێکی فێرکاریی گونجاو کە شایەنی ئەوەیە لێکۆڵینەوەی زیاتری لەسەر بکرێت و هەڵبسەنگێنرێت لەڕێی

ئەم ئەزموونەوە.

هەروەرها زانكۆ و بەش پاڵپشتییەكی ماددیی فەرمیی و میللییان دەست كەوتبوو، كە دەكرا ببێت بە سیستمێكی تازە لە پاڵپشتیكردنی ماددیدا، چونكە سەرەڕای ئەوەی حكومەتی مالیزی بەشی هەرەزۆری پاڵپشتیكردنەكەی گرتبووە ئەستۆ لەڕووی دامەزراندن و بەڕێوەبردن و وانەگوتنەوە و لێكۆڵینەوەكان و... هتد، لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی ئەو مۆركە ئیسلامییەی زانكۆ هەیەتی هاوكاریی میللی و ڕێكخراوەیی بە گرنگ دادەنا لە پاڵپشتیكردنی هەندێك لە خەرجییەكان، بۆیە یارمەتیی لەو لایەنە میللییە ئیسلامییانە وەر دەگرت، وەك: بانكی ئیسلامیی بۆ گەشەپێدان، ڕێكخراوە خێرخوازییەكان، بازرگانەكان، دەوڵەمەندان و ئەم یارمەتییە میللییانەش ئاسانكارییان دەكرد لە دابینكردنی كورسی خۆڕایی خوێندن بۆ خوێندكاران و بەستنی كۆنگرە زانستییەكان[١]، سەرەڕای ئەوەش بەرپرسانی زانكۆ بیریان لە پێكهێنانی وەقفێكی ئیسلامیی گەورە نەكردووەتەوە كە پاڵپشتیی ئەم چالاكییانە بكات.

وەقفی ئیسلامیی ڕۆڵێكی گەورەی گێڕاوە لە بووژانەوەی خوێندنی ئیسلامیدا بە درێژایی سەردەمەكان. جا دەكرا زانكۆی ئیسلامییش ئەم نەریتە مەزنە زیندوو بكاتەوە و بەكاری بهێنێت لە پاڵپشتیكردنی زۆرێك لە چالاكییەكانی ناو زانكۆدا، بەتایبەت كە دكتۆر عەبدولحەمید ئەبو سلێمان شارەزایی هەیە لە بواری وەقفدا بەو ڕۆڵەی كە گێڕاویەتی لە دامەزراندنی پەیمانگای جیهانیی فكری ئیسلامیی و بەجێگەیاندی چالاكییە جۆراوجۆرەكانی تا ئێستا. جا ئەگەر دكتۆر عەبدولحەمید ئەبو سلێمان ئەم كارەی ڕێك بخستایە دەیتوانی وەقفێكی گەورە بۆ زانكۆی

---

[١]– عبد الحميد أبو سليمان: إسلامية الجامعة وتفعيل التعليم العالي بين النظرية والتطبيق، سەرچاوەیەكی پێشوو، (ص ٢٥).

ئیسـلامیی پێـك بهێنێـت لەگـەڵ گـەورەیی ئـەم كـارە و پێداویسـتییە ماددیەكانیـدا بگونجێت، كە بەكۆتا نایەت، هەروەها دەبووە نموونەیـەكی زینـدوو لەسـەر توانـای دامەزراوەكانی ئوممەت، لەوانەش وەقف لەسەر بەجێگەیاندنی ئەركی ژیارستانییان كە بە درێژایی ژیانی ئوممەت پێی هەستاون. ئەمەش دەبووە نموونەیەكی جوان بۆ زانكـۆ عـەرەبی و ئیسـلامییەكانمان، تـاكو بگەڕێنـەوە بـۆ دامـەزراوەی وەقفـی ئیسـلامیی وەك سەرچـاوەیەك لـە سەرچـاوە ماددییـەكانیان بـۆ پاڵپشـتیكردنی خوێندنی زانكۆیی و پەرەپێدانی. لەوانەشە سەرقاڵبوونی دكتۆر عەبدولحەمید ئـەبو سلێمان بـە دروسـتكردنی باڵەخانـەكانی زانكـۆ و قۆنـاغی دامەزراندنـەوە كـاتی بـۆ نەهێشتبێتەوە بۆ پێكهێنانی وەقفێكی مەزنی لەم شێوەیە.

زانكۆی ئیسلامیی لە مالیزیا هـەلێكی دەگمـەن بـوو بـۆ دامەزرانـدنی كۆلێـژێكی پەروەردە، كە بڕوانامەی بەكالۆریۆس و لیسانس لە پـەروەردەدا ببەخشـێت لـەپاڵ بڕوانامەی ماستەر و دكتۆرادا، ئەمـەش هەلێكـە قـەرەبوو ناكرێتـەوە. پێداویسـتیی ئوممـەتی ئیسـلامییش بـە دامەزرانـدنی كۆلێـژێكی پـەرەوەردەی ئیسـلامیی، كـە فەلسـەفەی زانكـۆی ئیسـلامیی یـاخود فەلسـەفەی ئیسـلامێتی مەعریفـەی لـەخۆ گرتبێت پێویستییەكی گەورەیە، بەڵكو لەوانەیـە لـەپێش هـەموو پێداویسـتییەكانی ترەوە بێت، ئەمە ئەگەر بەڕاستی بیانـەوێت مامۆسـتای موسـڵمانی بـەتوانا لەسـەر دروستكردنی نـەوەی ئیسـلامیی نـوێ بخەنـە مەیـدان. ئەگـەرنا چـۆن خوێندنگـەی ئیسلامیی دروست بكـەین بـەبێ ئامـادەكردنی مامۆسـتای موسـڵمان؟ بـەڵكو چـۆن دەتوانین كۆلێژی پەروەردە دروست بكەین بەبێ ئامـادەكردنی مامۆسـتای زانكـۆی پەروەردەیی ئیسلامیی؟

دكتۆر عەبدولحەمید ئەبو سلێمان هەوڵی دروستكردنی قوتابخانەیەكی ئیسلامیی دا بۆ منداڵی ئەوانـەی لـە زانكـۆی ئیسـلامیی كـار دەكـەن، لـەم ڕێگەیەشـدا چـەند

هەنگاوێکیان نا و خوێندنگەکە و ناوەندێکی لێکۆڵینەوەی پڕۆگرامەکانی خوێندن و پلانە پەروەردەییەکان دروست کران بە مەبەستی دروستکردنی قوتابخانەیەکی ئیسلامیی جیهانیی وەك ئەڵقەیەك لە زنجیرەیەك خوێندنگەی پێشکەوتنی شارستانی. هەلی ئەوەم بۆ ڕەخسا سەردانی خوێندنگەکە بکەم، کە کۆمەڵێك مامۆستای ناوازە هەڵیان دەسووڕاند، کە باوەڕیان بە ئیسلامێتی مەعریفە هەبوو، توانییان بە یارمەتیی مامۆستایانێکی بەشی پەروەردە پلان بۆ پڕۆگرامەکانی خوێندن دابڕێژن، بە شێوەیەك هزری ئیسلامیی لەگەڵ دوایین ئەو پڕۆگرامانەی وڵاتە پێشکەوتووەکان پێی گەیشتوون تێیدا پێکەوە کۆ بکاتەوە. چاوم بەو پلانانە کەوت، بەتایبەت پڕۆگرامەکانی زمانی عەرەبی و پەروەردەی ئایینیی ئیسلامیی، هەر وەك چۆن چاوم کەوت بە ڕێبەری مامۆستا، کە دکتۆرە (فریال الخالدی) ئامادەی کردبوو بۆ یارمەتیدانی مامۆستاکان لەسەر گوتنەوەی زمانی عەرەبی و پەروەردەی ئیسلامی. ئامادەکەرانی ئەو پڕۆگرامانە ئاماژەیان بە دەیان دامەزراوەی فێرکردنی عەرەبی و ئیسلامیی و جیهانیی داوە لە چەندین دەوڵەتەوە کە سوودیان لێ بینیوە لە ئامادەکردنی ئەو پڕۆگرامانەدا: ئەمریکا و ئینگلتەرا و مالیزیا و ئەفریقای باشوور و سویسرا لەپاڵ زۆربەی دەوڵەتە عەرەبییەکاندا. ئەمەش کۆششێکی مەزنە[١]، بەڵام بەهۆی کەمیی ئەو کاتەی لەوێ بەسەرم برد و

---

[١]– بۆ وەرگرتنی وێنەیەك لە سروشتی ئەو پڕۆگرام و بڕیارانەی خاوەنەکانیان ئاڕاستەیەکی عەلمانییان هەیە، بگەڕێرەوە سەر: محمد إسماعيل ظافر، برامج ومناهج كليات التربية في دول الخليج العربي، دراسة تحليلية مقارنة وتطورية للواقع والمأمول، مكتب التربية العربي لدول الخليج، (١٤٠٩هـ/١٩٨٩م). لە بانگەواز بۆ گرنگیی بەئیسلامییکردنی زانستە پەروەردەییەکان و نموونە لەسەر ئەو بەئیسلامییکردنە، بڕوانە: عبد الرحمن النقيب: التربية الإسلامية، رسالة ومسيرة، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ١٠٧–١٥٣). بۆ وەرگرتنی وێنەیەك لەسەر پڕۆگرامەکانی ئەو قوتابخانە جیهانییە، بڕوانە: International Islamic School Curriculum هەروەها ڕێبەری مامۆستای زمانی عەرەبیی و زانستە

بەهۆی سەرقاڵیم بە پەرەپێدانی ماستەر لە پەروەردەدا کاتی پێویستم بۆ نەڕەخسا بەدوای ئەوەدا بچم تا چەند ئەو پلانانە جێبەجێ کراون، یان تا چەند خوێندنگەکە سەرکەوتوو بووە لە بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەی لەپێناویدا دروست کرا، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەزموونێکی گرنگە و شایەنی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی زیاترە. بەهۆی ئەو باوەڕەی د. عەبدولحەمید أبو سلێمان هەیبوو بە گرنگیی پەروەردە لە بەدیهێنانی چاکسازیی ژیاریدا، چ لەسەر ئاستی خوێندنی زانکۆیی بێت، یاخود خوێندنی پێش زانکۆ بۆیە ئاگاداری گرنگیی و مەترسیی پەروەردەی منداڵ بوو، لە ساڵانی کۆتاییدا تیشکی خستە سەر پێویستیی بایەخدان بەم ڕەهەندە ونبووە و بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە دامەزراوەیەکی بۆ گەشەپێدانی منداڵ دامەزراند (CHILD DEVELOPMENT FOUNDATION) کە شوێنکەوتووی پەیمانگای جیهانیی فکری ئیسلامییە بە ئامانجی بایەخدان و باش پەروەردەکردن و چاودێریکردنی منداڵان[1]، بەڵام چۆن خوێندنگەیەکی ئیسلامیی یاخود دامەزراوەیەکی ئیسلامیی بۆ گەشەپێدانی منداڵ سەرکەوتوو دەبێت بەبێ ئەوەی سەرەتا مامۆستای موسڵمان بۆ منداڵ و خوێندکار و

---

شەرعییەکان: Feryal Elkhaldi: Teacher's Guide. کە ئەویش کۆششێکە شایەنی بەدواداچوونە لەپێناو گەیشتن بە ئامانجی مەزن. برامج ومناهج كليات التربية في دول الخليج العربي، دراسة تحليلية مقارنة وتطورية للواقع والمأمول، مكتب التربية العربي لدول الخليج، (١٤٠٩هـ/١٩٨٩م).

[1]– عبدالحميد أبو سليمان: أزمة الإرادة و الوجدان، البعد الغائب في مشروع إصلاح الأمة، في إصلاح الثقافة والتربية، رؤية إسلامية معاصرة، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ٢٣١–٢٣٦). بۆ وردەکاریی زیاتر لەبارەی بابەتی تەواوکاریی مەعریفی و جێبەجێکردنەکانی لە پرۆگرامە زانکۆییەکان، بڕۆرەوە سەر:

ـ أبوبكر محمد إبراهيم: التكامل المعرفي وتطبيقاته في المناهج الجامعية: تجربة في كلية معارف الوحي الإسلامي والعلوم الإنسانية بالجامعة الإسلامية بماليزيا (١٩٩٠م–٢٠٠٠م)، رسالة دكتوراه، الجامعة الإسلامية بماليزيا، (٢٠٠٤م).

مامۆستاکەش ئامادە بکەین؟ ئەمە ئەوەیە کە دەبێت پەیمانگای جیهانیی فکری ئیسلامیی ئاوڕێکی لێ بداتەوە لە ماوەی داهاتوودا، ئەگەر بیەوێت سەرکەوتوو بێت لە گەیاندنی ئەو پەیامەی هەر لە سەرەتاوە بۆی دامەزرێنرا.

لە کۆتاییشدا ئامادەکردنی مامۆستا لە وڵاتانی ئیسلامیدا نابێت کارێکی تایبەت بێت بە هەریەکێك لەو وڵاتانەوە، چونکە خاڵی ئیسلامیی و پیشەیی هاوبەش هەیە کە پێویستە مامۆستای موسڵمان پەی پێ بەرێت، جا هەر ڕەگەزنامە و نیشتمان و زمانێکی هەبێت. هەموو زانستە دەروونییەکان و پەروەردەییەکان خاڵی هاوبەشن بۆ هەموو مامۆستاکان و بێگومان دەبێت لە ڕوانگەی یەکانگیری مەعریفەی ئیسلامییەوە بخوێنرێت، هەروەرها هەموو ڕۆڵە پیشەیی و شارەزاییە پیشەیی و تەکنەلۆجییەکان کۆلکەی هاوبەش پێك دەهێنن بۆ هەموو مامۆستایان.

دامەزراندنی کۆلێژی پەروەردەی ئیسلامیی لە هەر شوێنێك لە جیهانیی ئیسلامیی ڕووداوێکی گرنگ دەبێت لە مێژووی ئەم ئوممەتەدا و ئاماژەیەك دەبێت لە ئاماژەکانی چاکسازیی ڕۆشنبیریی و پەروەردەیی خوازراو، چونکە کۆلێژێکی بەم شێوەیە پرۆگرامەکانی لە ڕوانگەی یەکانگیریی مەعریفەی ئیسلامییەوە پێشکەش دەکات و کەشێکی فێرکاریی ئیسلامیی بۆ خوێندکارەکانی دەڕەخسێنێت. بەم شێوەیەش ئەو مامۆستا موسڵمانە پێشکەش بە کۆمەڵگا دەکات بەکردەیی تایبەتمەندییە ئیسلامیی و لێهاتووییە پیشەییەکانی پێکەوە کۆ دەکاتەوە. بەبێ ئەم مامۆستایە ناتوانین منداڵی موسڵمان و نەوەی موسڵمان پەروەردە بکەین و ئوممەتی ئیسلامییش سەرلەنوێ ناگەڕێتەوە بۆ بەجێگەیاندنی ڕۆڵی ژیاریی بەو شێوەیەی لێی چاوەڕێ دەکرێت.

## کۆتایی:

له لاپەڕەکانی پێشوودا باسمان لەو کۆششه کرد که ئێستا لـه میسـردا بەخـەرج دەدرێت لەپێناو پەرەپێدانی خوێندنی زانکۆیی بـه شـێوەیەکی گشـتی، سـەرەڕای ئەوەی جێی دەستخۆشییه، بەڵام هێشتا له سەرەتاکانیدایه و پێویستی به کاته بۆ ئەوەی بڕیاری لەسەر بدرێت و هەڵبسـەنگێنرێت، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئێمـه تیشـکمان خسته سەر بەشێکی زۆر گرنگ له چاکسازیی کۆلێـژەکانی پـەروەردە، کـه زۆر بـه گرنگیی دەزانـین، بـەڵکۆ وای دەبیـنین بـەبێ ئـەو چاکسـازیه بـەو ڕادەیـه سـوودی نابێت، له کاتێکدا ئـەو زانسـته پەروەردەییانـەی دەدرێـت بـه خوێنـدکارانمان لـه کۆلێژەکانی پەروەرده له ڕوانگەیەکی مـەعریفیی ڕۆژئاواییـەوه داڕێـژراوه، نـەك لـه ڕوانگەیەکی مەعریفیی تەواوکاری ئیسلامییەوه، جا ئەگـەر ئـەم ڕوانگـه مەعریفییـه سـرووش دوور بخاتــەوه وەك سەرچـاوەیەك لـه سەرچـاوەکانی مەعریفـه بـەهۆی بارودۆخی مێژوویی و ڕۆشنبیریی تایبەت به خۆیەوه، ئـەوا ڕوانگەیـەکی یەکلابینـه، له کاتێکدا ڕوانگەی مەعریفیی تەواوکاریی ئیسـلامیی سـرووش دوور ناخاتـەوه وەك سەرچاوەیەك له سەرچاوەکانی مەعریفه.

ئەگـەر موسـڵمانان لـه سـەردەمانی بووژانەوەیانـدا مەعریفەیـەکی تـەواوکارییان بەرهەم هێنابێت که هەستپێکراو و عەقڵ و سرووش تێیدا کۆ دەکرێنەوه، ئەوا لـەم

سـەردەمی ئێسـتاماندا داوالێکـراون ئـەو یەکانگیرییـە مـەعریفی و تەواوکارییـە مەعریفییـە بگەڕێننـەوە، تـاکو خۆیـان و هـەموو جیهـان ڕزگـار بکـەن لـەو ڕوانینـە یەکلایەنە وێرانکەرەی ژیارستانییەتی مرۆیی، بۆ ئـەوەی جـارێکی تـر مرۆڤایـەتی بەئاگا بێتەوە بە زانستێکی تەواوکار کە هەموو سەرچاوەکانی مەعریفە لەخۆ بگرێت و یـەکیان بخـات، بـۆ ئـەوەی گوتـەکانمان تـەنها لـە لایـەنی تیۆرییـەوە نـەبێت، ئەزموونی زانکۆی ئیسلامیی مالیزیامان خستە ڕوو لـە بـواری ئیسـلامێتی زانسـت و مەعریفەدا، بەتایبەت لە بەشی پەروەردە و ئەوەی لەم بوارەدا بەدەست هێنراوە.

لە ئاسۆکانەوە سـەرەتای سـپێدەیەکی نوێمـان لـیٚ دیـارە بـۆ ئـەم تەواوکارییـە مەعریفییە کە خۆی دەبینێتەوە لـە هەنـدێك لـەو دامـەزراوە ماندوونەناسـانەی لـەم پێناوەدا کار دەکەن، ئەوەی ئێستا لەیادم بێت وەك نموونە: ناوەندی جیهـانیی بـۆ توێژینەوەی ئابووری لە مەککە، ڕێکخراوی ئیسلامیی بۆ زانسـتە پزیشـکییەکان لـە کوەیت، ڕێکخراوی ئیسلامیی بۆ پەروەردە و زانسـتەکان و ڕۆشـنبیریی لـە ریبـات، ناوەندی توێژینەوەکانی مێژوو و هونەر و ڕۆشـنبیریی ئیسـلامیدا لـە ئەسـەتەنبوڵ، کۆڕی مەلەکی بۆ توێژینـەوە لـە شارسـتانیەتیی ئیسـلامیی لـە عـەممان، ناوەنـدی ئیسلامیی بۆ فیکـری ئیسـلامیی لـە واشـنتۆن و دامـەزراوەی تـریش. بـەڵام بـواری پەروەردە —کە بیٚ هیچ گومانێك مەترسیدارترینی بوارەکانە— پێویستی بە کۆششی زیـاترە، تـاکو بتوانێـت دووبـارە زانسـتە پەروەردەییـەکانمان دابڕێژێتـەوە بـە داڕشـتنەوەیەکی تەواوکارانـە، بـەو کـارەش ڕیٚ خـۆش دەکـەین بـۆ دروسـتکردنی مامۆستای باش و نەوەی شانازیکەر بە ڕۆشنبیریی و بەخششە ژیارییەکانیەوە.

ئەوەش پێویستی بە هەوڵ و هاریکاریی زیاتر و چەندئەوەندەکردنی کۆششەکان

هەیە بۆ دامەزراندنی یەك ناوەندی پەروەردەیی جیهانیی ئیسلامیی، کە خاوەنی چەندین لق بێت لە هەموو پارچەکانی جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیی، ئامانجە دیاریکراوەکەشی: بەدیهێنانی ئیسلامێتی زانست و مەعریفە بەتەواوی لەناو زانکۆکانماندا و بەدواداچوونی بەردەوام بۆ تاقیکردنەوە و بڵاوکردنەوە و هەڵسەنگاندنی ئەو پرۆگرامانە، بە بۆچوونی منیش ئەوە گەورەترین چاکسازییە کە بتوانرێت ئەنجام بدرێت لە خوێندنی زانکۆییدا لە جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیماندا.

***

# تایبه‌تمه‌ندێتیی ژیاریمان له نه‌هێشتنی نه‌خوێنده‌واری و فێرکردنی گه‌وران[1]

پێشتر لـه ئـه‌ده‌بیاتی پـه‌روه‌رده‌یی (خۆمـاڵی و جیهانیـدا) باسمـان لـه گـۆڕانی چه‌مکی (نه‌هێشتنی نه‌خوێنـده‌واری و فێرکردنـی گـه‌وران) کـرد، لـه کاتێکـه‌وه بـۆ کاتێکی تر و له شوێنێکه‌وه بۆ شوینێکی تر، ئه‌و گۆڕانکارییانه‌ی به‌سـه‌ر چـه‌مك و واتای نه‌خوێنده‌واریدا هـاتوون بوونه‌تـه هـۆی ئـه‌وه‌ی گۆڕانکـاری به‌سـه‌ر چـه‌مك و واتای نه‌هێشتنی نه‌خوێنده‌وارییشدا بێت، به‌و پێیه‌ی پێشـتر نه‌خوێنـده‌واری تـه‌نها خۆی ده‌بینییه‌وه لـه نـه‌بوونی توانـای خوێندنـه‌وه و نووسـین و ژمێریـاری، بـه‌ڵام ئێستا ماناکه‌ی فراوانتر بووه و نه‌بوونی شاره‌زاییش له‌و بـه‌هره سـه‌رده‌میانه‌ی کـه مرۆڤ به‌به‌رده‌وامی پێویستی پێ ده‌بێت بۆ ئه‌وه‌ی به‌شداری بکـات لـه پـه‌ره‌پێدانی

---

[1]– ئه‌م لێکۆڵینه‌وه‌یه پێشکه‌شی کۆڕبه‌ندی کۆلێژی په‌روه‌رده کراوه لـه‌ژێر ناونیشـانی: ڕۆڵـی زانکـۆ لـه نه‌هێشتنی نه‌خوێنده‌واری و فێرکردنی گه‌وره‌کاندا، له شوباتی (٢٠٠٥)دا.

کۆمەڵگاکەیدا لەخۆ دەگرێت، تەنانەت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئێستا ئەم جۆرە خوێندنە (فێرکردنی گەوران) بە ئاستی چوارەمی خوێندن هەژمار دەکات لەپاڵ سێ ئاستەکەی تردا (یەکەم: سەرەتایی، دووەم: ناوەندی، سێیەم: خوێندنی باڵا و زانکۆ). بەم شێوەیە خوێندن و فێرکردنی گەوران خوێندنێکی تایبەتمەندە و پێویستی بەردەوامی فێرکردنی هەمیشەیی دەیسەپێنێت، بێگومان ئەم کۆتا ئاستەش ناوازەترین ئاستە بۆ چەمکی نەهێشتنی نەخوێندەواریی فێرکردنی گەوران لە هەموو جیهاندا.

بەڵام ئەم چەمکە لەم مۆدێلە پێشکەوتووەیدا دەبێتە هۆی پشتگوێخستنی تایبەتمەندێتیی ژیاریمان کە وا پێویست دەکات جگە لە نەهێشتنی نەخوێندەواری و فێرکردنی گەوران، نەهێشتنی نەخوێندەواریی ئایینیی هەموو تاکەکانی گەلیش لەخۆ بگرێت، بەم پێیە نەخوێندەواری لە زمانەوانیدا و لە قورئانی پیرۆزدا بە واتای نەزانی و بێئاگایی دێت، هەر وەکو ئیبن مەنزور دەڵێت: "نەخوێندەوار واتە: بێئاگا و تێنەگەیشتوو، هەر وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لا يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلاَّ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَظُنُّونَ﴾{البقرة:٧٨} واتە: هەندێك لەو جوولەکانە نەخوێندەوارن، وا دەزانن کتێبی تەورات بێجگە لە چەند هیوا و ئاواتێك هیچی تر نییە، ئەوانە هەر گومانیان کردۆتە پیشەی خۆیان.". لەم بارەیەوە تەبەری دەڵێت: "لەم جووانە کۆمەڵێك کەس هەن نە کتێب دەخوێننەوە و نە دەشنووسن، وەك ئاژەڵ هیچ شتێك نازانن، بەڵکو تەنها گومانی درۆ دەبەن، بۆیە لێرەدا مەبەست لە نەخوێندەوار تەنها نەزانینی خوێندنەوە و نووسین نییە، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا بێئاگابوونە لە ڕاستی و حوکمە شەرعییەکان".

لەم بارەیەوە هەندێك لە ڕاڤەکارانی قورئان وەکو فەراء و کیسائی ڕایان وایە هۆکاری ئەوەی خودای گەورە ناوی لەم جوولەکانە ناوە نەخوێندەوار، دەگەڕێتەوە

بۆ ئـەوەی ئەمانـە بێئاگـا و نـەزان بـوون لـەبارەی ئـەو ئایینـە ڕاسـتەی کـە بۆیـان دابەزیبوو و بەشیان لەو کتێبەدا (تەوڕات) تەنها خوێندنـەوەی وشـەکانی بـووە بـێ ئەوەی لێی تێبگەن و ڕابمێنن و پەندی لێ وەر بگرن لە ژیانیاندا هەر وەکو خـودای گەورە لەبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿مَثَلُ الَّـذِينَ حُمِّلُـوا التَّـوْرَاةَ ثُـمَّ لَـمْ يَحْمِلُوهَـا كَمَثَـلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا﴾ {الجمعة ٥}، واتە: (نموونەی ئەوانەی کە تەوراتیان درا بەسەردا تـا پـەیڕەوی بکـەن، پاشـان هـەڵیان نـەگرت و پـەیڕەویان نـەکرد، وەك نموونـەی گوێدرێژێك وایە بارە کتێبێکی هـەڵگرتبێت). بۆیـە نەخوێنـدەواری هـەر وەك چـۆن نەخوێنـدەواری خوێندنـەوە و نووسـین و ژمێریـاری دەگرێتـەوە بـە هـەمان شـێوە نەخوێندەواری لە تێگەیشـتن و هـزر و ڕاسـتی و بیروباوەڕەکـانیش دەگرێتـەوە کـە ئەمەشیان بایەخی زیاترە و گرنگترە.

نەخوێندەواری لە بـواری هـزر و ڕاسـتی و بیروباوەڕەکـان پڕکێشـەترە، چـونکە هەنـدێ جـار مەعریفـە و زانسـت بـەبێ بیروبـاوەڕ و ئـایین دەبێتـە بـەڵا بەسـەر خاوەنەکەیەوە، هە روەك چۆن دەبینین زانست لە بـاڵاترین وێنەکانیـدا لـە ئـەمریکا نەیتوانیوە ئەمریکا بەدوور بگرێت لە ملهوڕی و ستەمکردن لـە گـەلانی جیهـان، بـە هەمان شێوە زانست لە هەندێك لە وڵاتانی جیهانیی دووەم نەیتوانیوە ڕێ بگرێت لە ناپاکیی خاوەنەکانی لە نیشتیمانەکەی خـۆی، بـۆ نموونـە ئـەوەی لـە ئەفغانسـتان ڕووی دا پاش ئەوەی زیاتر لە چل هەزار کەس ڕوویان لە یەکێتیی سۆڤیەت کرد بـە مەبەسـتی خوێنـدن و ڕاهێنـان دواتـر ئـەم ژمارەیـە بـۆ نزیکـەی سـەد هـەزار بـەرز بوویەوە، پاشان هەر ئەمان بوونە کادری کۆمۆنیستی لە سوپا و جومگـەکانی تـری دەسەڵاتدا و بوونە داردەست و هێـزی ڕوسـیا لـە ئەفغانسـتاندا و بـۆ بەرژەوەنـدیی ڕوسـیا کاریـان دەکـرد. هـەروەها ئـەوەی ئێسـتا لـە عێراقـدا دەگوزەرێـت لـە

چوونەدەسەڵاتی ئەو کادیرانەی کە لە ئەمریکادا خوێندوویانە و مەشقیان پێ کراوە نموونەیەکی ترە سەبارەت بە فێربوون و خوێندن دوور لە باوەڕی دروست و بیروباوەڕی ڕاستەقینە.

بە پێچەوانەوە نەهێشتنی نەخوێندەواریی ئایینی هۆکاری ئەوە بوو وا لە ڕوبعی کوڕی عامر بکات (کە یەکێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بەبێ ئەوەی بزانێت بنووسێت یاخود بخوێنێتەوە، بچێتە لای ڕۆستەمی ئیمپراتۆری فارس و ئیسلامیی بۆ بخاتە ڕوو هەر وەکو تەبەری دەیگێڕێتەوە: ((کاتێك زەهرە چووە لای ڕۆستەم، ڕۆستەم پێی گوت: ئێوە دراوسێی ئێمەن و بەشێك لە ئێوە لەژێر دەسەڵاتی ئێمەدا بوون و ئێمەش بەباشی لەگەڵیاندا مامەڵەمان کردووە و دەستمان لێ پاراستوون و پێگە و دەسەڵاتی باشمان پێ دەدان و لەناو کەس و ناوچەی خۆیاندا پارێزگاریمان لێ دەکردن و لەوەڕگاکانمان لەبەردەمدا کردبوونەوە و لە وڵاتی خۆمان ڕۆزیمان پێ دەدان و ڕێی هیچ بازرگانییەکمان لێ نەدەگرتن لە تەواوی زەوییەکانماندا ئەمەش هۆی ڕۆزی و ژیانی ئەوانی تێدا بوو، زەهرەش پێی گوت: ڕاست دەکەیت بەو شێوەیە بوو کە باست لێوە کرد، بەڵام ئێمە کارمان لە کاری ئەوان و داواکارییەکانمان لە داواکارییەکانی ئەوان جیاوازە، ئێمە بۆ داواکردنی دونیا نەهاتووینەتە ئێرە، بەڵکو خواست و ویستمان ڕۆژی دواییە، بەڵێ ئێمە بەو شێوەیە بووین کە باست کرد، هەرکەسێك لە ئێمە کە دەهاتە لای ئێوە قەرزاربارتان دەبوویەوە و دەپاڕایەوە تاکو هەندێك لەوەی لە دەستاندایە پێی ببەخشن، پاشان خودای گەورە و بەرز و باڵا پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردین و ئێمەش باوەڕمان پێ هێنا، خوداش بە پێغەمبەرەکەی فەرموو: من ئەم کۆمەڵە کەسەم بەسەر ئەوانەدا سەر خستووە کە باوەڕ بە ئایینەکەم ناهێنن و من بەمان تۆڵە لەو بێباوەڕانە دەکەمەوە، هەتاکو ئەمانیش دەست بەم ئایینەوە بگرن هەردەم سەرفرازیان

دەکەم و ئەم ئایینەش ئایینی ڕاستییە و هەرکەسێك پشتی لێ بکات ڕیسوا دەبێت، ئەوەشی پێوەی پابەند بێت سەرفراز و ڕێزدار دەبێت، ڕۆستەمیش گوتی: ئەم ئایینە چییە؟ زەهرە گوتی: پایەی ئەم ئایینە، کە بەبێ ئەو هیچ شتێکی ڕاناوەستێت، گەواهیدانە بەوەی هیچ خودایەك جگە لە الله بوونی نییە و موحەممەدیش پێغەمبەری خودایە، هەروەها باوەڕهێنان و ملکەچبوون بەوەی پێغەمبەر لەلایەن خودای گەورەوە هێناویەتی. ڕۆستەم گوتی: ئەمە چەند شتێکی باشە! چی تر هەیە بێجگە لەمە؟ گوتی: دەرهێنانی بەندەکان لە پەرستنی بەندەکانەوە بۆ پەرستنی خودای گەورە. ڕۆستەم گوتی: باشە، یچی تر؟ زەهرە گوتی: خەڵکی هەموو نەوەی ئادەم و حەوان و خوشك و برای یەکن لە یەك دایك و باوك، ڕۆستەم گوتی: ئەمە چەند شتێکی جوانە! پاشان ڕۆستەم پێی گوت: ئەگەر من بەمە ڕازی بم و بۆ ئەمە خەڵکەکەشم لەگەڵ بێت هەڵوێستی ئێوە چی دەبێت؟ ئایا دەگەڕێنەوە؟ زەهرە گوتی: بەڵێ، سوێند بە خودا هەرگیز لە ولأتتان نزیك ناکەوینەوە تەنها بۆ بازرگانی یاخود پێداویستییەك نەبێت)).

جوان لە ڕۆشنبیریی ئیسلام ڕابمێنە چۆن وای لەم هاوەڵەی پێغەمبەر کردووە بتوانێت ڕوونکردنەوەیەکی تێروتەسەل بخاتە ڕوو دەربارەی ئیسلام و پرنسیپ و ئامانجەکانی و هەروەها پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی لەگەڵ ولأتانی تردا، لە کاتێکدا نەیدەتوانی بخوێنێتەوە و بنووسێت، زۆرێك لە ڕۆشنبیرەکانی ئێستای ئوممەتی ئیسلامیی ناتوانن بەم شێوەیە ئیسلام بخەنە ڕوو و لە پەیامەکەی تێبگەن، چ جای ناڕۆشنبیرەکانی، ئەوانەی بێجگە لە چەند هیوا و ئاواتێك هیچ دەربارەی ئیسلام شارەزا نین و تەنها گومان دەبەن. ئەگەر ئەمە پێگە و باری ئەو هاوەڵەی پێغەمبەر بێت کە ناتوانێت بنووسێت و بخوێنێتەوە لە سەرەتاکانی ئیسلام و سەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەر)، ئەی دەبێت ئەو هاوڵانە

چۆن بووبێتن كه خوێندەوار و نووسەر و زانا بوون؟ ئەوانەی گەورەترین و بـالآترین ژیارییان بنیاتنا: ژیاریی مرۆڤی ڕاست و دروست، ژیاریی زانست و باوەڕ.

لێرەوه تێگەیشتنی ئێمه بـۆ نەهێشـتنی نەخوێنـدەواری لـه قورئـانی پـیرۆزەوه سەرچاوه دەگرێت كەوا یەكەم ئایەتێكی دابەزی بریتی بوو له ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾{العلق:١}، واته: ((ئـەی محمد بخوێنـه بـه نـاوی ئـەو پەروەردگارەتـەوه كـه هەموو شـتێكی بـەدی هێنـاوه)). هـەروەها پێغەمبـەرمان (دروودی خـوای لەسـەر) دەفەرموێت: ((طلب العلم فريضة على كل مسلم ومسلمة)) واته: (داواكردنی زانسـت پێویسته لەسەر هەموو موسوڵمانێكی نێر و مێ) بۆیه هەر له سـەرەتاوه فێربـوون و خوێندنی پەیوەست كردووه به باوەڕەوه، قورئانی پیرۆزیش سەدان جـار فـەرمانی پـێ كـردووین بــه زانســت و تێفكـرین و تێگەیشــتن و بیركردنــەوه و دووپــاتی كردووەتــەوه و جـەختی لەســەر كـردووه، هــەموو ئەمانــەش سەرچـاوەی گرتــووه لەوەوه دەبێت موسوڵمانان زانستدۆست بن تاكو بتوانن سوود له قورئان ببینن و به كەسـانی تریشـی بگەیـەنن، لـەو كاتــەوەی قورئـانی پـیرۆز دابـەزیوه بزووتنــەوەی بڵاوكردنەوەی زانست و فێركـردن بـڵاو بۆتـەوه و دەسـتی بـه جووڵـه كـردووه، بـه ڕادەیەك لای موسوڵمانان مەرجی ڕزگاركردنی دیلەكانی جـەنگ زۆر جـار فێركردنـی كەسی نەخوێندەوار بوو، هەر وەكو له جەنگی بەدر و جەنگەكانی تـردا ڕوویـان دا، لـه سـەردەمی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر) و جێنشـینه ڕاشـیدەكاندا لـەناو مزگەوتەكاندا دەست كرا به بەستنی بازنـەی زانسـتی بـه مەبەسـتی بڵاوكردنـەوەی زانســت، هەریــەكێك لــەم بازنــه زانســتییانه جــاری وا هــەبووه ســەدان و هــەزاران فێرخوازی لەخۆ گرتووه هـەر وەك ئـیبن حـەزم دەیگێڕێتـەوه، بـەم شـێوەیه و بـه تێپەڕبوونی كاتێكی كەم ئوممەتی ئیسـلامیی بـووه ئوممـەتی زانسـت و خوێنـدن و فێركردن.

زانایانی ئیسلام لە هەموو سەردەمێکدا دووپاتیان کردۆتەوە کەوا دەبێت هەموو موسوڵمانێکی نێر و مێی پێگەشتووی خاوەن عەقڵ ئـەوەی پێویسـتە لەسـەری لـە فـەرزەکان و نوێـژ و ڕۆژوو و پاکـژی و چـۆنیەتیی ئـەداکردنیان هـەمووی بزانێـت، هـەروەها دەبێـت هـەموو ڕێگەپێـدراو و قەدەغـەکراوەکان بزانێـت لـە خـواردن و خواردنەوە و جلوبەرگ و خـوێن و گوفتـار و کردارەکـان، زانایـانیش شـارەزا بـوون لەوەی باسمان کرد و لەوەشی کە پەیوەندیی بە کار و پیشەی موسوڵمانەوە هەیـە بە پێویستی دەزانن (فرض عين) بازرگان دەبێت بزانێت لەو مامەڵانەی دەیکات چی ڕێگەپێدراوە و چیش قەدەغەکراوە، هەروەها پێوستە لەسەر پزیشکیش بزانێت چی قەدەغـە کـراوە و چـی ڕێـی پـێ دراوە لـەوەی بـە پیشـەکەیەوە پەیوەسـتە وەك قەدەغەکردنی تیمارکردن بە مەی و لەباربردنی منـداڵ و... هتـد بـە هـەمان شـێوە سەبارەت بـە هـەموو پیشـەکانی وەك ئەنـدازیاری و مامۆسـتایەتی و بـەڕێوەبردن و سیاسەت و ... هتد.

ئایینی ئیسلام دەرکی بە مەترسیی زانست کردووە ئەگەر هاتو لە خـوداوە دوور بێت، بۆیە گرنگیـی زۆری بـەو زانسـتە داوە کـە بـە بـاوەڕەوە پەیوەسـتە، خـودای گـەورەش سەرزەنشـتی ئەوانـە دەکـات کـە شـارەزاییان لـە زانسـت و مەعریفـە کۆمەڵایـەتی و گەردوونییـەکان هەیـە، بـەڵام لـە هـەمان کاتـدا لـە شـەریعەت و بیروباوەڕەکەیان بێئاگان و لەم بارەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّـاسِ لا يَعْلَمُـونَ (٦) يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِنْ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنْ الآخِـرَةِ هُـمْ غَـافِلُونَ﴾ {الروم: ٦،٧} واتـە: ((بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، ئەوانە تەنها ڕواڵەتی ئەم ژیانی دونیایە دەزانن و لـە دوارۆژ بێئاگان)). بێگومان شارەزا بوون لـە زانسـت و مەعریفـە و دیاردەکـانی ئـەم دونیایە و بێئاگا بوون لە بیروباوەڕ و شەریعەت ئەمە تەنها ڕواڵەتی ژیانی دونیایـە و ڕێگر نییە لەوەی لە زەویدا خراپەکاری ئەنجام بدرێت، ژیاریی مرۆڤیش بنیات نانێت

بەو شێوەی کە پێویستە بوونی هەبێت.

بۆیــە بــەگوێرەی ئــەو تێگەشــتنەی هەمانــە بــۆ نەهێشــتنی نەخوێنــدەواری و فێرکردنی گەوران، پێویستە ئەوەی دواین جار جیهان پێی گەیشتووە لەم بـوارەدا گرێ بدەین لەگەڵ ڕەهەندی ئایینی ئیسـلامیدا. چـونکە زیـادکردنی ئـەم ڕەهەنـدە ئایینییە ئیسلامییە بـازێکی گـەورە بـەم چـەمکە دەدات لەسـەر ئاسـتی عـەرەبی و جیهانیدا، هەروەها دەبێتـە هـۆی جووڵانـدنی پاڵنـەری ئـایینی و بـاوەڕی کـە وا لـە نەخوێندەوار دەکات هەست بە پێویستی فێربوون و خوێندن بکات و ئەم پاڵنەرەش بەکار بهێنین بۆ کۆکردنەوەی زۆرترین هاوکاری و بەخشین لە خەڵکی بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە نەتەوەییە گرنگە. هەروەها ئەم چەمکە دەبێتە هۆی بەشـدارییپێکردنی هەموو بانگخواز و مزگەوتەکانی شار و دێهاتەکانی میسر بـە مەبەسـتی بـەدیهێنانی ئەم ئامانجە نەتەوەیی و ئسلامییە خوازراوە.

نەهێشـتنی نەخوێنـدەواری و فێرکردنـی گـەوران بـەم تێگەیشـتنە ئیسـلامیی و ژیارییە، سڕینەوەی نەخوێندەواریی ئایینی هەموو تاکەکانی گـەل لـەخۆ دەگرێـت، هەموو جۆرەکانی توندڕەوی و زیادەڕۆیی ئایینی لەلایـەن گەنجانـەوە هۆکارەکـانی دەگەڕێتەوە بۆ نەخوێنـدەواریی ئـایینی، ئەوەشـی سـەرنج بداتـە ئـەو پرسـیارانەی ئاڕاستەی لیژنە و لایەنەکانی فەتوا دەکرێت، دەبینێت پرسیارگەلێکی زۆر سادەن و ڕەنگدانەوەی نەخوێنـدەواریی ئـایینی پرسـیارکەر دەر دەخـەن، تەنانـەت لـەنێوان پرۆفیسۆر و زانایانی پسپۆڕییە جیاوازەکانیش ئەمە بەدی دەکرێت. بۆیە پێویسـتە لەسەر هەموو بانگخواز و مزگەوت و نووسەر و پەیمانگا ئەزهەرییەکان و دەزگاکانی ڕاگەیانـدن هـەموو تێکـڕا بـەدەم ئـەم بابەتـەوە بـێن و هـەوڵی نەهێشـتنی ئـەم نەخوێندەوارییە ئایینییە بدەن لەڕێگەی دانانی پلانێکی کاتیی دیاریکراو بۆ ماوەی دوو یاخود سێ ساڵ یان زیاتر، پاشان پێداچـوونەوە و چـاودێری و بەدواداچـوونی

بۆ بکەن بۆ ئەوەی بزانن تا چەند ئەم پلانە جێبەجێ کراوە.

بۆیە هەر دەبێت بە پرۆگرامەکانی نەهێشتنی نەخوێندەواریدا بچینەوە و ڕەهەندی ئیسلامیی و ئایینی بۆ زیاد بکەین لەگەڵ پێویستی دەستنیشانکردنی هەموو نەخوێندەوارەکانی پارێزگای دەقهلیە بە نموونە و دانانی پلانێکی کاتیی دیاریکراو بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری. لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی مەنسوورە هەموو مامۆستا و خوێندکار و دەرچووانی و وەزارەتی پەروەردە و فێرکردن بە هەموو قوتابخانە و مامۆستا و خوێندکارانیەوە و هەروەها وەزارەتی ئەوقاف و ئەزهەر بە هەموو مزگەوت و پەیمانگا و بانگخواز و مامۆستا و خوێندکارەکانیانەوە هەموو تێکڕا بەگەڕ بخرێن بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە: ئامانجی نەهێشتنی نەخوێندەواری پێکەوە بە هەردوو مانا باو و ئیسلامییە ژیارییەکەی.

وەزیری ئێستای پەروەردە و فێرکردن (پ.د. ئەحمەد جەمالەدین موسا) بەهۆی ئەوەی گەنجە و سەر بە پارێزگای دەقهلیەیە و لەڕێی ئەو پەیوەندییە کەسی و پیشەییانەی هەیەتی لەگەڵ بەڕێز پارێزگار (ئەحمەد سەعید سەوان) و بریکارەکانی وەزارەتی پەروەردە و فێرکردن و وەزارەتی ئەوقاف و هەروەها لەگەڵ کۆلێژەکانی زانکۆی مەنسورەدا بەتایبەتی کۆلێژی پەروەردە، ئەوا دەتوانێت پارێزگای دەقهلیە بکاتە پارێزگایەکی نموونەیی لەڕووی نەهێشتنی نەخوێندەواری و فێرکردنی گەوران بە واتا ئیسلامییە ژیارییەکەی، بۆ ئەم مەبەستەش دەتوانێت لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی وەك ڕادیۆ سوودمەند بێت بۆ پڕوپاگەندەکردن، یاخود پرۆسەی فێرکردن، هەروەها دەبێت سوود لە مزگەوت و زانکۆ و بارەگای پارتە سیاسییەکان و قوتابخانەکانیش وەر بگرێت و ئەم شوێنانەش بکاتە بارەگایەك بۆ نەهێشتنی نەخوێندەوارییی فێرکردنی گەوران.

بەدیهێنانی ئەم ئامانجەش پێویستی بە ژمارەیەکی زۆر مامۆستای ئامادەکراو هەیە، لەوانەیە پێویستیش بکات خولی کورتخایەن بۆ ماوەی مانگێك یان زیاتر بۆ ئەو کەسانە بکرێتە کە خواستی وانەگوتنەوە و فێرکردنیان هەیە، بەلاّم شارەزایی تەواویان نییە لە شێوازەکانی وانەگوتنەوە و چۆنیەتیی گەیاندنی زانیارییەکان بە کەسی بەرامبەر. کۆلێژی پەروەردەی زانکۆی مەنسورە ئامادەیی تێدایە بۆ ئەوەی هەستێت بە کردنەوەی ئەم خولانە، ئەویش لەڕێی کردنەوەی دیبلۆم بۆ فێرکردنی گەوران لەم کۆلێژەدا بۆ ئەوەی بتوانێت بەدەم ئەم داواکارییەوە بێت، چونکە ئەو مامۆستا سەرکەوتووەی باوەڕی بە پەیامی خۆی هەیە کلیلی سەرکەوتنی ئەم پرۆژەیە دەبێت. هەروەها دەبێت بایەخ بدرێت بە دەستنیشانکردنی پرۆگرام و پەرتووکی سوودبەخش و ئەوەشی پەیوەندییان پێوەی هەیە لە وێنە و فلێکس و فیلمی فێرکاری و تەندروستی و ئایینی بۆ بەدیهێنانی ئامانجە ئیسلامییە ژیارییەکان و باش وایە گۆڤارێکیش لەژێر ناونیشانی: (بخوێنە و فێر بە)دا ئامادە بکرێت و ژمارەی پێویستی لێ چاپ بکرێت و دابەش بکرێت بەسەر بەشداربووانی پرۆگرامی نەهێشتنی نەخوێندەواریدا بە واتا نوێیە گشتگیرەکەی.

ڕاگەیاندنی کۆششێکی نیشتیمانی لە پارێزگای دەقهلیە بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری و فێرکردنی گەوران لە ماوەی سێ ساڵی دیاریکراودا و بەشدارییپێکردنی هەموو تاك و دامودەزگاکانی ئەم پارێزگایە و هەستان بە هەڵمەتێکی جەماوەریی بەرفراوان بۆ بنەبڕکردنی ئەم گرفتە، کارێکی گرنگە و ئەستەمیش نییە، ئەگەر بێتو سەرکردایەتییەکی خۆڕاگر و دووربین ئەم ئەرکە لەئەستۆ بگرێت: پارێزگار و وەزیری پەروەردە و فێرکردن و ژمارەیەك لە

کەسایەتییە پەروەردەییە باوەڕدارەکان لەگەڵ بوونی پشتیوانیی جەماوەر، ئەمانە هەمووی هەلێکی زێڕین ئەڕەخسێنن بۆ پارێزگای دەقهلیە تاکو بەم ئامانجە مەزنە بگات. پێشنیار دەکەم بە پشتیوانیی خودای گەورە لەپاش تەواوبوونی ئەم سێ ساڵە و لەگەڵ بەدیهێنانی ئەم خەونە مەزنە لە دەقهلیەدا، کە نموونەیە بۆ پارێزگاکانی تر، ئەوا هەندێك هاندەری ماددی و مەعنەوی پێشکەش بەو مامۆستایانە بکرێت کە لەم پڕۆژە نیشتیمانییە مەزنەدا دیار و سەرکەوتوو بوون: ﴿وَقُلْ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ﴾{التوبة: ١٠٥}، واتە: (بەو خەڵکە بڵێ: هەرچی دەتوانن لە کار و کردەوە ئەنجامی بدەن، چونکە خودای گەورە و فورستادەکەی و بڕواداران کار و کردەوەتان دەبینن).

***

# قەیرانی بەهاکان لە پرۆگرامە پەروەردەییەکاندا لەسەر ئاستی جیهان و ڕەنگدانەوەکانی لەسەر پەروەردە لە جیهانیی ئیسلامیدا[1]

## پێشەکی:

دەنگێکی زۆر بەرز دەبێتەوە لە زۆر شوێنی جیاوازی جیهانەوە جاڕ دەدەن بە بوونی قەیرانێکی ڕەوشتی کە هەڕەشە لە ژیارستانییەتیی مرۆڤی هاوچەرخ دەکات، ئەو قەیرانە ڕەوشتییەش لە هەر وڵاتێکدا چەند وێنەیەکی جیاواز وەر دەگرێت، جارجار وەك بزووتنەوەیەکی یاخیبوون لە گەنجانەوە بەسەر دەسەڵات و دابونەریتەکاندا، هەندێك جاریش ڕۆچوونی تەواوە لە هەوا و ئارەزوو و ڕابواردن و سەرخۆشی و سێکسدا، یاخود وەك چالاکیی توندوتیژی خۆی دەنوێنێت لە دژی ماڵ و ڕۆح و ساماندا لەپاڵ خۆپەرستی و نەرێنیبوون و بەهەدەربردندا... هتد،

[1]– لێکۆڵینەوەیەکی پێشکەشکراو بە کۆڕی نێودەوڵەتیی لە بابەتی بەها ئیسلامییەکاندا، مناهج التربیة والتعلیم– تطوان –المغرب (٢١–٢٣ نوفمبر ٢٠٠٥م).

لەوانەشە هەموو ئەمانە بەیەکەوە لەیەك کاتدا کۆ بکاتەوە و ئەم لێکۆڵینەوەیە دەتوانێت نارەزاییەکان لە دەرهاویشتەکانی ئەو قەیرانە ڕەوشتییە بخاتە ڕوو لە هەموو کیشوەرەکاندا، لە ئاسیا یان ئەفریقا یان ئەورووپا یان هەردوو کیشوەرە ئەمریکییەکە بێت جیاوازی نییە، لە کیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێکی تر، هەمووی دەناڵێنێت بەدەست دەرهاویشتەکانی ئەو قەیرانەوە، چ لە وڵاتە دەوڵەمەندە پێشکەوتووەکاندا بێت، یاخود لە وڵاتە هەژارە تازە گەشەسەندووەکاندا بێت، هەروەها چ ئەو وڵاتانە پاشایەتی بن یان کۆماری یان دیکتاتۆری جیاوازیی نییە.

ئاسانیی پەیوەندی و پێکگەیشتن کە بەرهەمی تەکنەلۆجیای نوێیە سیفەتێکی جیهانیی بەم لەرزینە ڕەوشتییە داوە و لە توانای هیچ کۆمەڵگەیەکدا نەماوە دەرگاکانی لەبەردەمدا دابخات، یاخود لێی دەرباز بێت و لە زەریای فراوانی ئەم قەیرانە ڕەوشتییانەدا کۆمەڵگە عەرەبی و ئیسلامییەکان خۆیان لەبەردەم دەرهاویشتەی ترسناکدا دەبیننەوە کە هەڕەشەیان لێ دەکات، سەرەڕای ئەو باڵانسە مەزنەی هەیەتی لە بەرگریی کۆمەڵایەتی و بەها ڕەوشتییەکان[1].

ئەم توێژینەوەیەش هەوڵ دەدات تیشك بخاتە سەر ڕوخسارەکانی ئەم قەیرانە لە ڕۆژئاوادا و چۆن پرۆگرامە پەروەردەییە ڕۆژئاواییەکان هەوڵیان داوە چارەسەری قەیرانەکە بکەن و چۆن دەکرێت لە جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیماندا چارەسەری ئەم قەیرانە بکەین لەڕێی دامەزراوە فێرکارییە جیاوازەکانمانەوە و ئەوەی چۆن شێوازی ڕووبەڕووبوونەوەمان بۆ قەیرانەکە هەر دەبێت جیاواز بێت لەگەڵ شێوازە ڕۆژئاواییەکاندا، بە شێوەیەك نەکەوینە ناو ئەوەی ئەوان تێیکەوتن لە دابڕینی بەها و ڕەوشتەکان لە ئایین، بەتایبەت کە ئایینی ئیسلاممان بە پلەی یەکەم ئایینێکی ڕەوشتییە.

---

[1]- ماجد عرسان الكيلاني: اتجاهات معاصرة في التربية الأخلاقية، دار البشير، عمان، (١٩٩١م)، (ص ٥).

## قەیرانەکە لە ڕۆژئاوادا: هۆکار و شێوازەکانی چارەسەر:

زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئـاوا، لەنێویشـیاندا ئـەمریکا، هاوبەشـن لـە هەسـتکردن بـەم قەیرانە و هەر لە سەردەمی ڕۆشنگەرییەوە ئایینی مەسـیحی دوور خراوەتـەوە وەك سەرچـاوەیەکی سـەرەکی کـە پـەروەردەی ڕەوشـتی تێدا خەسـت دەبێتـەوە، لای بیرمەندانی ڕۆژئاوا بە بانگەشەی ئەوەی کریستیانێتی باوەڕی بە تـاوانی بنـەڕەتیی مرۆڤ هەیە، بۆیە ناکرێت ڕەوشتەکانی باشتر و پاڵفتە بکرێت، هەروەها لەبەر ئەوەی پـەروەردەی دونیـایی عەقڵانییـە و لەگـەڵ سـەردەمدا دەگونجێـت، لـە کاتێکـدا پەروەردەی مەسیحی ناعەقڵانییە، کەواتە جیاوازە لـە سروشـتی مرۆڤـی ڕۆژئـاوایی هاوچەرخ، ئەمە جگە لە ناعـەقلانیبوونی بیروبـاوەڕی سێکوچـکەی پـیرۆز (الثـالوث المقدس) کە وای کردووە پـەروەردەی ڕەوشـتی مەسـیحی بناغەیـەکی بیروبـاوەڕی ڕاستودروستی نەبێت. لە کۆتاییشدا ئەو چەشنە کلاسیکییانەی بەهاکان و شـێوازە پەروەردەییـیـەکان چـیدی توانـای ڕووبەڕووبوونـەوەی قەیرانـە ڕەوشـتی و کۆمەڵایەتییەکانی نەماوە کە مرۆڤی ڕۆژئاوایی هاوچەرخ تێی کەوتووە[١].

ئەم نووسینە بۆ گفتوگۆکردن نییە لەسەر ئەو بانگەشانەی دژ بـە مەسـیحیەت و ڕەوشـتی مەسـیحیەت و ڕاددەی توانـای مەسـیحیەت بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی ئـەو پەرەسەندنە گەورە و بەردەوامانەی تەکنەلۆژیا بەرهەمیان هێناوە و بەرهەمیشـیان دەهێنێت لە ژیاریی ڕۆژئاوایی و ژیـانی ڕۆژئاواییـدا. بـەڵام ئـەوەی دەتـوانین باسـی بکەین ئەوەیـە مەسـیحییەت —بـەزۆری— وەك سەرچـاوەیەك نـەماوە بـۆ پابەنـدیی ڕەوشتی لە ڕۆژئاوای نوێدا و عـەقڵی ڕۆژئـاوایی پێویسـتی بـە گـەڕان و دۆزینـەوەی سەرچاوەی نوێیە بۆ پابەندیی ڕەوشتی، چـونکە کۆمەڵگـەکان نـاتوانن لـە بۆشـایی

---

١– Paul. H –Hirst: Moral Education in Secular Society, London, University of London Press, (1974), (PP 17, 18, 23).

ڕەوشتیدا بژین، بەڵکو ژیان لە کۆمەڵێکدا بەبێ پابەندیی ڕەوشتی ڕێك نابێت و ناچێتە سەر، بێ ئەوەی ڕاست و چەوت و پەسەند و ناپەسەندیی کۆمەڵایەتی بۆ دیاری بکات.

ئا لێرەوە فەیلەسووفەکانی ڕۆژئاوا بەخۆ کەوتن بۆ گەڕان بەدوای سەرچاوەی پابەندیی ڕەوشتییدا تاکو شوێنی ئایین بگرنەوە، جا هەر قوتابخانەیەکی ڕەوشتی ڕەنجی خۆی داوە. هەرکەسێك فەلسەفە ڕۆژئاواییە جیاوازەکان بخوێنێتەوە لە ئایدیالیزم (Idealism) و ڕیالیزم (Realism) و مارکسییزم (Marxism) و بوونگەرایی (Existentialism) و پراگماتییزم (Pragmatism) هەست بەو کۆششە عەقڵییە دەکات کە بەخەرج دراوە لەلایەن فەیلەسووفانی ئەو ڕێبازە فەلسەفیانەوە و ڕێبازی تریش لەپێناو دۆزینەوەی سەرچاوەی پابەندی ڕەوشتی تاکو شوێنی دەقە مەسیحییەکان بگرێتەوە کە بیری ڕۆژئاوایی بەهۆی چەندین هۆکاری تایبەت بەخۆیەوە ڕەتی کردووەتەوە[1].

ئەگەر ڕەوشتی مەسیحی نەیتوانیبێت پێداویستییەکانی مرۆڤی ڕۆژئاوایی پڕ بکاتەوە بۆ پابەندیی ڕەوشتی، ئەوا بە هەمان شێوە ڕێچکە فەلسەفییەکانیش نەیانتوانیوە بەم کارە هەستن، لەوانە: بەرزبوونەوەی ڕێژەیی بەها ڕاستەوخۆکان (Cash Values) کە ڕووی جیاکەرەوەیە لە مامەڵە مادددییەکان لە ڕۆژئاوادا، لەگەڵ پاشەکشەی ئەو بەهایانەی پەیوەندییان بە ڕەهەندی مرۆڤایەتییەوە هەیە و بەربڵاوبوونی خۆپەرستی لەجیاتیی هەستی کۆمەڵی و تێرکردنی ڕاستەوخۆ و

---

[1] – محمد السيد الجليند: في الفلسفة الخلقية لدى مفكري الإسلام، مكتبة نهضة الشرق، جامعة القاهرة، (١٩٩٠م)، (ص ٣-٦٤)، بوشنسكي: الفلسفة المعاصرة في أوروبا. ترجمة عزت قرني، المجلس الوطني للثقافة والفنون والحقوق والآداب، الكويت، سلسلة عالم المعرفة رقم (١٦٥)، (١٩٩٢م)، سعيد إسماعيل علي: فلسفات تربوية معاصرة، المجلس الوطني للثقافة والفنون والآداب، الكويت، سلسلة عالم المعرفة رقم (١٩٨)، (١٩٩٥م).

هەنووکەیی لەجیاتیی بەهای جوانیی خـود زاڵبوونـدا و... هتـد، وە لەبـەردەم ئـەم دیاردە نەرێنییانـەی ڕەوشـتدا زانایـانی پـەروەردە و کۆمەڵناسـی و دەروونناسـی و هاوشێوەکانیان لە ڕۆژئاوادا چەند دەیەیەکە لە هەوڵی گـەڕان بـەدوای هۆکارەکـانی ئەم قەیرانە ڕەوشـتییەدان بـۆ ئـەوەی ڕوخسـار و ئامرازەکـانی ڕووبەڕووبوونـەوە و پاراستنی تازەپێگەیشتووان دەستنیشان و دیاری بکەن.

نزیکەی هەموو کـۆکن لەسـەر ئـەوەی بەرپرسـیارێتی لـەم قەیرانـە ڕەوشـتییەدا دەکەوێتە سەر پەروەردەی نویێ، کـە تـەنها بایـەخی بـە ئامرازەکـانی ژیـان داوە و ئامـانج و مەبەسـتەکانی ژیـانی پشـتگوێ خسـتووە و هـاووڵاتی بەرهەمهێنیشـی کردووەتـە ئامـانج، زیـاتر لـە هـاووڵاتی چـاك و چاکسـاز، بۆیـە پـەروەردەی نـوێ پێویستە بوارێکی فراوانتر بـدات بـە پـەروەردەی ڕەوشـتیی و بـۆ ئەمـەش چـەندین دامەزراوە و لیژنەی نیشتمانی بۆ توێژینەوە پێکهێنراوە و پارەیەکی زۆر زۆریان بـۆ دابین کراوە لەپێناو لێکۆڵینـەوە لـەبارەی هـەر شـتێك پەیوەنـدیی بـە پـەروەردەی ڕەوشتییەوە هەبێت، چ لەڕووی پرۆگرامـەوە، یـان مامۆسـتا و چـالاکی و ڕێگاکـانی وانەگوتنەوەوە. کەسێکیش بیەوێت دەتوانێت ئەنجامەکانی ئەم کۆششە زۆرەی لەم بوارەدا بەخەرج دراوە لە زۆرێك لە سەرچاوە بیانییەکانـدا ببینێـت و بەدواداچـوونی بۆ بکات[١].

سەرەڕای ئەو کۆششە گەورەیـەی ئـەو دامـەزراوە و لیژنانـە بەخـەرجی دەدەن، کەموکورتیی زۆر هەیـە کـە ئـەو لیژنـە و دامەزراوانـە تێـی دەکـەون و نـاتوانن لێـی دەرباز بن، ئـەویش ئەوەیـە کـە زۆربـەی لـە وێناکردنێکـەوە بـۆ مـرۆڤ سەرچـاوەی گرتووە کە بە هیچ شێوەیەك دەقە مەسـیحییەکان وەر ناگرێـت وەك سەرچـاوەیەك

---

[١]– لێکۆڵینەوەکەی ماجد عرسان الگیلانی لە پاشکۆدا ئاماژەی پێ دراوە (لا ١٣٩) زۆرێـك لـەم کۆششـە ڕۆژئاواییە ئەمریکییە لەخۆ دەگرێت لەم بوارەدا.

بۆ پابەندیی ڕەوشتی، هەر وەك چۆن هەموو دەقێکی ئایینیی تریش ڕەت دەکاتەوە وەك سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی پابەندی و لەجیاتیی ئەوە عەقڵ دادەنێت، یان ئەوەی زۆرینەی کۆمەڵگە لەسەری ڕێك کەوتوون بە پاساوی قازانجی پراگماتی یاخود سوودی پیشەیی بۆ ئەو ڕەوشتە پەسەندکراوە عەقڵی و پیشەییانە.

کاتێك ڕۆژئاوا ویستی عەقڵ بەکار بهێنێت، یان ئەوەی تاکەکانی کۆمەڵگە لەسەری ڕێك دەکەون بە پاساوی قازانج یان سوودی پیشەیی لە دیاریکردنی ئەو ڕەوشتانەی کە دەبێت لە مرۆڤی ڕۆژئاواییدا هەبێت، کەوتە داوی ڕێکنەکەوتن لەسەر ئەو ڕەوشتانە و ڕێژەییبوونی ڕەوشت، بەڵکو ڕێکنەکەوتن لەسەر چەمکی ئەو پەروەردە ڕەوشتییەش لە بنەڕەتەوە، لە کاتێکدا چەندین چەمك و دەستەواژەی بەیەکداچوو بەکار هێنرا لەم بوارەدا وەك: خوێندنی بەهاکان (Value Education)، پەروەردەی کەسایەتی (Character Education)، پەروەردەی کەسی و کۆمەڵایەتی (Personal and Social Education)، پەروەردەی هاووڵاتیبوون (Citizenship Education)، زانستی ڕەوشت (Deontology)، پەروەردەی دیموکراسیی (Democratic Education)، پەروەردەی ئایینی (Religious Education) و چەندین دەستەواژەی تر بە ناونیشانی هێمائامێز وەك بورجی بابل (The Tower of Babel)، کە تێیدا خەڵك بە زمانی جیاواز قسە دەکەن، یان پیاوە کوێرەکان و فیلەکە (The Blind Men and The Elephant) کە هەریەکێکیان لە گۆشەیەکەوە فیلەکە دەبینێت[1].

---

[1]– عبدالودود مكروم: ((طرق وأساليب التربية الخلقية في السياقي الثقافي المعاصر)) في: القيم في الفكر الغربي، رؤية وتحليل، دار الفكر العربي نقلا عن:

لێرەدا تەنها نموونە لەسەر ئەو جیاوازییە فرەییە دەهێنمەوە دەربارەی ئـەوەی چ ڕەوشـتێك دەبێت هـاوولاتی لەسـەر پـەروەردە بكرێـت، بەمـەش جیـاوازیی ئـەو ڕوانگانـەمان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە دەربـارەی هـاوولاتی و بـەهاكان بـەپێی شـوێن: ئینگلتەرا، كەنەدا، ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئـەمریكا، وەك نموونـە و بـەپێی كـاتی جیاواز لە یەك شوێندا: كۆریا لە مـاوەی مێـژووی بەدواییەكدا، لـە بـەریتانیا ( D. Beckham -2004) هەولێكی دا بۆ كێشانی نەخشەیەك بۆ بەها ڕەوشتییەكان، (Mapping Britain's Moral Values) بـە پشتبەسـتن بـە بـەهای ڕاسـتگۆیی (honesty) وەك بەهایـەكی تـەوەرەیی لـە بـواری گەشـەپێدانی ڕەوشتییدا و ئەوەی كە ڕەوشت یاسایەكی زێڕین پاڵپشتیی دەكات ((مامەڵـەكردن لەگـەڵ دەوروبـەردا بـەوەی پێـت خۆشـە مامەڵـەت لەگەڵدا بكـەن)) ئەمـە لـەپاڵ گەشەپێدانی بەهاكانی لێبوردەیی و دادوەریدا[1].

لـە كەنـەداش گەشـتن بـە كۆمـەڵێك بـەهای بنـەڕەتی (Foundational Values) كـە پرۆگرامەكانی پەروەردەی ڕەوشتی بەدەوریدا دەخولێنەوە، كە ئەمانەن[2]:

میهرەبانیی/هاوسۆزیی Compassion

- M. W. Berkowitz: Integrating Structure and Content in Moral Education, Paper presented in the meeting of American Educational Research Association, Chicago, (1997), (P. 14).

[1] – هەمان سەچاوەی پێشوو، بە وەرگرتن لە:

- D. Beckham: Mapping Britain's Moral Values, http://www.facingthechallenge.org/ Nestels.htm, (2004)

[2] – هەمان سەچاوەی پێشوو، بەوەرگرتن لە:

D. Beckham: "American Experience: Transcending Pluralism" In Education for Values: Morals ،Ethics and Citizenship in Contemporary Teaching ،Edited By: R. Garder (et - al) U.K, Kogan Paul (2000), (pp. 323-332)>

| | |
|---|---|
| خۆشڕەفتاریی | Courtesy |
| ئارامگرتن | Patience |
| ڕیزگرتن لە ژیان | Respect of life |
| هاوکاریی | cooperation |
| ئازادیی | Freedom |
| ئاشتیی | Peace |
| ڕێز لە خود/ کەسانی تر | Respect for self/others |
| ئازایەتیی | Courage |
| بەخشندەیی | Generosity |
| ڕێزگرتن لە ژینگە | respect for the environment |
| ڕاستگۆیی | Honesty |
| بەرپرسیارێتیی | Responsibility |
| دادپەروەریی | Justice |
| خۆ کۆنترۆڵکردن | Discipline |
| دڵسۆزی | Loyalty |
| خاکیبوون | Moderation |
| لێبووردەیی | Tolerance |

لە ئەمریکاش تیشك خرایە سەر بەها جەوهەرییەکان (Core Values) کە بە شێوەیەکی گشتی لەلای هەموو کەلتوورە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی ئەمریکی قبوڵ کراوە، ئەویش (Gibbs and Early 1994) دیارییان کرد، کە ئەمانەن[1]:

[1]– هەمان سەچاوەی پێشوو، بە وەرگرتن لە:

| | |
|---|---|
| میهرەبانیی/هاوسۆزیی | Compassion |
| ئازایەتیی | Courage |
| خۆشرەشفتاریی | Courtesy |
| داد | Fairness |
| ڕاستگۆیی | Honesty |
| دڵسۆزیی | Loyalty |
| سۆزوبەزەیی | Kindness |
| ڕیزگرتن | Respect |
| نەسرەوتن | Perseverance |
| بەرپرسیارێتیی | Responsibility |

لە کۆریادا پرۆگرامی پەروەردەی ڕەوشتی لە ساڵی (١٩٥٤ز)ەوە تاکو ئێستا لە گەشەسەندندا بووە، بە شێوەیەك تەوەرەی جیاواز و تەنانەت هەندێك جار ناوی جیاوازیشی لەخۆ گرتووە بە جۆرێك بایەخ بە کۆمەڵێك بەهای دیاریکراو دراوە بەپێی ئەو بارودۆخە ڕۆشنبیریی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەی کە کۆمەڵگەی کۆری تێیدا ژیاوە، و دەتوانرێت بەم شێوەیە پوخت بکرێنەوە[١]:

---

- D. Purple: "Values Education in United States of America" in Values in Education ،edited by ،J. Slephenson (et - al) N.Y. Routledge، (1998), (PP. 197-208).

[١]– هەمان سەچاوەی پێشوو، بە وەرگرتن لە:

B. Chu ،J. Park, J. D. Hoge: Moral Education: The Korean Experience, Korea, Kyungsung University, (1996).

| ماوه | ئەو بوارانەی جێی بایەخی پەروەردەی ڕەوشتین |
| --- | --- |
| ١٩٥٤– ١٩٦٣ز | - پەروەردەی مەعریفی |
| ١٩٦٣–١٩٧٣ز | - ڕەوشتەکانی بەرەنگاربوونەوەی کۆمۆنیستی<br>- چاکسازی ئابووری<br>- بەهاکانی کەلەپوور |
| ١٩٧٣–١٩٨٢ز | - چەسپاندنی نموونەی دیموکراسی لەکۆریا<br>- بەها و چاکەکاری پاڵپشت بۆ مۆدێرنە<br>- گەشەپێدانی ئابووریی |
| ١٩٨٢–١٩٨٧ز | - گۆڕانی میتۆدی ڕەوشتی لە دەروازەی ((هەگبەی کارە چاکەکانەوە)) بۆ دەروازەی گەشەی مەعریفی ڕەوشتی.<br>- پەرەپێدانی حوکمە ڕەوشتییەکان و گفتوگۆ ڕەوشتییەکان باشترن لە تەلقینی ڕەوشتیی. |
| ١٩٨٧–١٩٩٢ز | - جەختکردنەوە لەسەر شێوازە دیموکراسییەکان لە ژیاندا.<br>- گۆڕان لە بەرەنگاربوونەوەی کۆمۆنیستییەوە بۆ یەکبوون |
| ١٩٩٢ز | - ڕەوشتەکانی پەیوەندی لەنێوان کۆمەڵگاکاندا<br>- نەریتە ڕەوشتییەکان<br>- سەربەخۆیی کەسایەتیی ڕەوشتیی<br>- ڕێگای ژیانی خوازراو بۆ یەکبوونی دوو کۆریاکە و ژیانی دوای یەکگرتن. |

هەر وەك چۆن وڵاتانی ڕۆژئاوا و ئەمریکا دەربارەی ئەو بەهایانەی کە دەبێت هاووڵاتیی لەسەر پەروەردە بکرێت ناکۆکن، بە هەمان شێوە ناکۆکن لەسەر ئەوەی چۆن ئەو بەهایانە فێر بکرێن؟ وە چۆن پێشکەش بە خوێندکارانی بکرێت، ئایا

لەڕێی پێدانی ئەو بەهایانە بە خوێندکاران؟ یاخود لەڕێی پرۆگرامە جیاوازەکانەوە کە پێشکەشی خوێندکاران دەکرێت لە مێژوو و ئەدەب و زانستەکان و هەروەها لە بابەتەکانی خوێندن کە دەکرێت ئاسانکاریی بکەن لە پەروەردەی ڕەوشتیی خوێندکاراندا لەڕێی ئەو چالاکی و کەش فێرکارییانەوە کە دامەزراوە فێرکارییەکان بۆ خوێندکارانی فەراهەم دێنن و خوێندکار دەتوانێت لەڕێیانەوە زۆر لەو ڕەوشتانە وەر بگرێت. ئایا ئەو ڕەوشتانە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ بدرێن بە خوێندکار لەڕێی گفتوگۆ و تاوتوێ ڕەوشتییەکان و لێکۆڵینەوەی بارودۆخ و ڕۆڵگێڕان و... هتد، لەو ئەدەبیاتەی پێشتر ئاماژەمان پێ دا قسە و مشتومڕێکی زۆر دەبینین لەبارەی ئەو شێوازانەی دەکرێت پەروەردەی ڕەوشتی لەڕێیانەوە پێشکەش بە خوێندکاران بکرێت.

لەگەڵ ئەوەی ئەو هەوڵەی ڕۆژئاوا و وڵاتانی بەخەرجی دەدەن لەپێناو چارەسەرکردنی قەیرانە ڕەوشتییەکانیان لەڕێی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانیانەوە شایەنی دەستخۆشی و پێزانینە سەرەڕای ئەوەش کە ناتوانن لە سنووری کەلتوور و شارستانیی ڕۆژئاوایی عەلمانی دەر بچن کە ڕۆڵی ئایین پەراوێز دەخەن لە چارەسەری ئەو قەیرانەدا، بەڵام ئێمەش ڕازی نابین هەوڵی ئەوە بدەن ئەجێندا ڕەوشتییەکانی خۆیان بسەپێنن بەسەر هەموو وڵاتانی جیهاندا بەناوی (ڕەوشتە جیهانییەکانەوە) کە دەیانەوێت بیسەپێنن بەسەر هەموو وڵاتانی جیهاندا بە پاساوی ئەوەی نابێت کاری ئەم بنەما و ڕەوشتانە بخرێتە بەر بەزەیی ڕێژەییبوونی کەلتوورەکان، بەڵکو دەبێت بسەپێنرێت لەڕێی ڕێکخراوە نێوولاتییەکان و پەیماننامەکانی مافەکانی مرۆڤی جیهانیی و ئایزۆی ڕەوشتی جیهانییەوە[١].

---

[١]– نبيل علي: الثقافة العربية وعصر المعلومات، المجلس الوطني للثقافة والفنون والآداب، الكويت، سلسلة عالم المعرفة (٢٧٦)، (٢٠٠١م)، (ص ٤٠٦).

ئەمە لەبەر ئەوەی خودی ڕۆژئاوا خۆی بە چەقی خۆی و ژیارستانیەتە عەلمانییەکەی دەزانێت، ئەگەر پاساویشی هەبێت بۆ ڕەتکردنەوەی مەسیحیەت وەك سەرچاوەی بەها و ڕەوشتەکان، ئەوا ئێمەی موسڵمانان تەنانەت یەك پاساویشمان نییە بۆ ڕەتکردنەوەی ئیسلام وەك سەرچاوەیەکی بەها و ڕەوشتەکان، بەڵگەشمان بۆ ئەوە ئەو بەخششە ڕەوشتییە دەوڵەمەندەی ئەم ئایینەیە بە درێژایی سەردەمەکان و نموونە ڕەوشتییە تاك و ناوازەکان کە ئەم ئایینەیان بەرهەم هێناوە لە هەموو بوارە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیەکاندا و درێژبوونەوەی ئەو کاریگەرییە بۆ سەردەمی نوێشمان، ئەوەندەش بەسە هەندێك لە نووسینە ڕۆژئاواییەکان بێنین کە ئاماژە بەو کاریگەرییە ڕەوشتییەی ئیسلام دەکەن و چۆن کەمینە موسڵمانەکانی لە ڕۆژئاوا بە ڕەوشتی بەرز ڕازاندۆتەوە و بەمەش ئەو کەمینانەی پاراستووە لە توانەوە لە کەلتووری ڕۆژئاوادا و پاراستوونی لە هۆکار و ڕوخسارەکانی لادان لەو شارستانییەتە ڕۆژئاواییەدا لە خواردنەوەی کحوولی و ماددەی هۆشبەر و لادان و سێکس و توندوتیژیی و... هتد، هەروەها چۆن ژیرە —ناموسڵمانەکانی— ڕۆژئاوا و ئەمریکا بانگەشە دەکەن بۆ سوودمەندبوون لە ڕەوشتەکانی ئەم ئایینە مەزنە کە وای کردووە ئەو کەمینە ئیسلامییانە لەڕووی هەموو ڕەنگێکی دارمانی ڕەوشتیدا بوەستنەوە و کەسایەتیی ئیسلامیی و نموونە بەرزەکانی ئایینەکەیان بەپارێزراوی بهێڵنەوە[1].

بێگومان ئێمە دەبێت ئەو کۆششە مەزن و بودجە زەبەلاحانە بنرخێنین کە تەرخان کراون بۆ توێژینەوە و لێکۆڵینەوە لە بواری ڕەوشتدا لە وڵاتانی ڕۆژئاوا و ئەمریکادا لە

---

[1]– بەو مەبەستە بچۆرەوە سەر توێژینەوەی ئەندامی کۆنگرێسی ئەمریکیی ناموسڵمان وەك نموونەیەك لەسەر ئەو نووسینانە:
Paul Findley: Silent No More, Amana Publication, U.S.A., (2001).

ماوەی چەند دەیەی پێشوودا بۆ بەدیهێنانی ڕەوشتێکی ڕۆژئاوایی بۆ مرۆڤی ڕۆژئاوایی، کە یارمەتیی بدات قەیرانە ڕەوشتییەکەی تێپەڕێنێت و داواکارین سوود لە هەموو ئەو خوێندن و لێکۆڵینەوانە ببینرێت لە جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیماندا، هەروەها ئەو پڕۆگرامە نێوولاتییانەش دەنرخێنین کە لەلایەن ئەو ولاتانە پێشکەش دەکرێن بە منداڵانی جیهان، لە میانەی ((دیدگایەکی جیهانیی بۆ بەهاکان و هەموو ئەو شێوازە پەروەردەییانە دەنرخێنین کە لەو جۆرە پڕۆگرامانە و ڕێگەی هەڵبژاردنی مامۆستاکان تێیاندا بەکار دەهێنرێن))[1]. بەڵام ئێمە بەهۆی هەندێك هۆکاری تایبەت بە خۆمانەوە وەك پارێزراوی دەقەکانمان لە دەستتێوەردان و ڕاستی و نەگۆڕی ئەو دەقانە و عەقڵانیبوونیان و توانایان لەسەر بووژاندنەوەی ڕەوشتی ژیاریی لە هەموو سەردەمەکاندا، سەرەڕای ئەو ملهوڕیەی ڕۆژئاوا و ئەمریکا بە هێزەوە دەیکەن و ئەو ستەمانەی ئەنجامیان دەدەن گومانیان دروست کردووە لامان کە ڕۆژئاوا و ئەمریکا توانای سەرکردایەتیی ڕەوشتی جیهانیان هەبێت.

ژیاریی ڕۆژئاوایی لەوپەڕی مەزنیدا –کە خۆی لە ئەمریکادا دەبینێتەوە– وێنەی ژیارێکی ڕەوشتیی نموونەیی نییە و ئەو ژیارە نییە کە بتوانێت سیستەمی جیهانیی نوێ بەرەو جیهانێکی ڕەوشتیی باشتر ببات، ئەمە لەبەر ئەوەی ئەو ژیارە لە جەوهەردا ژیارێکی نامرۆڤانەیە و ژیاریی مرۆڤ نییە لە بەرزیی ڕەوشتیدا و لە جوامێری مەبەستەکانیدا[2]. هەر ئەوەش بەسە کە جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیمان دەیچێژێت لە ستەم و چەوساندنەوە بەدەستی ئەم ژیارە ڕۆژئاواییە خۆبەزلزانە لە فەلەستین و عێراق و ئەفغانستان و... هتد.

---

[1]– عبد الودود مكروم: القيم في الفكر الغربي، رؤية وتحليل، سەرچاوەیەکی پێشوو.

[2]– دەتوانرێت بە زۆرێك لە گەواهییەکانی دژی ئەو شارستانییەتەدا بچیتەوە لە: عبد الرحمن النقيب: التربية الإسلامية المعاصرة في مواجهة النظام العالمي الجديد، دار الفكر العربي، (١٩٩٧م)، (لا ٩–٤٤).

## قەیرانەکە لە جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیماندا :
## هۆکارەکان و شێوازەکانی چارەسەر:

ئەگەر ڕۆژئاوا لەبەر هەندێك هۆکاری تایبەت مەسیحیەتی دوور خستۆتەوە وەك سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی پابەندیی ڕەوشتی، ئەوا نابێت هەمان هەڵە لە جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیماندا دووبارە بکرێتەوە و شوێنی پەروەردەی ڕەوشتی ئیسلامیی بگرینەوە بە هەر دەستەواژەیەکی تری وەك: پەروەردەی ژیاریی، پەروەردەی نیشتمانی، یان پەروەردەی ژینگەیی یان جوانی و... هتد لە چەمك و دەستەواژەکان. هەموو ئەم چەمك و دەستەواژانە تەنها بەشێکن لە دەستەواژەی سەرەکی، کە بریتییە لە: پەروەردەی ڕەوشتی ئیسلامی.

پەروەردەی ڕەوشتی ئیسلامیی زانستێکی نامۆ نییە لەناو زانستە ئیسلامییەکاندا و ئەو نووسراوانەی لەبارەی ڕەوشتەوە لە کەلەپووری ئیسلامیدا نووسراون دەگمەن نین، چونکە زانایانی ئیسلام بە درێژایی سەردەمەکان دەستیان داوەتێ لە زانایانی فەرموودە و تەفسیر و فەقیەکان و فەیلەسووفەکان و سۆفییەکان... هتد، ئەو نووسراوە کەلەپوورییانەش سوودیان لە سەرچاوە بیانییە یۆنانی و فارسیی و هندییەکان وەر گرتووە، بە شێوەیەك دەتوانین بڵێین: کتێبخانەی ئیسلامیی هیچ کەموکوڕییەکی تێدا نییە، لەم جۆرە نووسراوانە وەك گومان دەبرێت، بەڵکو دەوڵەمەندیشە لەم بوارەدا بۆ کەسێك بیەوێت لێکۆڵینەوەی زانستی بەپێز ئەنجام بدات[1].

---

[1]– بۆ نموونە بڕۆرەوە سەر: علي زيغور: ميادين العقل العملي في الفلسفة الإسلامية الموسعة: الأخلاق والتربية و السياسة و الإقتصاد والتدبير والأدائية، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت (٢٠٠١م)، علي خليل أبو العينين: ((مقدمة في مفهوم الأخلاق الإسلامية وأصالتها في الفكر الإسلامي))، دراسة مقدمة إلى دورة مناهج البحث التربوي في الدراسات العليا بمركز صالح عبد الله كامل – جامعة الأزهر

پەروەردەی ڕەوشتیی ئیسلامیی بێگومان دەبێت مادده خاوەکەی لە قورئانی پیرۆزەوە و فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر) وەر بگرێت، لەگەڵ ئەوەی هاوەڵ و شوێنکەوتووان لەسەری بوون لە ڕەوشتی بەرز، زۆر ئەم وتەیەی پێشەوا (القرافي)م بەدڵە لە پەرتووکەکەیدا (*الفروق*): "ئەگەر پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر) جگە لە هاوەڵانی هیچ موعجیزەیەکی تری نەبووایە، ئەوا ئەوان بەس بوون بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتییەکەی)) بەهۆی ئەو چاکەکاری و ڕەوشتە جوانانەی هەیانبووە[1].

پەروەردەی ڕەوشتیی ئیسلامیی بەشێکە لە پەروەردەی ئایینیی ئیسلامیی، کە دەبێت بدرێت بە خوێندکاران لە هەموو قۆناغەکاندا، بە زانکۆشەوە. جا هەوڵی لابردنی ئەو ماددەیە: ماددەی پەروەردەی ئایینیی ئیسلامیی و شوێنگرتنەوەی بە پەروەردەی ڕەوشتیی یان پەروەردەی شارستانیی یان هەر ناوێکی تر بێت، هەروەها ئەو بابەتە بکرێت بە بابەتێکی ناسەرەکیی، کە دەر چوون و کەوتنی خوێندکاری لەسەر نەوەستێت، کارەساتێکە تووشی خوێندنی عەرەبی و ئیسلامیی بووە و گرنگترین سیما ئیسلامییەکانی شێواندووە و زۆر لەوە دەترسم لە پشت ئەوەوە پاڵنەری عەلمانی ناوخۆیی و دەرەکی ناچارکەر بوونیان هەبێت[2].

مەزنترین وڵاتی جیهان (ئەمریکا) شاڵاوێکی ئاشکرای کرد لە دەستتێوەردان لە پرۆگرامەکانی پەروەردەی ئایینیی ئیسلامیی بە پاساوی ئەوەی ئەو پرۆگرامانە هانی تیرۆر و ڕق دەدەن دژ بە ڕۆژئاوا و جووەکان و باشتر وا بوو ئەمریکا ئەو

---

الشريف، القاهرة، (٢٣-٢٧/٧/٢٠٠٠م).

[1]- عبد الفتاح أبو غدة: الرسول المعلم وأساليبه في التعليم، مكتب المطبوعات الإسلامية، (١٩٩٦م)، (ص ١٤).

[2]- بۆ ئەم بابەتە بگەڕێرەوە سەر: عبد الرحمن النقيب في: كيف نعلم أولادنا الإسلام بطريقة صحيحة، دار السلام، القاهرة، (٢٠٠٥م)، (ص٥-٢٠)، (ص ١٩٧-٢١٦).

ڕاپۆرتەی لەیاد بووایە کە دەسەڵاتە ئەمریکییەکان لە سەرەتای هەشتاکاندا دەریان کرد لەژێر ناونیشانی: ((ئوممەتێك ڕووبەڕووی مەترسی دەبێتەوە)) کە تێیدا هاتبوو: "ئەگەر دەتەوێت ئوممەتێك لە چەك دابڕیت، ئەوا لە سیستمی خوێندنەکەی دابڕە و ئەگەر ئوممەتێکیش بیەوێت دەست لە کاروباری خوێندنی ئوممەتێکی تر وەر بدات، ئەوا دەبێت ئەم کارە وەك ڕاگەیاندنی جەنگ لەگەڵیدا سەیر بکرێت".

لەبری ئەوەی ئەمریکا ڕێز لە ئیسلامەکەمان بگرێت، هاتووە بە شێوەیەکی زۆر ئاشکرا و دیار دەست لە گۆڕینی پرۆگرامەکانی پەروەردەی ئایینیی ئیسلامیی وەردەدات. ئەوەتا بۆ نموونە پاڵپشتییەك بە بڕی (١٠٠) ملیۆن دۆلار دەدات بە پاکستان بۆ دروستکردنی بانکێکی زانیاریی لەبارەی خوێندکارانی خوێندنگە قورئانییەکان بە ئامانجی دەستخستنی زانیاریی بنەڕەتیی لەسەر هەموو خوێندکار و مامۆستایەك لە خوێندنگاکاندا، هەروەها بۆ چاودێری خستنەسەر هەموو بڵاوکراوەکانی ئەم خوێندنگانە و ئەو چاپخانانەی پەیوەستن پێیانەوە و بۆ بەدیهێنانی پرۆگرامی خوێندنی نوێ، کە پێشتر نەدەخوێندرا، مامۆستایانیش ناچار دەکرێن خولی ڕاهێنان ببینن لەسەر ئەم پرۆگرامە نوێیانە و هەرکەسێکیش ناڕەزایی دەر ببڕێت لە پیشەکەی دەر دەکرێت.

لە جەزائیر وەزارەتی پەروەردە بەدەم ئەم داوایەوە چوو و وەزیرەکەی بڕیارێکی دەر کرد بە لابردنی ڕێنمایی و ئەو زیکرانەی کە پەیوەستن بە کاری مردووشۆردنەوە لەگەڵ هەموو ئایەت و فەرموودەکانی تەرغیب و تەرهیب لە سزای گۆڕ و فیقهی جیهاد، هەروەها وێنەی ئەو منداڵانەشیان لادا کە دەستنوێژ دەشۆن یاخود نوێژ دەکەن لە بەرگێکی ئیسلامیی و گۆڕیان بە وێنەی تر، کە پانتۆڵی جینزیی لەبەردایە و ئەم هێرشە بە پاکستان و جەزائیرەوە نەوەستانەوە، بەڵکو

زۆر وڵاتی ئیسلامیی تریشی گرتەوە، وەك: سعوودیە و یەمەن، بە بیانووی ئەوەی پرۆگرامی خویندنی ئایینی کار لەسەر پێگەیاندنی تیرۆریست دەکەن[1].

کۆمەڵێك شارەزای سیاسیی دیاری ئەمریکی کە ناوی ((گرووپی ١٩))یان لێ نرا، ڕاپۆرتێکی گرنگیان ئامادە کرد و پێشکەشیان کرد بۆ دەزگای ئاسایشی نیشتمانیی ئەمریکی کە لێکۆڵینەوەیەکی گرنگیی لەخۆ دەگرت دەربارەی ئەو چەمکەی ناویان نا ((لایەنە دەروونییەکانی تیرۆری ئیسلامی)) ئەم گرووپە لێکۆڵینەوەکەیان بۆ هەندێك پێشنیار کۆتایی پێ هێنابوو بەرزیان کردەوە بۆ سەرۆکی ئەمریکی (جۆرج بوش) ئەویش ڕەزامەندیی دەربڕی لەسەریان. لێکۆڵینەوەکە کە تەنها (The week) پوختەیەکی لەبارەیەوە بڵاو کردەوە دەربارەی گرنگیی لایەنی دەروونی لە کارە تیرۆریستییەکاندا لای عەرەب بەتایبەتی و لای موسڵمانان بەگشتی و لێکۆڵینەوەکە هۆشیاریی ئەوەی دا کە دروستبوونی وێنەی نەرێنی لەبارەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و پەیوەندیی لەنێوان ئەو و ئیسرائیلدا دروستکەری تۆوی سەرەتایە بۆ کارە تیرۆرستییە عەرەبی و ئیسلامییەکان دژ بە ئەمریکا. هەروەها لێکۆڵینەوەکە دەڵێت: لە ئێستادا گرنگە دارشتەیەکی پابەندکار بدۆزینەوە بۆ هاوکاری لەنێوان وڵاتە عەرەبییەکان و ئەمریکادا لە گۆڕینی پرۆگرامەکانی خوێندن و سیاسەتی ڕاگەیاندن و ڕازییبوون بە ڕۆڵگێڕانی هاوبەش لەنێوان هەردوو لادا.

هەروەها لێکۆڵینەوەکە وای دەبینێت گرنگترین لایەن لە ڕوانگەی ئەمریکی خۆی لە گۆڕینی پرۆگرامە فێرکارییەکاندا دەبینێتەوە کە هاندەرن بۆ ڕقلێبوونەوە لە جوولەکە و جیهانیی ڕۆژئاوایی بەدیاریکراوی، بەتایبەت کاتێك ئەم پرۆگرامانە

---

[1] – محمود عبده أحمد فرج: تعليم الدين الإسلامي للناطقين بغير العربية، رؤية مستقبلية، مؤسسة الإخلاص للطباعة والنشر، بنها، مصر، (٢٠٠٣م)، (ص ٨٤، ٨٥).

بەڕاشکاوی بانگەشە بۆ هەستان بە کاری تۆقێنەر دەکەن لەڕێی هەندێك بابەتەوە کە هاندەرن بۆ چەمکێك بە ناوی ((جیهاد)). لێکۆڵینەوەکە دەڵێت: ئەم چەمکە — جیهاد— موسڵمانەکان هان دەدات لەسەر خۆبەکوشتدانیان بەرامبەر لەناوبردن و تۆقاندنی ئەوەی موسڵمان نییە لە جوولەکە و مەسیحی، ئەم چەمکەیە لە واقعی ئیسرائیلدا ڕەنگ دەداتەوە، چونکە تیرۆرستە فەلەستینییەکان —وەك لێکۆڵینەوەکە ناوزەندیان دەکات— فێر دەکرێن لە بیروباوەڕەکانیاندا کە هەرکەسێك بەو شێوەیە بکوژرێت ڕازیبوونی خودا بەدەست دێنێت و شوێنێکی هێمنی بۆ دابین دەکات دوای مردنی.

هەروەها لێکۆڵینەوەکە وای دەبینێت کە لەناوبردنی شوێنەوارە دەروونییە خراپەکانی تیرۆری عەرەبی، بێگومان دەبێت لە قۆناغە سەرەتاییەکانی خوێندنەوە دەست پێ بکات، ئەگەر نا، ئەو شاڵاوە نێودەوڵەتییەی ئێستا دژی تیرۆر پێی هەڵدەستێن جگە دامرکێنێکی کاتی زیاتر نییە کە ماوەکەی (٥) بۆ (١٠) ساڵی داهاتوو دەبێت و ساڵانێك دێن کە تیرۆرستە عەرەبەکان زۆر دڕندەتر و توندوتیژتر دەبن لە نەوەی ئێستا. لێکۆڵینەوەکە ئاماژە بەوە دەکات: بەپێی واقعی لێکۆڵینەوە و ئامارەکان هەر (١٥) ساڵێك کۆمەڵەیەکی نوێ لە تیرۆرستان سەر هەڵدەدەن، کە زۆر توندوتیژانەتر و خوێناوییترن لە کۆمەڵەکانی پێش خۆیان و ئەم سووڕە خوێناوییە ڕوونتر بووە لە ساڵانی حەفتاکانەوە، بەڵام لە نەوەدەکانەوە بەکردەیی هەن.

لێکۆڵینەوەکە دەڵێت: میسر بە مۆڵگەی سەرەکیی بیرە تیرۆرستییە کردەییەکان و پێکهێنانی شانە تیرۆرستییەکان دادەنرێت و لەڕێی میسرەوە ئەم شانانە بڵاو دەبنەوە، سەرەتا بە وڵاتە عەرەبییەکاندا، پاشان بەدوایدا کاری تیرۆرستیی دێت دژ بە بەرژەوەندییە ڕۆژئاواییەکان. لێکۆڵینەوەکە ئاماژە بەوەش

دەدات کە ئەم سوورە (١٥) ساڵییە دەکەوێتە ژێر باری زۆر هۆکاری دەروونییـەوە، لە سەروو هەموویانەوە کتێبی پـیرۆزی موسـڵمانان ((قورئـان)) و ڕوونـە کـە دژوارە لەڕووی کردەییەوە داوا لە حکومەتە عەرەبییەکان بکرێت قورئان بگۆڕن، بەڵام زۆر لە مەرجەعیاتی ئایینیی هەن دەکرێت قورئان بـە شـێوەیەکی جیـاواز ڕاڤـە بکـەن، تـاکو ئاسـانکاری بکـات و هاوکـار بێـت لـە بـەجێهێنانی ئـەو خواسـتانەی ئـەمریکا دەیەوێت.

لێکۆڵینەوەکـە وای دەبینێـت: گـەورەترین کاریگـەری لـە دەوڵەتـە عـەرەبی و ئیسلامییەکاندا، بەتایبەتی لە میسر و سعوودیەوە سەرچاوە دەگرێت، لـە کاتێکـدا ڕۆڵی دەوڵەتە عەرەبی و ئیسلامییەکانی تر لاوەکییە، سعوودیەش دەتوانێت ڕۆڵـی سەرەکی ببینێت لەڕێی ئەو قورساییە ئایینییەی هەیەتی لـە ناوچـەکەدا، هـەروەها بوونی ناوچەی پیرۆزەکانی موسڵمانان تێیدا، هـەروەها میسـریش دەتوانێـت ڕۆڵـی سـەرەکی ببینێـت، لـەڕێی ئـەوەی ئەزهـەری لـەخۆ گرتـووە و گـەورەترین وڵاتـی عەرەبییـە کـە پێکـدادانی هـزرە ئایینییـەکانی تێـدا ڕوو دەدات لـەنێوان چـەندین گرووپی جیاوازەوە. هەروەها میسرییەکان بەسروشتی خۆیان ڕوویان لە دینداریيە.

لێکۆڵینەوەکە دەڵێت: ئێمە ناتوانین پێکهاتـەی قورئـان بگـۆڕین، بـەڵام دەبێـت دەست وەر بدەین لەوەی لە ناوەڕۆکەکەی خاڵیی بکەینەوە، نووسـینەکە هەنـدێك پێشنیار لە بەڕێوەبردنی ئەمریکی داوا دەکات، تاکو بخرێنە بواری جێبەجێکردنەوە و دیارترینیان:

١- پێویسـتیی ناچـارکردنی مەرجەعییـەت و خـاوەن بەرپرسـیارێتییە ئایینییەکان بۆ ئەوەی تیشك بخەنە سەر لقە پەیوەستەکان بـە کـەش و پەرستشـە ئایینییەکانەوە و کارکردن لەسەر ئەوەی ڕۆڵی ئایین قەتیس بکرێت لـە پەیوەنـدیی نێوان تـاك و پـەروەردگاری، بـەبێ ئـەوەی سـەر بکێشـێت بـۆ زیـاتر لـەوە، لەگـەڵ

هەوڵدان بۆ دوورخستنەوەی موسڵمانان لە هەر ڕۆڵێکی ژیاریی یان سیاسی یان شۆڕشگێڕی.

٢- پێویست بە شێوەی قۆناغبەندیی گۆڕانکاری بکرێت لە پرۆگرامەکانی خوێندن لە میسر و وڵاتە عەرەبییەکان و ئەم قۆناغبەندییە ئەمانەی خوارەوە بگرێتەوە:

أ- **قۆناغی فێرکردنی سەرەتایی**: بە شێوەیەك پێکهاتەی وانەی ئایینیی بگۆڕردرێت و ناوی: ((ڕۆشنبیریی ئایینیی)) لێ بنرێت، بە ئامانجی ئەوەی وێنەیەکی ئەرێنی دروست بکرێت لەبارەی کارە چاکە بنەڕەتییەکان لە ئایینەکانی جوولەکە و مەسیحیی و ئیسلامدا و جەخت لەسەر ڕۆڵی هەموو ئایینەکان بکرێتەوە لە دروستکردنی ژیاریی مرۆڤایەتیدا و ئەم گۆڕانکارییە درێژ ببێتەوە بۆ گۆڕینی پرۆگرامەکانی زمانی عەرەبی، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندیی بە بابەتەکانی خوێندنەوە و دەقە ئەدەبییەکانەوە هەیە دوای ئەوەی سەرنجی ئەوە دراوە ئەم دەقانە هان دەدەن بۆ ڕق لە خەڵکی تر و عەرەبەکان لە وێنەی شەڕکەری دڕندەدا دەر دەخات و مێژووی خوێناوییان دژ بە خەڵکی تر بیر دەخاتەوە، کە ئەمەش وا دەکات ئەو منداڵانە هاوکار نەبن لەگەڵ ئەوانەی پێیان دەڵێن دوژمن.

لێکۆڵینەوەکەش لەم بارەیەوە دەڵێت: ئێمە ڕازی دەبین لەسەر هەندێك بابەتی خوێندنەوە لەسەر خۆشەویستی نیشتمان و وڵات، بەڵام بە شێوەیەکی جوان، بە جۆرێك وێنەی سروشتی گشتی وڵاتەکەیان پێشکەش بکات و هەموو شتێکی لێ دەسڕینەوە کە بابەت و دەقی ئەدەبیی و مێژوویی دەوروژێنێت بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی ڕق دژ بە ڕۆژئاوا و هەموو شتێکی ئەمریکی و ئەوروپی، تەنانەت ئەوەی پەیوەندیی بە وڵاتانی دراوسێیانەوە هەبێت ((ئاشکرایە لێرە مەبەستی ئیسرائیلە)).

لێکۆڵینەوەکە وای دەبینێت: پێویستە پرۆگرامەکانی مێژوو بگۆڕدرێت و باشترین شتێك کە تیشك بخرێتە سەری: مێژووی شۆڕشە زانستییەکانە لە جیهاندا و چۆن پێشکەوتنی مرۆڤ لە قۆناغێکەوە گواستراوەتەوە بۆ قۆناغێکی تر و ئەو دابونەریتانەی بڵاو بوون لە سەرەتاکانی ژیانی مرۆڤدا و ڕادەی پەرەسەندنی ئەو دابونەریتانە بەبێ خۆدان لەوەی ناو نراوە قۆناغەکانی داگیرکاری یاخود دەرخستنی بکوژەکان وەك ئەوەی پاڵەوان و شەهیدن، بەڵکو دەبێت لایەنە ئەرێنییەکان و ڕۆڵی پێشەنگی ژیاری ڕۆژئاوایی بچەسپێنرێت لای گەلە عەرەبی و ئیسلامییەکان.

ئەم چەمکانەش دەبێت درێژ ببنەوە بۆ مامۆستا و بەرپرسە پێشەنگەکان لە خوێندندا، بە جۆرێك سەرنجیان بەلای خۆیاندا ڕابکێشرێت و کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکرێت و ڕێ بۆ هەندێکیان خۆش بکرێت سەردانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بکەن، تا بتوانرێت شوێنەواری دوژمنایەتیی دەروونییان بسڕێتەوە دژ بە ئەمریکا، بە جۆرێك بتوانن هەڵبکەن لەگەڵ چەمکە نوێیەکاندا تاکو بتوانن خوێندکارەکان بە پەروەردەیەکی ڕاست پەروەردە بکەن دوور لە دوژمنایەتی و ڕوانینە مێژووییە ناڕاستەکان بۆ سروشتی پەیوەندییەکان لەنێوان ڕۆژئاوا و عەرەب و موسڵماناندا.

ب- **سەبارەت بە قۆناغی خوێندنی ناوەندیی:** لێکۆڵینەوەکە وای دەبینێت ئەو هەنگاوانەی نرابوون بۆ قۆناغی سەرەتایی لە پەرەپێدان و گۆڕانکاری، بەردەوام بێت، بەڵام لەم قۆناغەدا تیشك بخرێتە سەر پێکهاتەی زانستی و بەدەستهێنانی مەعریفە و لێهاتوویی زانستیی نوێ، هەروەها تیشك بخرێتە سەر دیارترین دەستکەوتە زانستییە جیهانییەکان کە بەدی هێنراون. دەربارەی پێکهاتەی پرۆگرامە ئایینییەکانیش ئەوا ناونیشانی ((تاووتوێ و لێکتێگەیشتنی ژیارەکانی

جیهان))  تەوەرەی خوێندنی ئەم قۆناغە بێت، کەوا دەر بخرێت ژیارەکانی جیهان خاوەنی هەمان ڕوانینن لەوەی مرۆڤ چۆن بینا دەکرێت،  ئەوەی دەبێت مرۆڤ پابەند بێت بەو ڕەوشتانەی لە هەموو ژیارەکاندا بەرپان.

هەروەها دەبێت لەم پرۆگرامە ئایینییە نوێیانەدا تیشک بخرێتە سەر لابردنی ((پەیژەی لەپێشینەیی ژیارەکان)) واتە: نابێت ژیارێك بانگەشە بکات کە لە ژیارێکی تر باشترە، بەڵکو دەبێت ڕوون بێت کە هەموو ژیارێك بە شێوەیەکی یەکسان سوودیان بۆ مرۆڤایەتی هەیە و پێوەری سەرەکیی بۆ جیاکردنەوەی ژیارەکان لە یەکدی ڕادەی کۆنی و نوێبوونیان بێت، هەروەها ژیارە کۆنەکان بوون کە بەردی بناغەی ئەم ژیارە نوێیانەیان داناوە، لەم قۆناغەشدا لێکۆڵینەوەکە دەڵێت: دەبێت زمانی ئایینی بنیات بنرێت لەسەر عەقڵ و لۆژیك، نەك لەسەر نەقڵ و شوێنکەوتن بۆ کتێبی پیرۆز بەبێ بیرکردنەوە، ئەمەش یارمەتیدەرێکی گەورە دەبێت لە ڕێگرتن لەو منداڵانە لە تێکەڵبوونیان بە کۆمەڵە تیرۆرستییە مەترسیدارەکان.

لێکۆڵینەوە ئەمریکییەکە دەڵێت: ئەو هێزەی کۆمەڵە تیرۆرستییەکان لە میسر و سعوودیە و جەزائیر بەدەستیان هێناوە، سەرکەوتنیانە لە سەپاندنی چەمکی نەقڵ و شوێنکەوتوویی بۆ کتێبی پیرۆز و فەرموودەکان و بەتەواویی چەمکی عەقڵ و لۆژیکیان وەلا ناوە.

لێکۆڵینەوەکە دەڵێت: مرۆڤ لەم قۆناغە ئامادەییەدا تووشی کۆمەڵێك گۆڕانکاریی فیسیۆلۆجی گەورە دەبێت و ئەم گۆڕانکارییانە یان لە بەرژەوەندیی بنیاتنانی مرۆڤێکی هاوکار دەبێت کە توندوتیژی لەلا ون دەبێت بەرامبەر خەڵکی تر، یان پێچەوانەکەی دەبێت لە زیادبوونی ئەم توندوتیژییە، بە جۆرێك بگۆڕێت بۆ پڕۆژەیەکی مرۆیی تیرۆرستی، کە مەترسی تەقینەوەی هەبێت. بۆیە

دەستتێوەردانمان بەبەهێزی لەم قۆناغەدا بەرهەمی زیاتر دەبێت بۆ بەدیهێنانی سەرکەوتنی گرنگ لە لەناوبردنی بناغەی دەروونی تیرۆردا.

ج- لەبارەی قۆناغی دواناوەندییەوە: پرۆژە ئەمریکییەکە ئەم قۆناغە بە قۆناغێکی تایبەتتر لە قۆناغەکانی تر سەیر دەکات کە بابەتی ئایینی تایبەت بەجیا دەدرێت بە هەڵگرانی هەریەکێك لە ئایینەکان، لە ساڵی یەکەمدا خوێندکاران چەمکە بناغەییەکانی ئایینە تایبەتییەکانیان فێر دەبن لەڕووی پەرستشەکانەوە و چۆنیەتیی بەجێهێنانیان و مەرجەکانیان و سوودی ئەم پەرستشانە و ساڵی دووەم خوێندکار هەندێك لە بەسەرهاتە مێژووییەکان دەخوێنێت لەبارەی پێغەمبەرانەوە و ساڵی سێیەمیش ڕوانینێك بە پشکنین و دووبارە هەڵسەنگاندنەوەی عەقڵانی هەندێك هەڵەی ئایینی بەربڵاو لەبارەی توندوتیژیی ئایینی ئیسلامییەوە و پەیوەندیی لەگەڵ ئوممەت و گەلانی تردا و برایەتیی لەنێوان ژیارەکاندا فێر دەکرێن و هەمان ئەو چەمکانە دەبێت درێژ ببنەوە بۆ کتێبەکانی مێژوو و پرۆگرامەکانی تر، بە جۆرێك ئەوەی پەیوەندیی بە شوێنەوارەکانی هەردوو جەنگی جیهانیی یەکەم و دووەمەوە هەیە بەسەر مرۆڤایەتییەوە بخوێنرێت، هەروەها پێدانی ڕوانینێکی داهاتوویی بۆ هاوکاریی نێوان گەلان و تاکە جیاوازەکان لە ئاڕاستە و ئینتیما ئایینییەکانیاندا.

لێکۆڵینەوەکە خاڵی نەبوو لە ئاماژەکردن بە پرۆگرامە زانکۆییەکان و جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی پرۆگرامە ئایینییەکان بوونیان نییە و کاریگەرییان نییە لە زانکۆدا. لەگەڵ ئاماژەکردن بە پێویستیی پێکهێنانی خوێندکار و خۆناساندن و هاوکاری لەگەڵ گرووپی خوێندکاریدا لە وڵاتانی تری جیهان و لەپێش هەمووشیانەوە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ناوی لەم پرۆگرامە بنرێت: ((پرۆگرامی هاوکاریی زانکۆیی)) بۆ ئەم قۆناغەش لێکۆڵینەوەکە دەڵێت: دەبێت

چەشنی بەکاربەریی (إستهلاکی) ئـەمریکی زەق بکرێتـەوە و بـڕوانین کـێ باشـترین نموونەی عەرەبییە کە هاوئاهەنگە لەگەڵ ئەو نموونە ئەمریکییـە، تـاکو پێشـینەیی بـدرێت بـەو نموونەیـە و هاوکـاریی بکـەین لـەوەی پێویسـتیەتی لـەڕووی مـاددی و مەعنەوییەوە.

هەروەها ئەم لێکۆڵینەوە ئەمریکییە تیشك دەخاتە سەر: پێویستیی پشتبەستن بە بیرۆکەی لێکدانەوە (تأویل) و داهێنانی زمانێکی ئایینیی نوێ لە هەموو بنـەما و پرنسیپە بنەڕەتییەکانی ئایینی ئیسلامدا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ جیهانیی ڕۆژئاوادا، بەتایبـەت ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا، لێکدانـەوە (تأویـل) چەشـنێکی بیرکردنەوەی بڵاوە لای زۆرێك لە کۆمەڵگە عەرەبییەکان بە مەبەستی پێدانی واتـا و ڕاڤەی دیاریکراو بۆ زۆر لەو بابەتانـەی کـە پەیوەنـدیی بـە پەرستشـەکانەوە نییـە، بەڵکو ئەو بابەتانەی هانی ڕق و توندوتیژی و تۆڵەسەندنەوە دەدەن و ئەو تەفسیرە ئایینییانەی دەبێت ئەو لێکدانەوانەی پشتی پێ ببەستن ئـەرێنی بـن تـاکو گشـتگیر بکرێن، بە ڕادەیەك هەموو بیرۆکە نەرێنییەکانی تر لەپاڵیدا ون بن.

لێکۆڵینەوەکە ئاماژە بەوە دەکات ئەو بیرۆکە ئەمریکییانەی خرانە ڕوو نابێت لە چوارچێوەی پەیوەندییە ستراتیجییە بنەڕەتییەکانی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و وڵاتە عەرەبییەکاندا دەر بچێت و دەبێت جـەخت لـەوە بکرێتـەوە ئـەم کارانـە لـە چوارچێوەی لەناوبردنی تیرۆری نێودەوڵەتیدایە و دەبێت بەم پێیە درێژ ببێتەوە بۆ بەسـتنی ڕێککـەوتنی دوولایەنـە لەگـەڵ وڵاتـی عـەرەبیی تـردا کـە پێشـتر پابەنـدی سـتراتیجی هاوبـەش نـەبووە لەگەڵیانـدا، لـەم پێناوەشـدا دەبێـت هـەر دەنگێکـی ناڕەزایی ڕەت بکەینەوە کە دژی ئەم سیاسەتە ئەمریکییە نوێیە بە بیانووی ئەوەی دەستتێوەردان لەو بابەتانەی پەیوەندییان بە سەروەریی نیشتمانیی ئەو وڵاتانـەوە هەیە.

لـه كۆتاييـدا لێكۆڵینەوەكـە داوا دەكـات: پێویسـتی ڕەتكردنـەوە و بـەرگریی دروستبوونی وڵاتی ئاینی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، چونكە دەبێتـە لەوەرگەیـەكی سیاسی بـۆ گەشـەكردنی كۆمەڵـە و تەوژمـە تیرۆرسـتییەكان و ئـەو دەوڵەتـەش لـە پرۆگرامـەكانی خوێندنیـدا تیشـك دەخاتـە سـەر ئـایینی ئیسـلام لـەڕێی قورئـان و فـەرموودەوە، بۆیـە ئێـران و سـوودان لـەو وڵاتانـەن كـە دەبێـت سیسـتمەكانیان بڕووخێنرێـت هـەر وەك چـۆن دەبێـت بەتونـدی دەسـت وەردەیـن بـۆ ناچـاركردنی سعوودیە لەسەر وازهێنان لە جێبەجێكردنی شـەریعەتی ئیسـلامیی لـە وڵاتـدا. بـەم جۆرە ئەم لێكۆڵینەوەیـە بـەرز كرایـەوە بـۆ سـەرۆكی ئـەمریكا –بـوش– و ئـەویش ڕەزامەندیی لەسەر دەر بڕی، بەڵام بڕیاری دا ڕاگەیاندنی بـە دەوڵەتـە عەرەبیـەكان دوا بخات و ناچار بكرێن جێبەجێی بكەن لەدوای لێدانی عێراق و گـۆڕینی سیسـتمی حوكمڕانی، بۆ ئـەوەی دەوڵەتـە عەرەبییـەكان خۆیـان ناچـار ببیـنن و ڕازی بـن بـە جێبەجێكردنی ئەو بڕیارانە بەتـەواویی یـان ئـەو گۆڕانكارییانـەی بەسـەر زۆرێك لـە وڵاتاندا دێت لە ناوچەكەدا، دوای ڕووخاندنی حوكم لـە عێراقـدا وا دەكـات پلانەكـە بەتەواویی جێبەجێ بكرێت لەڕێی هەنـدێك لایەنـەوە كـە شـوێنكەوتووی سیاسـەتی ئەمریكین[1].

لەبەردەم ئەم پلانە جیهانییە دڕندانەدا دەبێـت –بەتایبـەت وەك پـەروەریاران– ڕوانینێكـی زانسـتیی ڕوونمـان هـەبێت بـۆ چـۆنیەتیی ڕووبەڕووبوونـەوەی ئـەم مەترسـییەی هەڕەشـەمان لـێ دەكـات لـە پیرۆزتـرین شـتێك كـە هەمانـە: ئـەو

---

[1]– بۆ ئاگاداربوونی زیاتر لـە ڕەهەنـدەكانی پلانەكـە، بڕوانـە: السـید عمـر: ((الخريطـة الإدراكيـة الراهنـة للتعليم الديني السعودي المصري)) في أمني في العالم، مركز الحضـارة والدراسـات السياسـية، القـاهرة عـام (٢٠٠٢م)، سليمان إبراهيم العسكري: بيان للمثقفين الأمريكيين: دعوة للحوار أم للحرب، مجلة العربي يونيو (٢٠٠٢م)، مصطفى بكري: خطة واشنطن لتغيير المناهج التعليمية في مصر والعالم العربي، جريدة الأسبوع، القاهرة في (٢/١٢/٢٠٠٢م)

دەوڵەمەندییە تیۆری و کردەییەی هەمانە لە بواری ئایین و ڕەوشتدا و گرنگیی دەرخستنی ئەوە و پێشکەشکردنی بە ڕۆڵەکانمان و هەموو جیهان بە ڕێگەیەکی کارا و کاریگەر.

سەرەڕای چڕوپڕیی بەرهەممان لە بواری کەلەپووری ڕەوشتیدا کەچی زۆربەی بەها هاتووەکانمان لەم کەلەپوورەدا پێویستی بە ناوەڕۆکی نوێ هەیە، بۆ نموونە: بەهاکانی ئازادی و دادپەروەریی و یەکسانی و متمانە و لێبووردەیی لەگەڵ خەڵکی تردا، هەر وەك چەند لقێکی ڕەوشتی نوێ پەیدا بوون، وەك: ڕەوشتەکانی ژینگە و ڕەوشتە بایۆلۆجییەکان و ڕەوشتەکانی زانیاریی و ڕەوشتەکانی ئینتەرنێت پێویستیان بە شوێنگرتنە لە بالآگەردانی درەختی ڕەوشت لە ئیسلامدا. لە کۆتاییشدا ڕەوشتە تاکەکەسییەکان نابێت چەقی تەوەری ڕەوشتەکان بن، بە جۆرێك ڕەوشتەکان تەنها ڕزگاربوونی تاکەکەسی دەستەبەر بکەن، بەڵکو دەبێت ڕەوشتە کۆمەڵگەییەکان کە پەیوەندییان هەیە بە چاکیی دامەزراوە سیاسی و ئابووری و کۆمەلآیەتی و یەکێتیی ئوممەت و ڕابوونەوە جێی خۆیان بکەنەوە لە وانەکانی ڕەوشتە ئیسلامییەکاندا[1].

ئەگەر جەختمان لەسەر گرنگیی بابەتی پەروەردەی ئایینیی ئیسلامیی کردبێتەوە وەك یەکێك لە سەرچاوەکانی پەروەردەی ڕەوشتی ئیسلامیی مانای ئەوە نییە ڕۆڵی هەموو بابەتە فێرکارییەکانی تر کە دەدرێن بە خوێندکار پشتگوێ دەخەین، لە کاتێکدا هەموو ئەو بابەت و مەعریفانە دەکرێت ڕێخۆشکەر بن بۆ پەروەردەی ڕەوشتی خوێندکار. لێکۆڵینەوەکەی ((خالد الصمدی)) لەم بارەوە ئاسانکاریی بۆ کردووین: ((بەها ئیسلامییەکان لە پرۆگرامەکانی خوێندندا، پرۆژەیەکە بۆ لێکدانی بەهاکان لەگەڵ خوێندنی بنەڕەتی)) کە چۆن بابەتەکانی

[1]– نبیل علي: الثقافة العربية وعصر المعلومات، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ٤٠٢–٤٧٥).

مێژوو و زانستەکان و ئاداب و هونەرەکان و جوگرافیا و زمانەکان و... هتد دەتوانن ڕێخۆشکەر بن لە پەروەردەی ڕەوشتی خوێندکارەکاندا[1]. ئەمە لەپاڵ ((بەئیسلامیکردنی زانست و مەعریفەکاندا)) کە زۆرێك لە دامەزراوەکانی ئوممەت و لە سەروو هەموویانەوە پەیمانگای جیهانیی فکری ئیسلامیی لەخۆیان گرتووە، لە کاتێکدا سەرکەوتنی ئەو پڕۆژەیە بە پێشهاتێکی گرنگ دادەنرێت لە پێشهاتەکانی پەروەردەی ڕەوشتی ئیسلامیی و پێویستییەکی گرنگ دەبێت لە بەدیهێنانی مرۆڤی قورئان و فەرموودە کە مرۆڤێکە بەکردەیی توانای سەرکردایەتی و پێشڕەویی ڕەوشتی جیهانیی هەیە بە واتا ڕاستەکەی[2].

پێکهاتەکانی پرۆگرامەکە هەرچەند دەوڵەمەند بن، کارەکە پێویستیی بە شێوازی خستنەڕووی نوێ هەیە بۆ ئەو پێکهاتانە کە تەنها بە نووسین و وانەگوتنەوە ناکرێت، بەڵکو ڕێگاکانی خوێندنەوە گرنگییەکی گەورە دەدات بە دەرهێنانی هونەری کتێبەکانی پەروەردەی ئیسلامیی لەڕووی ئەوەی پێویستە لەخۆی بگرێت لە شێوە و وێنە و نەخشە و پرسیار و گفتوگۆ و سەرچاوە و ماڵپەڕی ئینتەرنێت و... هتد، بەوەی ئامانجی پڕۆگرامەکە بە شێوەیەکی باشتر بهێنێتە دی، لەپاڵ وانەدانیشدا پێویستە پشت بە ئامرازی فێرکاریی جیاواز ببەسترێت لە داتاشۆ و وێنە و شێوە و نەخشە و تۆماری دەنگی و ڤیدیۆ و نموونە و شتی بەرجەستە و سەردانی مەیدانی و... هتد.

هەروەها مامۆستا دەبێت بارودۆخ و هەڵوێستە جیاوازەکان بقۆزێتەوە بۆ پێدانی

---

[1]– خالد الصمدي: القيم الإسلامية في المناهج الدراسية، مشروع برنامج لإدماج القيم في التعليم الأساسي، المنظمة الإسلامية للتربية والعلوم والثقافة، إيسيسكو (٢٠٠٣م).

[2]– لە ئیسلامییبوونی مەعریفەدا بڕوانە: المعهد العالمي للفكر الإسلامي، إسلامية المعرفة، المبادئ العامة، خطة العمل – الإنجازات، المعهد العالمي للفكر الإسلامي – فيرجينيا – الولايات المتحدة الأمريكية، (١٩٩٢م).

ڕوونکردنەوە کە یارمەتیی دەرن لـە چاندنی ڕەوشـتە بەرزەکانـدا، هـەر وەك چۆن دەتوانێت نموونە لە ڕەفتار و ڕەوشتە جوانەکان نیشان بدات لە وانەکانی تایبەت بە ژیانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) و وانەی ئـاداب و مێـژوو و هیـی تـریش لـە پرۆگرامــە دانراوەکــان و دەکرێــت نموونــە لــە قەیرانــە ڕەوشــتییە نیشــتمانی و جیهانییەکان بخاتە ڕوو لەگەڵ گفتوگۆ بۆ دۆزینەوەی چارەسەرە ڕەوشتییەکان بـۆ ئــەو قەیرانانــە و دەتوانێــت گفتوگۆیــەکی ڕەوشــتییانە دەربــارەی کێشــە یــان هەڵوێستێکی ڕەوشتی دابمەزرێنێت و دەتوانێت خوێنـدکارەکان هـان بـدات لەسـەر نووسینی گوتاری ڕەوشتی یان بەشداریکردن لە کارێکی چاپکراوەی خوێندنگەدا کە ئاڕاستەیەکی ڕەوشتییانەی هەبێت یان پێکهێنانی گرووپێکی فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە، یان یارمەتیدانی خاوەن پێداویستییەکان یان پاککردنەوەی خوێندنگــە و گــەڕەك و شــێوازی هاوشــێوە، کــە دەتوانرێــت بــەکار بهێنرێــت لــە پەروەردەی ڕەوشتیدا بەبێ پشتبەستن بە شێوازی وانەپێـدان بەتـەنها، وەك چۆن ئێستا باوە لە وانەکانی پەروەردەی ئایینی ئیسلامیدا.

بەم شێوەیە پـەروەردەی ڕەوشـتیی خوێنـدکاران هـەر دەبێـت لـەڕێی چـالاکیی خوێندنگەیی زۆرەوە بێت کە خوێندکارەکان ڕەفتـارە ئیسـلامییەکانی تێـدا پیـادە دەکەن، وەك گرووپی کتێبخانە و گرووپی پەخش و ڕۆژنامەوانی و نواندن و داڕشتن و ڕۆشـنبیریی و پێشـانگاکان و گوتـاردان و... هتـد، لـە پـاڵ ئەوەشـدا کەشـێکی خوێندنگەیی پەیوەندی و ڕەفتارە ئیسلامییە ڕاستەکانی تێـدا زاڵ بـن و خوێنـدکار نموونــەی ڕەوشــتیی پێشــەنگی تێــدا ببینێــت لــە هــەموو بوارەکانــدا: زانســتی و تەندروستی و ڕۆحی و کۆمەڵایەتی.

بۆ ئەوەی پەروەردەی ڕەوشتیی ئیسلامیی سەرکەوتوو بێت، دەبێت مامۆستای پەروەردەی ئـایینیی ئیسـلامیی پـەروەردە بکرێـت و زانیـاریی شـەرعیی پێویسـتی

هەبێت و ئاگادار بێت لە بابەتـەکانی سـەردەم و پرسـەکانی ئوممـەت و پێشـەنگیی ڕەفتاری و ڕۆحی پەیامداریی هـەبێت بـۆ قوتابیـان. بـەڵام بەداخـەوە تـا ئێسـتا لـە وڵاتەکانماندا —ئەوەندەی لێکۆڵەر ئاگادار بێت— دامەزراوەیەکی پـەروەردەیی نییـە کە بتوانێت ئەم جۆرە مامۆستا پەیامدارانە بەرهەم بهێنێت و ئەوەی ئێسـتا هەیـە: یان دەرچووی زانکۆ شەرعییەکانن، کە هونەری پـەروەردە نـازانن، یـان دەرچـووی کۆلێژە پەروەردەییەکانن، کە لە زانستە شەرعییەکاندا شارەزا نین و زۆربـەی کـات ڕۆحی پەیامدارییان نییە.

لێرەوە پێویستیی گەورەمان بـە بـوونی دامەزراوەیـەکی شـەرعیی پـەروەردەیی هەیە، کە پسپۆڕ بێت لە ئامادەکردنی مامۆستای پەروەردەی ئایینیی ئیسـلامیی و بتوانێـت بـەم ئەرکـە هەسـتێت لـەژێر سـێبەری ئـەو کێشمەکێشـمانەی ڕووبـەڕووی ئوممەتی ئیسـلامیی دەبنـەوە، هـەروەها بـۆ هەڵبـژاردنی کـادیریش لـە زیـرەکترین خوێندکارەکان و ڕەخساندنی هەموو بارودۆخە ماددی و ئەدەبییەکان کە ئامادەیان دەکات تاکو بتوانن ڕۆڵی پێشەنگی ئـایینی و ڕەوشـتی ببیـنن، چ لـە مـاوەی کـاتی ئامادەکردندا، یاخود دوای ئەوە.

لە کۆتاییشدا گەورەترین کێشمەکێشمێك کە ڕووبەڕووی پـەروەردەی ڕەوشـتیی ئیسـلامیی دەبێتـەوە لـە جیهـانیی عـەرەبی و ئیسـلامیماندا بریتییـە لـەوەی: ئایـا دەتوانین هەموو ئەمانە فەراهەم بهێـنین: میتـۆدی ئیسـلامیی، مامۆسـتا، چـالاکی، کەشـێکی خوێندنگـەیی و فێرکـاریی ئیسـلامیی لـەژێر سـایەی ئـەو حکومـەت و بەرپرسانەدا کە زۆربەیان باوەڕیـان بـە گرنگیـی پـەروەردەی ئـایینیی ئیسـلامیی و ڕۆڵی کاریگەریی نییە لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئاسـتەنگەکانی سـەردەمدا. سـەرەڕای باوەڕی بەهێزمان بەو ڕۆڵە گەورەیەی حکومەت و بەرپرسەکان دەیـانتوانی بیگێـڕن بۆ سەرکەوتنی پـەروەردەی ئـایینیی ئیسـلامیی، ئەمـە ڕۆڵـی ئێمـە وەلا نانێـت لـە

پەروەریار و مامۆستا و دایك و باوك و ڕۆڵی بانگخوازە ئیسلامییەکان، یان ڕۆڵیان کەم بکاتەوە لە سەرکەوتنی ئەو پەروەردە ئایینییە ئیسلامییەی کە ئەمانەتە لە گەردنی هەمووماندا، ئەمانەتێك لەبەردەم خودا و پێغەمبەرەکەی و باوەڕدارانـدا پرسیارمان لەبارەیەوە دەکرێت.

ئەوەشی سەیرە لەبارەی ئەم ئایینە مەزنەوە ئەوەیە: سەرەڕای کەموکورتیی ئەو پرۆگرامە شەرعییانەی دەدرێت بە خوێندکارانمان لە ئێستادا و سەرەڕای دەگمەنیی مامۆستای پەیامدار کە لەپێناو پەیامەکەیدا بژی و سەرەڕای نەبوونی کەشی خوێندنی پاڵنەر بۆ پابەندیی ئیسلامی[1]، بەڵام هێشتا ئەم ئایینە تێدەکۆشێت و جەنگی مانەوە دەکات بەرامبەر ئەو هێرشە دڕندانەی لە ناوەوە و دەرەوەوە ڕووبەڕووی دەبنەوە و هێشتا ئەم ئایینە توانای ئەوەی هەیە چەندین نەوە بخاتەوە کە پەیامی ئیسلامیان هەڵگرتووە و لەپێناویدا دەژین و لارییشیان نییە لەپێناویدا ڕۆحی خۆیان ببەخشن.

---

[1]– بۆ زانینی ڕادەی پابەندیی گەنجانمان بە ئیسلامەوە، بڕوانە: عبد الرحمن النقيب: بعض القوى والعوامل المؤثرة على التدين الإسلامي لدى الشباب الجامعي، دراسة ميدانية، دار الفكر العربي، القاهرة، (١٩٨٣م)، بحوث في التربية الإسلامية، الكتاب الثاني، دار الفكر العربي، القاهرة، (١٩٨٢م)، (ص ١٤٥–١٦٨).

## کۆتایی:

له لاپەڕەکانی پێشوودا هەوڵمان دا ئەوە ڕوون بکەینەوە چۆن قەیرانی ڕەوشتی قـەیرانێکی جیهانییـە و هـەموو جیهـانیی ئـەمڕۆمان دەگرێتـەوە. پاشـان ئـەوەمان خستە ڕوو چۆن ڕۆژئاوا و ئـەمریکا هـەوڵی ڕووبەڕووبوونـەوەی ئـەو قەیرانـە دەدەن لـەڕێی توێژینـەوە و لێکۆڵینـەوەوە کـە زۆربـەی جـار لـە ڕۆحێکـی عەلمانییـەوە سەرچاوە دەگرێت کە باوەڕی بـە عەقلانییـەت و سـوودگەرایی و کۆمەڵایـەتیبوونی ڕەوشت و ئەرکە نیشتمانی و نەتەوەییەکانی و هەموو ئەمانە هەیە دوور لە ئایین لە زۆربەی بارەکاندا و چۆن ئەو کۆششـانە ئـەوەی لێـی چـاوەڕوان دەکـرا نـەیانتوانی بەدی بهێنن و ڕۆژئاوایـەکی ڕەوشـتداریان بەرهـەم نـەهێنا کـە بتوانێـت پێشـڕەویی کاروانی بەجیهانکردنی بەها ڕەوشتییەکان بکات.

پاشـان لەسـەر ئـەو قەیرانـە ڕەوشـتییە وەسـتاین لـە جیهـانیی عـەرەبی و ئیسـلامیماندا و ئـەوەی چـۆن لـە پابەندنـەبوونی ئێمـەوە بـە بـەها ئیسـلامییە ڕاستەکانمانەوە بە سەرچاوە ڕاستەکانیەوە لە قورئان و فەرموودەی صەحیحەوە و پێشـەنگە چـاکەکارەکان بـە درێـژایی سـەردەمەکان سەرچـاوە دەگرێـت و چـۆن دەکرێت پرۆگرام بۆ پەروەردەی ڕەوشـتیی ئیسـلامیی داڕێـژین، کـە پێکهاتەیـەکی سـەردەمیانەی هـەبێت و بـە شـێوازی سـەردەمییانە پێشـکەش بکرێـت لـەڕێی مامۆستای پەیامدار و چالاکی خوێندنگەیی و کەشی فێرکاریی گونجـاوەوە، لەگـەڵ ئاماژەدان بە گرنگیی بەئیسـلامیکردنی زانسـت و مەعریفـەکان لـەپێناو بـەدیهێنانی ئەو پەروەردە ڕەوشتییە ئیسلامییەدا.

ئەم توێژینەوەیە جەختی لەوە کردەوە کە ڕۆژئاوا — بە سەرکردەیی ئـەمریکا— لەبەر هەندێك هۆکار کە پەیوەندیی بە کەلتووری عەلمانییەکەیەوە هەیـە ناتوانێـت لەڕووی ڕەوشتییەوە سەرکردایەتیی جیهان بکات و ئەوەی موسـڵمانان جێگـرەوەی

ژياريي ڕەوشتين ئەگەر بەكردەيی بتوانن تيۆرييەكی تەواو پێشكە شبكەن لەسەر مرۆڤی قورئان و سوننەت و ئەو ڕەوشتە مرۆييە جيهانييانەی كە دەبێت تێيدا بێت و چۆن دەكرێت بەكردەيی ئەو ڕەوشتانە دەست بخات. بۆيە موسڵمانان جگە لە خۆيان لۆمەی هيچ كەسێك نەكەن ئەگەر ڕۆژئاوا بە تيۆر و فەلسەفەكانيەوە بێن بۆ ئەوەی جيهانيی پێداگری بكەن بەناوی ((ئايزۆی ڕەوشت)) يان ((ڕەوشتە جيهانييەكان)).

### بانگەوازێك بۆ ئەم كۆنگرەيە:

بەپێی ئەوەی پێشتر باس كرا، ئەم لێكۆڵينەوەيە گرنگيی ئەوەمان پێ ڕادەگەيەنێت كە ئەم كۆڕە نێودەوڵەتييانە تەواو نەبێت تەنها بە پێكهێنانی ليژنەيەك لە شارەزا شەرعی و پەروەردەييەكان نەبێت ئەركی ئەوەيان پێ بسپێردرێت پەيوەندی بكەن بە ئيسيسكۆ و پەيمانگای جيهانيی فكری ئيسلامييەوە و دامەزراوەی تريشەوە كە دەيانناسن، لەپێناو دانانی پلانێكی دياريكراودا بۆ ئامادەكردنی لێكۆڵينەوەی قووڵ لەبارەی باری پەروەردەی ئايينيی ئيسلاميی لە جيهانيی عەرەبی و ئيسلاميماندا[1] و ئامادەكردنی پرۆگرامی سەردەميانەی نوێ بۆ هەموو قۆناغەكانی خوێندن كە هەموو سيما زانستی و هونەرييە گونجاوەكانی تێدا دەستەبەر بێت، پرۆگرام بۆ ئامادەكردنی مامۆستای پەروەردەی ئيسلاميی و دابينكردنی بودجەی پێويست بۆ بەجێگەياندنی ئەم كارە زانستييە گرنگانە كەوا لە ئوممەت دەكات هەموو پلانە ناوەكی و دەرەكييەكان تێپەڕێنێت كە دەيانەوێت شووناسە عەرەبی و ئيسلامييە هەتاهەتاييەكەی لێ بستێنن.

---

[1]- ئەوەش لەڕێگەی لێكۆڵينەوەی زانستيی جێمتمانەوە لەبارەی ڕەهەندەكانی پلانە ئەمريكييەكە دژ بە ئوممەت كە لەو شتانەی كردوونيەتيە ئامانج دەستتێوەردانە لە پەروەردە و فێركردنی ڕۆڵەكانی ئوممەت و ئەو لێكۆڵينەوانە هەتا دەتوانرێت بڵاو بكرێنەوە بۆ ئەوەی بەئاگايی ئوممەت لە ڕەهەندەكانی ئەو پيلانانە زياد بكەين و بتوانێت ڕووبەڕوويان ببێتەوە بە شێوازێكی زانستييانەی گونجاو.

# هاوسەنگیی لەنێوان پێکهێنەرەکانی کەسایەتیی خوێندکاردا

## ( لێکۆڵینەوەیەکی ڕۆچوو لە ڕەگ و ڕیشەدا )[1]

### پوختەی لێکۆڵینەوەکە:

ئـەم لێکۆڵینەوەیـە هـەوڵ دەدات گرنگیـی گەڕانـەوەمان دەر بخـات بـۆ بنـەما پەروەردەییـە نـەگۆڕەکانمان لـە قورئـان و سـوننەت لـە تـاووتوێکردنی بابەتـە پەروەردەییەکاندا، لەپاڵ سوودمەندبوون لەوەی زانستە پەروەردەییەکانی سەردەم تا ئێستا پێی گەیشتوون و جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئـەرکی کۆکردنـەوە لـەنێوان ڕەسەنایەتی و هاوچەرخیبووندا ناکرێت تاکەکان پێی هەستن، بـەڵکو تـەنها لـەڕێی دامەزراوەکانەوە دەکرێت ئەم کارە تاکەکەسییانە ڕێك بخرێن و بیکـەن بـە کـارێکی بەکۆمەڵی بەردەوام، تاکو ئامانجە پەروەردەییەکانی ئوممـەت دێنـە دی. هـەروەها نموونە لەسەر ئەوە دێنێتەوە بە خودی تەوەری لێکۆڵینەوەکە خۆی ((هاوسەنگیی

[1]– پێشەکییەك بۆ کۆڕی بەرەو ڕوانینێکی داهاتوویيانە، بۆ ڕێڕەوی خوێندنی گشتیی لە جیهانی ئیسلامیدا و کۆمەڵگەکانی کەمایەتییە موسڵمانەکان، کۆماری سوودان، (صفر ١٤٢٧هـ/٢٢–٢٥ لەنیسانی ٢٠٠٦م).

لــەنێوان پێکهێنــەرەکانی کەســایەتیی خوێنــدکاردا)) و ئــەوەی چــۆن کەســایەتیی خوێندکار لە بنەما پەروەردەییە نەگۆڕەکانماندا تەنها پەیوەست نییە بە ڕەهەنـدی جەستەیی و ڕەهەنـدی عەقڵییــەوە، بــەڵکو ڕەهەنـدی ڕۆحیشــی بـۆ زیـاد دەکـات و هاوسەنگیی نێوان ئـەو پێکهێنەرانـە دەکاتـە بناغەیـەك بـۆ سـەرکەوتنی پـەروەردە لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵگە.

پاشان لێکۆڵینەوەکە ئەوە دەر دەخات کـە هـەر پێکهێنـەرێك لـەو پێکهێنەرانـە پێویستی بە توێژینــەوەی قــووڵ هەیـە، کـە دەسـتەیەکی کـار پێـی هەسـتن لـەڕێی دامەزراوەیــەکی زانســتیی پســپۆڕەوە – پێشــنیار دەکــەم دەســتەی ئیســلامیی جیهانیی بێت بۆ فێرکردن– ئەرکی ئەم توێژینەوەیە بگرنە ئەستۆ و چۆن دێتـە دی لە پەروەردەی هاوچەرخماندا؟ چۆن هاوسەنگی دروست بکرێت لەنێوانیاندا؟ چۆن ئەو کـارە لـە چوارچـێوەی ئامانجـەکانی پـەروەردەی ئیسـلامییدا ئـەنجام بـدرێت؟ چۆن ئامانجە گشتییەکانی پەروەردەی ئیسلامیی بگۆڕدرێن بۆ ئامانجی تایبەت بـە هەر قۆناغێکی خوێندن و هەر بابەتێکی خوێندن... هتد.

ئەگەر بابەتی لێکۆڵینەوەکە بەکردەیی پێویسـتیی بـە کـاری دامـەزراوەیی بێـت بـۆ بەجێگەیانــدنی بــە شــێوەیەکی ڕاســت و ورد و بەســوود، بــە هــەمان شــێوە هــەموو تــەوەرەکانی کۆڕبەندەکـە ناکرێـت کـاری تاکەکەسـیی نادامـەزراوەیی بەسـەریاندا بـاڵ بکێشێت، ئەو کارانە هەرچییەك بن، لێرەشـەوە لێکۆڵینەوەکـە بـە پێویسـتی دەزانێـت دامەزراوەیەکی پەروەردەیی ئیسلامیی جیهانیی هەبێت بۆ هەستان بەم جۆرە کۆششـە زانستییە گەورانە، چ لەسەر ئاستی تیۆریدانانی پەروەردەیی بێـت، یـان لەسـەر ئاسـتی جێبەجێکردنی پەروەردەیی و داوا دەکـات دەسـتەی ئیسـلامیی جیهـانیی بـۆ فێرکـردن ئەم بەرپرسیارێتییە بگرێتە ئەستۆ: بە پلان و جێبەجێکردن و بەدواداچوونەوە.

## پێشەكی:

بابەتی چاكسازیی خوێندن لە جیهانیی ئیسلامیی و كەمایەتییە موسڵمانەكانی دەرەوەی جیهانی ئیسلامیی، بیری زۆرێك لە پەروەریار و بیرمەندانی داگیر كردووە لەم ساڵانەی دواییدا و لەم بارەوە نووسین و گوتار و كۆنگرە و كۆڕبەند و وۆركشۆپ زۆر بووە. هەر لێكۆڵەرێك دەتوانێت ژمارەیەكی ئێجگار زۆر لەو ئەدەبیات و چالاكییە پەروەردەییانە تێبینی بكات لەسەر ئاستی ناوچەیی و نەتەوەیی و ئیسلامیی، هەموو ئەمانە هەستێكی بەهێز لای زۆرێك لە پەروەریار و بیرمەندان دەجووڵێنێت كە سیستەمی فێركاریی ئێستامان ئوممەتی تووشی بێهیوایی كردووە لە ڕێچكە ژیاریدا و لە بەنرخترین شتیدا زیانی لێ داوە، لە گەنج و عەقڵە گەنجە داهێنەرەكانیدا، وەك بڵێیت لە بەهاكانی بەرهەمداركردنی مرۆییەوە هەڵگەڕاوەتەوە بۆ كرداری داڕوخانی مرۆیی، دروێنەی زەوییەكی بێپیت هەرگیز وەك دروێنەی زەوییەكی بەپیت نابێت[١].

بۆ ئەوەی تەنها باس لە بابەت گشتییەكان نەكەین، چاوێك بە پڕۆسەی خوێندنی دراوسێ نزیك و گەورەترین دوژمنماندا بخشێنین، ئسرائیل، كە ئەم خوێندنە چۆن توانیویەتی چەندین نەوە دروست بكات، بە جۆرێك مانەوە و پەرەپێدانیان بۆ دەوڵەتە داگیركەرەكەیان دەستەبەر كردووە لە ناوەڕاستی جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیماندا، كە ئەمەش دڵنیامان دەكاتەوە لە سەركەوتوویی ئەم خوێندنە لە پەروەردەكردنی نەوەی خۆڕاگر و بەرگریكەر، لە كاتێكدا خوێندنی عەرەبی و ئیسلامیمان سەر نەكەتووە لە پەروەردەی نەوەیەكی لەو شێوەیە كە

---

١- منى أبو الفضل: نحو منهجية علمية لتدريس النظم السياسية العربية، مكتبة الشروق الدولية، القاهرة، (٢٠٠٦م)، (ص ٣٥).

ڕۆڵی خۆیان لە ژیاندا بزانن و بتوانن ئەم ڕۆڵە بەجێ بهێنن بە لێهاتوویی و بەهێزی[1].

هەرچەندە ئەم لێکۆڵینەوەیە تیشك دەخاتە سەر پێکهێنەرەکانی کەسایەتیی خوێندکار کە دەبێت سیستەمەکانی خوێندن لە جیهانیی ئیسلامیماندا ڕەچاوی بکەن، لەگەڵ جێهێشتنی ئەوەی دەمێنێت بۆ لێکۆڵینەوەکانی تر، بەڵام ئەوە ڕێ لەوە ناگرێت هەندێك تێبینیی جەوهەری لەبارەی ئەم پێکگەیشتنە زانستییەوە بخەینە ڕوو:

**یەکەم:** زۆربەی ئەو کۆنگرە و کۆڕبەند و وۆرکشۆپانەی لەم ماوانەی پێشوودا بەستراون، خاوەن مۆرکێکی ناوچەیی بوون و زۆر دەگمەنە بەرز بووبنەوە بۆ ئاستی نیشتمانی عەرەبی، چ جای ئاستی ئوممەتی ئیسلامیی، سەرەڕای ئەوە چاکسازیی پەروەردەیی دەبێت بە پلەی یەکەم ئامانجی هەستانەوەی ئوممەتی عەرەبی بێت وەك ژێرخانێکی بەهێز و پێشەنگ و پێشڕەو بۆ یەکێتیی ئوممەتی ئیسلامیی و بەبێ دانانی یەکبوونی ئوممەتی عەرەبی وەك بەشێك لە یەکبوونی ئوممەتی ئیسلامیی، ئەو کۆششانە هەموو خاڵی دەبنەوە لە ڕۆحی بزوێنەریان و جەمسەری جێگیریان، کە هەموو کۆششەکانی چاکسازی بەدەوریدا دەسووڕێنەوە. دوژمنانمان بەردەوام لە پلانی ئەوەدان ناوی ((ئوممەتی عەرەبی)) و ((ئوممەتی ئیسلامی)) بسڕنەوە و لەجێی ئەوە ناوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورە بهێننە پێشەوە، ئەم پلانەش بەشێکە لە ستراتیجیەتی ئەمنی ئەمریکی، کە کابینەی جۆرج بۆش دایان ڕشتبوو لە ئەیلولی ساڵی (٢٠٠٢ز)دا، بۆیە ئێمەش پێویستە لەسەرمان لە کاتی

---

[1]– بۆ بەراورد لە نێوان پەروەردە لە ئیسرائیل و لە نیشتمانی عەرەبیدا، بۆ نموونە بڕوانە بۆ:

ـ أنطوان زحلان، العلم والتكنولوجيا في الصراع العربي الإسرائيلي، مؤسسة الدراسات الفلسطينية، بيروت، (١٩٨١م).

ـ عارف توفيق عطاري: التربية اليهودية في فلسطين المحتلة والدياسبورا، مؤسسة الرسالة، بيروت، (١٩٧٧م).

تــاووتوێکردنی بابــەتی چاکســازی لــە پرۆســەی فێرکردنــی جیهــانیی عــەرەبی و ئیسلامیماندا بەردەوام جەخت لەسەر ناسنامەی عەرەبی و ئیسـلامیمان بکەینـەوە، هەروەها بەردەوام هەوڵی بەستنی کۆڕبەند و کۆنگرەی پەروەردەیی بـدەین لەسـەر هــەردوو ئاســتی عــەرەبی و ئیســلامیی بــۆ ئــەوەی ڕووبــەڕووی پلانــی ڕۆژهــەڵاتی ناوەڕاستی گەورە ببینــەوە بـە هــەموو ڕەهەنـدە ڕامیـاری و ئـابووری و سـەربازی و ڕۆشنبیریی و پەروەردەییەکانیەوە.[1]

**دووەم:** کاتی ئەوە هاتووە دان بەوەدا بنێین وەرگرتنی ئەزموونی ڕۆژئـاوایی لـە چاکسازیی پەروەردەییدا تەنانەت لە بەرزترین وێنەکانیشیدا بەبێ گەڕانەوە بۆ ڕەگ و ڕیشــە ڕۆشــنبیریی و پەروەردەییــە ئیســلامییەکان ناتوانێــت ئــەو چاکســازیە پەروەردەییەمان بۆ بێنێتە دی هەوڵی بۆ دەدەین، لە کاتێکدا ڕۆژئاوا بە دانپێدانانی بیرمەنـد و پــەروەردەکارەکانیان لـە قــەیرانێکی پــەروەردەیی ڕەوشـتیدان و هــەوڵ دەدەن چارەسەری بۆ بدۆزنەوە، لە دامەزراندنی ناوەندی لێکۆڵینەوە و گرێبەسـتی پیشەیی و دەسـتووری ڕەوشـتییانە، ئەوانــەش هــەوڵێکن بــەرز نابنــەوە بـۆ ئاسـتی ئەوەی ئیسلام هێناویەتی لە بنەمای ڕەوشتیی و ئامرازی زانستی بۆ بەدەستهێنانی ئەو ڕەوشتانە[2]، پاشـان مرۆڤـی ڕۆژئـاوایی ئـەو نموونەیـە نییـە کـە دەمانـەوێت بـۆ نەوەکانمان بیبینین و پێویسـتە لەسـەر پــەروەردەکاری موسـڵمان پشـت بـە بنـەما ئیسلامییە ڕاسـتەکانی ببەسـتێت لـە قورئـان و سـوننەت، لـە کێشـانی وێنـەی ئـەو کەسایەتییە ئیسلامییەی دەیەوێت پەروەردەی بکات لەڕووی زانستی و کردەییەوە.

---

[1]– عبد الـرحمن النقيـب: مشـروع الشـرق الأوسـط الكـبير، التحـدي والإسـتجابة في مـؤتمر جمعيـة التربيـة المقارنة، المنعقد بكلية التربية جامعة عين شمس، (٢١، ٢٢ كانون الثاني ٢٠٠٦م).

[2]– عبد الرحمن النقيب: أزمة القيم في المناهج التربوية على الصـعيد العـالمي وانعكاسـاتها علـى التربيـة في العالم الإسلامي، الندوة الدولية في موضـوع القـيم الإسـلامية ومنـاهج التربيـة والتعلـيم –تطـوان– المغـرب، (٢١–٢٣ تشرين الثاني ٢٠٠٥م).

**سێیەم:** سەرەڕای زۆریی ژمارەی کۆنگرە و کۆڕبەند و وۆرکشۆپەکان دەربارەی چاکسازیی خوێندن لە جیهانیی ئیسلامییدا، وەك دلۆپێك وایە لە زەریایەکدا بە بەراورد لەگەڵ پێداویستییەکانی ئوممەت و توانا و لێهاتووییەکانیدا، چونکە ئوممەتێك بیەوێت ڕابێت و بە ڕۆڵی ژیاریی چاوەڕوانکراوی خۆی هەستێت و توانا و لێهاتوویی ماددیی و مەعنەویی زۆری هەبێت، پێویستی بە خستنەباری جێبەجێکردنی ئەو کۆنگرە و کۆڕبەند و وۆرکشۆپانە هەیە، تاکو وزە و تواناکان بخاتە گەڕ لە شێوەیەکی سیستماتیك و ڕێکخراودا کە بتوانێت هەموو لایەنە کردەییەکانی چاکسازی پەروەردەیی لەخۆ بگرێت کە ئوممەت پێویستیەتی و لە قۆناغی وەرگرتن و چارەسەرەوە تێپەڕین بۆ قۆناغی پەیوەندی و ئاڵوگۆڕ، پەیوەندی بە هاوپیشە و بەرپرسەکانەوە و ئاڵوگۆڕکردنی بیرۆکەکان لەگەڵیاندا، پاشان تێپەڕین بۆ قۆناغی دەستپێشخەری و بەدواداچوون، دەستپێشخەری لە جێبەجێکردنی چاکسازی لەلایەن خۆمانەوە و بەدواداچوونیشی.

"ئێمە –پەروەردەکاران و ئەوانەی لە بواری زانستی پەروەردەییدا کار دەکەن لە دامەزراوە زانستییەکاندا– خۆمان بە گەورەترین بەرپرسیار دادەنێین لەم کەمتەرخەمییەدا، کەمتەرخەمیمان کردووە لە وەرگرتن و چارەسەردا و کەمتەرخەمیمان کردووە لە پەیوەندی و ئاڵوگۆڕکردندا و کەمتەرخەمیمان کردووە لە دەستپێشخەری و بەدواداچووندا"[١]، لە وەرگرتن و چارەسەرکردندا کەمتەرخەمیمان کردووە، لەبەر ئەوەی ڕوانینەکانمان زۆربەی جار ناوچەیی و تەسك بووە و سنووردار بووە و گشتگیر نەبووە بۆ هەموو کردارێکی پەروەردەیی بە هەموو ڕەهەند و قۆناغە جیاوازەکانیەوە، کەمتەرخەمیمان کردووە لە پەیوەندی و ئاڵوگۆڕکردندا، لەبەر ئەوەی زۆر دەگمەنە بەرهەمی جگە لە خۆمان بخوێنینەوە،

---

[١]– منى أبو الفضل: سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ٢٧).

زۆر بەدەگمەن بیرۆکە و ڕوانینەکان ئـاڵوگۆڕ دەکـەین لـەنێوان یەکتریـدا، هـەروەها کەمتەرخەمیمان کردووە لە دەستپێکردنی چاکسازی لە خۆماندا، لـەو وانانـەی کـە دەیاندەین، ئەو لێکۆڵینەوانەی ئەنجامیان دەدەین، لە بەدواداچـوونی ئـەوەدا کـە ڕوو دەدات لە جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیدا، لە هەوڵی چاکسازیی پـەروەردەیی، چ لە ئەنجامی هۆشیارییەوە هاتبن لە ناوەوە، یان لە ئەنجامی پەستانی دەرەکییەوە.

## بۆچی لێکۆڵینەوەیەکی ڕیشەیی ئە نجام دەدەین؟

بەڵێ، ئایا باشتر و بەسوودتر نەدەبوو لەڕووی زانستی و لەڕووی پەروەردەییەوە بگەڕێینـەوە بـۆ ئـەوەی کۆتـا جـار زانایـانی پـەروەردە و دەروونناسـە هاوچـەرخە ڕۆژئاواییەکان نووسیویانە دەربارەی پێکهێنەرە جیاوازەکانی کەسایەتیی خوێندکار و ئەوەی چۆن هـەوڵی دەوڵەمەنـدکردنی ئـەو پێکهێنەرانـە دەدەن لـەڕێی چـالاکیی پەروەردەیی و فێرکارییەوە، کە بـاڵی کێشـاوە تـا هـەموو دامـەزراوە پەروەردەییـە سیستماتیك و ناسیستماتیکەکان بگرێتەوە کە بەرهەمەکەی ئەم مرۆڤـە ڕۆژئاواییـە بوو بە ژیارە هاوچەرخەکەیەوە کە خۆی و ڕێزی سەپاندووە بەسەر هەموو جیهاندا، ئایا هیچ عەقڵێکی ناڕۆژئاوایی دەتوانێـت بگـات بـەوەی ئـەو زانـا ڕۆژئاواییانـە پێـی گەیشتوون لەڕێی تاقیکردنەوە و کارە زانستییە بەکۆمەڵەکانیانـەوە، کـە بـەرزترین بودجـەی لێکۆڵینـەوەی زانسـتییان بـۆ دابـین کـراوە لـە هـەموو جیهانـدا، چ جـای بانگەشـەی ئـەوە بکرێـت کـە بتـوانین بگـەین بـە باشـتر لـەوەی ئـەو زانایانـە پێـی گەیشتوون دەربارەی پێکهێنەرەکانی کەسایەتیی خوێندکار؟ ئایا دەکرێت بەرهەمی ئەم کۆششە زانستییە مەزنە ڕەت بکەینەوە و لە سەرەتاوە دەسـت پـێ بکەینـەوە بە لێکۆڵینەوەی پێکهێنەرە جیاوازەکـانی کەسـایەتیی خوێنـدکار لێکۆڵینەوەیـەکی قووڵ لە ڕەگ و ڕیشەدا؟

مەبەستمان لە ڕەگ و ڕیشە لێرەدا بنەما ڕاستەکانمانە لە قورئـان و سـوننەت و جێبەجێکردنە پەروەردەییە ڕاستەکانیان بە درێژایی سەردەمەکان[1]؟ ئایا دەکرێت سەرلەنوێ لەو بنەمایانە بکۆڵینەوە تا بزانین پێکهێنەرەکانی کەسایەتیی خوێندکار چۆنە؟ ئەو وەڵامەی لە لێکۆڵینەوەی زانستیی لەوەی هزری پەروەردەیی تا ئێستا پێی گەیشـتووە لـە لایـەك و ئـەوەی لـە لێکۆڵینـەوەی ڕەگ و ڕیشـە پەروەردەییـە ڕاستەکانمان لە قورئان و سوننەت و جێبەجێکردنەکانیان بە درێژایی سـەردەمەکان دەستمان دەکەوێت جەخت لەوە دەکاتەوە کە بنەما پەروەردەییـەکانمان ڕەچاوی ئەو ڕەهەندانـە دەکـەن کـە توێژینـەوە و لێکۆڵینـەوە پەروەردەییـە ڕۆژئاواییـەکان ڕەچاویان نەکردووە، بەڵکو تەنها ئەوە ((مرۆڤـی ئوممـەت)) و ((مرۆڤـی پـەیام)) و ((مرۆڤــی مەبەســت و ئامــانج)) پێشــکەش دەکــات نــەك تــەنها ((مرۆڤێکــی یەکڕەهەندی)).

## ئەو پێکهێنەرانەی کەسایەتیی خوێندکار کە لە جیهاندا لەسەری کۆکن:

### کۆمەڵێك پێکهێنەری کەسایەتیی خوێندکار هەیە جیاوازی لەسەر نییە:

**یەکەم: پێکهێنەری جەستەیی،** کە گرنگیی بە دەستەبەرکردنی چاودێریی تەواو دەدات بـە تەندروسـتی و توانـای جەسـتەیی خوێنـدکار لـە قۆناغـە جیاوازەکـانی تەمەنیـدا، ڕێکخسـتنی ئـەوەی پەیوەنـدیی پێـوە هەیـە لـە خـۆراك و وەرزشـی جەسـتەیی و چـاودێریی تەندروسـتی و ڕاهێنـانی گونجـاو بـۆ هـەموو تەمەنـەکان و

---

[1]– لە لێکۆڵینەوە جددییەکان لەم بوارەدا:

- عمـر التـومي الشـيباني: مفهـوم الإنسـان في الفكـر الإسـلامي، الـدار الجماهيريـة للنشـر، ليبيـا، (١٩٨٧م).
- محروس سيد مرسي: التربية والطبيعة الإنسانية في الفكر الإسلامي وبعض الفلسفات الغربية، دار المعارف، القاهرة، (١٩٨٨م).

دانانی ئاستی دیاریکراو، که دەبێت خوێندکار پێی بگات له هەر ساڵێك له ساڵەکانی ژیانی خوێندنیدا لەڕووی جەستەیی و تەندروستییەوە.

ئەگەر پەروەردەی نوێ گرنگییەکی زۆر گەورە بدات بەم ڕەهەندە لەبەر ئامانجی دنیایی ڕووت، ئەوا بنەما پەروەردەییەکانمان له قورئان و سوننەت گرنگیی زیاتری پێ دەدات لەپێناو ئامانجی بەرزتردا، لەبەر ئەوەی ئیسلام وەك جێنشینی خودا بۆ تاکی موسڵمان دەڕوانێت له زەویدا، بۆیەش داوای زۆر ڕاسپاردە و کاری لێ دەکات لەپێناو ئاوەدانکردنەوەی گەردوون و جیهاندا لەپێناو خودا و هەستان به ئەرکە ئیسلامییە زۆرەکانی له نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج... هتد.

گومانی تێدا نییە هەموو ئەوانە پێویستییان بە توانای جەستە و تەندروستی هەیە، بۆیە ڕێنماییەکانی ئیسلام هانی هەموو ئەوانە دەدات و بانگەشەی بۆ دەکات. پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر) دەفەرموێت ((المؤمن القوي خير وأحب إلى الله من المؤمن الضعيف)) و خودای گەورە له کتێبە پیرۆزەکەیدا زیاد لە بۆنەیەکدا باسی چاکەی پیاوی بەهێز دەکات، هەر وەکو دەفەرموێت: ﴿مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ﴾{الفتح:٢٩} واتە: ((محەمەد ڕەوانەکراوی خودایە، ئەوانەش که له خزمەتیدان توندوتیژن بەرامبەر بێباوەڕان و بەبەزەیی و میهرەبانن لەنێو خۆیاندا)). هەروەها دەفەرموێت: ﴿قَالَ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ﴾{البقرة:٢٤٧} واتە: ((گوتی بەڕاستی خودا ئەوی هەڵبژاردووە بەسەر ئێوەدا و بەشی زیاتری داوەتێ له فراوانیی زانین و توانایی جەستە)). هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَاأَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ﴾{القصص: ٢٦}، واتە: ((بابەگیان بەکرێی بگرە (بۆ شوانی)، باشترین کەسێك که تۆ بەکرێی بگریت کەسی بەهێز و ئەمین و دەست و داوێن پاکە)). پێغەمبەری خوداش (دروودی خوای لەسەر) بە هاوەڵانی دەگوت: ((علموا أولادكم

الرماية ومروهم فاليثبوا على الخيل وثبًا)) واتـه: (منداڵـەکانتان فێـری تیرهاوێشـتن بکەن و ڕایان بهێنن لەسەر ئەسپسواری). و دەیفەرموو: ((حق الولد علـى الوالـد أن يعلمه الكتابة والسباحة والرماية)) واته: (مافی منداڵە لەسـەر بـاوك فێـری نووسـین و مەلە و تیرهاوێشتنی بکات). هەروەها عائیشە (ڕەزای خوای لەسـەر) دەگێڕێتـەوە: ((پێغەمبەری خودا پێشبڕکێی لەگەڵدا کرد و ئەم لاواز بـوو و لێـی بـردەوە، پاشـان ساڵ هات و ڕۆیشت و ئەم قەڵەوتر بووبوو، کە پێشبڕکێیان کـرد پێغەمبـەری خـودا لێی بردەوە و جاری پێشووی بیر هێنایەوە و فەرمووی: ئەمە بەرامبەر ئەو جارە)). ئەگەر لەپاڵ ئەوەدا باس لە بەجێهێنانی فەرزی حەج بکەین کە چ ڕاهێنانێکە لەسەر کاری سەخت و لەیادمان بێت کە یەکێکە لە ڕوکنەکانی ئیسلام: ﴿وَأَذِّنْ فِـي النَّـاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَـالاً وَعَلَـى كُلِّ ضَـامِرٍ يَـأْتِينَ مِـنْ كُلِّ فَـجٍّ عَمِيـقٍ﴾{الحج:٢٧} واتـە: ((بانگی خەڵکی بکە و جاڕ بدە لەناویاندا با بێن بۆ حەج، ئـەوانیش بـە پیـادە دێـن بەدەم بانگەوازەکەتەوە، یان بە سواری (ئەو وشترانەی کە دووریـی ماوەکـە لاوازی کردوون) و لە هەموو ڕێگەیەکی دوورەوە هەر دێـن)). وە ئـەوەی جیهـاد لـەپێناوی خودادا لەخۆی دەگرێت لـە ڕاهێنـانی جەسـتەیی و سـەربازیی جیـاواز، کـە ئیسـلام فەرمانی پێ دەکات و بانگەوازی بۆ دەکات وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّـهِ وَعَـدُوَّكُمْ﴾{الأنفال:٦٠} واتە: ((هەرچی لە تواناتاندا هەیە بـۆ بـەهێزکردنی سـوپای ئیسـلام بیخەنـە گـەڕ و ئامـادەیی بکـە و لـە ئامـادەکردنی هـەموو جـۆرە ئەسـپێك، تـا دوژمنـانی خـودا و دوژمنانی خۆتانی پێ چاوترسێن بکـەن)). یـان کـە دەفـەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِـيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَـابِرُونَ يَغْلِبُـوا مِـائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُـنْ مِنْكُمْ مِئَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفًا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَ يَفْقَهُونَ﴾ {الأنفال:٦٥} واتە: ((ئەی پێغەمبەر: هانی ئیمانداران بدە لەسەر جەنگ، ئەگەر بیست کەسی خـۆڕاگر هـەبێت

له ئێوه، ئەوا زاڵ دەبن بەسەر دوو سەد کەسدا، خۆ ئەگەر سەد کەس لە ئێوە هەبن، ئەوا بەسەر هەزار کەس لەوانەی کە بێباوەڕن زاڵ دەبن، چونکە بەڕاستی ئەوانە کەسانێکن کە تێناگەن)). بۆمان دەر دەکەوێت کە ئیسلام چەندە گرنگیی بە توانای جەستەیی داوە.

پاشان پێنج نوێژی ڕۆژانە –جگە لە نوێژە سوننەتەکان– کە چەند جۆر وەرزش و مەشق لەخۆ دەگرێت بۆ هەموو تەمەنەکان دەگونجێت بە گەورە و منداڵەوە و ئەنجامدانیان هیچی تێناچێت و دەکرێت لە کاتێکی کەمدا لە هەر شوێن و ساتێکدا ئەنجام بدرێن، وەك ڕاهێنانێکی گشتگیر وایە بۆ پەل و ماسوولکە و ئەندامە جیاوازەکانی جەستە[1].

باش وایە کۆتایی بە قسەکانمان بێنین لەسەر نوێژ، بەوەی نووسەری کتێبی ((الصلاة صحة ووقاية وعلاج)) باسی کردووە، دوای ئەوەی بەراوردی کردووە بە مەشقی وەرزشی تری وەك یۆگا و سۆریاناما سکار (کە جۆرێکی پێشکەوتووە لە یۆگا) و ئەوەی چۆن لە هەموو ئەمانە جیاوازە، بەوەی نەك تەنها توانای جەستەیی زیاد دەکات، بەڵکو ئاستی ڕۆحی و عەقڵییش بەرز دەکاتەوە کە دەڵێت: ((جووڵەکانی نوێژ ڕێکوپێکتر و سووکترن و هەموو لایەنە پێویستەکانیش پڕ دەکەنەوە کە لە پێشکەوتووترین مەشقە وەرزشییەکاندا هەن کە تا ئێستا زانست پێی گەیشتووە چ جای ئەو لایەنە تایبەتانەی کە تەنها لە نوێژدا هەن لە ڕوکن و مەرجەکان و خوێندنی فاتیحە لە هەموو ڕکاتێکدا و پاشان خوێندنی ئایەتی تر لە چەند ڕکاتێکی دیاریکراودا)).[2]

---

[1]– أحمد شوقي الفنجري: الطب الوقائي في الإسلام، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، (١٩٨٠م)، (ص ٧٣، ٧٨).

[2]– محمد زكي سويدان: الصلاة صحة ووقاية وعلاج، مطابع شركة الإعلانات الأهلية، القاهرة، (١٩٧٦م)،

ئەگەر بمانەوێت هەموو دەقەكان بێنین لە قورئـان و فـەرموودەی صـەحیح، كـە باسیان لە گرنگیی ڕەهەندی جەستەییی كـردووە لـە كەسـايەتيی موسـڵماندا، ئـەوا بابەتەكـە زۆر درێـژە دەكێشـێت، خـۆراكی حـەڵاڵ و حـەرام و یاسـاكانی خـواردنی تەندروست، پاكوخاوێنیی جەستە و ژینگە، خۆپاراستن لە نەخۆشییە گوازراوەكان، یاسـاكانی تەندروسـتیی سێكسـی و هـی تـریش، كـە وا دەكـات پـەروەردەكاری هاوچەرخ ناچار بێت لە هێنانی ئەو ڕەگ و ڕیشـە ئیسـلامییە بـۆ ئـەم پێكهێنـەرەی كەسایەتیی خوێندكاری موسڵمان و پێداگر بن لەسەر گەیشتن بەوەی خودای گەورە دەیەوێت لە توانای جەستە، بە پشتبەستن بەوەی زانستەكانی سەردەم كۆتا جـار پێـی گەیشـتوون لـە بـواری پـەروەردەی جەسـتەیی و پـەروەردەی تەندروسـتیی خوێنداكاری موسڵماندا[1].

ئەوەی خوێندكاران دەیچێژن لە نەبوونی ئامادەیی جەستەیی و تەندروسـتی لـە جیهانیی ئیسلامیدا، زۆربـەی جار دەسـتكورتییان بـۆ بـڕی پێویسـت لـە خـۆراكی تەندروست و پاكوخاوێنیی جەستە و ژینگە و پارێزراوی لە نەخۆشییەكان، بێگومان ئاستەنگێكی پەروەردەییە كە هەر دەبێت لەم كۆنگرەیەدا ڕووبەڕووی ببینەوە و بیر لە هۆكارەكانی بكەینەوە و چۆن زاڵ بین بەسەر ئەو هۆكارانەدا. ئەوەش پێویسـتی بـە توێژینەوەیـەكی قـووڵ هەیـە بـۆ پێـدانی وێنەیـەكی تـەواو ورد لـە دۆخـی خوێنـدكارانمان لـە جیهـانیی عـەرەبی و ئیسـلامیدا و پشـكیان لـە پـەروەردەی جەستەیی و تەندروستی، لە كاتێكدا هیچ ئوممەتێك ناتوانێت بەبێ پەروەردەیـەكی

(ص ٢٠٦، ٢٠٧).

[1]– عبد الرحمن النقيب: ((دور الإسلام وتعاليمه في التخطيط للتربية الصحية في مدارس العالم الإسـلامي))، في: عبد الرحمن النقيب: بحوث في التربية الإسلامية، الكتاب الثاني، دار الفكر العربـي، القـاهرة، (١٩٨٤م)، (ص ٩٩، ١٢٦).

جەستەیی و تەندروستی ئاستبەرزی ڕاست و دروست ڕابێت. ئەمەش کارێکە یەك لێکۆڵینەوە لە کاتێکی کەمدا ناتوانێت پێی هەستێت، بەڵکو بەرپرسیارێتیی کارێکی بەکۆمەڵە، کە پێشنیار دەکەم دەستەی ئیسلامیی جیهانیی بۆ فێرکردن بە هاوکاری لەگەڵ لایەنی تر کە بایەخ بە هەستانەوەی ئوممەتی ئیسلامیی دەدەن پێی هەستن.

**دووەم پێکهێنەر لە پێکهێنەرەکانی کەسایەتیی خوێندکار، کە جیهان لەسەری کۆکە، ئەویش پێکهێنەری عەقڵییە:** ئەمیش پێکهێنەرێکە پەروەردەی ڕۆژئاوایی نوێ تا کۆتا سنوور گرنگیی پێ داوە، تەنانەت لە ئەمریکا ساڵی (٢٠٠٢ز) یاسای (No Child Behind) دەر چوو، کە دەڵێت: نابێت هیچ منداڵێك بێبەش بێت لە خوێندنێکی باش. پەروەردەی عەقڵیی پایەیەکی زۆر بەرزی هەیە لە پەروەردەی فێرکردنی ڕۆژئاواییدا، بەتایبەت کە شارستانیەتی ڕۆژئاوایی شارستانیەتێکی زانستیی عەقڵییە بە پلەی یەك، بەتایبەت کە دەستبەرداری باوەڕەکەی (ئایینی مەسیحیی) بووە لەبەر هەندێك هۆکاری مێژوویی و بابەتیانەی تایبەت بە خۆی، کە دەگەڕێتەوە بۆ هەڵوێستی کڵێسە لە زانست و زانایان و دژیەکیی هەندێك لە دەقەکان لەگەڵ ڕاستییە زانستییەکاندا، لەپاڵ دەستێوەردانی مرۆیی لە داڕشتنی ئەو دەقانەدا، بە گۆڕینی و دەستکاریکردن[1]، چ جای ئەوەی جیاوازیی ئایینی بووەتە هۆکاری جەنگ و خوێنڕێژی بە درێژایی مێژووی ئەوروپی.

توێژەر سەرسامبوونی زۆری خۆی بەو لێکۆڵینەوە زۆر و قووڵانە دەر دەبڕێت

---

[1]– لەوەدا بڕوانە:

– موريس بوكاي: دراسة الكتب المقدسة في ضوء المعارف الحديثة، دار المعارف، القاهرة، (١٩٧٨م).

– محمد محمد أمزيان: منهج البحث الإجتماعي بين الوضعية والمعيارية، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، هيرندن، فيرجينيا، الولايات المتحدة الأمريكية، (١٩٨١م)، (ص ٢٩–٧٦).

دەربارەی عـەقڵی مرۆیـی و پێکهـاتنی بـە درێـژایی قۆناغـە جیاوازەکـانی تەمـەن و پێویســتییەکانی ئــەم پێکهاتنــە و توانــا عەقڵییــە جیاوازەکــان و چــۆنیەتیی دەوڵەمەنـدکردنیان، ئـەو لێکۆڵینەوانـە مـۆرکی گرووپیـان بەسـەردا زاڵـە، نـەك لێکۆڵینـەوەی تـاك، بـەردەوامبوون بـۆ چـەندین سـاڵی زۆر نـەك کـارێکی خێـرا، پشتبەستن بە واقعی فێرکاریی خوێندکار، نەك لێکۆڵینەوەی دابڕاو لە پەرەسەندنی کرداری فێرکاری لەسەر ئەرزی واقـع، هـەموو ئەمانـە بـەرز دەنـرخێنین و تـا کۆتـا سنوور سوودلێوەرگرتنیان بە پێویست دەزانین. بەڵام کە ئەم کارە دەکەین دەبێت زۆر ئاگاداری دوو شت بین:

**یەکەم:** ئەوەی هـیچ ئایینێـك لـە ئایینـەکان، یـان بانگـەوازێك لـە بانگـەوازەکان ئەوەنــدە گرنگیــی بــە پــەروەردەی عــەقڵیی نــەداوە کــە بنــەما پەروەردەییــە ڕاسـتەکانمان لـە قورئـان وسـوننەت پێیـان داوە، چـونکە قورئـان و فـەرموودەی صەحیح بانگەشەیان بۆ بەدواداچوونی زانست کردووە و زۆر باسی چاکەی زانستیان کردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَـتٍ﴾{المجادلة:١١} واتە: ((خودا ئەوانـەی باوەڕیـان هێنـاوە لـە ئێـوە و ئەوانـەی زانستیان پێ بەخشراوە چەندین پلە بەرز دەکاتەوە)). هەروەها دەفەرموێت: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ﴾{الزمر:٩} واتـە: ((بڵـێ ئایـا ئەوانـەی دەزانـن و شـارەزان وەك ئەوانـەن کـە نـازانن و شـارەزاییان نییـە؟)) هـەروەها کـە دەفەرموێت: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾{الأنبياء: ٧} واتـە: ((دەی بپرسن لە خاوەن کتێبەکانی پێشوو ئەگەر ئێوە ئەم ڕاستییانە نـازانن)). هـەروەها پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: ((من سلك طريقا يلتمس فيه علمًا سلك الله به طريقًا إلى الجنة)) واتە: (هەرکەسێك ڕێگایـەك بگرێتـە بـەر لـەپێناو زانستدا، ئەوا خودا ڕێگایەکی پێ دەبڕێت بەرەو بەهەشت). و دەفەرموێت: ((طلـب

العلم فريضة على كل مسلم)) واتە: (داواكردنی زانست فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێك) وە چەندین ئایەت و فەرموودەی تر كە بانگ بۆ داواكردنی زانست دەكەن و هان دەدەن لەسەری.

قورئانی پیرۆز و فەرموودەكانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) لێوانلێون لە بانگكردن بۆ بەكارهێنانی مێشك و بیركردنەوە لە دیاردەكانی گەردوون و پاڵنان بۆ تێرامان لە نیشانە جیاوازەكانی خودا و بەڵگە زۆرەكانی (ڕوەك و ئاژەڵ و مرۆڤ و سروشت... هتد). سەركۆنەكردنی نەزانان و بێئاگایان و گاڵتەكردن بەوانەی نازانن و بیر ناكەنەوە. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ﴾{العنكبوت: ٢٠} واتە: ((پێیان بڵێ: با بگەڕێن بە زەویدا و تەماشا بكەن و سەرنج بدەن چۆن ئەو زاتە دروستكراوانی بەدی هێناوە)). هەروەها دەفەرموێت: ﴿قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾{یونس: ١٠١} واتە: ((پێیان بڵێ: تەماشا بكەن و سەرنج بدەن خودا چیی دروست كردووە لە ئاسمانەكان و زەویدا)). هەروەها دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ (٢٧) وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾{فاطر: ٢٧، ٢٨} واتە: ((ئایا سەرنجت نەداوە كە بەڕاستی خودا لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، جا ئێمە بەو بارانە جۆرەها بەروبوومی ڕەنگجیاوازمان دەر هێنا، هەروەها هەندێك لە كەژ و كێوەكانمان بە زنجیرە كێشاوە، هەیانە چین و هێڵ و نەخشی سپی و سوورە و ئەوانیش ڕەنگیان جیاوازە، هەشیانە ڕەشێكی تاریك و تۆخە و لە ئادەمی و زیندەوەر و ئاژەڵ و ماڵاتیشدا ڕەنگی جۆراوجۆر هەیە بە وێنەی جیاوازی میوەهات، بە ڕاستی لەناو بەندەكانی خودادا تەنیا زانایان وەك پێویست لە خودا دەترسن، بێگومان خودا زۆر باڵادەست و زۆریش لێبوردەیە)).

نموونەی ئەم ئایەتانە و زۆری تریش عەقڵی موسڵمان بانگ دەکەن بۆ تێڕامان و ڕوانین لە دیاردەکانی سروشت و بواری گەردوون و تێڕامان لە نهێنییەکانی و قووڵبوونەوە لە تێگەیشتنیاندا.

ئایەتی تریش هەن دژ بە بەکارهێنانی گومانن لە بیرکردنەوەدا و هانی موسڵمان دەدەن بیریان لەسەر بناغەیەکی بەهێز لە ڕاستیی ڕوون بنیات بنێن. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا مَا هِيَ إِلاَّ حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلاَّ الدَّهْرُ وَمَا لَهُمْ بِذَلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلاَّ يَظُنُّونَ﴾{الجاثية: ٢٤} واتە: ((خودانەناسان دەیانگوت: ژیان تەنها ئەم ژیانی دنیایەیە، دەمرین و دەژین و جگە لە ڕۆژگار هیچ شتێ لەناومان نابات، جا ئەوانە وەنەبێت لەسەر بنچینەی هیچ جۆرە زانست و زانیارییەك ئەوە بڵێن، بەڵکو تەنها پشت بە گومان و دوودڵی دەبەستن)). هەروەها خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلاَّ ظَنًّا إِنَّ الظَّنَّ لاَ يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ﴾{یونس: ٣٦} واتە: ((زۆربەیان شوێنی هیچ شتێك ناکەون تەنها گومان نەبێت، بەڕاستی گومانیش هیچ سوودێك بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت لەبارەی حەق و ڕاستییەوە، بەڕاستی خودا زانایە بە هەموو ئەو کار و کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن)). ئایەتی تر هەن هەردەم سەرنج ڕادەکێشن بۆ بەڵگەی عەقڵیی و ڕێگری دەکەن لە شوێنکەوتنی کوێرانە بۆ پێشینەکان بەبێ گەڕان و ڕوانین هەر وەکو دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنْزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ شَيْئًا وَلاَ يَهْتَدُونَ﴾{البقرة: ١٧٠} واتە: ((کاتێك پێیان بووترێت شوێن ئەو قورئانە بکەون کە خودا ناردوویەتیە خوارەوە، دەڵێن: نەخێر بەڵکو شوێن ئەوە دەکەوین کە باو و باپیرانمان لەسەری بوون، ئایا ئەگەر باو و باپیرانیشیان هیچتێنەگەیشتوو و گومڕابن و ڕێنماییش وەر نەگرن)). دەفەرموێت: ﴿بَلْ قَالُوا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِمْ مُهْتَدُونَ

(٢٢) وَكَذَلِكَ مَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِنْ نَذِيرٍ إِلاَّ قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِمْ مُقْتَدُونَ (٢٣) قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكُمْ بِأَهْدَى مِمَّا وَجَدْتُمْ عَلَيْهِ آبَاءَكُمْ قَالُوا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُمْ بِهِ كَافِرُونَ (٢٤) فَانْتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾{الزخرف: ٢٢-٢٥} واتە: ((ئەوانە هیچی وا نییە، بەڵكو دەیانگوت: بەڕاستی ئێمە باو و باپیرانمان لەسەر ئایینێك دیوە و بێگومان ئێمەش پەیڕەوی ڕێبازی ئەوانین. هەروەها پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێكمان نەناردووە بۆ هیچ شارێك كە خۆشگوزەرانەكانیان نەیانوتبێت: بەڕاستی ئێمە باو و باپیرانی خۆمان لەسەر ئایینێك دیوە، بێگومان ئێمەش لەسەر ئاینی ئەوان دەڕۆین. پێغەمبەرەكەش گوتی: باشە... ئەگەر لە ئایین و ڕێبازی باو و باپیرانتان چاكتریشم بۆ هێنان هەر شوێنیان دەكەون؟ لە وەڵامدا گوتیان: بێگومان ئێمە بێباوەڕین بەو ئایینەی بە ئێوەدا نێردراوە. جا ئێمەش تۆڵەمان لێ سەندن، جا سەیركە و ببینە سەرئەنجامی ئەوانەی بڕوایان بە پەیامی پێغەمبەران نەكرد چۆن بوو)).

جا بابەتەكە درێژەی دەبێت ئەگەر هەموو ئەو ئایەت و فەرموودانە بهێنین كە بانگ بۆ تێڕامان و بەكارهێنانی عەقڵ و چاوكراوەیی و بەكارهێنانی هەستەوەرەكان لە بیستن و بینین... هتد دەكەن و بەكارهێنانی عەقڵ بۆ گەیشتن بە هۆكارەكان، هەروەها پاڵنەری سەرەكی كە هانی عەقڵی مسوڵمان دەدات بریتییە لەو ئایەت و فەرموودانەی هانی داواكردنی زانست دەدەن و بانگ دەكەن بۆ تێگەیشتن لە سوننەتەكانی خودا و نیشانەكانی[١]، دەرچوون بەرەو بوارە جیاوازەكانی زانست و

[١]- سەبارەت بەو ئایەت و فەرموودانەی لە باسی زانست و داواكردنیدا هاتوون، بۆ نموونە:

- ابن جماعة: تذكرة السامع والمتعلم في أدب العالم والمتعلم، حيدر آباد الدكن، (١٣٥٣هـ).
- الغزالي: إحياء علوم الدين، (ج١)، دار إحياء الكتب العربية، القاهرة (١٩٧٦م).
- طاش كبرى زاده: مفتاح السعادة ومصباح السيادة لطاش كبرى زاده، (ج١)، دار الكتب الحديثة، القاهرة، (١٩٧٦م).

مەعریفە، کە لێیانەوە وەر دەگیرێن و یاسای توێژینەوەی زانستییان بۆ دادەنێت و بەرزی دەکاتەوە، بە جۆرێك ماوەیەکی زۆر تێنەپەڕی تا عـەقڵی موسـڵمان بنـەمای گشتیی ناسراوی بۆ توێژینەوە لە هەموو بوارەکانـدا دانـا. ئـەوەتا میتـۆد هەیـە بـۆ توێژینەوەی زانستە زمانەوانییەکان لە نەحو و صرف و ڕەوانبێژی و ڕاڤـە، پاشـان دەستەواژەکانی زانستی فەرموودە، هـی تـریش بـۆ دانـانی فەرهەنگـەکانی زمـان و زانیارینامە و بۆ زانستە سروشتی و گەردوونییەکان... هتد[1]، ئەم گەڕانە زانسـتییە بەردەوامە لـە ڕاسـتییە زانسـتیەکان لـە هـەموو زانسـتە تیـۆری و کردەییەکانـدا – هاوشانی یەك– کەلەپوورێکی زانستیی چڕوپڕی هێنایە بەرهەم.

**دووەم:** عەقڵی موسـڵمان هـەوڵی دەستخسـتنی زانسـت دەدات بـە هاوڕێیـەتیی بنەما ئیسلامییە ڕاستەکان لە قورئان و سوننەت و بـە هـیچ شـێوەیەك لـەو دەقانـە دوور نەکەوتووەتـەوە لـە هـەر بـوار و پسـپۆڕیەك بووبێـت، چ زانسـتی مرۆیـی یـان گەردوونی یان شەرعی بن، سرووش چەندین دەرگـای لەبـەردەم عـەقڵی موسـڵماندا کــردەوە لـــە زانســـت و مەعریفـــە، نـــەك تـــەنها لـــە بـــواری زانســـتە شـــەرعی و زمانەوانییەکانــدا، بــەڵکو درێــژ بوویــەوە بــۆ زانســتەکانی پزیشــکی و جــەدەل و ڕوخسارناسـی و ئەنـدازیاری و جـەبر و هاوکێشـەزانی و ئەستێرەناسـی و ... هتـد. لەدەوری قورئان زانستەکانی (النحو) و ڕەوانبێـژی و تەفسـیر و بنـەماکانی ئـایین و مێژوو و چیرۆك و ئامۆژگاریی پزیشکی و ئەندازیاری دەر کەوتن.[2]

---

[1]– سەبارەت بە بیرۆکەی مەنهەجە توێژینەوەییەکان لای موسڵمانان بگەڕێرەوە بۆ:

– غزي حسن عناية: مناهج البحث، مؤسسة شباب جامعة الاسكندرية (١٩٨٤م).

– جلال محمد عبد الحميد موسى: منهج البحث العلمي عند العرب في مجال العلوم الطبيعية والكونية، دار الكتاب اللبناني، بيروت، (١٩٨٢م).

– عبداللطيف محمد العبد: مناهج البحث العلمي، النهضة المصرية، القاهرة، (١٩٧٩م).

[2]– بـۆ ڕوونکردنـەوەی ئـەوە بگـەڕێرەوە بـۆ: طـاش کـبری زادە: مفتـاح السـعادة ومصـباح السـيادة،

سرووش بابەتی سەرەکیی هەموو زانستەکانە، بەڵکو ژیاریی ئیسلامیی هەمووی هەوڵێکە بۆ خستنەڕووی هزری و میتۆدی ئەم سرووشە، ئەمەش لە خودی پێکهاتەی زانستەکاندا دەر دەکەوێت. زانستی ئوسولیی فیقه بەو سرووشە دەست پێ دەکات کە لە قورئان و سووننەتدا هەیە وەك بناغەیەك بۆ ئەو هەستە مێژووییەی کە بە ڕۆڵی خۆی هەڵدەستێت لە نەقلکردندا لەڕێی میتۆدەکانی ڕیوایەت و تەواتور و ئاحاد. زانستی (کەلام)یش بە سرووش دەست پێ دەکات بە شیکردنەوەی ئایەت و فەرموودەکانی بۆ دروستکردنی وێنایەك بۆ زاتی خودا و سیفەت و کارەکانی. سۆفیگەرییش بە سرووش دەست پێ دەکات بە نواندنی ئەمر و نەهییەکانی لە ڕەفتاردا. فەلسەفەش بە سرووش و تێگەیشتن لێی دەست پێ دەکات، بە جۆرێك لە ڕێیەوە بتوانرێت هەموو ژینگە کەلتوورییە جیاوازەکان بگرێتە خۆ.[1]

زانستە سروشتییەکانی فیزیا و کیمیا و فەلەك و زیندەزانیی و بیرکارییەکان بە هەمان شێوە بە سرووش دەست پێ دەکەن، چونکە هەوڵێکن بۆ تێگەیشتن لە یاسا خوداییەکان بە مرۆڤ و گەردوون و ژیانەوە و شیکردنەوەی ئەو یاسایانەن بە شێوەیەك کە بتوانرێت لە بەرژەوەندیی مرۆڤدا بەکار بهێنرێن. ئەمە هۆکاری ئەوەیە کە دەبینین زانایەکی وەکو ئەبو حەسەن لە مزگەوتدا دانیشتووە خەریکی خوێندنی فەلەکە لە ((المجسطي))دا و کۆمەڵێك لە زانایان دێن بەسەریدا و یەکیان لێی دەپرسێت: چی دەخوێنیت؟ ئەویش گوتی خەریکی ڕاڤەکردنی ئایەتێکم لە ئایەتەکانی خودا، زاناکەش گوتی: کام ئایەت؟ ئەنبارییش گوتی: ﴿أَفَلَمْ يَنْظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا﴾{ق: ٦} واتە: ((ئایا ورد نەبوونەتەوە لەو ئاسمانەی کە

---

سەرچاوەیەکی پێشوو، (٢/٥٣٠-٥٣٧).

[1]- حسن حنفي: التراث والتجديد، المركز العربي للبحث والنشر، القاهرة، (١٩٨١م)، (ص ١٧٤-١٩٢).

بـه ڕاسـەریانەوەیە: چـۆنمان دروسـت کـردووە)). جـا مـن ڕاڤـەی چـۆنیەتیی بیناکردنەکەی دەکەم[1]. هەمان واتـا لەلایـەن زانایـەکی تـر دەدۆزینـەوە کـە هـەمان پرسیاری لێ کرا، ئەویش لە وەڵامدا گـوتی: خـەریکی شـیکردنەوەی ئـەم ئایەتـەم: ﴿أَفَلاَ يَنْظُرُونَ إِلَـى الْإِبِـلِ كَيْـفَ خُلِقَـتْ (١٧) وَإِلَـى السَّـمَاءِ كَيْـفَ رُفِعَـتْ (١٨) وَإِلَـى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ (١٩) وَإِلَـى الْـأَرْضِ كَيْـفَ سُـطِحَتْ﴾{الغاشية: ١٧-٢٠} (١) واتـە: ((ئایا ناڕوانن بۆ وشتر چۆن بەدی هێنراوە و بـۆ ئاسمـان چـۆن بـەرز کراوەتـەوە و چیاکان چۆن داکوتراون و بۆ زەویی چۆن تەخت کراوە)).[2]

یەکێك لە لێکۆڵەرەکان ئامارێکی کرد بۆ ئەو ئایەتانەی لە قورئانـدا هـاتوون کـە باس لە زانستە سروشتییەکان دەکەن، بۆی دەر کەوت نزیکـەی دە-یـەکی قورئـان پێك دەهێنن. کە لە کۆی (٦٢٥٧) ئایەت لە قورئاندا (دیسان تەئکید بکرێتـەوە لـە ژمارەی ئایەتەکانی قورئان و لەگەڵ ئەو برگەیەی پێشتر یـەك بخرێـت کـە بـاس لـە هەمان بابەت دەکات) بینیی (٦٢٠) ئایـەت بـاس لـە بابەتـە زانسـتییە جیاوازەکـان دەکەن کە بەم شێوەیە دابەش بـوون: بیرکـاری (٦١)، فیزیـا (٦٤)، گەردیلـە (٥)، کیمیا (٩)، ڕێژەیی (٦٢)، فەلەك (١٠٠)، زیندەزانی (٢٦)، جوگرافیای گشتی (٧٣)، زانسـتی ڕەچـەڵەکە مرۆییـەکان (١٠)، چـینەکانی زەوی (٢٠)، گـەردوون و مێـژووی ڕووداوە گەردوونییەکان (٣٦)، باسی زانست و زانایان و هاندان لەسەر زانستدۆستی (٦٤).[3]

ئەم دەقانە عەقڵی موسڵمانیان جووڵاند بـۆ دەسـتدانە ئـەو بـوارە زانسـتییانە و

---

[1]- ظهير الدين البيهقي: تاريخ حكماء الإسلام، تحقيق محمد كرد علي، مطبعة الترقي بدمشـق، (١٩٤٦م)، (ص ١٠٣، ١٠٤).

[2]- يوسف مروة: العلوم الطبيعية في القرآن، منشورات مروة العلمية، بيروت (١٩٨٦م)، (ص ٧١).

[3]- هەمان سەرچاوەی پێشوو، (لا ١٦٠).

گەڕان بەدوای حیکمەتی خودا لەو بوارانەدا و پەنـد لـە سیسـتمی گـەردوون و یاسـا ئەزەلییەکانیان وەر بگرێت، یەکێك لە زانا هاوچەرخەکان بە دەستەواژەیەکی جوان بۆچـوون لـەم راسـتییە دەکـات، کـە دەڵێـت: "هـەر جارێـك لـە یـەکێك لـەم یاسـا زانستییانە تێدەگەم باوەڕم بە توانا و مەزنیی و دانایی و هێزی خودا زیاتر دەبێت، چـونکە ئـەوەی ئـەم یاسـا فیزیـایی و کیمیـایی و گەردوونناسـی و زینـدەزانی و بیرکارییانەی داناوە مرۆڤ نییـە. ئـەوەی زانایـان کردوویانـە تـەنها لادانـی پەردەیـە لەسەر ئەم یاسا خوداییانە و هەوڵی تێگەیشتن لێیان و شیکردنەوە و بەکارهێنانیانە و ئـەم یاسـایانە هـەر هـەن مـرۆڤ هـەبێت یـان نـەبێت، لـەپێش درووسـتکردنی گەردوونـەوە هـەن، لێـرەوە تێدەگـەم کـە یاسـاکانی سروشـت وتـەی خـودان و سیستمەکانی ئەون لە بـەڕێوەبردنی گەردوونـدا لـە سـەرەتای بەدیهێنانـەوە و هـەر یاسایەك کەوا ئاشکرای دەکەین و لێی دەکۆڵینـەوە و لێـی تێدەگـەین، بەڵگەیـەکی پڕشنگدارە لەسەر بوون و مەزنی و دانایی و توانای خودای گەورە))[١].

پەرتووکەکانی پۆلێنکردنی زانستە ئیسـلامییەکان ئـەم زانسـتانەمان لـە وێنـەی درەختێکی فرە لق و چڵدا پێ نیشان دەدەن، کە هەمووی زانیاریی مرۆڤ دەربارەی خودا زیاد دەکەن و لە  خودای نزیك دەکەنـەوە. ئـەم وێناکردنـە ئیسـلامییەش بـۆ

---

[١]– سەبارەت بەم ڕوانینە ئیسلامییە بۆ مەعریفە بڕۆرەوە سەر:

– لێکۆڵەر: ((منهج المعرفة في القرآن الكريم والسنة)) بحوث في التربية الإسلامية، الكتاب الخامس، دار الفكر العربي، القاهرة، (١٩٨٧م)، (ص ٣٧–٦٤).

- Ziiauddin Sardar: Science ،Technology and Development in the Muslim World ،Creem Helm, London, (1977), (pp. 22-25).

- Seyyad Hossein Nasr: Islamic Science, World of Islam Festival Publishing, Co. Ltd., London, (1976).

- Seyyad Hossein Nasr: An Introduction to Islamic Cosmological Doctrines, Cambridge, London, (1976).

مەعریفە زۆر بەجوانی دەتوانین ببینین بە خوێندنی بەرهەمەکانی وەك: (إحصاء العلوم للفارابي، رسائل إخوان الصفا، مفاتيح العلوم للخوارزمي، مفتاح السعادة ومصباح السيادة لطاش كبرى زاده) و بەرهەمی تریش کە بریتین لە وێنایی ئیسلامیی هەڵقولاو لە دەقە ئیسلامییەکانی وەك: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ﴾{فصلت: ٥٣} واتە: ((ئێمە لە ئاییندەدا بەڵگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بوونەوەردا و لە خودی خۆشیاندا))[١].

جیاوازییەکی بنەڕەتی هەیە لەنێوان ڕوانگەی ئیسلامیی و ڕوانگەی عەلمانیی بۆ زانست، ڕوانگەی ئیسلامیی بۆ زانست ڕوانگەیەکی یەکگرتوو و تەواوکارییە، بەڵام ڕوانگەی عەلمانیی ڕوانگەیەکی ماددییە و هەوڵی گۆشەگیرکردنی زانست دەدات لە باوەڕ و سرووش. زۆر هەڵەیە ئەگەر وا بزانین ئەم زانستە عەلمانییە وێنەی تەواو و بێخەوشی زانستە، یاخود نموونەی باڵای زانستە، بەڵکو لۆژیکیتر ئەوەیە بڵێین: بیردۆزەی ئیسلامیی بۆ زانست فراوانتر و ڕاستترە لە بیردۆزەی مرۆڤکرد، لە کاتێکدا بەرهەمی بیردۆزەی ئیسلامیی بۆ زانست زانایانێك بوون زانست و باوەڕیان بەیەکەوە کۆ کردەوە، لە کاتێکدا بەرهەمی بیردۆزەی عەلمانی بۆ زانست چەندین نەوەی بێباوەڕە لە زانایان کە زانستەکەیان لە بێباوەڕی و بەلاڕێچووندا نەیپاراستن.

بیردۆزەی ئیسلامیی بۆ زانست ژیارستانیەکی بەرهەم هێنا کە مرۆڤ و سروشتی وێران نەکرد و ژینگەی پیس نەکرد و جیهانیی نەخستە بەر هەڕەشەی وێرانی، وەك ئەوەی بیردۆزەی مرۆڤکرد کردی[٢]، لێرەدا بەرپرسیارێتیی زانا موسڵمانەکان دەر

---

[١]– بۆ سروشتی مەعریفەی عەلمانیی بڕوانە:
E.A. Bult: The metaphysical Foundation of Modern Science, Longman, New York, (1951).

[٢]– سەبارەت بە قەیرانی زانستی ماددی و مەترسییەکانی لەسەر مرۆڤ بڕوانە:

دەکەوێت لە هەموو شوێنێك، کە دووبارە بناغەی مەعریفەی مرۆیی بنیات بنێنەوە، کە تەریب بێت لەگەڵ وێنای ئیسلامیی، بە شێوەیەك کە ببێت بە ڕشتەیەکی عەقڵی و هزریی و زانستیی تەواوکار کە بەدەوری سرووشدا دەسووڕێتەوە و هەموو ئەو زانست و زانیارییانە لەخۆ دەگرێت کە مرۆڤی هاوچەرخ پێی گەیشتووە، هەموو ئەمانە لە سایەی ڕێنمونی و ڕێنیشاندانی سرووشدا.

ڕەنگە ئەوەی خوێندکارانی جیهانیی ئیسلامیمان دەیچێژن لە نەبوونی پەروەردەیەکی عەقڵیی ڕاست و دروستەوە بێت، جا چ بەپێی پێوەرە ڕۆژئاواییەکان بێت، یاخود بەپێی پێوەرە ئیسلامییەکان بێت، کە سەرجەمی جۆرەکانی زانست و مەعریفە هەژمار دەکات بە ئامرازێك بۆ گەیشتن بە خودا و ئاشکراکردنی نیشانە سەرسوڕهێنەرەکانی، ئەمەش پێویستی بە لێکۆڵینەوەی قووڵ هەیە بۆ پێدانی وێنەیەکی تەواو ورد لە دۆخی خوێندکارانمان لە جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیدا و ئەو پشکەی لە پەروەردەی عەقڵیی بەریان کەوتووە، چ لە ڕوانگەی ڕۆژئاواییەوە بێت، یاخود لە ڕوانگەی ئیسلامییەوە و چۆن دەکرێت ئوممەتەکەمان ڕاببێت بەبێ پەروەردەیەکی عەقڵی، کە ڕێنموونیی عەقڵ و ڕێنموونیی سرووش کۆ بکاتەوە، ئەمەش بەبێ دووبارەداڕشتنەوەی زانستەکان و مەعریفە بەدی نایەت، کە پێویستە بە داڕشتنەوەیەکی ئیسلامیی ڕاست هاوشێوەی پێشینە چاکەکانمان دابڕێژرێن، جارێکی تریش دەیڵێمەوە کە ئەم کارە ناتوانرێت بە توێژینەوەی یەك

---

- John D ‹Garcia: The Moral Society, A Rational Alternative to Death, Julian Press, New York, (1971).
- Ro'berto Vacca: The Coming Dark Age, Doubleday, Anchor Books, New York, (1973).
- Seyyed Hossien Nasr: Man and Nature ‹the Spiritnal Crisis of Modern Man, Amandala Books, Unwin, (1976).

کەس و لە کاتێکی کەمدا ئەنجام بدرێت، بەڵکو بەرپرسیارێتیی کارێکی بەکۆمەڵە کە من پێشنیار دەکەم دەستەی ئیسلامیی جیهانیی بۆ فێرکردن پێی هەستن بە هاوکاری لەگەڵ ئەو لایەنانەی بایەخ بە ڕابوونی ئوممەتی ئیسلامیی دەدەن.

**پێکهێنەری سێیەم لە کەسایەتیی خوێنکاری موسڵمان، بریتیە لە ڕەهەندی پەروەردەی ڕۆحیی ئیسلامی:** ئەمیش ڕەهەندێکی تایبەتە بە موسڵمان لە پەیوەندی لەگەڵ پەروەردگاریدا، کە هیچ کەسێك ناتوانێت هاوشانی بوەستێت تەنها کەسێك نەبێت کە (الله)ی وەك پەروەردگار و قورئانی وەك کتێب و پێشەوامان محمدی وەك پیغەمبەر و نێردراو قبوڵ بێت. لەڕێی ئەو پەروەردە ڕۆحییەوە خوێنکار لە پلەکانی خۆشەویستیی خودادا بەرز دەبێتەوە، خۆشەویستیی پێغەمبەری خودا، خۆشەویستیی کتێبی خودا، خۆشەویستیی موسڵمانان لە هەر جێیەك بن تاکو دەبێتە تاکی ئوممەت و تاکی بیروباوەڕ و و تاکی بانگەواز.

بەڵێ، لەوانەیە جۆری تر لە پەروەردەی ڕۆحیی هەبن لە مەسیحی و جوو و تەنانەت ئایینە نائاسمانییەکانیشدا، بەڵام هەرگیز بەو بەهێزی و پتەوی و ڕوونییەی پەروەردەی ڕۆحیی ئیسلامیی نین، کە ڕەگە پاك و جێگیر و مرۆڤایەتی و گشتییەکانی لە کتێبی خودا و سوننەتی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر) وەرگرتووە. ئەمە پەروەردەیەکی ڕۆحییە کە لەگەڵ خوێنکاردا دەست پێ دەکات لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا لە بێشکەوە بۆ گۆڕ، ئەندازەی پەیوەندی و ڕایەڵەکانی بەرز دەکاتەوە لەگەڵ پەروەردگاریدا، هەروەها لەگەڵ پێغەمبەر و هاوەڵانیەوە، لەگەڵ کتێبی پەروەردگاریدا، هەموو ئوممەتی ئیسلامیی.

پەروەردەی ڕۆحی هێزێکی پاڵنەرە کە وا لە خوێندکار دەکات لە بیروباوەڕیدا بەرز ببێتەوە و هەست بەشیرینیی پەرستشەکانی بکات و بەختەوەر بێت بە خوێندنی قورئان و چاو ببڕێتە پێکگەیشتنی لەگەڵ ((محمد (دروودی خوای لەسەر)

و هاوەڵانی)) لە کاتێکدا کە بەشداریی موسڵمانان دەکات لە هەر شوێنێك بن، لە هەموو خۆشی و ناخۆشییەکیاندا و هەست دەکات هەموو یەك ئوممەتن و پایەکانی باوەڕ پێکەوەیان دەبەستێتەوە: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ {الحجرات: ١٠} واتە: ((بەڕاستی باوەڕداران برای یەکن)) هەروەها ((المسلم للمسلم كالبنيان المرصوص يشد بعضه بعضًا)) واتە: ((موسڵمان بۆ موسڵمان وەك بینای لەسەریەکهەڵچنراو وایە، هەر بەشێکی ئەوی تر ڕادەکێشێت)) ((مثل المؤمنين في توادهم كمثل الجسد الواحد إذا اشتكى منه عضو تداعت له سائر الجسد بالحمى والسهر)) واتە: ((نموونەی باوەڕداران لە سۆز و خۆشەویستییاندا بۆ یەکتر، وەك نموونەی یەك جەستە وایە، ئەگەر ئەندامێکی بناڵێنێت، ئەوا هەموو جەستە لەگەڵی دێنە تا و شەونخونیی)).[١]

پەروەردەی ڕۆحیی ئیسلامیی سەرچاوەگرتوو لە قورئان و سوننەتەوەیە موسڵمانی هاوچەرخ بەرز دەکاتەوە تا ببێتە پێشەنگ و پێشڕەو بۆ کەسانی تر لە بواری بیروباوەڕی ڕاستدا و لە پەرستشی ورد و ڕەوشتی بەرز و پەیوەندیی بەخوداوە و بانگەواز بۆ ڕێنماییەکەی. بەڕاستی پەروەردەی ڕۆحیی ڕاست و دروست خەڵکی بەرەو ئیسلام و شیرینی و سانایی ئیسلام ڕادەکێشێت.

ئیسلام لەڕێگەی بانگەوازەکەیەوە بۆ باوەڕ و پەیوەندیی بەهێز بە خوداوە، دەروون ئارام دەکات و هەست و عەقڵ ڕازی دەکات و ئەو پەیوەندییە ئیسلامییانەی پێکی دەهێنێت لەنێوان تاك و کۆمەڵاندا دەیانکات بە یەك جەستە و

---

[١]– بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.

سەبارەت بە ڕەهەندی ڕۆحیی ئوممەت، بڕوانە:

– منى أبو الفضل: الأمة القطب نحو تأصيل إسلامي لمفهوم الأمة في الإسلام، سلسلة قضايا الفكر الإسلامي (١٤)، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، القاهرة، (١٩٩٦م).

سیستەمێکی ئابووریی دادپەروەر دروست دەکات، کە هەستی ڕق و کینە لەنێو تاکەکاندا ناخولقێنێت و ئەو پاڵنەرە ڕەوشتییانەی دەیوروژێنێت تاك و کۆمەڵ بەرز دەکاتەوە، ئیسلام بەم هەموو بەها و ڕێنماییانە کەشێکی تەندروست دەخولقێنێت چ لەڕووی دەروونییەوە بێت یان لەڕووی عەقڵییەوە و زۆرێك لەوەی کۆمەڵگەکانمان بەدەستیەوە دەناڵێنن لەناو دەبات، لە هەستکردن بە نامۆبوون (Alination) و بێهیوایی (Frustration) و هەستکردن بە دەستەوسانیی (Powerlessness) و لێکەوتەکانیان لە توندوتیژی و نائارامی و تاوان و مانگرتن (Strikers)[1].

بەم شێوەیە ئەوەی لە ئیسلامدا هەیە لە زیکر و پەیوەندی بە خودا و هەستکردن بە میهرەبانیی خودا، هەموو ئەمانە ژیانی دەروونیی موسڵمان دەوڵەمەند دەکەن... خوای گەورە لەبارەی کاریگەریی دەروونیی خوێندنی قورئانەوە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ أَلاَ بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾{الرعد: ٢٨} واتە: ((ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و دڵیان ئاسوودە دەبێت بە یادی خودا، ئەی هەر بە یادی خودا نییە دڵ ئاسوودە دەبێت)). هەروەها دەفەرموێت: ﴿أَوَمَنْ كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا﴾{الأنعام:١٢٢} واتە: ((ئایا کەسێك مردووبووبێت و زیندوومانکردبێتەوە و ڕووناکیمان بۆ فەراهەم هێنا بێت بەهۆی ئەوەوە بەناو خەڵکیدا دەگەڕێت و دەڕوات، ئایا وەك ئەوە وایە لەناو تاریکستانێکدا بێت کە بە

[1]– بڕوانە:

– جمعية الإصلاح والتوجيه الإجتماعي: المجتمع العاري بالوثائق والأرقام، مطبعة كاظم، دبي، الإمارات العربية المتحدة، (١٩٨٣م).

– قيس النوري: ((الإغتراب إصطلاحًا ومفهومًا وواقعًا))، عالم الفكر، العدد الأول، نيسان – حزيران (١٩٧٩م).

– سيد صبحي: الشباب وأزمة التعبير، المطبعة التجارية الحديثة، القاهرة، (١٩٨٣م).

هیچ جۆرێ دەرچوونی نییە؟)) هەروەها بانگ دەکات بۆ ئارامگرتن و باوەڕ لە کاتی نەهامــەتی و کارەســات و نارەزاییدەرنــەبڕین و لەدەســتنەدانی ئــارامی، کــە دەفەرموێت: ﴿مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلاَ فِي أَنْفُسِكُمْ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا﴾{الحديد: ٢٢} واتە: ((هیچ بەڵا و ڕووداوێك لە زەویدا بۆتان پێش نەهاتووە کە لە –لوح المحفوظ–دا تۆمار نەکرابێت پـێش ئـەوەی ڕووداوەکـە پـێش بێـت)) و دەرگای ڕەحمـەت لەبـەردەم هەڵەکاراندا دەکاتـەوە ئەگـەر بگەڕێنـەوە بـۆ ڕێگـای ڕاست کە دەفـەرموێت: ﴿وَلَـيْسَ عَلَـيْكُمْ جُنَـاحٌ فِيمَـا أَخْطَـأْتُمْ بِـهِ وَلَكِـنْ مَـا تَعَمَّـدَتْ قُلُوبُكُمْ﴾{الأحزاب:٥} واتە: ((ئەگەر هەڵەیەکتان کرد بەنەزانی، ئەوا هیچ گوناهێکتان لەسەر نییە، بەڵام گوناهبار دەبن ئەگەر بـە دڵ و بـە دەسـتی ئەنقەسـت بیکـەن)). هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ يَعْمَلْ سُوءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَـهُ ثُـمَّ يَسْـتَغْفِرِ اللَّـهَ يَجِدِ اللَّـهَ غَفُورًا رَحِيمًا﴾{النساء: ١١٠} واتە: ((ئەوەی خراپەیـەك بکـات، یـان سـتەم لـە خـۆی بکـات لـەوەودوا بەخۆیـدا بچـێتەوە و داوای لێخۆشـبوون لـە خـودا بکـات، ئـەوە خودایەکی لێخۆشبوو و میهرەبانی دەست دەکەوێت)).

پێغەمبەری خودا ئاگادارمان دەکاتەوە لەوەی مرۆڤ بـەدوای دونیـادا ڕابکـات بـە شێوەیەك تووشی دڵەڕاوکێ و ئازاری دەروونیی بکات و لە جێی ئـەوە هـانی دەدات بۆ ئامانج و ئاسۆی گەورەتر و فراوانتر و دەفەرموێت: ((من كانت الآخرة همه جعـل الله غناه في قلبه وجمع له شمله وأتته الدنيا وهي راغمة، ومن كانت الدنيا همه جعـل الله فقره بين عينيه وفرق عليه شمله ولم يأته من الدنيا إلا ماقـدر لـه)) واتـە: (هـەر کەسێك مـەراقی دواڕۆژ بێـت، خـودا دەوڵەمەندییەکـەی دەخاتـە دڵـی و کـاری ڕێـك دەخات و دنیـا بەملکەچـیی بـۆی دێـت، هـەر کەسـیش مـەراقی دونیـا بێـت، خـودا هەژارییەکەی دەخاتە پێشچاوی و کاری شپرزە دەکـات و لـەوە زیـاتریش کـە بـۆی

نووسراوە دەستی ناکەوێت).[1]

موسڵمانان دەرکیان بە گرنگیی و باڵابوونی ئەم ڕەهەندە دەروونییە کردبوو لە ژیانی موسڵماندا ((دڵنەخۆشی)) لەم بارەیەشەوە ئیبن قەییم دەڵێت: ((نەخۆشی دوو جۆرە: نەخۆشی دڵەکان و نەخۆشیی جەستەکان، هەردووکیشیان لە قورئاندا باس کراون))[2]. پاشان باس لە دەستنیشانکردنی هەردوو جۆرە نەخۆشییەکە دەکات و چارەسەریان، هەروەها ئیبن جەوزی لە پێشەکیی کتێبی ((الطب الروحاني))دا دەڵێت: "کاتێك کتێبێکم نووسی لە پزیشکیی لاشەدا و ناوم لێ نا (لقط المنافع) بە باشترم زانی کتێبێکی بەدوادا بنووسم لە پزیشکیی دەروونەکاندا و ناوم لێ نا (الطب الروحاني)، چونکە پزیشکیی لاشە چاککردنی شێوەیە و پزیشکیی دەروون چاککردنی واتاکانە، کە ئەمەش پیرۆزترە"[3]. کتێبە پزیشکییە ئیسلامییەکانی سەردەمی بووژانەوەی ئیسلامیی پڕن لەو کتێبانەی باس لە چارەسەری دەروونیی دەکەن[4]. ئەمیش لایەنێکە توێژینەوە پزیشکییە هاوچەرخەکان پشتگوێیان خستووە، یەکێك لە لێکۆڵەران سەبارەت بەم بابەتە دەڵێت: "شیکاری دەروونی لە پزیشکیی هاوچەرخدا پشتگوێ خراوە، هەموو نەخۆشییەکان هۆکارەکەیان تا و هەڵامەتە و بەکتریا و مشەخۆرەکانە، هەر نەخۆشییەك نیشانەی خۆی هەیە و کاتێك هۆکارە دەروونییەکان دەستنیشان کران

---

[1]- أحمد شوقي الفنجري: الطب الوقائي في الإسلام، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ٧٩–١٠٨).

- يوسف القرضاوي: الإيمان والحياة، مكتبة وهبة، القاهرة، (١٩٧٧م)، (ص ٧٤–٣٤٩).

[2]- ابن قيم الجوزية: الطب النبوي، دار إحياء الكتب العربية، القاهرة، (١٩٥٧م)، (ص ١–١٨).

[3]- الحافظ ابن الجوزي: الطب الروحاني، مكتبة القدس، القاهرة، (١٩٨١م)، (د.خ).

[4]- هەمان سەرچاوەی پێشوو، الإمام الشيرازي: الطب الروحاني، مطبعة المؤيد، القاهرة، (١٣٩٩هـ)، ابن حزم: رسالة في مداواة النفوس وتهذيب الأخلاق، والزهد في الرذائل، مطبعة النيل، القاهرة، (١٣٢٣هـ)، وإحياء علوم الدين للغزالي، البابي الحلبي، القاهرة، (١٩٥٧م).

له نەخۆشییەکاندا، کە ئەمەش بەم درەنگانە کرا، کاتێك هۆکارە دەروونییەکان نەخۆشییەکانیان زیاد کرد — و بە شێوەیەکی ناڕوون و دەستنیشاننەکراو دانران، جیاواز لە نیشاندانی نەخۆشییەکان کاتێك هۆکارەکەی بەکتیریایی یان کەڕوویی یان مشەخۆری دەبێت، ئەمەش کەموکورتییەکی نەشیاوە لە لێکۆڵینەوەدا لەگەڵ دانپێدانانی نووسەران لە کتێبەکانیاندا کە هۆکارە دەروونییە ڕۆحییەکان ڕۆڵی گرنگ دەبینن لە هەر شتێکدا کە لە جەستەدا ڕوو دەدات"[1].

((پزیشکیی ڕۆحانی)) کە زانا موسڵمانەکانمان باسیان لێ کردووە، جیاوازە لە تێڕوانینی چارەسەری دەروونیی هاوچەرخ، چونکە پزیشکیی ڕووحانیی ئیسلامیی کار لەسەر پتەوکردنی پەیوەندیی مرۆڤ دەکات لەگەڵ پەروەردگاریدا و هەوڵی دوورخستنەوەی لە خەسڵەتە ناشرینەکان دەدات و بە خەسڵەتە جوانەکان دەیڕازێنێتەوە، گومانی تێدا نییە کە ئەو قوتابخانە ئیسلامییە لە چارەسەری دەروونییدا لەم سەردەمەماندا پێویستی بە کەسێکە پەرەی پێ بدات و پشتڕاستی بکاتەوە بە لێکۆڵینەوەی زیاتر، تاکو قوتابخانەیەکی ئیسلامیی تایبەتمان هەبێت لە چارەسەری دەروونیی ئیسلامیی یان پزیشکیی ڕۆحانیی[2].

دەستنیشانکردنی ڕووخسارەکانی کەموکورتی لە پەروەردەی خوێندکارەکانماندا بە پەروەردەیەکی ڕۆحیی ئیسلامیی دروست دەگاتە ئەنجام، کە

---

[1]– خالص جلبي كنجو: الطب محراب للإيمان، مؤسسة الرسالة، بيروت، (١٩٨٢م)، (ص ٨).

[2]– لە لێکۆڵینەوە بەهێزەکان لەسەر ئەم ڕێبازە:

– سيد محمد عثمان: المسؤولية الإجتماعية والشخصية المسلمة، دراسة نفسية تربوية، الأنجلو، القاهرة، (١٩٧٩م).

– حسن الشرقاوي: نحو علم نفس إسلامي، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، (١٩٧٦م).

-Malik Badri: The Dilema of Psychologists, M.W.H. London Publishers, (1979).

له هەموو قۆناغەکانی خوێندندا هەر له قۆناغی دایەنگەوە تاکو خوێندنی زانکۆیی و دوای ئەویش، ئەوەی چۆن ئەم کەموکورتییانـە چارەسـەر بکـەین لـە پـەروەردەی عەرەبی و ئیسلامیماندا پێویستییەکی گومانلێنەکراوە ئەگـەر بمانـەوێت بـەکردەیی ئوممەتەکــەمان هەســتێنینەوە و ئامــادەی بکــەین بــۆ بەجێگەیانــدنی پەیامــە ژیارییەکەی لەپێناو ئامادەگیی ڕەوشتی و ڕۆحی بەسەر هەموو جیهانیاندا. ئەمەش کارێکی زانستیی زەبەلاحە، ناکرێـت لێکۆڵینـەوەی تاکێـك لـە کـاتێکی کەمـدا پێـی هەسـتێت، بـەڵکو بەرپرسـیارێتیی کـارێکی بەکۆمەڵـە، پێشـنیار دەکـەم دەسـتەی ئیسلامیی جیهانیی بۆ فێرکردن پێی هەستێت بە هاوکـاریی لەگـەڵ لایـەنی تـر لـەو لایەنانەی هەستانەوەی ئوممەتیان لا گرنگە.

## هاوسەنگیی لەنێوان پێکهێنەرەکانی کەسایەتیی خوێندکاری موسڵماندا:

ئەگـەر پـەروەردەکان بـە درێـژایی سـەردەمەکان و بـەپێی جیـاوازیی ناوچـەکان هەریەکەو تیشکی خستبێتە سەر یەکێك لە لایەنەکانی کەسایەتیی مرۆڤ یان بەشێك لێی، وەك چـۆن پـەروەردەی یۆنـانی لـە سـەردەمە کۆنەکانـدا گرنگیـی بـە لایـەنی جەســتەیی و لایــەنی عــەقڵیی دەدا، پــەروەردەی مەســیحییش لــە ســەدەکانی ناوەڕاستدا گرنگیی بە لایەنی ڕۆحیی دەدا، لە کاتێکدا پەروەردەی نوێ گرنگیی بە لایەنی جەستەیی و عەقڵیی دەدات و لایەنی ڕۆحیی فەرامۆش کـردووە، ئـەوا بنـەما پەروەردەییە ڕاستەکانمان لە قورئـان و سـوننەت جـەخت لـە گەشـەی هەمەلایـەنی مــرۆڤ دەکاتــەوە بــە جەســتە و عــەقڵ و ڕۆحــەوە و کــاملبوون و پێشــکەوتن و بەختەوەریی کەسـایەتیی موسـڵمان پەیوەسـتە بـە ڕاددەی گونجـان و کۆکبـوون و هەماهەنگی لەنێوان ئەو پێکهێنەرانەدا و هەر لادانێك لەو گونجانە جگە لە زیـان بـۆ تاك و کۆمەڵگە هیچی تری لێ ناکەوێتەوە. ئیسلام بەپێی ئەوەی ئایینی فـیترەت و

هاوسـەنگیی و ناوەندگیرییـە لـە هـەموو شـتێکدا زۆر بەتـەنگ گەشـەی گونجـاوی موسڵمانەوەیە لـەڕووی جەسـتەیی و عـەقڵیی و ڕۆحییـەوە هـەر بـەو شـێوەیەی لـە پەڕەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا باس کـراوە. بـەڵام چـۆن بـەکردەیی دەتـوانین ئـەم هاوسەنگییە دەستەبەر بکەین؟ چۆن کەشێکی فێرکـاریی گونجـاو بهێنینـە کایـەوە بەم گەشەسەندنە هاوسەنگە تەواوەوە، ئەمەش بە هەمان شێوە کـارێکی وا ئاسـان نییە کە لێکۆڵینەوەی تاکێك لە کاتێکی کەمدا پێی هەستێت، بەڵکو بەرپرسیارێتیی کارێکی بەکۆمەڵە، پێشنیار دەکەم دەستەی ئیسلامیی جیهانیی بۆ فێرکـردن پێـی هەستێت، بە هاوکاری لەگەڵ لایەنی تر لـەو لایەنانـەی هەسـتانەوەی ئوممـەتیان لا گرنگە.

### لە کۆتاییدا: بۆچی ئەو کەسایەتییە پەروەردە بکەین؟

لە کۆتایی ئەم بەشەدا نـازانم ئایـا پێکاومـە لـە دواخسـتنی شـیکارییەکانی ئـەم بەشە بۆ ئێرە کە تیایدا باسم لە هەرسـێ پێکهێنەرەکـەی کەسـایەتیی خوێنـدکاری موسڵمان کـردووە، بـۆ ئـەوەی دەری بخـەم پـەروەردەکردنی ئـەو کەسـایەتییە بـە هەرسێ ڕەهەندەکەیەوە کاریگـەریی تـەواو نابێـت، مەگـەر لـەژێر سـایەی ئامـانجی پەروەردەیی وەرگیراو لـە بنـەما پەروەردەییـە ڕاسـتەکانماندا نـەبێت لـە قورئـان و سوننەت، یان باشتر وا بوو لە سەرەتای لێکۆڵینەوەکەدا بێت بـۆ ئـەوەی ئـەو سـێ پێکهێنەرە ببەستمەوە بە ئامانجە پەروەردەییەکانـەوە لـە قورئـان و فـەرموودەدا، تاکو گرنگیی مەزنیی ئەو ئامانجانە دەر بخەم لە بنیاتنـانی کەسـایەتیی موسـڵماندا بە هەرسێ ڕەهەندەکەیەوە؟ هەرکامێکیان بێت، ئەوەی ئەم پەڕەیە جەختی لەسەر دەکاتەوە ئەوەیە: کە پەروەردەی نوێ دەناڵێنێـت بەدەسـت قـەیرانی دیـاریکردنی ئامانجــە پەروەردەییەکانــەوە، بــەهۆی ئــەوەی ســرووش دوور دەخاتــەوە لــە

سەرچاوەکانی هەڵقوڵانی ئامانجە پەروەردەییەکان، ئەمەش کێشەیەکی تایبەتە بە پەروەردەی نوێوە، کە نەدەبوو درێژ ببێتەوە بۆ پەروەردەی عەرەبی و ئیسلامیمان وەك ئەوەی لەم ڕۆژگارە بەدی دەکرێت.

ئامانجە پەروەردەییە ئیسلامییەکان نابێت تەنها بۆ تێرکردنی پێویستییە دنیاییەکانی مرۆڤ بێت، ئەو پێویستیانە هەرچەند زۆر و هەمەچەشنیش بن، بێگومان پەروەردەکە زۆر ئامانجدارترە[١]. ئەمە لە کاتێکدا ئامانجە پەروەردەییەکان، بەو شێوەیەی بنەما پەروەردەییە نەگۆڕەکانمان دەستنیشانیان کردووە، کورت نابێتەوە تەنها لەسەر مرۆڤی بەهێز لەڕووی جەستە و عەقڵ و ڕۆحەوە، بەڵکو لەو چوارچێوەیەدا دایدەنێت کە ئەو خوێندکارانە لە داهاتوودا ببنە خاوەن پەیام بۆ نیشتمانیان و ئەو جیهانەی تێیدا دەژین.

**ئامانج لە پرۆسەی پەروەردە بە هەموو پێکهێنەرەکانیەوە بەدیهێنانی نەوەیەکی موسڵمانی بەهێزە لەڕووی جەستە و عەقڵ و ڕۆحەوە، کە بتوانێت ئەم سێ ئامانجە پەروەردەییە ئیسلامییە بەدی بهێنێت:**

١- ئاوەدانکردنەوەی زەوی هەر وەکو خودای گەورە لەم ئایەتەدا باسی لێوە کردووە: ﴿هُوَ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُجِيبٌ﴾ {هود: ٦١} واتە: ((ئەو بەرپای کردوون لە زەویدا و داوای لێ کردوون کە ئاوەدانی بکەنەوە، جا کە وا بوو داوای لێخۆشبوونی لێ بکەن، پاشان بگەڕێنەوە بۆ لای و فەرمانەکانی بەجێ بهێنن، چونکە بەڕاستی پەروەردگاری من

---

[١]- سەبارەت بە قەیرانی ئامانجەکانی پەروەردە لە خوێندنی ڕۆژئاوایی نوێدا بڕوانە: ماجد عرسان الكيلاني: أهداف التربية الإسلامية، سلسلة إسلامية المعرفة (رقم ٢٠)، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، هيرندن، فيرجينيا، الولايات المتحدة الأمريكية، (١٩٩٧م)، (ص ٣٣-٦٠).

زۆر نزیکە و نزا وەرگرە)). مرۆڤ لەسەریەتی پێداویستیی گونجاو دابین بکات بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی بە سیاسەتی شەرعی و ئابووری و دادپەروەریی بووژاوە، هەروەها ڕەوشتی قورئانیی جوان. وە ئاوەدانکردنەوەی زەویی لە دیدی قورئاندا کورت نابێتەوە لەسەر لایەنە مادییەکانی ئاوەدانکردنەوە یان ژیاریی، بەڵکو ئاوەدانکردنەوەی مادیی و ڕۆحیی دەگرێتەوە بەیەکەوە.

زانایانی ئیسلام هەر لە سەرەتاوە دەرکیان بەوە کردووە ڕێککردنی کاروباری دونیا و ئاوەدانکردنەوەی مەرجێکی گرنگە بۆ ڕێککردنی کاروباری دین، تەنانەت پێشەوا غەزالی ناسراو بە زوهد، سەبارەت بە پشتگوێخستنی کاروباری دونیا دەڵێت: "مەبەستەکانی بەدیهێنان دین و دونیا دەگرێتە خۆ و دین ڕێکبوون بەخۆیەوە نابینێت ئەگەر دونیا باش نەبێت، چونکە دونیا کێڵگەی دواڕۆژە و ئامرازێکی گەیەنەرە بە خودا، نەك بۆ ئەوە بێت بکرێتە ئارامگە و شوێنی نیشتەجێبوون."[1]

ئەگەر گفتوگۆ بکەین لەسەر واتای ئاوەدانکردنەوەی ئیسلامیی بە لایەنە مادیی و ڕۆحییەکانیەوە و گرنگیی پێشکەوتنی کشتوکاڵیی و پیشەسازیی و بازرگانیی و سەربازیی و... هتد لەپاڵ پشتگوێنەخستنی بەرزبوونەوەی لایەنی ڕۆحیی و ڕەوشتی، باسەکەمان زۆر درێژە دەکێشێت و ئەوەی چۆن ئاوەدانکردنەوەی ئیسلامیی جیاوازە لە ئاوەدانکردنەوەی ڕۆژئاوایی، کە دواڕۆژ و ڕەوشت و ئایینی ڕاست پشتگوێ دەخات[2]. ئەم جۆرە ئاوەدانکردنەوە ئیسلامییەش نەوەیەکی

---

[1]– الغزالي: إحياء علوم الدين، سەرچاوەیەکی پێشوو، (١٣/١).

[2]– سەبارەت بە ئاوەدانکردنەوەی ئیسلامیی، بڕوانە: عبد الرحمن النقيب: مدخل لدراسة الإتجاه الحرفي والمهني في التربية الإسلامية، في بحوث في الربية الإسلامية، دار الفكر العربي، القاهرة، (١٩٨٧م)، (١١٣/٣) و ئەوەی دوای ئەوەش.

ئیسلامیی نەبێت، کە پەروەردە کراوە لەسەر پەروەردەیەکی ئیسلامیی دروست لەپێناو ئەو ئامانجەدا، کەس ناتوانێت بیهێنێتە دی.

٢- پەرستنی خودا وەك لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ (٥٦) مَا أُرِيدُ مِنْهُمْ مِنْ رِزْقٍ وَمَا أُرِيدُ أَنْ يُطْعِمُونِ (٥٧) إِنَّ اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾{الذاريات: ٥٦-٥٨} واتە: ((بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە، تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن. نە ڕۆزیم لێیان دەوێت نە خواردن و خواردنەوە. چونکە بەڕاستی هەر خودا خۆی ڕۆزیبەخشە و خاوەنی هێز و دەسەلاتی پتەوە)). بە هەموو ئەوەی کە بەندایەتی بۆ خودا دەیگەیەنێت گوێڕایەڵیی تەواو بۆ خودا لە هەموو ئەوەدا کە فەرمانی پێ کردووە و دوورکەوتنەوە لە هەموو ئەوەی قەدەغەی کردووە و کەسایەتیی خواپەرستی جێبەجێکار بۆ فەرمانەکانی و دوور لە قەدەغەکراوەکانی ئامانجێکی ئیسلامییە پەروەردەی ئیسلامیی هەوڵی بۆ دەدات[1]. خواپەرستییش لە ئیسلامدا لەسەر ئەنجامدانی پەرستشەکان کورت نابێتەوە بە واتا تەسکەکەی لە نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکاتدا، کە بە هەموویەوە چەند کاتژمێرێك لە کاتی موسڵمان دەگرن، بەڵکو واتای پەرستن لە ئیسلامدا فراوان دەبێتەوە تا هەموو گوتە و کردار و ڕەفتارێك دەگرێتەوە و مرۆڤ ئەنجامی دەدات کە تێیدا پابەندە بە فەرمانەکانی خوداوە و دوورە لە قەدەغەکراوەکانی، بەمەش ژیانی مرۆڤ هەمووی دەبێت بە پەرستش و پەیوەندییەکی تەواو بە خوداوە. هەرچەندە مرۆڤ پابەندی ئەوە بێت لە گشت ڕەفتارەکانیدا بەندایەتییەکەی زیاتر دەکات[2]. بەم پێیە ڕێژەی سەرکەوتووی

[1]- عفاف إبراهيم الدباغ: المنظور الإسلامي للطبيعة الإنسانية، محاضرة بالمعهد الإسلامي للخدمة الإجتماعية للبنات بالرياض، المعهد العالمي للفكر الإسلامي بالقاهرة، (١٩٩١م)، (ص ٢٣).

[2]- سەبارەت بە واتای بەندایەتی، بڕوانە:

هــــەر پەروەردەیـــەك وابەســـتەیە بـــە ڕێـــژەی نزیککردنـــەوەی بەنـــدەکان لـــە بەندایەتیکردنی پەروەرێنیان.

٣- جێنشـینیی مـرۆڤ هـەر وەکـو لـەم ئایەتـەدا بـاس کـراوە: ﴿وَإِذْ قَـالَ رَبُّـكَ لِلْمَلَآئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِـي الْـأَرْضِ خَلِيفَـةً﴾{البقرة: ٣٠} واتـە: ((بیریـان بێنـەوە کاتێـك پەروەردگاری تۆ بـە فریشـتەکانی گـوت: بەڕاسـتی مـن جێنشـینێك لەسـەر زەویـدا دروست دەکەم)). هەروەها: ﴿وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي الْأَرْضِ فَيَنْظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ﴾{الأعراف: ١٢٩} واتە: ((ئێوە لە زەویدا بکاتە جێنشین، ئەوسا سەیرتان دەکات کە ئێوە چۆن کار دەکەن)) و ئایەتی تریش. ئەوەی ئەم جێنشـینییە پێویسـتیەتی لـە هـەوڵ بـۆ گەیشتن بە کامڵبوون، بـەپێی توانـای مـرۆڤ، تـاکو شـیاوی ئـەم جێنشـینییە بێـت. ئەوەش تەنها بە شـوێنکەوتنی خـودا دەبێـت لـە هـەموو سیفاتەکانیدا بـۆ ئـەوەی مرۆڤێکی خوداناسی لێ دەر بچێت لە ڕەوشت و ڕەفتارەکانیدا. لەوانەشە ئەمـە لـە گرنگترین ئەرکەکانی ئوممەتی جێنشین بێت، کە لە ڕەفتاریـدا پێشـەنگ بێـت و لـە بەها و نموونەکانیدا ناوەندگیر بێت، هەروەها شـوێنکەوتەی پێغەمبەرەکـەی بێـت. فـەرمانکار بـە چـاکە بێـت و ڕێگـر بێـت لـە خراپـە، هـەر وەك خـودای گـەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَـيْكُمْ شَـهِيدًا﴾{البقرة: ١٤٣} واتـە: ((بـەو شـێوەیە ئێوەمـان بـە گـەلێکی میـانڕەو گێڕاوە، تا ببنـە شـایەت بەسـەر خەڵکییـەوە و پێغەمبـەریش شـایەت بێـت بەسـەر ئێـوەوە)). هـەروەها: ﴿وَلْـتَكُنْ مِـنْكُمْ أُمَّـةٌ يَـدْعُونَ إِلَـى الْخَيْـرِ وَيَـأْمُرُونَ بِـالْمَعْرُوفِ

---

- ابن قيم الجوزية: مدارك السالكين في منازل إياك نعبد وإياك نستعين، تحقيق محمد حامد الفقي، دار الكتاب العربي، بيروت، (١٩٧٢م).
- يوسف القرضاوي: العبادة في الإسلام، مؤسسة الرسالة، بيروت، (١٩٨١م).
- أبو الأعلى المودودي: المصطلحات الأربعة في القرآن، دار التراث للطباعة والنشر، القاهرة، (١٩٧٢م).

وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾{آل عمران: ١٠٤} واتـه: ((پێویسـته لـه ئێـوه ئوممه‌تێك پێك بێت یاخود هه‌مووتان ئوممه‌تێك بن باگه‌واز بکه‌ن بـۆ خێـر و چـاکه، فه‌رمان ده‌ده‌ن به هه‌موو کارێکی بـاو و دروسـت، قه‌ده‌غـه‌ی هـه‌موو نادروسـتییه‌ك بکه‌ن، ئا ئه‌وانه هه‌ر سه‌رفرازن)). هه‌روه‌ها: ﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾{آل عمران: ١١٠} واته: ((به‌ڕاسـتی ئێـوه چاکترین ئوممه‌تێکن که بۆ سوودی خه‌ڵکی هێنراونه‌ته مه‌یدانه‌وه، چـونکه فـه‌رمان به چاکه ده‌که‌ن و قه‌ده‌غه‌ی خراپه ده‌که‌ن و باوه‌ڕ ده‌هێنن به خودا)).

پێداچوونه‌وه‌ی ئه‌و سێ ئامانجه‌ی پێشوو ئه‌و جیاوازییه گه‌وره‌یـه ده‌خاتـه ڕوو که هه‌یه له‌نێوان ئه‌و ئامانجانه‌ی په‌روه‌رده‌ی ئیسلامیی که هه‌وڵی به‌ده‌سـتهێنانیان ده‌دات له‌گـه‌ڵ ئامانجـه‌کانی پـه‌روه‌رده‌ی نوێـدا، بـه‌و شـێوه‌ی کـه لـه ئـه‌ده‌بیاتی په‌روه‌رده‌یی ڕۆژئاواییدا هاتوون.

سه‌ره‌ڕای مه‌زنیی ئـه‌و ئامانجـه په‌روه‌رده‌ییـه ئیسـلامییه گشـتییانه، پێویسـته کۆششـێکی گـه‌وره به‌خـه‌رج بـدرێت لـه‌پێناو گـۆڕینی ئـه‌و ئامانجـه گشـتییانه بـۆ ئامانجی تایبه‌ت، به هه‌ر قۆناغێکی خوێندن و هه‌ر بابـه‌تێکی خوێنـدن و تـا ئێسـتا ئه‌م کاره‌ش ئه‌نجام نه‌دراوه. کارێکی گه‌وره‌ی به‌م شـێوه‌یه گـۆڕینی ئـه‌و ئامانجـه په‌روه‌رده‌ییه گشتییانه بۆ ئامانجی په‌روه‌رده‌یی تایبه‌ت به هه‌ر قۆنـاغ و بابـه‌تێکی خوێنـدن ناکرێـت لێکۆڵینـه‌وه‌ی تاکێـك لـه کـاتێکی که‌مـدا پێـی هه‌سـتێت، بـه‌ڵکو به‌رپرسیارێتیی کارێکی به‌کۆمه‌ڵه، که پێشنیار ده‌که‌م ده‌سته‌ی ئیسلامیی جیهانیی بۆ فێرکردن پێی هه‌ستێت به هاوکاری له‌گه‌ڵ لایه‌نی تر له‌و لایه‌نانه‌ی هه‌ستانه‌وه‌ی ئوممه‌تیان لا گرنگه.

لـه کۆتاییـدا هـه‌لی ئـه‌م کۆڕبه‌نـده‌م قۆسـته‌وه تـاکو پێتـان نیشـان بـده‌م کـه ته‌وه‌ره‌یه‌ك لـه تـه‌وه‌ره‌کانی کۆڕبه‌نده‌کـه: ((هاوسـه‌نگیی لـه‌نێوان پێکهێنـه‌ره‌کانی

کەسایەتیی خوێندکاردا: لێکۆڵینەوەیەکی ڕۆچوو لە ڕەگ و ڕیشەدا)) پێویستی بە توێژینەوە و بەدواداچوونی بەکۆمەڵی زیاتر هەیە نەك تاکەکەسیی، ئەوەی کە هێشتا ڕێگەیەکی دوورودرێژمان لەبەردەمدایە لە لێکۆڵینەوەی زانستیی جددی بۆ ئەوەی بەکردەیی ببینە خاوەنی پەروەردەیەکی ئیسلامیی بە بنەما تیۆریی و جێبەجێکردنە کردەییەکانیەوە و دەبێت ڕاستگۆ بین لەگەڵ خۆمان و ئوممەتەکەماندا و بەڕاشکاوی بڵێین کە تا ئێستا زۆرێك لەو ئەرکە پەروەردەییانەی لەڕووی عەقڵ و شەرعەوە لەسەرمان پێویستە بەجێمان نەهێناوە و ئەوەی ناتوانین تاك تاك بەدەستیان بهێنین، مەگەر لەڕێی کارێکی بەکۆمەڵی ڕێکخراو و پلانبۆدارێژراو ئەنجامی بدەین، لەوانەشە دەستەی ئیسلامیی جیهانیی بۆ فێرکردن شایەنی ئەوە بێت و بتوانێت لە ئێستا و لە داهاتووشدا بەم ئەرکە هەستێ، و کۆتایی بە پەڕەکەم دەهێنم بە دوو بڕگەی وەرگیراو، کە بەگرنگیان دەزانم جەختیان لەسەر بکەمەوە ئەوانیش:

- ((گەڕان بەدوای پایەکانی کەسایەتیی موسڵمان، یان پێکهێنەرەکانی کاری چاك و گەشەپێدان و پاککردنەوە و چاودێرییکردنیان پێویستی بە دامەزراوەیەکی بیردۆزیی یاخود تێکۆشانی پەروەردەیی هەیە... و پێکهێنانی وەها دامەزراوەیەکی پەروەردەیی پێویستییەکە دەستبەرداربوون لێی مەحاڵە و شوێنگرەوەی نییە، ئەمە لە کاتێکدا ڕۆڵی بیرمەندی تاك یان پەروەردەکاری تاك یان چاکسازیی تاك لە سەردەمی تەقینەوەی مەعریفی و بەیەکداچوونی پەیوەندییەکان و ئاڵۆزبوونی کێشەکاندا و سەردەمی مانگە دەستکردەکان و کۆمپیوتەر و فاکس و تەلەکس و ئینتەرنێتدا تەواو بووە... و تێگەیشتنی بەکۆمەڵ و بەدواداچوونی بەکۆمەڵ و جێبەجێکردنی بەکۆمەڵ بووە بە پێویستییەکی ژیان لە

هەموو گۆڕەپانەکاندا، هەر بۆیە بنەما ئیسلامییەکان ئەم بەهایەیان کردووەتە گرنگترینی بەهاکان: کە دەستی خودا لەگەڵ کۆمەڵدایە)).[1]

لەپاڵ ((دامەزراوەی بیردۆزیی و تێکۆشانی پەروەردەییدا (تاقیگەی جێبەجێکردنە پەروەردەییەکان) دابنرێت، کە پێویستە بۆ تاقیکردنەوەی ئەو بیرۆکە و بۆچوونانەی تێکۆشەرانی دامەرزراوەی تیۆریی دانانی پەروەردەیی پێشنیارکراو دەری دەکەن بە ئامانجی گۆڕینی بیرۆکە بۆ کردار، وە لەپێناو تاقیکردنەوە و گۆڕین و پەرەپێدانیدا لەژێر ڕۆشنایی ئەو ئەنجامانەدا کە جێبەجێکردنە کردەییەکە دەری دەخات)).[2]

- بڕگەی دووەمیش: ((شتێکی سروشتییە کە پێویست بێت لەسەر میراتگرانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) ئەو لێهاتووییانەیان تێدا بێت کەوا پێویستن بۆ ئەم سەردەمە و ڕۆشنبیریی ئەم سەردەمە و تەوژمە دەرچووەکانی ئەم سەردەمە لە هەموو گۆڕەپانێکدا، وە بوونەوەرە دەرکەوتووە نوێیەکان.

ئەو کەسەی ئاگای لەم سەردەمە نییە بە هەموو پێکهاتە و گۆڕەپان و پەرەسەندن و کارتێکەرە کاریگەرەکانیەوە و بە ئامرازە زمانەوانی و مەعریفی و تەکنەلۆجییەکانی سەردەمەوە ناتوانێت خەڵکی ئەم سەردەمە بانگ بکات و قەناعەتیان پێ بهێنێت بەو بەها و وێنە باڵایانەی پەروردەی ئیسلامیی دەیخاتە ڕوو لەپێناو مانەوەی ڕەچەڵەکی مرۆڤ و بەرزبوونەوەی، وە ناتوانێت خەڵکی ئەم سەردەمە ئاگادار بکاتەوە لە مەترسییەکانی ئەو بەها و وێنە خراپانەی کە هەڕەشەی لەناوچوون و دواکەوتن لە ڕەچەڵەکی مرۆیی دەکەن)).[3]

---

[1]– ماجد عرسان الكيلاني: أهداف التربية الإسلامية، مرجع سابق، (ص ٥٤٠).

[2]– هەمان سەرچاوە (ص ٥٤١، ٥٤٢).

[3]– هەمان سەرچاوە، (ص ٥٤٤)

# ویژدانی پیشەیی
# لای ئەندامانی دەستەی وانەگوتنەوە
# ( واقیع و چاوەڕوانکراو )[1]

سەرەتا دەمەوێت بەرزنرخاندن و پێزانینی خۆم دەر بڕم بۆ بەشی بنەماکانی پەروەردە لە (الزقازیق) بەهۆی هەڵبژاردنی ئەم ناونیشانەوە: ویژدانی پیشەیی لای ئەندامانی دەستەی وانەگوتنەوە: واقیع و چاوەڕوانکراو، کە ببێتە بابەتێکی ئەم کۆڕبەندە زانستییەی بەش، ئەمە لە کاتێکدا دەگمەنە کۆڕبەند و کۆنگرەکان بایەخ بەم ڕەهەندە بەهادار و ڕەوشتییە لە کرداری فێرکردندا بدەن، سەرەڕای گرنگیی ئەم ڕەهەندە و مەترسییەکانی بە جۆرێك دەتوانرێت بگوترێت: ناتوانرێت چاکسازیی پەروەردەیی ئەنجام بدرێت بەبێ ئەم ڕەهەندە بەهادار و ڕەوشتییە. هەموو کارە هونەریی و کارگێڕی و زانستییەکان کە لەناو زانکۆدا ئەنجام دەدەرێن بەرهەمدار نابن بەبێ ئەوەی ویژدانێکی پیشەیی ئاڕاستەی بکات و پاڵی بنێت بەرەو

---

[1]– لێکۆڵینەوەیەکی پێشکەشکراو بە کۆڕبەندی زانستی بۆ بەشی بنەماکانی پەروەردە – زانکۆی (الزقازیق)، چوارشەممە (٣/٥/٢٠٠٦).

ڕێگـای ڕاسـت. لێرەشـەوە گرنگیـی و مەترسـیی ئـەم کۆڕبەنـدە زانسـتییە دەر دەکەوێت لەبارەی ویـژدانی پیشـەییەوە لای ئەنـدامانی دەسـتەی وانەگوتنـەوە لـە زانکۆدا (واقیع و چاوەڕوانکراو).

لەم سـاڵانەی کۆتاییـدا قسـە زۆر بـووە لـەبارەی ڕوخسـارە زۆرەکـانی لادان لـە بەجێهێنانی پیشەیی ئەندامانی دەستەی وانەگوتنەوە لە زانکۆ میسرییەکاندا و ئەم لادانـە هـەموو کارەکـانی ئەنـدامانی دەسـتەی وانەگوتنـەوەی گرتووەتـەوە، وەك: کەمتەرخەمیی لە وانەگوتنەوە و لاوازیی ئاستی لێکۆڵینەوە زانستییەکان چ لەڕووی بەرهەمهێنانـــەوە یـــان سەرپەرشـــتیکردنەوە و گەنـــدەڵیی لـــە بـــەڕێوەبردن و پشتگوێخستنی ڕەوشتەوە... هتد، بۆیە ئاسایی بوو دەنگی داواکاریی بەرز ببێتەوە بۆ گرنگیی بوونی بەڵێننامەی شەرەف کە توندوتۆڵیی کـاری نـاو زانکـۆ ڕابگرێـت و ویژدانی پیشەیی لە لێکهەڵوەشان بپارێزێت.

قسەکردن لەسەر ویژدانی پیشەیی بۆ ئەندامانی دەستەی وانەگوتنەوە لە زانکۆ، وامان لێ دەکات باس لە دیدی ڕۆژئاواییش بکـەین، کـە ئـایین ڕەت دەکاتـەوە وەك سەرچاوەیەکی پابەندیی ڕەوشتی و لەجیاتیی ئـەوە عـەقڵ دادەنێـت، یـان ئـەوەی زۆرینەی کۆمەڵگە لەسەری کۆك بن، یان سوود و قازانجی پیشەیی ئەو ڕەوشـتانەی لەڕووی عەقڵ و کۆمەڵگەوە یاخود پیشەوە پەسەند کراون، سەرەڕای ئەو کۆششە گەورەیەی ڕۆژئاوا بەخەرجی دەدات لەپێناو دۆزینـەوەی ڕەوشـتێك یـان ویـژدانێکی نائـایینیی ڕۆژئـاوا کەوتووەتـە داوی ڕێکنەکـەوتن لەسـەر ئـەو ڕەوشـتانە یـان ڕێـژەییبوونی ئـەو ڕەوشـتانەوە، بـەڵکو تەنانـەت لەسـەر چـەمکی پـەروەردەی ڕەوشـتییش ڕێـك نەکـەوتوون، لـە کاتێکـدا چـەندین چـەمك و دەسـتەواژەی بەیەکداچوو لەم بوارەدا بەکار هێنراون، نموونەش لەسەر ئەوە: خوێنـدنی بـەهاکان (Value Education)، پەروەردەی کەسایەتی (Character Education)،

پەروەردەی کەسیی و کۆمەڵایەتیی (Personal and Social Education)، پـەروەردەی هـاووڵاتیبوون (Citizenship Education)، زانسـتی ڕەوشـت (Deontology)، پەروەردەی دیموکراسـیی (Democratic Education)، پەروەردەی ئاییني (Religious Education) و چەندین دەستەواژەی تـر بـە شـێوەیەك لـە شـێوەکان (بـورجی بابل)مـان دێننـەوە یـاد ( The Tower of Babel)، کە تێیدا خەڵك بـە زمـانی جیـاواز قسـە دەکـەن، یـان پیـاوە نابیناکـان لەگـەڵ فیلەکـەدا (The Blind Men and The Elephant) کـە هەریەکێکیان لە گۆشەیەکەوە فیلەکە دەبینێت، ئێرە جێـی گفتوگـۆی ئـەوە نییـە کە: بۆچی ئاییني مەسیحی ڕەت کرایەوە وەك سەرچـاوەیەکی ڕەوشـتەکان یـاخود ویژدان، هەروەها ئەو کۆششە گەورەیەش کە بەخەرج دەدرێت لەلایەن دامـەزراوە و لیژنە و فەلسەفە ڕۆژئاواییەکانەوە بۆ دۆزینەوە و بەدیهێنانی ڕەوشـتی کۆمەڵایـەتی و پیشەیی لەجیاتی ڕەوشـتە ئایینییـە مەسـیحییەکان و لەوانەیـە یـەکێك لـە پـەڕە پێشکەشکراوەکان بە کۆڕبەندەکە هەموو ئەوانە تاووتوێ بکات.[1]

ئەگـەر ئـەوە ڕوانـینی ڕۆژئـاوایی بێـت بـۆ ڕەوشـت و ویـژدان، ئـەوا ڕوانـینی ئیسلامیی بۆ ڕەوشت و ویژدان – کە بابـەتی ئـەم پەڕەیەیـە – لـەوەوە سەرچـاوە دەگرێـت کـە نموونـەی ڕەوشـتیی موسـڵمان قورئـان و سـوننەت و جێبـەجێکردنی پێغەمبەر (دروودی خـوای لەسـەر) بـۆ ئـەو ڕەوشـتانە دیارییـان کـردووە. ڕەوشـت پلەیەکی بەرزی لە پێکهێنانی کەسایەتیی موسڵماندا دیاری کـردووە، هـەر پیشـە و کارێکی هەبێت. ئەوەندەش بەسە ئەم گوتانەی پێغەمبەر (دروودی خـوای لەسـەر)

---

[1]– لەوەدا بڕۆرەوە سەر: ((أزمة القيم في المناهج التربوية على الصعيد العالمي وانعكاساتها على التربية في العالم الإسلامي))، دراسة مقدمة إلى الندوة الدولية في موضوع القيم الإسلامية في منـاهج التربيـة والتعلـيم – تطوان – المغرب، (٢١–٢٣ التشرين الثاني ٢٠٠٥م).

بهێنین، تاکو گرنگیدانی ئەم ئایینەمان بۆ دەر بکەوێت بە بەها باڵاکان: ((إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق)) واتە: (من هەر بۆ ئەوە نێردراوم ڕەوشتە جوانەکان تەواو بکەن) هەروەها: ((لا دين لمن لا خلق لك)) واتە: (ئەوەی ڕەوشتی نەبێت ئایینیشی نییە).

زانای مسوڵمان یان توێژەری ئیسلامیی، ڕەوشتەکانی بە شێوەیەکی گشتی هەر لەم ئایینەوە وەر دەگرێت و خوێندنەوەیەکی خێرا بۆ کتێبی خودا یان یەکێك لە کتێبە دروستەکانی فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بەسە، تا بڕی زۆری ئەو ئایەت و فەرموودانەمان پێ نیشان بدات کە باس لە ڕەوشتە ئیسلامییەکان و ئەو ویژدان و ڕەوشتانە دەکەن کە دەبێت موسڵمانی لەسەر بێت.

لەپاڵ ئایەت و فەرموودەکاندا زۆر نووسینی کەلەپووریی دەبینین کە سەبارەت بە ڕەوشت نووسراون بە درێژایی سەردەمە ئیسلامییەکان لەلایەن زانایانی فەرموودە و فیقه و فەلسەفە و سۆفیگەرێتی و... هتد، ئەو نووسینە کەلەپوورییانە سوودیان لە سەرچاوە بیانییە یۆنانی و فارسی و هیندییەکان وەر گرتووە، بە جۆرێك دەتوانین بڵێین: کتێبخانەی عەرەبیی ئیسلامیی دەوڵەمەندە لە بواری پەروەردەی ڕەوشتیی و پێکهێنانی ویژدانی گشتیدا.[1]

زانایانمان بە ڕەوشتە گشتییەکان یان ویژدانە گشتییەکانەوە نەوەستاون، بەڵکو تیشکیان خستووەتە سەر هەندێك لایەنی گرنگ، کە دەبێت خاوەن کار و

[1]- بۆ نموونە بڕوانە:

- علي زيغور: ميادين العقل العملي في الفلسفة الإسلامية الموسعة: الأخلاق والتربية والسياسة والإقتصاد والتدبير والأدائية، المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع، بيروت (٢٠٠١م).

- علي خليل أبو العينين: مقدمة في مفهوم الأخلاق الإسلامية وأصالتها في الفكر الإسلامي ((دراسة مقدمة إلى دورة مناهج البحث التربوي في الدراسات العليا بمركز صالح عبد الله كامل)) – جامعة الأزهر الشريف، القاهرة، (٢٣-٢٧/٧/٢٠٠٠م).

پیشەکان خۆیـانی پـێ بڕازێننـەوە و لـە سـەروو هەمووشـیانەوە ئادابـەکانی زانـا و فێرخـواز و ئادابـەکانی لێکۆڵینـەوە و گفتوگـۆ، ئەوەنـدەش بەسـە لێـرەدا هەنـدێك ناونیشان لەو ئەدەبیاتانە بهێـنین کـە شـایەنی لێکۆڵینـەوە و بەدواداچـوونن، وەك: (وصـايا الإمـام أبـي حنيفـة النعمـان) (١٠٥ك)، (الشـافعي) (٢٠٤ك)، (آداب البحـث للسـمرقندي) (دەوری ٦٠٠ك وەفـاتی کـردووە)، دەستنووسـێکە لـە کتێبخانـەی ئەزهەرییە، (وصايا السهروردي) (٦٣٢ك)، (وصـايا ابـن العربـي) (٦٣٨ك)، (رسـالة التـأليف للسـيوطي) (٩١١ك) دەستنووسـێکە لـە کتێبخانـەی شـارەوانیی ئەسکەندەرییە و کتێبخانـەی ئەزهەرییـە، نامـەی (أدب البحـث لطـاش کبری زاده) (٩٦٨ك) دەستنووسـێکە لـە کتێبخانـەی شـارەوانیی ئەسـکەندەرییە و کتێبخانـەی ئەزهەرییە، کتێبی (منية المريد في أدب المفيد والمستفيد) و جگە لەوانەش زۆری تر هەن.[١]

خوێندنـەوەی ئـەو ئەدەبیاتانـە دەسـتوورێکی ڕەوشـتیی دەدات بـە لێکۆڵـەری پەروەردەیی لە بەجێگەیاندنی پیشەی زانست و فێرکردندا، لەوانەشە لە گرنگترینی ئەو دەستوورە ڕەوشتییانە ئەمانە بن:

١- خۆپارێزی (تقوى الله): هەندێك لە لێکۆڵەران[٢] وا دەبینن کە خۆپارێزی بـە واتای لەخواترسان و پابەندبوون بـەوەی فـەرمانی پـێ کـردووە و وازهێنـان لـەوەی ڕێگریی لێ کـردووە سەرچـاوەیەکی گرنگـە لـە سەرچـاوەکانی مەعریفـە، لەوەشـدا پشت بەم ئایەتە دەبەستن: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّـهُ﴾{البقرة: ٢٨٢} واتـە: ((لـە

---

[١]- عبد الرحمن النقيب: التربية الإسلامية المعاصرة في مواجهة النظام العالمي الجديـد، دار الفكـر العربـي، (١٩٩٧م)، (ص ٢٢٤).

[٢]- لبيب سعيد: الدراسة الأولى في مناهج البحث الإجتمـاعي في القـرآن الكـريم وعنـد علمائـه ومفسـريه، دار عكاظ، جدة، (ص ٩٤-١١٢).

خودا بترسن و خودا فێرتان دەكات)). هەروەها: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تَتَّقُوا اللَّهَ يَجْعَلْ لَكُمْ فُرْقَانًا﴾ {الأنفال: ٢٩} ((ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر تەقوای خوا بكەن و خۆپارێز بن ئەوا خودا بەرچاوڕوونییەكی تەواوتان بۆ فەراهەم دێنیّ)). دوای ئەوەی دەیان ئایەت دێنێت كە باس لە خۆپارێزی دەكەن و باس لە بەرهەمەكەی دەكەن لە ژیانی موسڵماندا، جەخت لەوە دەكاتەوە كە لە بەرهەمەكانیشی ((ڕێنموونییە بۆ حەق)) كاتێك لێكۆڵینەوە لە كاروبارەكانی گەردوون و ژیاندا دەكرێت. خۆپارێزییش بەم واتایە نزیكە لە قەبلاّندن (حدس) لای فەیلەسووفەكان و سۆفییەكان[1]، كە فەیلەسووفەكان و سۆفییەكان باس لە هەندێك حاڵەتی قەبلاّندن (حدس) دەكەن یان (ڕووناكیی ناوەكیی) یاخود جۆرێك لە قەناعەت كە ڕاڤە ناكرێت مەگەر بە جۆرێك لە پەیوەندیی بە خوداوە نەبێت.

هەنتەرمید دەڵێت: "سەرەڕای زۆریی نووسینی سۆفییەكان، ئێمە زۆر كەم نەبێت نایزانین لەبارەی ئەو ئەزموونە سەرەكییانەوە كە بوونەتە سەرچاوەی ئەم نووسینانە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەمان باری قەبلاّندن و ڕووناكیی ناوەكیی یاخود قەناعەتێكی شینەكراوەمان بەسەردا هاتوووە، كە كۆمەڵە بارێكن ئەوەندە بەو ئەزموونە سۆفییانە دەچن، بە جۆرێك دەتوانین لەڕێیانەوە ئەزموونی ئەو سۆفییانە لە مێشك نزیك بكەینەوە و ئەوەی كە لەبەردامماندا دەوەستێتەوە بۆ ئەوەی خۆمان بدەینە پاڵ گرووپێكی سۆفی، نەبوونی ئەو ئەزموونانە نییە لە لامان، بەڵكو –بەهۆی هەوەسەوە یاخود فێركردنمانەوە– ئەم ئەزموونانە بە گرنگیی وەر ناگرین و نایانكەینە بەشێكی بنەڕەتیی لە ژیانمان"[2].

---

[1]– هنترميد: الفلسفة أنواعها ومشكلاتها، ترجمة: فؤاد زكريا، دار نهضة مصر، القاهرة، (١٩٧٥م)، (ص ١٧٣–١٨٨).

[2]– سەرچاوەی پێشوو (ص ١٨٤).

غـەزالیش لـە (المنقـذ مـن الضـلال)ەکەیـدا باسـی لـەوە کـردووە کـە لـەودیو مەعریفـەی عەقڵییـەوە قۆنـاغێکی تـر لـە مەعریفـە هەیـە ((چـاوێکی تـری تێـدا دەکرێتەوە غەیبی پێ دەبینیت، هەروەها ئەوەی لە داهـاتوودا ڕوو دەدات و شـتی تـریش لـە عـەقڵ نادیـارە)) و لـە کاتێکـدا هەنـدێك هـەوڵ دەدەن ئـەو مەعریفەیـە بگەڕێننـەوە بـۆ ئـەوەی ((ئـەنجامی کارلێکێکـە لـەنێوان مەعریفـەی هەسـتیی و عەقڵییـدا)) مـرۆڤ هەنـدێك جـار دەگاتــە بـارێکی ئامـادەیی زەینیـی و دەروونیـی ڕاستەوخۆ و بـەخێرایی و بەباشـی و بـە شـێوەیەك کـە شـێوازی زانسـتیی پلەبەنـد تێدەپەڕێنێت لە شتانێکی ئاڵۆز تێـدەگات یـان دەرەنجامـانێکی دەسـت دەکـەوێت بەسەر زۆر لە گشتاندنەکاندا دەچەسپێت، ئەمەش پێی دەگوترێت (الاستبصار)[١].

هـەروەها (لبیـب سـعید) وای دەبینێـت کـە خۆپـارێزی وەك سەرچـاوەیەك لـە سەرچاوەکانی مەعریفە شایەنی ئەوەیە لە پێشەوەی پڕۆگرامە زانستییەکان بێـت و ڕاستکەرەوەی لارولۆچەکان بێت و هەموو پێشەوا متمانەپێکراوەکانمان لە زانایـانی ئیسلام لە ژیاننامە ڕاستەکانیاندا ئەوە سەلماوە کە بەتەواوی کەسـی خۆپـارێزبوون و دوو دێـڕە هۆنراوەیـەکی پێشـەوا شـافیعی دەهێنێتـەوە کـە پەیوەنـدیی نێـوان خۆپارێزی و زانستخوازی ڕوون دەکاتەوە:

**شکوت إلى وكيع سوء حفظي فأرشدني إلى ترك المعاصي**
**وأعلمني بأن العـلـم نـور ونـور الله لا يهدى لعـاصـي**

پاشـان کۆتـایی بـە قسـەکەی دەهێنێـت بـەوەی کـە هۆکـاری دوورخسـتنەوەی خۆپارێزی لەلایەن دانەرانی پڕۆگرامەکانـەوە سـەختیی بەدەسـتهێنانی خۆپارێزییـە کە فراوانە و ڕێگەی زۆرە و کەسی خۆپارێز–ڕاسـتەقینە– کـە مـن و ئـەو کەسـەش

---

[١]– الغزالي: المنقذ من الضلال، تحقيق: جميل صليبا، كامل عياد، دار الأنـدلس، بـيروت، (١٩٨١م)، (ص ١١).

خۆپـارێز نییـە –ڕاسـتەقینە– کـە لـە ڕوویەکـەوە خۆپـارێزە و لـە لایـەکی تـرەوە سنووری خودای گەورە دەبەزێنێت و ئەگەر لە ژیانماندا سـەیری ئەوانـە بکـەین کـە پێیان دەگوترێت خۆپارێز بەپێی دابونەریت، دەبینی ڕێگەیـەکی لاریـان لـە زانسـت هەڵبژاردووە، جیا لەوەی لە قورئاندا دەیبینین، جا گومانی تێدا نییـە کـە ئەوانـەی ئەو خۆپارێزە تەواوە نین کە لە قورئاندا باس کراوە، هەر وەك چۆن پارەیەکی کەم ناگات بە نیسابی زەکـات و ئـەو دەوڵەمەندییـە نییـە کـە زەکـاتی لەسـەر پێویسـت دەکات، بە هەمان شێوەش خاوەن شتێکی کەم لە تـەقوا ئـەو خۆپـارێزە نییـە کـە خودای گەورە فێری دەکـات و فورقـانی (جیاکـاریی لـەنێوان ڕاسـت و هەڵـەدا) پـێ دەبەخشێت.[1] هەروەها وای دەبینێـت کـە خۆپـارێزی سەرچـاوەیەکی پێویسـتە بـۆ مەعریفە لای موسڵمان، بەتایبەت لە زانستە ئایینییەکاندا، مەبەستیشمان ئەوە نییە کە خۆپارێزی تایبەت بێت بە زانستە ئایینییەکانەوە، بەڵکو هەموو زانستە ئایینی و نائایینییەکانیش بەیەکەوە دەگرێتەوە، (ابن سینا) بۆ نموونە وەك لە ژیاننامەکەیدا دەگێڕدرێتەوە ((ئەگەر سـەری لـە بابـەتێك دەر نەکردایـە و نەگەشـتایەتە ئـەنجام، پەنای دەبرد بۆ مزگەوت و نوێژی دەکرد و دەپاڕایـەوە بـۆ لای خـودا، تـاکو خـودا دەرگای لێ دەکردەوە)).[2]

٢– **پاکیی نییەت لە توێژینەوەدا و دوورکەوتنەوە لە هەوا و ئارەزووکان:** وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلا تَتَّبِـعِ الْهَـوَى فَيُضِـلَّكَ عَـنْ سَـبِيلِ اللَّـهِ﴾ {ص:٢٦} واتە: ((هەرگیز شوێنی ئارەزووت مەکەوە تا نەبێتـە هـۆی لادان و گومڕاکردنـت لـە ڕێبـازی خـودا)). هـەروەها: ﴿أَفَرَأَيْـتَ مَـنِ اتَّخَـذَ إِلَهَـهُ هَـوَاهُ وَأَضَـلَّهُ اللَّـهُ عَلَـى

[1] – إسحاق فرحان وآخرون: نحـو صـياغة إسـلامية لمنـاهج التربيـة، وزارة الأوقـاف والشـؤون والمقدسـات الإسلامية، عمان، (١٩٨٠م)، (ص ٧٧).

[2] – لبيب سعيد: سەرچاوەی پێشوو، (ص ١١١).

عِلْمٍ﴾{الجاثية: ٢٣} واتە: ((ئاخۆ بینیوتـە ئـەو کەسـەی کـە هـەوا و ئـارەزووی خـۆی کردۆتە خودای خۆی و خوداش گومڕای کرد کە زانیویەتی شایەنی ئەوەیە)).

٣- **جێگیری و شوێنەکەوتنی گومان:** وەك دەفەرموویێت: ﴿إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلاّ الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنْفُسُ وَلَقَدْ جَاءَهُمْ مِنْ رَبِّهِمُ الْهُدَى﴾{النجم:٢٣} واتـە: ((ئەوانـە تـەنها شـوێنی گومـان و ئـارەزووی دەروونـە نەخۆشـەکانیان دەکـەون، لـە کاتێکدا کـە بەڕاسـتی لەلایـەن پەروەردگاریانـەوە هیدایـەت و ڕێنموویيـان پـێ گەیشـتووە)). هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا لَهُمْ بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلاّ الظَّنَّ وَإِنَّ الظَّنَّ لاَ يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا﴾ (النجم: ٢٨) واتـە: ((ئەوانـە لـەو بارەيـەوە هـيچ جـۆرە زانسـت و زانیارییەکیان نییە، بەڵکو هەر شوێنی گومانی بێسەروبەر دەکەون، لە کاتێکدا کـە گومان بە هیچ شیوەیەك شوێنی حەق و ڕاستی ناگرێتەوە)).

٤- **خۆلادان لە داواکردنی دونیا بە زانست و هیواخواستن بە پاداشتی خودا:** وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ وَمَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ نَصِيبٍ﴾{الشورى:٢٠} واتـە: ((جـا ئـەوەی کـە بەرهـەمی قیامـەتی دەوێـت لـە دونیـادا کـار و کـردەوەی چـاك دەچـێنێت، ئێمـە پاداشـتی هـەوڵ و کۆششـەکەی بـە زیـادەوە پـێ دەبەخشـین و ئەوەیش کە بەرهەمی دونیای دەوێت هەندێك لە دونیای پێ دەبەخشـین، بـەلاَم لـە قیامەتدا هیچ جۆرە بەشێکی نییە)). هەروەها: ﴿مَنْ كَانَ يُرِيدُ الْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُ فِيهَا مَا نَشَاءُ لِمَنْ نُرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُ جَهَنَّمَ يَصْلاَهَا مَذْمُومًا مَدْحُورًا (١٨) وَمَنْ أَرَادَ الْآخِرَةَ وَسَعَى لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ كَانَ سَعْيُهُمْ مَشْكُورًا﴾{الإسراء: ١٨، ١٩} واتـە: ((هەر کەسـێك تـەنها ژیـانی دونیـای بوێـت لـەم دونیـادا زوو پێـی دەدەیـن ئـەوەی بمانەوێت بۆ هەر کەسێك لەپاشان دۆزەخمـان بـۆی سـاز داوە و دەچـێتە نـاوی بـە لۆمەکراوی و دەرکراوی لە میهرەبانی خودا. هەر کەسێکیش مەبەستی ڕۆژی دوایـی

بووبێت و هەوڵی بۆ بدات بەو جۆرەی شایستەی ئەوە و باوەڕداریش بێت، ئا ئەوانە کردەوە و تێکۆشانەکەیان وەر گیراوە)).

٥- **بڵاوکردنەوەی زانست و نەشاردنەوەی:** هەر وەك دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلاَ تَكْتُمُونَهُ﴾ (آل عمران: ١٨٧) واتە: ((کاتێك خودا پەیمانی وەر گرت لەوانەی کتێبیان پێ بەخشراوە کە ڕوونی بکەنەوە بۆ خەڵکی و مەرامەکانی باس بکەن و نەیشارنەوە)).

٦- **ڕووبەڕووبوونەوەی زانایان بۆ لادانەکانی تاك و کۆمەڵگاکان:** وەك دەفەرموێت: ﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾{آل عمران: ١١٠} واتە: ((بەڕاستی ئێوە چاکترین ئوممەتێکن کە بۆ خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بە چاکە دەدەن و قەدەغەی خراپە دەکەن و باوەڕیش بە خودا دەهێنن)).

٧- **شوێننەکەوتنی کوێرانە بۆ زانایان و گەورەکان بەبێ دەستگرتن بە بەڵگەوە:** وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ (التوبة:٣١) واتە: ((گاور و جوو حاخام و قەشەکانی خۆیان کردووەتە پەروەردگاری خۆیان لەجیاتیی خودا)).

٨- **ئیجتیهاد و ئادابی ڕاجیایی:** هەر وەك دەفەرموێت: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾{النحل:١٢٥} واتە: ((بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامە و ڕێبازی پەروەردگارت بەدانایی و ئامۆژگاری چاك و شیرین و لەگەڵیان بدوێ بە چاکترین شێوە، بێگومان پەروەردگارت خۆی چاك دەزانێت بەوانەی گومڕا بوون و لایان داوە لە ڕێگاکەی و هەر خۆشی زانایە بەوانەی لەسەر ڕێگای ڕاستن)).

**٩- خاكيبوون و دووركەوتنەوە لە خۆبەگەورەزانیی و پاڵفتەی دەروون:** وەك دەفەرموێت: ﴿سَأَصْرِفُ عَنْ آيَاتِيَ الَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾{الأعراف:١٤٦} واتە: ((ئەو کەسانەی کە بەناحەق فیز دەکەن لە زەویدا و خۆیان بە گەورەتر دەنوێنن لە خەڵکی، لەمەودوا ڕووی دڵیان وەر دەچەرخێنم لە تێگەیشتنی ئایەت و فەرمانەکانم)). هەروەها: ﴿فَلاَ تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى﴾{النجم:٣٢} واتە: ((کەواتە خۆتان بە چاك مەزانن و خۆتان بە پاڵفتە دامەنێن هەر خودا خۆی دەزانێت کێ تەقوای هەیە و پارێزکارە)).

**مامۆستای نموونەیی بەو شێوەیەی هەندێك لە کتێبەکانی کەلەپووری پەروەردەییمان وێنایان کردووە:**

بە هەمان شێوە زانایانی پەروەردەی موسڵمان بایەخیان بە کەسایەتیی مامۆستا داوە و لە پلەیان بەرز کردووەتەوە و پیشەکەیان بە یەکێك لە پیرۆزترین پیشەکان داناوە، لە کاتێکدا پیرۆزترین بەدیهێنراو لەسەر زەویی مرۆڤە و مامۆستاش پیشەی فێرکردن و پێگەیاندن و ڕێنموونیکردنی ئەم مرۆڤەیە[١]، بەم شێوەیە پیشەی مامۆستا باشترین و شەرەفمەندترینی پیشەکانە و هەر کەسێك دەست بداتە فێرکردن، ئەوا دەستی داوەتە کارێکی مەزن و مەترسییەکی گەورە و دەبێت کەسێکی ژیر و دیندار بێت، دووربین بێت لە پێگەیاندنی ڕەوشتەکاندا، لێزان بێت لە پەروەردەی منداڵدا و خاوەن ڕێز و کەسایەتییەکی سەنگین بێت و دوور بێت لە سووك و چرووکی، لەپاڵ خوێندکارەکەیدا قسە و گاڵتەی کەم بێت، وشك و مۆن نەبێت، بەڵکو خوێنشیرین و ژیر و خاوەن چاکە و خاوێنی و پاکی بێت[٢] و لە

---

[١]- أبو حامد الغزالي: إحياء علوم الدين، دار إحياء الكتب العربية، القاهرة، بدون، (١/١).

[٢]- ابن سينا: كتاب السياسة، نقلا عن الفكر التربوي العربي الإسلامي (وهو مختارات من كتب التراث)،جمع د. محمد ناصر، وكالة المطبوعات بالكويت، (١٩٧٧م)، (ص ٢٨٥).

خۆشـبەختیی مرۆڤـە کـە مامۆسـتایەکی ((پـاك و خۆشـڕەفتار و ڕەوشـتجوان، زەینڕۆشن و زانستخواز و ڕاستیخواز و نادەمارگیر بۆ بۆچوون یان مەزهەبێك))[1]ی بۆ ڕێك بکەوێت.

هـەروەها مامۆسـتا لـە ئیسـلامدا هەڵدەسـتێت بـە پیشـەکەی بـە پاڵنـەرێکی ئیسلامیی جوامێرانـە کـە بڵاوکردنـەوەی زانسـت و مەعریفەیـە لـەپێناو ڕازییبـوونی خودا و سەرکەوتنی ڕاستیدا تاکو کۆمەڵگەی موسڵمانان بەرز ببێتەوە، چونکە ئـەو ((بـە فێرکردنیـان (خوێنـدکارەکان) و پـەروەردەکردنیان مەبەسـتی ڕەزامەنـدیی خـودای گەورەیـە لەگـەڵ بڵاوکردنـەوەی زانسـت و زیندووکردنـەوەی شـەرع و دەرخسـتنی بـەردەوامی حـەق و پووکاندنـەوەی ناحـەق و بـەردەوامبوونی خێـر و بەرەکەتی ئوممەتی ئیسـلامیی بـە زۆربـوونی زاناکـانی. پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسەر) دەفەرموێت: ((إن الله تعالى وملائكته وأهل السماوات والأرض حتى النملة في جحرها يصلون على معلم الناس الخير)) واتـە: خـودا و فریشـتەکانی و خـەڵکی ئاسمانەکان و زەوی تەنانەت مێرووله له لانەکەیدا داوای خێر بۆ ئەو کەسە دەکـەن کە خەڵکی فێری خێر و شتی باش دەکات)).[2]

مامۆسـتا حـەزی زانسـت لای خوێنـدکارانی دروسـت دەکـات و هانیـان دەدات لەسەر زانست و بەدواداچوونی، زۆربەی کات ((بە باسکردنی ئەوەی خودای گـەورە بۆ زانایانی ئامادە کردووە لە پلەی بەرز و ئەوەی کە ئەوان میراتگری پێغەمبـەرانن و لەسـەر مینبـەری نـوورن کـە پێغەمبـەران و شـەهیدەکان پێـی سەرسـام دەبـن و

---

[1]– إخوان الصفا: رسائل إخوان الصفا، نقلا عن التربية عند العرب مظاهرها واتجاهاتها: محمد فوزي العنتيل، مكتبة مصر، (١٩٦٦م)، (ص ٢٧).

[2]– ابن جماعة: تذكرة السامع والمتكلم، نقلا عن الفكر التربوي العربي الإسلامي، سەرچاوەیەکی پێشوو (ص ٣٩٦).

ئەوەی هاوشێوەی ئەمانەیە لەو ئایەت و فەرمووده و ڕیوایات و هەواڵ و شیعرانەی لەبارەی چاكە و پێگەی زانست و زانایانەوە هاتوون)).[1]

دەبێت مامۆستا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە، بۆ خوێندكارەكەشی پێی خۆش بێت، هەر وەك چۆن لە فەرموودەدا هاتووە و ئەوەشی بۆ خۆی پێی ناخۆشە بۆ ئەویش پێی ناخۆش بێت و دەبێت گرنگیی بە بەرژەوەندیی خوێندكارەكانی بدات و بەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بكات كە مامەڵەی پێ دەكات لەگەڵ خۆشەویستترین منداڵەكانیدا، لە سۆز و بەزەیی و چاكەكردن لەگەڵی و ئارامگرتن لەسەر بێوەفاییەك كە لەوانەیە لێی ببینرێت و كەموكورتییەك كە هیچ مرۆڤێك نییە كەموكورتیی نەبێت، هەروەها بێڕێزییەك كە هەندێك جار دەیكات و تا بتوانێت داوای لێبووردنەكانی پەسەند بكات و لەگەڵ ئەوەشدا لەو كارەی كە نەشیاوە دووری بخاتەوە بە ئامۆژگاری و نەرمونیانی، نەك بە هەڵچوون و توندوتیژی، بە مەبەستی پەروەردەیەكی چاك و چاككردنی ڕەوشتی و باشتركردنی بارودۆخی، جا ئەگەر بە زیرەك بوو و بە ئاماژەیەك تێگەیشت ئەوا پێویست بە گوتن ناكات و ئەگەر بە گوتنی ڕاستەوخۆ نەبێت تێنەگەیشت، ئەوا بەڕاشكاوی پێی بڵێت، بەڵام بە پلەبەندی و نەرمونیانی[2]، مامۆستا دەبێت خاوەن بەزەیی بێت لە ئاستی فێرخوازەكانیدا و وەك ڕۆڵەی خۆی لەگەڵیاندا بجووڵێتەوە و داكۆكی بكات لەسەر هەموو شتێك كە سوود بە ئایین و دونیایان دەگەیەنێت، بەمەش مافی مامۆستا مەزنتر دەبێت لە مافی دایك و باوك، چونكە دایك و باوك هۆكاری بوونی ئێستا و ژیانی كاتین و مامۆستا هۆكاری ژیانی هەتاهەتاییە، وە ئەگەر مامۆستا نەبێت ئەوا ئەوەی لەلایەن باوكەوەیە دەیبات بەرەو تیاچوونی هەتاهەتایی و ئەوە مامۆستایە

[1]- سەرچاوەی پێشوو (ص ٣٩٦).

[2]- سەرچاوەی پێشوو (ص ٣٩٦).

که بەسوودە بۆ ژیانی دوارۆژی هەتاهەتایی[1] و ئەگەر دایك و باوك بوونی جەستەیی بە منداڵ ببەخشن، ئەوا مامۆستا بوونی عەقڵیی و ڕۆحیی پێ دەبەخشێت.

هەروەها لەسەر مامۆستا پێویستە لەپێناو بەرژەوەندیی خوێندکارەکانیدا هەوڵ بدات ((دڵنەواییان بکات و یارمەتییان بدات بەوەی لە بەردەستیدایە لە دەسەڵات و پارە، ئەگەر بتوانێت ئەو کارە بکات و ئایینەکەی پارێزراو بێت و خۆی پێویستی نەبێت، چونکە خودای گەورە لە هاوکاریی بەندەدایە، چەند بەندە لە هاوکاری براکەیدا بێت و هەر کەسێك پێویستیی براکەی بەجێ بهێنێت، ئەوا خودای گەورە پێویستیی ئەو بەجێ دەهێنێت و هەر کەسێك کارێك لەسەر کەسێك ئاسان بکات، ئەوا خودای گەورە لە ڕۆژی دواییدا لێپرسینەوەی لەسەر ئاسان دەکات، بەتایبەت کە ئەو هاوکارییە لە داواکردنی زانستدا بێت، جا ئەوە دەبێتە باشترین چاکە)).[2]

پەروەردەکارە موسڵمانەکانیش داوایان کردووە مامۆستا لە خوێندکارەکانی بپرسێت ئەگەر دیار نەبن و سەریان لێ بدات ئەگەر نەخۆش بکەون و ئاگاداری بارودۆخیان بێت و کێشەکانیان بزانێت، تاکو پەیوەندییەکی پتەو لەنێوانیاندا دروست ببێت، ئەمە چونکە ئامادەکردنی ((زانستخوازێك)) کە ئەمانەتی زانست هەڵدەگرێت ئەرکێکی مەزنە و دەبێت مامۆستا زۆر لە خەمیدا بێت و ناتوانێت ئەم کارەش بکات بەبێ ئەوەی پەیوەندییەکی مرۆییانەی پتەو لەنێوان ئەو و خوێندکارەکەیدا هەبێت، (ابن جماعە) دەڵێت: "ئەگەر هەندێك خوێندکار یان ئامادەبووی ئەڵقەی زانست دیار نەبوون زیاد لە نەریتی خۆی، مامۆستا دەبێت

---

[1]– الغزالي: إحياء علوم الدين، نقلا عن الفكر التربوي العربي الإسلامي، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ٣٣٣).

[2]– ابن جماعة: تذكرة السامع والمتكلم، نقلا عن الفكر التربوي العربي الإسلامي، سەرچاوەیەکی پێشوو (ص ٤٠١).

پرسیار لەبارەی خۆی و بارودۆخیەوە بکات و ئەو کەسانەش کە پەیوەندییان پێوەی هەیە، پرسیاریان لەبارەوە بکات و پێداویستییەکانیان بۆ پڕ بکاتەوە ئەوەندەی پێی دەکرێت، ئەگەر لە توانایدا هەبوو یارمەتیی دەدات و ئەگەرنا سۆزی بۆ دەر دەبڕێت و دوعای بۆ دەکات، بزانە کە خوێندکاری چاك خێری دەگەڕێتەوە بۆ مامۆستاکەی لە دونیا و لە دوارۆژیشدا، هەروەها دەبێتە ئازیزترین کەس و نزیکترین کەس لێیەوە."[1]

مامۆستا نابێت دەست بداتە گوتنەوەی وانەیەك تا بەتەواویی شارەزا نەبێت لەو بابەتەی بە خوێندکارانی دەدات و نابێت شەرم لەوە بکات کە بەدوای زانیارییەکدا بڕوات کە نایزانێت، یان دان بە کەموکورتیی زانستیدا بنێت، ئەگەر شتێکی نەزانی، بەڵکو دەبێت هەوڵ بدات بۆ بەهێزکردنی زیاتری خۆی لەڕووی زانستییەوە. (ابن جماعه) دەڵێت: "نابێت (مامۆستا) دەست بداتە وانەگوتنەوە، مەگەر شایەنی بێت هەروەها وانەیەك نەڵێتەوە لە بابەتێکدا کە نایزانێت."[2]

لە شوێنێکی تردا دەڵێت: "خۆی بە گەورە نەگرێت لەوەی سوود لە کەسێکی خوار خۆیەوە وەر بگرێت، چ لە ڕووی پلەوپایە، یاخود نەژاد، یاخود تەمەنەوە فێری شتێك ببێت کە نایزانێت، بەڵکو دەبێت بەپەرۆش بێت لەسەر سوودوەرگرتن لە هەر کەسێکەوە بێت، چونکە دانایی ونبووی باوەڕدارە لە هەر جێیەك دەستی بکەوێت وەری دەگرێت))[3] ((ئەگەر پرسیاری شتێکی لێ کرا کە نەیدەزانی، ئەوا با بڵێت: نازانم، چونکە گوتنی (نازانم) لە زانستەوەیە، هەر وەکو دەگوترێت: (نازانم)

---

[1]- سەرچاوەی پێشوو.

[2]- سەرچاوەی پێشوو (ص ٣٩٤).

[3]- ابن جماعة: تذكرة السامع والمتكلم، نقلا عن الفكر التربوي العربي الإسلامي (ص ٣٨٧).

نیوەی زانستە)).[1]

**هەروەها** نابێت مامۆستا زانستێك بە كەم سەیر بكات كە خۆی نایڵێتەوە بە خوێندكاران، چونكە هەموو زانستەكان سوودبەخش و پێویستن بۆ بەرەوپێشچوونی تاك و كۆمەڵگاكان. لەو بارەشەوە غەزالی دەڵێت: "ئەو كەسەی لە زانستێكدا شارەزایە نابێت لە ناخی خوێندكاردا زانستەكانی تر ناشرین بكات، وەك چۆن مامۆستای زمان زۆر جار زانستی فیقه ناشرین دەكات و مامۆستای فیقه زۆر جار زانستی فەرموودە و تەفسیر ناشرین دەكەن... ئەم ڕەوشتانە ناشرینن بۆ مامۆستا و دەبێت خۆی لێیان دوور بگرێت، بەڵكو مامۆستای زانستێك دەبێت ڕێگە بۆ خوێندكارەكەی فراوان بكات بۆ فێربوونی زانستەكانی تر."[2]

مامۆستای سەركەوتوو ئەوەیە كە ڕەچاوی توانای خوێندكارەكانی بكات لە وەرگرتندا و لە ڕاستییەكانی زانستیشدا ئەوەی مێشكیان پەسەندی ناكات پێیان نەڵێت و پلەبەندییان لەگەڵدا بكات لە ئاسانەوە بۆ سەختتر، تاكو بەتوانا دەبن لە زانستەكەدا ((بەپێی توانای تێگەیشتنی خوێندارەكە زانستی پێشكەش بكات و شتێكی پیّ نەڵێت كە لە توانای ژیریی خوێندكار زیاتر بێت و بیریان شپرزە نەكات، لەمەشدا شوێنپێی پێغەمبەری ئازیزمان (دروودی خوای لەسەر) هەنگاو بنێت، كە دەفەرموێت: ((**نحن – معاشر الأنبياء – أمرنا أن ننزل الناس منازلهم ونكلمهم على قدر عقولهم))** واتە: ((ئێمە –كۆمەڵی پێغەمبەران– فەرمانمان پیّ كراوە ڕەچاوی پێگەی خەڵكی بكەین و بەپێی ئاستی ژیرییان قسەیان لەگەڵدا بكەین)).[3]

ابن خلدون دەڵێت: "بزانە كە پێدانی زانست بە فێرخواز تەنها ئەو كاتە

---

[1]– سەرچاوەی پێشوو (ص ٣٩٢).

[2]– سەرچاوەی پێشوو (ص ٣٣٤).

[3]– سەرچاوەی پێشوو (ص ٣٩٤).

سـوودبەخش دەبێـت کـە پلەبەپلـە بێـت و وردەوردە و کـەم کـەم بێـت، لـە هـەر بابەتێکدا لەو زانستەدا سەرەتا شتە بنەڕەتییەکانی بابەتەکـەی پـێ دەدرێت و بـە شـێوەیەکی گشـتی بـۆی بـاس دەکرێـت و ڕەچـاوی توانـای عـەقڵیی و ئامـادەیی دەکرێت بۆ وەرگرتنی، تا ئەو کاتەی زانستەکە بەتەواویی وەر دەگرێت."[1]

(ابن جماعه) دەڵێـت: "پێویسـتە لەسـەر مامۆسـتا تێبکۆشـێت بـۆ فێرکـردن و تێگەیاندنی خوێندکار و هەوڵ بدات واتای بابەتەکان لـە زەینییـەوە نزیـك بکاتـەوە بەبێ ئەوەی زۆر لە خوێندکارەکە بکات لەوەی بەدەر لە توانایەتی و ئـەرکێکی زۆر بـدات بەسـەریدا کـە توانـای لەبـەرکردنی نـەبێت، هـەروەها بابەتەکـە بـۆ ئـەو خوێندکارەی تێناگات زیاتر ڕوون بکاتەوە و بۆی دووبارە و چەندبارە بکاتەوە."[2]

((ئەگـەر مامۆسـتا تـەواو بـوو لـە وانەگوتنـەوە، بـاش وایـە هەنـدێك پرسـیاری پەیوەندیدار بدات بە خوێندکاران، تاکو تێگەیشتن و لەبەرکردنیان تاقی بکاتەوە بۆ ئەو بابەتەی بـۆی بـاس کـردوون، جـا ئـەوەی دەر کـەوت تێگەیشـتنی باشـترە بـە ڕاستوەڵامدانەوەی زیاد لە جارێك دەستخۆشیی لێ بکات و ئەوەی لێی تێنەگەیشت ئەو چاکەیەی لەگەڵدا بکات و بۆی دووبارە بکاتەوە)).[3]

دەبێت مامۆستا لەسەر سوودوەرگرتنی خوێندکاران و تێگەیشتنیان بـۆ ئـەوەی خوێندوویانـە دڵنیـا بێتـەوە و پەسـنی ئـەو خوێنـدکارەش بکـات کـە خـۆی مانـدوو کردووە، ئەگەر بزانێت ئەو پەسنکردن و پیاهەڵدانە تووشی لەخۆباییبوونی ناکـات. ڕەخنـە لـە کەمتەرخەمـەکانیان بگرێـت، ئەگـەر بزانێـت ئـەو ڕەخنەگرتنـە تووشـی هەڵاتنی ناکـات. ئەمـەش بـەوەی هەنـدێك جـار داوا لـە خوێنـدکاران بکـات ئـەوەی

---

[1]- سەرچاوەی پێشوو (ص ٢٧٢).

[2]- سەرچاوەی پێشوو (ص ٣٩٧، ٣٩٨).

[3]- ابن جماعة: تذكرة السامع والمتكلم، نقلا عن الفكر التربوي العربي الإسلامي (ص ٣٩٧، ٣٩٨).

لەبەریان کردووە دووپاتی بکەنەوە و هەروەها زاڵبوونیان بەسەر بنەما گرنگ و بابەتە ناوازەکاندا تاقی بکاتەوە بە کۆمەڵێك پرسیار، کە بەندن لەسەر بنەمایەك کە پێی داون، یاخود بەڵگەیەك کە باسی کردووە، جا هەرکامیان وەڵامەکەی ڕاست بوو و نەترسا تووشی لەخۆباییبوون ببێت، ئەوا دەستخۆشیی لێ دەکات و ستاییشی دەکات لەناو هاوڕێکانیدا بۆ ئەوەی هانیان بدات بۆ کۆشش و داواکردنی زیاتر. هەرکامێکیشیانی بینی کەمتەرخەمە و ترسی ئەوەی نەبوو واز بهێنێت، ئەوا دەبێت توند بێت بەرامبەر کەمتەرخەمییەکەی و ورەی بەرز بکاتەوە و هانی بدات بۆ بەدەستهێنانی پلەی بەرز لە زانستخوازییدا، بەتایبەت ئەگەر لەوانە بێت کە توندی چالاکتری دەکات و دەستخۆشیی کراوەتری دەکات و ئەگەر پێویستی کرد بابەتەکە دووبارە بکاتەوە، ئەوا با دووبارەی بکاتەوە، بۆ ئەوەی باشتر لە بابەتەکە ڕۆبچن و تێبگەن.[1]

نابێت مامۆستا تەنها خەمی گەشەی مەعریفیی خوێندکارەکانی بێت، بەڵکو بە هەمان شێوە بایەخ بدات بە گەشەی جەستەییان، غەزالی دەڵێت: "دەبێت ڕێ بە منداڵ بدرێت دوای تەواوبوون لە کتێبەکانی یارییەکی جوان بکات، کە ماندووبوونی ناو کتێبەکانی پێ دەر بچێت، بە جۆرێك ماندوو نەبێت لە یارییەکەیدا، چونکە ڕێگریکردن لە منداڵ بۆ یارییکردن و ماندووکردنی بە فێرکردن دڵی دەمرێنێت، و زیرەکیی کەم دەکات و ژیانی لێ تاڵ دەکات تا وای لێ دەکات بەتەواویی هەوڵی وازلێهێنانی بدات"[2].

لە شوێنێکی تردا دەڵێت: "دەبێت منداڵ لە هەندێك کاتی ڕۆژدا ڕابهێنرێت

---

[1]- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[2]- محمد عطية الإبراشي: التربية الإسلامية وفلاسفتها، البابي الحلبي، القاهرة، (١٩٦٩م)، (ص ٢٧٦-٢٧٨).

لەسەر ڕۆیشتن و جووڵە و وەرزش، تاکو تەمبەڵی بەسەریدا زاڵ نەبێت."[1]

هەروەها دەبێت مامۆستا بایەخ بە پەروەردەی ڕەوشتیی خوێندکارانی بدات و ((ئاگاداری بارودۆخی خوێندکارانی بێت لە ئاکار و ئایین و ڕەوشتیان لە ئاشکرا و لە نهێنییشدا، جا ئەگەر یەکێکیان شتێکی نەشیاوی لێ بکەوێتەوە لە ئەنجامدانی قەدەغەکراوێك، یاخود کارێکی ناشرین، یان کارێك کە ببێتە هۆی لەناوچوونی ماڵ و وازهێنان لە کار یان بێڕێزییەك لەگەڵ مامۆستایەکدا، یان خەڵکی تر، یان زۆربلێیی بەبێ هیچ سوودێك، یان تێکەڵاویی کەسانێك کە نابێت تێکەڵاوییان بکرێت... هتد))[2] دەبێت مامۆستا کار بکات بۆ چارەسەرکردنی بەوەی کە گونجاوە لە ئەدەبدادان و سەرزەنشتکردن و لۆمە و سزا. بەگشتی نابێت مامۆستا تەنها زانست فێری خوێندکارانی بکات، بەڵکو زانست و ڕەوشت بەیەکەوە ((وەك چۆن بەرژەوەندییەکانی ئایینەکەیان فێر دەکات بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خودای گەورەدا، ئاواش بەرژەوەندییەکانی دونیایان فێر دەکات بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکدا، تاکو چاکەی هەردوو بارەکەیان دەست بکەوێت)).[3]

دەبێت مامۆستا بەتەواویی خۆی یەکلایی بکاتەوە بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکەکەی و بە هیچ شتێکەوە خۆی سەرقاڵ نەکات جگە لە چاودێریی خوێندکارانی و گرنگیدان بە کاروباریان. (ابن سحنون) دەڵێت: "ناگونجێت بۆ مامۆستا بە شتێکەوە سەرقاڵ بێت جگە لە خوێندکارەکانی، مەگەر کاتێك کە لەگەڵی نەبن — واتا کاتی فێرکردنیان نەبێت."[4]

---

[1]– هەمان سەرچاوە.

[2]– محمد عطية الإبراشي: التربية الإسلامية وفلاسفتها، البابي الحلبي، القاهرة (ص ٤٠٠، ٤٠١).

[3]– محمد عطية الإبراشي: التربية الإسلامية وفلاسفتها، البابي الحلبي، القاهرة (ص ٤٠٠، ٤٠١).

[4]– هەمان سەرچاوە (ص ٢٤).

زانایانی موسڵمانی بواری پەروەدەیی وایان بینیوە کە جائیز نییە مامۆستا لە کاتی کارەکەیدا سەرقاڵ بێت بە هیچ شتێکەوە، مەگەر فێرکردنی خوێندکارەکانی نەبێت، دەنا ئەو پارەیەی وەری دەگرێت دەبێت بە پارەیەکی تێکەڵ بە حەرام، بۆیە پێویستە مامۆستا تێبکۆشێت تاکو ئەوەی لەسەریەتی بیگەیەنێت بە خوێندکاران (لە فێرکردن و سەرپەرشتی) جا ئەگەر وای کرد ئەوا ئەو پاداشتەی وەری دەگرێت لەسەری تەواو پاك و دوورە لە حەرام... با بشزانێت کە ئەگەر کەمتەرخەمیی کرد لە گەیاندنی ئەوەی لەسەریەتی، ئەوا ئەوەی وەری دەگرێت مافی خۆی نییە[1]، هەروەها پابەندبوونی مامۆستا بە پیشەکەیەوە ((دەچێتە باری ئەو گرێبەستانەوە کە خودای گەورە فەرمانی پێ کردووین بەجێیان بگەیەنین و چاودێریکردنی ئەوانەی چاویان لەو کردووە وەك مامۆستای خۆیان دەچێتە ژێر فەرموودەی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر): ((کلکم راع وکلکم مسؤول عن رعيته)) واتە: (هەمووتان شوانن و هەمووشتان لێپرسراون لەبارەی ژێردەستەکانتانەوە). دەبێت بشزانێت کە ئەگەر بە ئەرکی خۆی هەستێت بەرامبەریان و بە ئامۆژگاریکردنیان و گەیاندنی ئەوەی ئەرکە لەسەری پێیان، ئەوا دەچێتە ژێر فەرموودەی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر): ((أيما مملوك أدى حق مواليه وحق ربه فله أجران)) واتە: هەر خاوەندارێك مافی ژێردەستەکانی و مافی خودای بەجێ گەیاند، ئەوا دوو پاداشتی هەیە)).[2]

وە لە باشیی چاودێریکردنیشیان ئەوەی لەگەڵیاندا نەرمونیان بێت، لە عائیشە دایکی باوەڕدارانەوە (ڕەزای خوای لەسەر) هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) فەرموویەتی: ((اللهم من ولي من أمر أمتي شيئا فرفق بهم فارفق بك)) واتە:

---

[1]- هەمان سەرچاوە (ص ٩٤، ٩٥).

[2]- هەمان سەرچاوە (ص ٩٤، ٩٥).

خودایە هەرکەس کارێکی ئوممەتەکەمی پێ سپێردرا و ئەویش لەگەڵیاندا نەرمونیان بوو، تۆش نەرمونیان بە لەگەڵیدا. هەروەها پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر) فەرموویەتی: ((إن الله يحب الرفق في الأمر كله وإنما يرحم الله من عباده الرحماء)) واتە: خودای گەورە حەزی لە نەرمونیانییە لە هەموو کارێکدا و خودای گەورە لە بەندەکانیدا هەر سۆز و بەزەیی بۆ ئەوانە دەبێت کە خۆیان بەسۆز و بەبەزەیین.[1]

هەروەها زانایانی موسڵمانی بواری پەروەردە هۆشدارییان داوە لەوەی مامۆستا دادپەروەر نەبێت لەنێوان خوێندکارەکانیدا: هەژار و دەوڵەمەند، بەهۆی ئەوەی دەوڵەمەندەکان توانای ئەوەیان هەیە بەخشش بدەن بە مامۆستاکان، کە لەوانەیە کار لە پەیوەندیی زانستیی مامۆستا بە خوێندکارەوە بکات. چونکە دەگێڕنەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، کە پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەر) فەرموویەتی: ((أيما مؤدب ولي ثلاثة صبية من هذه الأمة فلم يعلمهم بالسوية فقيرهم من غنيهم، وغنيهم من فقيرهم، حشر يوم القيامة من الخائنين)) واتە: هەر پەروەردەکارێك کاری سێ منداڵی ئەم ئوممەتەی پێ بسپێردرێت و وەك یەك فێریان نەکات، هەژار وەك دەوڵەمەند، دەوڵەمەند وەك هەژار، ئەوا ڕۆژی دوایی لەناو ناپاکاندا حەشر دەکرێت.[2]

باسەکەمان درێژە دەکێشێت ئەگەر باس لە هەموو خەسڵەتە ڕەوشتیی و زانستییەکانی مامۆستا و ئەوەی دەبێت پێی ڕازابێتەوە بکەین، لە توانا و مەعریفەی پەروەردەیی بەو شێوەیەی کە لە کتێبەکانی کەلەپوورماندا هاتوون، کە کۆمەڵێك تایبەتمەندین لە بەهای مامۆستا زیاد دەکەن و بەرزی دەکەنەوە بۆ

---

[1]– هەمان سەرچاوە (ص ٩٤، ٩٥).

[2]– محمد عطية الإبراشي: التربية الإسلامية وفلاسفتها، البابي الحلبي، القاهرة (ص ٢٠، ٢١).

پلەیەکی باڵا بە هەر پێوەرێك بپێورێت. گومانی تێدا نییە لەڕێی کۆمەڵێك مامۆستاوە کە ئەو خەسڵەتانەیان لە خۆیاندا بەرجەستە کردووە ژیاریی عەرەبی گەشاوەمان بنیات نرا و ئەمیش زۆری بە ژیارەکانی تر بەخشی و چەندین سەدەی دووردرێژ بەردەوام بوو لە بەخشش، تا ئەوکاتەی زانایانی پەروەردەی ئیسلامیی کەمتەرخەمییان کرد لە ((مەرجەکانی مامۆستایەتی و پێگەیاندن)) و ڕەوشت و ئەرکەکانیدا، بەو هۆیەشەوە پلەوپایەی زانست و زانایان لێك ترازا و زانست و مەعریفەکان چەقیان بەست و ژیانی عەقڵی و ئایینی و دونیایی تێك چوون. باری ئەم ئوممەتەش سەرلەنوێ ڕێك نابێتەوە، تەنها بەوە نەبێت کە باری سەرەتای ئوممەتەکەی پێ ڕێك بوو، ئەویش: نەوەی نوێ لە مامۆستا، کە بەرز ببنەوە بۆ ئاستی پەیامەکە و بگەڕێنەوە بۆ وەرگرتن لە کەلەپووری پەروەردەیی و زانستییان لەگەڵ بەدەستهێنانی ڕۆشنبیریی سەردەم و کاری جددیی لەپێناو بووژانەوەیەکی پەروەردەییدا کە ناوازەیی زانستی نوێ و پیرۆزیی باوەڕ و مەزنیی کەلەپووری پەروەردەیی و دەروونیمان بەیەکەوە کۆ بکاتەوە.

ئەو ئەدەبیاتە ڕەوشتییانە خوێندکار و مامۆستای باشیان بە درێژایی سەردەمانی بووژانەوەی ئیسلامیی بەرهەم هێناوە، کە ژیارێکی ئیسلامیی بەرزیان بنیات نا بە درێژایی سەردەم، بۆ نموونە لێرەدا ئاماژە بە هەندێك نووسراوی زانستیی موسڵمانانمان دەدەین، کە دەبوو خوێندکاری موسوڵمان لەنێوان ئەو هەمووە بوارە زانستییە زۆرانەدا بەپێی حەزی خۆی بوارێك بۆ خۆی هەڵبژێرێت وەك: (إحصاء العلوم)ی الفارابی، (مفاتیح العلوم)ی خەواریزمی، (الفهرست)ی ئیبن نەدیم، (مفتاح السعادة ومصباح السیادة)ی طاش کبری زادە، (مقدمة ابن خلدون)[١]. زانایانی موسڵمان ئەو دانراوانەیان پێشکەش کردووە وەك ڕێبەری زانستیی بۆ

[١]– هەمان سەرچاوە (ص ٤٦).

خوێندکارانیان کە تێیدا بوارە جیاوازەکانی پسپۆڕییان باس کردووە و بیرۆکەیەکی کورتیان لەبارەی هەر زانستێکیانەوە باس کردووە لەگەڵ بەناوبانگترین کتێب و لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە هەریەکێك لەو زانستانە بە جیا. هانی زانستخوازانیشیان دەدا لە هەریەکێك لەو زانستانە ئەوە هەڵبژێرن کە حەزیان لێیەتی و بە زانستە گرنگەکان دەستیان پێ دەکرد، پاشان کەمتر و هەروەها بەم شێوەیە، چونکە تەمەنی مرۆڤ سنووردارە و زانستەکانیش زۆرن.

ئەو دانراو و نووسراوانەش تەنها وەك ڕێبەری و ڕێنیشاندەرێکی ئەکادیمی و پەروەردەیی خزمەتیان بە خوێندکارانی خوێندنی ئاستبەرز نەکردووە، بەڵکو وێنەیەکی گشتگیری دا بەو خوێندکارانە لەبارەی زۆریی زانستەکان و سەختیی کۆکردنەوە لەنێوانیاندا، بەوەش جەختی لەو هەستە کردەوە لەلایان کە دەریاکانی زانست فراوان و قووڵن و ئەوەی لە سەروو هەموو خاوەن زانستێکەوە زانایەك هەیە. وە ئەوەی ئەوان هەرچەند هەوڵ و کۆشش بدەن ناتوانن پەی بە هەموو ئەو زانستانە بەرن، لەوانەشە ئەمە گەورەترین وانە بێت لەبارەی خاکیبوونی زانستیی و لەخۆباییینەبوون و بانگەشەنەکردنەوە، تەنانەت لەوانەیە زیادەڕۆییم نەکردبێت ئەگەر بڵێم: ئەو ڕێبەرییانە پاڵنەری خودی مامۆستا گەورەکان بوون بۆ قووڵبوونەوە لە زانستدا، چونکە بۆ هەر لقێك لە لقەکانی مەعریفە گرنگترین سەرچاوە و مەرجەعەکانی دیاری کردووە، بەمەش هەموو مرۆڤێك ئاستی خۆی دەزانێت لە زانستد، و ئەوەی ناوەڕۆك و کرۆکەکان دەخوێنێتەوە لەگەڵ ئەوەی تەنها بە توێکڵەوە قاییل دەبێت هاوئاست نین.

هەروەها تێبینیی دەکەین کە مامۆستایانی خوێندنی باڵا لای موسڵمانان بە ڕوانینێکی پسپۆڕانەی بەرتەسکیان نەبووە لە ئامادەکردنی زانستیدا، بەوەی تەنها لە یەك بابەتدا پسپۆڕ بن، یاخود تەنها لە یەك لقدا، بەبێ بایەخدان بە خوێندنەوەی

فراوان لە زانست و مەعریفەکانی تردا، ئەو مەعریفە پسپۆڕییە تەسکە ((زانای پسپۆڕی یەکڕەهەندیی)) بۆ بەرهەم هێنایین، کە یەکێك لە زانایان بەگاڵتەئامێزەوە لەم بارەیەوە دەدوێت: "زانینی زۆرتر و زۆرتره دەربارەی کەمتر و کەمتر." زانایەکی تریش دەڵێت: "بەردەوام پسپۆڕتر و پسپۆڕتر دەبوو تا وای لێ هات لە هیچدا بوو بە پسپۆڕ".

خوێندنەوەیەکی خێرا بەناو ژیاننامەی زانا موسڵمانەکاندا بە هەر پسپۆڕییەك بەناوبانگ بووبن، ئەوەمان لا دڵنیا دەکاتەوە کە هەموویان خاوەن پسپۆڕیی فراوان بوون. سەرەڕای بەناوبانگبوونی یەکێکیان بە فیقه و ئەدەب یان پزیشکیی یان فەلسەفە یان کیمیا... هتد زۆر دەگمەنە کە هەموو بایەخدانێکی تەنها لەو زانستەدا بووبێت کە تێیدا بەناوبانگ بووە، بەڵکو هەمیشە بازنەی بایەخدانی زانستییان فراوان بووەتەوە تا لێکۆڵینەوەی هاودەمی لە سروشت و سیاسەت و ڕەوشت و گەردوونناسیی... هتد گرتووەتەوە، (براون) و هاوئاوازەکانی بەهەڵەدا چوون کاتێك ئەوە دەگەڕێننەوە بۆ ئەوەی کۆی مەعریفەکان لە سەردەمە ئیسلامییەکاندا زۆر زەبەلاح نەبوون، بە جۆرێك ئەم زانستانە هەمووی لە توانای تێگەیشتنی تەنها کەسێکەوە بەدەر بن[1]، هەر ئەو کتێبانەی پۆلێنکردنی زانستە ئیسلامییەکان کە ئاماژەمان پێ دا ئەم قسەیە هەڵدەوەشێننەوە و نزیکتر لە ڕاستی ئەوەیە کە سیستمی فێرکردنی ئیسلامیی بەندە لەسەر خۆشویستن و پیرۆزکردنی زانست لەلایەك و ئازادیی خوێندکار لە هەڵبژاردن و دەستدانە هەر زانستێك کە دەیەوێت، لە لایەکی تر بەبێ ئەوەی ببەسترێتەوە بە قۆناغی خوێندنی دیاریکراوەوە و ئازادی لە گەشتکردن لەپێناو داواکردنی زانستدا، ئەمە لەپاڵ ئەو ئاسانکارییە ماددیی و

---

[1]– إدوارد ج. براون: الطب العربي، ترجمة: أحمد شوقي حسن، مؤسسة سجل العرب، القاهرة، (١٩٦٦م)، (ص ١٤٠، ١٤١).

مەعنەوییانـەدا کـە بـۆ خوێنـدکار دەسـتەبەر بـوون لـە سـەردەمی بووژانـەوەی ئیسلامییدا[1]، ئەمانە هەموو هۆکاری ئـەو (بەپیتییـە زانسـتییە) بـوون کـە زاناکـانی موسڵمانان پێی تایبەتمەند بوون لـە گشـت بـوار و پسـپۆڕییەکاندا، بەپیتییـەك کـە چـڕی نووسـراو و دانراوەکانیـان و زۆریـی خوێنـدکارەکانیان و جـۆری ئـەو ژیانـە زانستییەی کە ژیاون و ئەو جێدەستە زانستییەی پاش خۆیان بەجێیان هێشـتووە، هەموو بەڵگەن لەسەر ئەمە.

هیچ خوێنەرێکی ئەکادیمییش ناتوانێـت سەرسـام نـەبێت بـەو ئاسـتە زانسـتییە تایبەتـەی مامۆسـتایانی خوێنـدنی بـاڵای موسـڵمان پێشکەشـیان کـردووە، چ بـە ژمارەی کاتژمێرەکانی وانەگوتنەوە بیپێوین، یان بـە ژمـارەی دانـراو و تازەگەرییـە زانستییەکانیان، یان بەشدارییان لە پەرەپێدانی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، ئەو زانایانـە زۆربەی کاتەکانیان لەگەڵ خوێندکارانیان بەسەر بردووە لە دامەزراوە پەروەردەییە جیاوازەکاندا: مزگەوت، قوتابخانە، بیمارستان، ڕوانگە (المرصـد)، لـەپاڵ ڕۆشـتنی خوێندکاراندا بۆ ماڵی زانایان بۆ لێکۆڵینەوە و گفتوگۆی زانستیی و بەیەکەوەبوونی زیاتر.

(عبداللطيف البغدادي) وێنەیەکمان لەو بارەیەوە پێشکەش دەکات کە دەڵێـت: "ژیانی من لەو ماوەیەدا –ماوەی مانەوەی لە میسر– ئەوە بـوو قورئـان بـە خـەڵك بخوێنم لە مزگەوتی ئەزهەر، لە سەرەتای ڕۆژەوە (ڕاستەوخۆ دوای نوێژی بەیانیی) تاکو کاتژمێر چوار (مەبەستی چوار کاتژمێر دوای نوێژی بەیانییە) و لە ناوەڕاسـتی ڕۆژدا ئەوانە دێن کە دەیانەوێت پزیشـکیی و زانسـتی تـریش بخـوێنن و لـە کۆتـایی

[1]– بۆ وەرگرتنی وێنەیەکی سادە لەبارەی ئاسانکارییە زانستییە دەستەبەرەکان بـۆ زانـا موسـڵمانەکان، بڕوانە: محمد عبد العليم مرسي: مسيرات البحث العلمي عند المسلمين، إدارة الثقافة والنشر، جامعة الإمـام محمد بن سعود الإسلامية، (١٤٠٨م).

ڕۆژدا دەگەڕێمەوە بۆ مزگەوتی ئەزهەر و کۆمەڵێکی تر قورئانم لا دەخوێنن و شەویش لەگەڵ خۆم خەریك دەبم."[1]

واتا (عبداللطيف البغدادي) کاری ئەکادیمیی ڕاستەوخۆ دوای نوێژی بەیانی دەست دەکات بە وانەگوتنەوە لە مزگەوتی ئەزهەر تاکو نزیکەی نیوەڕۆ، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ و تۆزێك پشوو، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ مزگەوتی ئەزهەر لە کۆتایی ڕۆژدا بۆ دووبارە وانەگوتنەوە، شەویش بە خوێندنەوە و بەدواداچوون بەسەر دەبات، وخەریکە ئەمە ژیاننامەی زۆربەی مامۆستایانی خوێندنی بالا بێت لەڕووی زۆریی ژمارەی کاتژمێرەکانی وانەگوتنەوەوە، کە لەپێناو بلاوکردنەوە و پەخشکردنی زانستدا پێی هەستاون.[2]

مامۆستایانی خوێندنی بالا بە شێوازی وانەگوتنەوەوە نەوەستاون، بەڵکو شێوازی گفتوگۆ و دیبەیتی زانستییشیان بەکار هێناوە کە هەندێك جار لەنێوان خوێندکار و مامۆستاکاندا بووە، هەندێك جاریش لەنێوان خودی مامۆستاکاندا، هەر وەك چۆن نووسینیان بەکار هێناوە کاتێك سەرچاوە و ڕاهێنانی کردەیی کەم لە بەردەستدا بوون لەو زانستانەی پێویستیان بە ڕاهێنانی کردەییە، وەك پزیشکیی و فەلەك و کیمیا.

ئەوەتا (أبو المجد أبي الحكم) پزیشکی بیمارستانی گەورە لە دیمەشق –کە نوورەدین زەنکی بنیاتی نا– خەریکی پشکنین و چارەسەرە و خوێندکارەکانی لەدەورین، پاشان لەگەڵیاندا دەڕوات بۆ کتێبخانەی بیمارستانی ئامادەکراو بە هەزاران کتێب و سەرچاوە، بۆ خوێندنەوە و گفتوگۆی حاڵەتەکانی نەخۆشی کە

---

[1]– محمد عبد الله عنان: مصر الإسلامية، مطبعة الخانجي، القاهرة، (١٩٦٩م)، (ص ١٣٢).

[2]– بۆ نموونە بڕوانە: الحياة العلمية لابن سينا في: عبد الرحمن النقيب: فلسفة التربية عند ابن سينا، دار الثقافة، القاهرة، (١٩٨٤م)، (ص ٣٠–٣٨).

پێویستیان بە خوێندنەوەیە. لە هەمان کاتیشدا داوایان لێ دەکات فلانە کتێب بخوێننەوە و پێداچوونەوە بۆ فلانە بۆ فلانە خاڵ بکەن لە فلانە کتێبدا و بەردەوام دەبێت لەگەڵیان لەنێوان کار و خوێندنەوەدا بۆ ماوەی سێ کاتژمێر، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی.[1]

هەر وەك چۆن زانا موسڵمانەکان شێوازی فێرکردنی نامەنووسینیان بەکار هێناوە و کتێبخانەی عەرەبی پڕە لە ناوی نامەی زانستیی و ئەدەبیی کە مامۆستا موسڵمانەکان بۆ خوێندکارەکانیان نووسیوە، وەك وەڵامدانەوە بۆ هەندێك پرسیاری دیاریکراو، یان هەندێك زانا نووسیویانە، وەك وەڵامدانەوەی هەندێکی تریان لەسەر بۆچوونێکی زانستی، یان وەك ڕوونکردنەوەیەك بۆ بابەتێکی ناڕوون و نامە زانستییەکان یەکێك بوو لە بەهێزترین شێوازەکانی پەیوەندی لەنێوان زانایان و خوێندکاران و هەروەها زانایان و هاوڕێیانیان لە پسپۆڕییدا لە هەموو جیهانیی ئیسلامییدا.

زۆر دەگمەنە نموونەی پەیوەندیی نێوان خوێندکار و مامۆستاکەی ببینین بە شێوەیەك نزیك بێت لەو پەیوەندییەی لەنێوان خوێندکار و مامۆستاکەیدا هەبووە لە سەردەمە ئیسلامییە بووژاوەکاندا. مامۆستا وەك کوڕی خۆی مامەڵەی لەگەڵ خوێندکارەکانیدا دەکرد و خوێندکارانیش ڕێزیان لە مامۆستاکانیان دەگرت و شانازییان بەوەوە دەکرد کە خوێندکاری فلانە مامۆستان. وە کاتێك ژیاننامە جیاوازەکان دەخوێنینەوە هەست دەکەین لەبەردەم کۆمەڵێك ((خوێندنگەی زاستی و ئەدەبی))داین، کە زیاتر بەدەوری مامۆستادا دەسووڕێنەوە وەك لەوەی بەدەوری ئەو دامەزراوەیەدا بسووڕێنەوە کە خوێندکارەکەی لێ دەر دەچێت، هەر زانایەك

[1]– عبد الرحمن النقيب: الإعداد التربوي والمهني للطبيب عند المسلمين، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ١٢٢).

دەدرێتە پاڵ مامۆستاكانی فلاّن و فلاّن، لە هەمان كاتدا باس لە خوێندكارەكانی دەكرێت (لە خوێندكارەكانی فلاّن و فلاّنن) واتا ئێمە بەڕاستی لەبەردەم خوێندنگەی زانستی و ئەدەبیداین. گومانیشی تێدا نییە بوونی خوێندنگەی زانستی و ئەدەبیی زۆر، بەڵگەیە لەسەر ئاستێكی زانستی و ئەكادیمیی نایاب.

زۆریی بەرهەمی زانستی و هزری مامۆستایانی خوێندنی باڵا لای موسڵمانان ئاماژەیە بە بوونی ئاستێكی نایاب، چونكە زۆریی ئەم ڕێژەیە سەرسامت دەكات، بەتایبەت ئەگەر باری قورسی وانەگوتنەوەمان لە پێشچاو بێت كە ئەو زانایانە هەڵیان گرتووە. تا ئێستاش لەیادمە كە چۆن سەرسام بووبووم پاش تۆماركردنی نامەی ماجستێرەكەم لەبارەی ((بۆچوونە پەروەردەییەكان لە نووسراوەكانی ئیبن سینادا)) كاتێك بینیم ئەم پیاوە زیاد لە سەد و پەنجا چاپكراو و دەستنووسی هەیە و زۆربەی زانستەكانی سەردەمی خۆی گرتۆتەوە، تەنانەت شیعریش. كە (الأب قنواتي) ناوی ئەو دانراوانەی ژماردووە[١]، بۆ زانینی بەرهەمی مامۆستایانی تری خوێندنی باڵا لای موسڵمانان (ابن سينا) بكە پێوەر.

سەرەڕای ئەو بەرهەمە زانستییە زۆرانە زانایان ڕۆڵی نایابیان هەبووە لە كرانەوەدا بەسەر هەموو ڕۆشنبیرییەكانی سەردەمی خۆیاندا، هەروەها لە وەرگێڕانی هەموو زانست و مەعریفەكان بۆ عەرەبی، پاشان تێپەڕاندنی قۆناغی وەرگێڕان بۆ قۆناغی داهێنان و شارەزایی لە ماوەی دوو یان سێ نەوەدا: نەوەی وەرگێڕان، نەوەی ڕابوون، نەوەی داهێنان، كە ئەوەش كارێكی ژیاریی مەزنە بە هەر پێوەرێكی زانستی بپێورێت. بەڵێ لە پشت ئەوەوە سیستمێكی سیاسی هەبوو كە بڕیاری بەعەرەبیكردن و كۆكردنەوەی هەموو كتێبەكانی دا لە سەرتاسەری جیهانەوە و پێدانی نرخی كتێبە وەرگێڕدراوەكە بە كێشی خۆی لە زێڕ، بەڵام ئەگەر

[١]– الأب قنواتي: مؤلفات ابن سينا، دار المعارف، القاهرة، (١٩٥٠م).

ئیرادەی بەهێزی ئەو زانایانە و شانازیکردنیان بە زمانەکەیانەوە و بەتواناییان تێیدا نەبووایە، ئەو ڕووداوە ژیارییە مەزنە ڕووی نەدەدا.

زاناکان هەر پسپۆڕییەکیان هەبووبێت تا کۆتاسنوور گرنگییان بە زمانی عەرەبی داوە و خەمخۆرییان بۆ زمانی عەرەبی و ڕێزگرتنیان لێی گەیشتبووە ڕادەیەك ڕێیان بە خوێندکارانیان نەدەدا هەڵەی بچووك بکەن لە خوێندنەوەی کتێبە زانستییەکاندا، چ جای کتێبە ئەدەبییەکان، (مهذب الدین عبدالرحیم) —بۆ نموونە— لەپاڵ ئەو کتێبە پزیشکییانەی پێویستی پێ بووە و لەگەڵ خۆی هەڵی گرتوون هەمیشە چەند کتێبێکی زمانییشی پێ بووە وەك: ((الصحاح))ی جەوهەری و ((المجمل))ی ئیبن فارس. هەروەها خەڵکێکی زۆر دەهاتنە دیوەخانەکەی (أمين الدولة ابن التلميذ) و لە بواری پزیشکیدا نووسراویان بۆ دەخوێندەوە و دوو لە نەحوییەکانیش هەمیشە لە دیوەخانەکەیدا بوون خەڵات و بەخششی پێ دەدان، ئەگەر یەکێك لەوانەی دەخوێننەوە هەڵەی نەحوییان زۆر بووایە یان زمانیان گرێی تێدا بووایە، ئەوا دەیدا بە یەکێك لە نەحوییەکان بۆی بخوێنێتەوە و ئەویش گوێی بۆ دەگرت[1]، بێگومان زانیارییان بە زمانی عەرەبی لەپاڵ زمانە بیانییەکانی سەردەمەکەیاندا لە سریانی و یۆنانی و ڕۆمی و فارسی کرداری بەعەرەبیکردنی بۆ ئاسان کردبوون. هەروەها گومانی تێدا نییە کە کرداری بەعەرەبیکردن یارمەتیی بڵاوبوونەوە و پەخشی زانستی داوە و ئاسانی کردووە. وەك چۆن دەروونناسان دەڵێن: وەڵامدانەوەی فێرخوازان بۆ زمانی دایك هەرگیز وەك وەڵامدانەوەیان نییە بۆ زمانێکی بیانی، هەرچەند لەو زمانەشدا شارەزا بن، چونکە وەڵامدانەوەیان بۆ زمانێکی بیانی هەر دەبێت کەموکورتی و هەڵەی تێدا بێت. بۆیە بە زمانی هەژماری ئەگەرەکان دەڵێین:

---

[1]– عبد الرحمن النقيب: الإعداد التربوي والمهني للطبيب عند المسلمين، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ١٦٠).

ئەگەری دەرکەوتنی بلیمەتی و داهێنان لەنێوان ئەوانەی بە زمانی خۆیان بیر دەکەنەوە –لە خراپترین ئەگەردا– زۆرترە لەوانەی بە زمانێکی تر جگە لە زمانی خۆیان بیر دەکەنەوە.[1]

لە کۆتاییدا ئاستی زانستی نایابی مامۆستایانی خوێندنی ئاستبەرز لای موسڵمانان ڕێگر نەبووە لەوەی بەشداریی کایەی سیاسی بکەن و بۆچوونەکانیان دەر ببڕن و سەرکردایەتیی جەماوەر بکەن، کاتێك ئەو جەماوەرە پێویستیان بە سەرکردایەتییەکی هۆشیار بووبێت، لەم بارەشەوە مێژوو هەڵوێستی پرشنگداری بۆ تۆمار کردوون. زانا لە ئیسلامدا –هەر پسپۆڕییەکی هەبێت– لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە تەنها ئەوەندەی لێ داواکراو نییە زانست بگەیەنێت، بەڵکو لێی چاوەڕوان دەکرێت فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە بکات، هەرچەندە ئاستەنگ و ناڕەحەتییش بێنە ڕێی.[2] زاناش هێزەکەی لە زانستی زۆر و زۆریی خوێندکارەکانی و هەروەها لە سەربەخۆیی ماددییەوە لە دەسەڵات و دەسەڵاتدار سەرچاوەی دەگرت، چونکە ئەو سامانانەی بۆ خوێندن وەقف دەکران–بە شێوەیەکی گشتی– بەشی زانا و خوێندکارانی دەکرد و بێنیازی دەکردن لە دەسەڵاتداران، بۆیە بۆ زانست ژیان و خۆیانیان بۆ یەکلایی کردەوە و بە دەستپاکی پێشڕەوی خەڵکیان دەکرد و لە هیچ شتێکدا درۆیان لەگەڵ نەدەکردن.

ئەمانە بەکورتی چەند دیمەنێکی بوون بەخێرایی خستمنە ڕوو بەپێی ئەو

---

[1]– رضوان السيد: كتاب العالم والمتعلم لأبي حنيفة والمنهج التربوي الإسلامي، (ص ١٣)، من أبحاث مؤتمر التربية الإسلامية الذي عقدته اللجنة الدائمة العليا للاحتفالات بالقرن الخامس عشر الهجري بالتعاون مع جمعية المقاصد الخيرية الإسلامية في بيروت، الفترة من (١٠–٢٦ من جمادى الأولى ١٤٠١هـ)، (١٥–٢١ من آذار ١٩٨١م)، جمعية المقاصد الخيرية الإسلامية، بيروت، (١٩٨١م).

[2]– مازن المبارك: اللغة العربية في التعليم العالي والبحث العلمي، مؤسسة الرسالة، بيروت، (١٩٧٣م)، (ص ٤٢).

بارودۆخەی بۆ کۆڕبەندەکە ڕەخساوە و لەگەڵ ئەو کاتەی بۆ من دیاری کراوە، ویستم سەرنجتان ڕابکێشم بۆ گرنگیی ئەنجامدانی خوێندنەوەی هۆشیارانە بۆ ئەو ئاستە نایابەی مامۆستایانی خوێندنی ئاستبەرز لای موسڵمانان پێشکەشیان کردووە، چ لە وانەگوتنەوەدا بووبێت، یاخود لێکۆڵینەوەی زانستی، یان لە خزمەتکردنی کۆمەڵگەدا بووبێت. ئەویش خوێندنەوەیەکە ئەگەر بەقووڵی و لەسەرخۆیی ئەنجام بدرێت دەکرێت زۆر سوودبەخش بێت لە ئاشکراکردنی ڕوانینی نوێ بۆ پەرەپێدانی ئاستی مامۆستای زانکۆ لە زانکۆ عەرەبیە ئیسلامییەکانماندا.

**کۆتایی:**

لە هەموو ئەوەی کە ڕابوورد جەخت دەکەینەوە لەسەر گرنگیی گەڕانەوەمان بۆ قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (درووی خوای لەسەر) و کەلەپووری پەروەردەیی ڕەوشتییمان، ئەگەر بێتو بمانەوێت ویژدانی پیشەیی لای ئەندامانی دەستەی وانەگوتنەوە دروست بکەین لە خوێندنگە و زانکۆ عەرەبی و ئیسلامییەکانماندا و ئەگەر ڕۆژئاوا ئایینی دوور خستبێتەوە وەك سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی دەستخستنی ڕەوشت یان ویژدان، لەبەر هۆکارگەلێك کە پەیوەندیی بە خۆیانەوە هەیە، ئەوا نابێت ئێمە لەم ڕێگایەدا لە پشت ئەوانەوە بڕۆین، چونکە ئیسلامەکەمان توانای ئەوەی هەیە ویژدانی پیشەیی بجووڵێنێت و بەرزی بکاتەوە بۆ پلەی بەرز. لە مێژوودا ئەم کارەی کردووە و ئێستاش هەر خەریکە دەیکات و لە داهاتووشدا هەمان کار دەکات، هەموو ئەوەی لەسەرمانە کاراکردنەوەی ڕۆڵی ئایینە لە پەروەردەی ڕەوشت و ویژداندا، ڕۆڵی پەروەردەی ئایینی ئیسلامیی کارا بکەینەوە بە دەستەواژە و میتۆد و ڕێگاکانی وانەگوتنەوە و چالاکی و کەشی فێرکاری و کۆمەڵگەی بەدەمەوەهاتوو و لە ئامادەنەبوونی ئایینی ڕاستەقینەدا سەختە ویژدان دروست بکەین لە ناوچەی عەرەبی و ئیسلامییماندا، کە لە بنەڕەتدا شوێنی سرووش

و گەیاندنی پەیامە.[1]

[1] – عبد الرحمن النقيب: كيف نعلم أولادنا الإسلام بطريقة صحيحة، دار السلام، القاهرة، (٢٠٠٥م)، (ص ١٩٧– ٢١٦).

# دواكەوتوویی ئافرەت
# یاخود دواكەوتوویی كۆمەڵگە؟[1]

## پێشەكی:

نزیكەی مانگێك پێش ئێستا داوام لێ كرا پڕۆگرامێكی خوێندن ئامادە بكەم كە هێڵە گشتییەكانی پرسی ئافرەتی تێدا باس بكەم، لەپاڵ باسكردنی بارودۆخی پەروەردەیی و ئابووری و ڕامیاری و ڕۆشنبیریی تایبەت بە ئافرەت لە نیشتیمانی عەرەبیدا، بە جۆرێك بتوانرێت ئەم وانەیە لە قۆناغێك لە قۆناغەكانی خوێندندا بخوێندرێت، ئەمە لە كاتێكدا ئامادەكردنی پڕۆگرامێكی لەم شێوەیە بەتەنها كاری تاكێك نییە، بەڵكو پێویستە كۆمەڵێكی شارەزا و پسپۆڕ لە بوارەكانی پەروەردەیی و ئابووری و ڕامیاری و كۆمەڵایەتی و زانستە شەرعییەكاندا پێی هەڵبستن و كاری لەسەر بكەن.

---

[1]– ئەم توێژینەوەیە پێشكەش كراوە بە كۆنگرەی: المرأة في مجتمعاتنا على ساحة أطر حضارية متباينة، كلية الآداب – جامعة عين شمس (١٤–١٦ من نوفمبر ٢٠٠٦م).

ناشبێت ئەم پرۆگرامە تەنها لە لایەنە تیۆرییەکەیدا کورت بکرێتەوە، بەڵکو پێویستە کۆمەڵێك توێژینەوەی ئاماری لەخۆ بگرێت تێیدا تەواوی بارودۆخە ئابووری و رۆشنبیریی و پەروەردەییەکانی ئافرەت لە نیشتیمانی عەرەبیدا رووماڵ بکات، لەپاڵ وەرگرتنی رای شارەزایان سەبارەت بە هۆکارەکانی ئەو بارودۆخە خراپانەی ئافرەتی عەرەبی تێیدا دەژییێت، پاشان دەبێت باس لەوە بکرێت چۆن دەتوانین بە شێوەیەکی زانستی رووبەرووی ئەم هۆکارانە ببینەوە. ئەم کارە زۆر گەورەیە و لە توانای تەنها توێژەرێکدا نییە لە کاتێکی سنورداری وەك کۆنگرە ئەنجامی بدات، بۆیە پێشنیارم کردووە بۆ ئەوانەی بەم کۆنگرەیە هەستاون کۆربەندێك بەتایبەت بۆ ئەم مەبەستە ببەستن تێیدا پلانێك دابنێن بۆ دارشتنی ئەم پرۆگرامە، یاخود بە ئەنجامدانی توێژینەوەیەك هەستن تێیدا باس لە بارودۆخی ئافرەت بکرێت لە جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیدا و هەموو بوارەکانی ژیانی ئافرەت لەخۆ بگرێت، بە جۆرێك بتوانین بۆ دانانی ئەو پرۆگرامەی مەبەستمانە لەم توێژینەوەیە سوودمەند بین.

تا ئەو کاتەی ئەم پرۆژەیە بەو شێوە زانستییە خوازراوە جێبەجێ دەکرێت، من لێرەدا هەوڵم داوە تاووتوێی بارودۆخی ئافرەت بکەم لە جیهانیی عەرەبیدا لەرێی بەریەککەوتن و نزیکبوونەوەی راستەخۆ لەگەڵ واقیعی ئافرەت: وەك دایکێك، وەك ژنێك، وەك کچێك، نەك تەنها توێژینەوەیەکی تیۆری رووت ئەنجام بدەم لە دوورەوە لە ئافرەت بروانێت، هەروەها بە گشتگیری لە گرفتەکانی ئافرەت دەروانێت و نایەت باس لە چارەسەری هەندێك گرفت بکات و وای وێنا بکات کە ئەم گرفتانە تەنها تایبەتن بە ئافرەتان، چونکە زۆرێك لەو گرفتانەی لە کۆمەڵگا عەرەبییەکاندا رووبەرووی ئافرەتان دەبنەوە هەمان ئەو گرفتانەن کە رووبەرووی پیاوان دەبنەوە. ئافرەتان و پیاوانیش تەنها پێکەوە و لە یەك سەنگەردا دەتوانن رووبەرووی ئەم

گرفتانە ببنەوە، نەك لە سەنگەری جیاواز و دژیەکدا.

هەموو ئەو بابەتانەی لە جیهانیی عەرەبیدا سەبارەت بە دواکەوتوویی ئافرەت دەورووژێندرێن بە شێوەیەکی گشتی بەشێکن لە گرفتی دواکەوتوویی ئەم جیهانە — جیهانی عەرەبی— گرفتەکانی ئافرەتیش بەجیا چارەسەر ناکرێن، بەڵکو دەبێت لە چوارچێوەی ژیاریی عەرەبیی ئیسلامیدا و لەڕێی چارەسەرکردنی گرفتەکانی کۆمەڵگاوە چارەسەر بکرێن، بە شێوەیەك تیشك بخاتە سەر ئەو بەها و سەرچاوە هزریانەی لە ژیاریی عەرەیبی ئیسلامیی پرشنگداردا هەن، کە لەڕووی ڕۆشنبیریی و مەعریفی و شارستانێتیدا بەسەر هەموو جیهاندا ڕنگیان دابۆوە، بەتایبەت لە چەرخە زێڕینەکانی ئەم ژیارەدا[1]، دەبێت سەرلەنوێ و لە ئێستاماندا پرشنگ بداتەوە و ڕووناکییەکەی بڵاو بێتەوە، تاکو کەسایەتیی ناوازە و پەیامی ژیاریی ونبوو بۆ پیاوان و ئافرەتانمان بگێڕێتەوە.

بۆیە لەم توێژینەوەیەدا هەوڵ دەدەم بەکورتی و بەپوختی ئاماژە بۆ ئەو ئاڵنگاریانە بکەم کە بە شێوەیەکی گشتی ڕووبەڕووی کۆمەڵگا دەبنەوە، پاشان بە شێوەیەکی تایبەت بوارێکی زیاتر دەڕەخسێنم بۆ باسکردن لەو ئاڵنگارییانەی ڕووبەڕووی ئافرەت دەبنەوە.

**لەم چەند خاڵەدا بەکورتی باس لەو ئاڵنگارییانە دەکەم کە ڕووبەڕووی کۆمەڵگا دەبنەوە:**

[1]- حبيبة البرقاوي: ((مسؤولية المرأة في التنمية من خلال التشريع الإسلامي)) في المرأة والتنمية في الثمانينات، بحوث ودراسات، المؤتمر الإقليمي الثاني للمرأة في الخليج والجزيرة العربية، (٢٨-٣١ من مارس ١٩٨١م)، إشراف وإعداد ونشر يحيى فايز الحداد، الجمعية الثقافية الاجتماعية النسائية، الكويت، (١٩٨٢م)، (ص٥١٥).

١- ئاڵنگاریی ناسنامە: تا ئێستاش ناسنامەی عەرەبیی ئیسلامیمان جێی مشتومڕێکی زۆرە، ئایا لە هەمان کاتدا ناسنامەیەکی عەرەبی و ئیسلامییە یاخود تەنها ناسنامەیەکی عەرەبییە؟ یاخود تەنها نیشتیمانییە؟[1] چ جای ئەوەی ناسنامەیەکی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی بێت کە تا ڕادەیەك بەشەرمەوە لێی دەدوێین. ئەگەر ناسنامەی عەرەبی ئیسلامیی لەناوماندا بەتەواوی ڕەگی داکوتیبایە، ئەوا زۆرێك لەو ئاڵنگارییانە نەدەمان و دەڕەوینەوە کە ڕووبەڕووی ئافرەتان و پیاوانمان دەبنەوە بەهۆی خۆچواندنی ڕووکەشی بێدیدگا بە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواوە، ئەگەر ئەم ناسنامەیە ڕەگی داکوتیبایە، ئەوا بەسانایی دەمانتوانی لە چاخی جیهانگیریدا بژین، بیٚ ئەوەی کەسێتی و ناسنامەی ڕۆشنبیریی و ژیاریمان لەدەست بدەین، ئەو کاتە بەبیٚ هیچ ترسێك هەر شتێکمان مەبەست بووایە لە کەسانی ترمان وەر دەگرت، هەروەها پێشمان دەبەخشین، هەر وەکو چۆن پێشتر بە هەموو متمانە و لێهاتووییەکەوە بە کەسانی ترمان دەبەخشی. بەڵکو ڕەگداکوتینی ناسنامەی عەرەبی ئیسلامیمان بەهێزترین ئامرازێکە تا بتوانین لەڕێیەوە ڕووبەڕووی ئاڵنگاری و گرفتی زایۆنیزم ببینەوە وەك وڵاتێکی داگیرکەری پلاندار لە ناوجەرگەی جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیدا.[2]

٢- ئاڵنگاری پێکەوەگرێدانی ڕەسەنایەتی و سەردەمیبوون، کە ئەم خاڵەش درێژەپێدەری خاڵی یەکەمە: تا ئێستاش کۆمەڵگا عەرەبییەکان نەیانتوانیوە یەکلایی بکەنەوە چۆن ئیسلام لە جوانترین وێنەکانی پێشکەوتنیدا گوزەر دەکات،

---

[1] - محمد محمد حسين: أزمة العصر، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط٣، (١٩٨٧م)، (ص٩٥)، وما بعدها، عبد الرحمن النقيب: ((تعارض الولاء في التعليم المصري في الفترة ١٨٨٢-١٩٧٠م))، دراسة حالة، في بحوث في التربية الإسلامية، دار الفكر العربي، (١٩٨٧م)، (٣/٨٩-١١٠).

[2] - عبد الوهاب المسيري: موسوعة اليهود واليهودية، دار الشروق، القاهرة، (٢٠٠٠م)، (ص٣٤٥) وما بعدها.

هەر لە بیروباوەڕێکی ڕوون و ئاشکرا و ئەو پەرستشانەی کە بەندە بە خوداوە دەبەستنەوە و بەها ڕوەشتییە بڵندەکانی و سیستمە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانیدا کە ئازادی و یەکسانی و دادپەروەریی و پێشکەوتن بۆ خەڵك دەستەبەر دەکەن، هەروەها چۆن گوزەر دەکات لەگەڵ سەردەمیبووندا لە ئەوپەڕی پێشکەوتنی تەکنەلۆژی و زانیاری و کۆمپانیای کیشوەربڕدا. ئەم ئیسلامە پێشکەوتوو و ژیاردۆستە لەسەر دەستی موسوڵمانانی ئێستا بۆتە ئایینێکی لاواز کە توانای پێشخستن و هەستاندنەوە و یەکخستنی ئوممەتی ئیسلامیی نییە. بەڕاستی ئیسلامیی ئێستامان پێویستی بە شۆڕش هەیە[١] و سەردەمیبوونیشمان پێویستی بە ڕەسەنایەتی هەیە.[٢]

٣- هەرەسهێنانی پرۆسەی فێرکردنی ئوممەتی ئیسلامیی لە ئامادەکردنی تاکێکی موسوڵمان تاکو بتوانێت سەردەمیانە و لەگەڵ تەکنەلۆژیادا بژییێت، بێ ئەوەی ڕۆحانیەتی ئیسلام لەدەست بدات، بەڕاستی سیستمی فێرکردن هەرەسی هێناوە لە بەسەردەمیکردنی کۆمەڵگا و وەرگرتنی تەکنەلۆژیا، هەر وەك هەرەسیشی هێناوە لە چاندنی ڕۆحانیەت و بەها بالاَّ تایبەتیەکانی ئیسلام، بۆیە دەبینین بەرهەمی فێرکردنمان کوالێتییەکی نزمی هەیە لە هەردوو ڕووە ماددی و ڕۆحیەکەیدا، ئەو فێرکردنەی پیاوان و ئافرەتانی ئوممەتی ئیسلامیی پێویستیان

---

[١]- في حاجتنا الى تثوير اسلامنا انظر: جمال البنا، نحو فقه جديد، دار الفكر الإسلامي، القاهرة، (١٩٩٥م)، ثلاثة أجزاء، تثوير القرآن، دار الفكر الإسلامي، القاهرة، (١٩٩٣م). يوسف القرضاوي: كيف نتعامل مع القرآن، المعهد العالمي لفكر الإسلامي، القاهرة، (١٩٩٣م). محمد الغزالي: تراثنا الفكري في ميزان الشرع والعقل، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، القاهرة، (١٩٩٦م). محمد الغزالي: السنة النبوية بين أهل الفقه وأهل الحديث، دار الشروق، (١٩٨٩م).

[٢]- في حاجتنا الى تأصيل معاصرتنا انظر: عماد الدين خليل: حول تشكيل العقل المسلم، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، القاهرة، (١٩٩٢م). عبدالحميد أبو سليمان: أزمة العقل المسلم، مرجع سابق، (١٩٩٣م).

پێیـەتی جـۆرە فێرکردنێکـە توانـای هـەبێت ئامادەیـان بکـات بـە جۆرێـك لەگـەڵ سـەردەمی خۆیانـدا بگـونجێن بـێ ئـەوەی لـە ڕۆحانیـەت و ڕۆشـنبیریی ئیسـلام بیبێبەشـیان بکـات. ڕۆژهـەلات و ڕۆژئـاواش بـەهۆی نـەبوونی ئـەم ڕۆحانیەتـە نموونەییەوە دەناڵێنن لە پەروەردەکردنی تاك ڕوانگەی مرۆڤدا[1]. ئێستا گـەورەترین ئاڵنگارییـەك ڕووبـەڕووی ئوممـەتی ئیسـلامیی دەبێتـەوە خـۆی دەبینێتـەوە لـە سەرلەنوێ داڕشتنەوەی شێوازی فێرکردن، بە جۆرێـك لـە هـەمان کاتـدا فێرکردنـی زانست و تەکنەلۆژیای سەردەم هاوشانی فێرکردنی ئیسلام بە شـێوەیەکی گشـتگیر و تێروتەسەل دابین بکات کە ئەمەش پێویستی بە کۆشش و نوێگەرییەکی زۆر هەیە لـە بـواری پـەروەردەدا.[2] لـە ئێسـتاماندا هـیچ پاسـاوێك نییـە بـۆ جیاکردنـەوەی دامـەزراوەی خوێندنـە ئایینییـەکان و دامـەزراوەی خوێندنـە شارسـتانێتییەکان لـە قۆناغەکانی فێرکردنی پێش زانکۆدا، بە هەمان شـێوە ئـەو هەوڵانـەی بـۆ نوێگـەری دەدرێن لە فێرکردنی ئایینیـدا لـە ئاسـتی پێویسـتدا نـین، بـەڵکو ئـەوەی ئوممـەتی ئیسلامیی پێویستی پێیەتی بریتییە لە فێرکردنێك هەردوو جـۆرە خوێندنەکـەی لـە خۆیدا یەك خستبێت و بۆ هەمووانیش کراوە بێت لـە نێـر و مـێ و گـەورە و بچـووك هەریەکەیان بەپێی توانای عەقڵی و ئەو پاڵنەرەی بۆ خوێندن هەیانە.

٤- ئاڵنگارییـەکی گشـتی هەیـە کـە ڕووبـەڕووی تێکـڕای ئوممـەتی ئیسـلامیی دەبێتەوە ئەویش گرفتی کـاری داهێنەرانـە و زیـادکردنی بەرهەمـە، هەرکەسـەو لـە جێـی خـۆی، لەگـەڵ دادپـەروەریی لـە دابەشـکردنی سـاماندا و زاڵبـوونی ڕۆحـی

---

[1] - في الحضارة العلمانية أحادية الجانب، انظر: عبد الوهاب المسيري: موسوعة اليهود واليهودية، (١/١٩١) و ما بعدها.

[2] - عبد الرحمن النقيب: منهج التربية الإسلامية والعلمية في التربية الإسلامية رسالة ومسيرة، دار الفكر العربي، (١٩٩٠م)، (ص ١٥٥-١٨٠).

خۆشەویستی و هاریکاری و دەستەبەری کۆمەڵایەتی لەنێو کۆمەڵگەی عەرەبیدا. لێرەدا جارێکی تر گرنگیی ڕۆڵی فێرکردن بەدیار دەکەوێت وەك ئامرازێك بۆ وردکاریی زیاتر لە کارکردندا، بۆ باشترکردنی کوالێتیی بەرهەمەکان و بڵاوکردنەوەی بەهاکانی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و چاندنی بەهاکانی خۆشەویستی و هاریکاری و دەستەبەریی کۆمەڵایەتی، ئەمانەش هەموویان بەهاگەلێکی ئیسلامیی ڕەسەنن و ئوممەتی ئیسلامیی لەو ئاڕاستە و ڕێبازە مادديانە دەپارێزێت کە قوربانیی بە دادپەروەریی کۆمەڵایەتی دەدەن لەپێناو ئابووریی زیاتر و دەسەڵاتی فراوانتری کیشوەربڕ.

٥- ئاڵنگاریی پەرەپێدانێکی گشتگیر ڕووبەڕووی هەموو تاکێکی کۆمەڵگای عەرەبی دەبێتەوە: لە پیاو و ژن و پیر و لاو و منداڵ و شارنشین و گوندنشینەکان. مەبەستیش لەم پەرەپێدانە گشتگیرە هەمان پەرەپێدانی گشتگیری ڕۆژئاوایی نییە، بەڵکو دەبێت ڕەهەندی ڕۆحی و ئاییني بۆ ئەم لایەنە ماددییە زیاد بکرێت[1]. بەڵکو ئەوەی جێی سەرنج و تێڕامانە ئەوەیە کە ڕەهەندی ئاییني بەبێ هیچ گومانێك گەورەترین بزوێنەرە بۆ ئەنجامدانی پەرەپێدانێکی گشتگیر لە کۆمەڵگا عەرەبییەکاندا. ئەم ڕەهەندە پاڵنەر و بزوێنەر و بەرزکەرەوەیە، هەرکەسێکیش مێژووی ئەم ناوچەیە بخوێنێتەوە دەبینێت هەموو کات لە هەموو شۆڕش و تێکۆشان و سەرکەوتنێکدا و لە بنیاتنانی شارستانێتیەکاندا سرووشیان لە ئایین وەرگرتووە، ئەمەش لە بنیاتنانی ژیاریی فیرعەونییەکان و بنیاتنانی ژیاریی ئیسلامیی و هەروەها لە بەرپەرچدانەوەی داگیرکەراندا بە درێژایی مێژوو بەئاشکرایی بەدی دەکرێت. ئێمەش ناتوانین پەرەپێدانێکی گشتگیر ئەنجام بدەین مەگەر بە

---

[1]- عبد الرحمن النقيب: ((منهج التربية الإسلامية في التنمية)) في بحوث التربية الإسلامية، دار الفكر العربي، (١٩٧٧م)، (١/٣٨-٥٢).

شێوەیەکی دروست پاڵنەری ئیسلامیی بەگەڕ بخەین بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە. تاکو ئێستا هەموو ئەزموونەکانی وەك سەرمایەداری لیبڕاڵی و کۆمۆنیستی ناسری و بەعسی و هەموو ئەزموونەکانی تر هەرەسیان هێناوە لەوەی لە جیهانیی عەرەبیدا ئەم پەرەپێدانە گشتگیرە ئەنجام بدەن. بۆیە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە پاڵنەری ئیسلامیی بە شێوەیەکی دروست تاقیی بکەینەوە بۆ بەدیهێنانی پەرەپێدانێکی ژیاریی گشتگیری ئیسلامیی تاکو ببێتە مایەی خێر و خۆشی پیاوان و ئافرەتانمان.

ئەوەی باسمان کرد پوختەیەك بوو لە هێڵە گشتیەکانی ئەو ئاڵنگارییە گرنگانەی ڕووبەڕووی پیاوان و ئافرەتان دەبنەوە لە کۆمەڵگا عەرەبییەکاندا.

**ئێستاش بە شێوەیەکی تایبەت باس لە گرنگترین ئاڵنگارییەکان دەکەین کە ڕووبەڕووی ئافرەتان دەبنەوە:**

**یەکەم:** ئەو ئاڵنگارییانەی سەرچاوە دەگرن لە نەشیاویی سیستمی فێرکردن لە ئامادەکردنی ئافرەتاندا تاکو بتوانن ڕۆڵە جیاوازەکانی خۆیان لە کۆمەڵگادا ببینن. لەوانەیە بەلاتانەوە سەیر بێت کە تاکو ئێستاش ڕۆڵی ئافرەت لە ژیاندا ناڕوونە و لەسەری ڕێك نەکەوتوون. ڕۆجیێ گارودیش بێزاریی خۆی دەر دەبڕێت لەبارەی بەکەمنرخاندنی ڕۆڵی ئافرەت لەناو ماڵی خۆیدا بەرامبەر بە ڕۆڵی لە دەرەوەی ماڵەکەیدا، لە کاتێکدا ئەو ڕۆڵەی لە دەرەوە دەیبینێت گرنگییەکەی کەمترە لەو ڕۆڵەی لە ماڵی خۆیدا دەیبینێت و دەڵێت: "بەڕاستی بێ هۆ و بێ مەبەست نییە کاتێك باس لە کاری ناو ماڵ ناکرێت تەنانەت لە کۆی داهاتی ناوخۆیی و نیشتیمانییشدا باسی لێوە ناکرێت (لە کاتێکدا کاری ماڵەوە سێ-یەکی کاری نیشتیمانی پێك دەهێنێت) وەك بڵێیت ئەم جۆرە کارە هیچ بەشدارییەك ناکات لە پێکهێنانی سامانی نیشتیمانیدا، لە کاتێکدا بەشێکی سەرەکیی ئەم سامانە پێك

دەهێنێت، ئەوەشی جێی سەرنجە کاتێك ئافرەتان لە کاری ماڵەوە (بێ کرێ) دێنە دەرەوە، ئەوا زۆربەی کات ڕوو لەو کارانە دەکەن کەوا کرێکانیان زۆر کەمە و بۆیان نەشیاوە و زیاتر پاشکۆ دەبن"[1].

لە فەرەنسادا توێژەرێك هەستا بە هەژمارکردنی کۆی ئەو کاتژمێرانەی پیاوان و ئافرەتان وەك هێزی کاری فەرمی لە دەرەوە بەسەری دەبەن لەگەڵ هەژمارکردنی کاتژمێری ئەو کارانەی ئافرەتان لە کاری ماڵەوەیاندا بەسەری دەبەن لە ماوەی ساڵێکدا، تێبینی کرد لە ماوەی ئەو ساڵەدا یەکەمیان (٤٣٠٠٠) کاتژمێر و دووەمیان (٤٥٠٠٠) کاتژمێرە، بۆیە پێشنیازی کرد گرنگیی بدرێت بە خوێندنی ماڵداری بۆ پیاوان و ئافرەتان لە قۆناغی دواناوەندیدا[2]. بەهەمان شێوە لە توێژینەوەیەکی تردا سەرەڕای ئەوەی لایەنگیری لە کاری ئافرەت دەکات لە دەرەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باس لەوە دەکات کە ئافرەتان نزیکەی نیوەی دانیشتوانی گۆی زەوی پێکدەهێنن، بەڵام دوو لە سێی کاتژمێری کارەکانی هەموو مرۆڤەکان ئەوان ئەنجامی دەدەن لەوانەش کاری ناو ماڵ و کشتوکاڵ و کارە دەستیە ساکارەکان[3]. بە واتایەکی تر کاری ئافرەت لە ماڵەوەدا وەك بەڕێوەبەری ماڵ و وەك خێزان و پەروەریاری منداڵ گرنگیەکەی هیچی کەمتر نییە لە کارکردنی لە دەرەوەی ماڵدا. سەرەڕای ئەوەش ئەو فێرکردنەی ئێستا بە ئافرەتان پێشکەش دەکرێت ناتوانێت بە شێوەیەکی گونجاو ئامادەی بکات بۆ ئەوەی ببێتە خێزان و دایك و پەروەریاری منداڵ سەرەڕای گرنگیی زۆری ئەم ڕۆڵە کۆمەڵایەتیە و ئەو شارەزایی و لێهاتووییەی

---

[1]- روجيه جارودي: في سبيل ارتقاء المرأة، دار الآداب، بيروت، (١٩٨٨م)، (ص ٩,١٠).

[2] –Jac Queline Chaboud: the Education and Advancement of Women, UNESCO, Paris, (p.87).

[3]- حيدر إبراهيم علي: ((إدماج المرأة في خطط التنمية)): مشاكل وإمكانات في: المرأة والتنمية في الثمانينات، بحوث ودراسات، سەرچاوەیەکی پێشوو (ص ٦٤).

که بۆ بینینی ئەم ڕۆڵە پێویستی پێ دەبێت.

بەلاّم لە ژێر ناوی یەکسانیدا هەموو ئەم ڕاستییانە پشتگوێ دەخرێن و ئافرەتان لەم کارە بێبەش دەکرێن بە بێ بوونی هیچ بەڵگەیەکی زانستی یاخود ئـەزموونێکی پشـت ڕاسـتکەرەوە. لـەم لایەنـەوە یـەکێتی سـۆڤیەت بـە یـەکێك لـە ولاّتـە پێشکەوتووەکان دادەنرا چونکە باوەڕی بە فێرکردنی ئافرەت و یەکسانی تـەواویان هەبوو لە گەڵ پیاواندا بە تایبەتی لە بواری کارکردندا بە شێوەیەك بەرزترین ڕێژەی ئەنـدازیاری ئافرەتیـان هـەبوو لـە هـەموو جیهانداکـە نزیکـەی (٣٦٪)ی هـەموو ئەندازیارەکانی یەکێتی سۆڤیەتیان پێـك دەهێنـا و ڕێـژەی (٤٥٪)ی هـەموو بەشـە زانستیەکان و (٧٠٪)ی هەموو مامۆستاکان و (٨٠٪)ی ڕێژەی هـەموو پزیشـکەکانی یەکێتی سۆڤیەتیان پێکهێنابوو، بەلاّم دواتر گەڕانەوە بۆ تاووتوێکردنی ئەم بابەتە و بە پێویستیان زانی کچان پرۆگرامی خوێندنی تایبەت بە خۆیان هەبێت و لەگەڵ ئەو ڕۆڵە کۆمەلاّیەتییەی وەك ئافرەتێك هەیانە بگونجێت[١].

بە هەمان شێوە ئافرەتانی ئێمـە پـەروەردە و فێرکردنێکـی تـەواوی ئیسـلامیان پێشکەش ناکرێت تا بتوانن لە هەموو بوارەکانی ژیانیاندا بە ئەرکە ئیسلامییەکانیان هەستن و پێوەی پابەندبن و ئەمەش وایان لێ دەکـات جێـی ڕەخنـە بـن و نـەتوانن بەشداری لە بانگەوازی ئیسلامیی و چاکسازی کۆمەلاّیەتیدا بکـەن، ئەوەشـی زیـاتر ئەم گرفتەی قووڵتر کردۆتەوە بێبەشکردنی ئافرەتان بووە لە خوێندنی ئەزهـەر بـۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لە مێژووی نوێی میسردا، بە هەمان شێوە لە هاتوچـۆکردنی مزگەوتەکانیش بێبەشکراوە و بواری بۆ نەڕەخساوە بە باشی لە کاروباری ئاینەکەی شارەزا بێت کە لە دەرئەنجامدا بۆتە هۆی ئەوەی بە ئاسانی بەڕووی داب و نـەریتی ڕۆژئاوادا بکرێنەوە و لە ڕەفتار و جل و بەرگ و خەو و خۆراکیانـدا چـاو لـە ڕۆژئـاوا

---

[١]- J. Chaboud: Op cit. (p.100).

بکەن ئەمەش مەترسیەکی گەورە لەسەر پرۆسەی پێگەیاندنی نەوەکانی داهاتوومان دروست دەکات و لاوازیان دەکات لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئاڵنگارییەکانی سەردەم[١].

لێرەدا تاووتوێکردنی ئەوەی ئایا کامیان باشتر و گونجاوترە پەیوەندیدارە بە بابەتەکەوە: خوێندنی تێکەڵاو (Co-Education) باشترە یاخود خوێندنی جیاکراوە (Separate Education) ئەگەر هاتوو هیچ پێویستیەك بۆ تێکەڵکردنیان نەبوو؟ ئایا وا باشە ئافرەتان هەمان ئەو زانستانە بخوێنن کە پیاوان دەیخوێنن یاخود باشتر وایە ڕەچاوی ڕۆڵی کۆمەڵایەتی هەردوو ڕەگەز بکرێت لە کاتی دانانی پرۆگرامەکانی خوێندن؟ ئەمە و چەندین پرسیار و بابەتگەلی دیکە کە باس لە چۆنیەتی ڕێکخستنی شێوازەکانی فێرکردنی ئافرەتان دەکەن نەك باس لە مافی ئافرەت لە خوێندندا.

لەوانەیە بەلای کەسانێکەوە سەیر بێت ئەگەر بزانێت تا ئێستاش لەسەر ئاستی هەموو جیهان ٣٥ وڵات هەن کە هەردوو جۆرەکەی خوێندن لە خۆ دەگرن (تێکەڵاو و جیاکراوە)، ٣٦ وڵاتیش تەنها خوێندنی جیاکراوە لە خۆ دەگرن[٢]، وڵاتێکی وەکو بەریتانیا تا ئێستاش پارێزگاری کردووە لە نیوەی خوێندنگا دواناوەندیە جیاکراوەکانی و وەك خۆی هێشتونیەتەوە[٣]، وڵاتێکی تری وەکو یەکێتی سۆڤیەت لەپاش ئەوەی بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ دژایەتیی خوێندنی جیاکراوەی کرد لەم بۆچوونەیان پەشیمان بوونەوە و پەییان بە دیوی دووەمی ئەم جۆرە خوێندنە و سوودەکانی برد بۆ کچە خوێندکارەکان لەڕووی زانستی و دەروونییەوە، لە کاتێکدا

---

[١]- زيدان عبدالباقي: المرأة بين الدين والمجتمع، مطبعة السعادة، القاهرة، (١٩٨١م)، (ص ٩)، أحمد ابن محمد بن عبد الله أبابطين: المرأة المسلمة المعاصرة، إعدادها ومسؤوليتها في الدعوة، دار عالم الكتب للنشر، الرياض، (١٩٩١م)، (ص ١٤٧-١٥٢).

[2]- J. Chaboud: Op. Cit. (p. 52).

[3]- Ronald King: Education of Girls, longman, London, 1972, (p.7).

له هەموو ولاّتان زیاتر یەکێتی سۆڤیەت باوەڕی بە فێرکردنی ئافرەتان و یەکسانیان هەبوو لەگەڵ پیاواندا بە تایبەتی لەم بوارەدا[1]، ئایا ئەمە نابێتە هۆکار بۆئەوەی دووبارە و بە شێوەیەکی پراکتیکی لەم پرسە جێبایەخە تێبفکرین و بیر لە ئامادەکردنی ئافرەتان بکەینەوە لەڕێی فێرکردنەوە؟

له کۆتاییدا و لەم سەردەمەی ئێستاماندا که زۆر باس دەکرێت له فێرکردنی تاك و فێرکردنی کەسی و فێرکردنی کراوە (Open System) و فێرکردن بە درێژایی ژیان و خوێندنگەی بێ پۆل یاخود بێ قۆناغ (Ungraded School) کە خوێندکارەکان بەپێی توانا و لێهاتووییان فێردەکرێن نەك بە پێی پۆلێنی قۆناغ و پۆلەکانی خوێندن یاخود بە پێی پلە بەندییەکی چەقبەستوو، بەمەش دەرگای خوێندن بە ڕووی هەمووانـدا والاّ دەبێت، هەریەك بەپێی توانا و لێهاتوویی و پێویستییە کۆمەلاّیەتییەکانی خۆی، ئایا ئەمە پێویستی ناکات لەسەرمان چاوێکی زانستی بەسەر پلەبەندی خوێندنماندا بخشێنینەوە و وای لێ بکەین گونجاوتر و کراوەتر بێت و له هەمان کاتدا زیار پێداویستییە ڕاستەقینەکانمان دابین بکات، بەتایبەتی پێداویستییەکانی ئافرەت و ڕۆڵە جیاوازەکەیان له کۆمەڵگادا؟

**دووەم:** بەهۆی نەشیاوی سیستمی خوێندن و دابینەکردنی بۆ پێداویستی و داواکارییەکانی ڕۆڵە کۆمەلاّیەتییە جیاوازەکانی ئافرەت له کۆمەڵگا عەرەبیەکاندا، بایەخێکی زۆر دراوە بە کارکردنی ئافرەت لە دەرەوەی ماڵدا و بە بەرزترین و باشترین پێگەی کۆمەلاّیەتییش هەژمارکراوە، کۆمەڵێك هۆکاری تریش هەن که زیاتر پاڵپشتیی ئەم ئاڕاستەیە دەکەن وەك: بەرزبوونەوەی تێچووی بژێوی و کەمبوونی داهاتی تاك و بەرزبوونەوەی کرێخانوو بە شێوەیەك له توانای کرێچی بەدەر بێت و

[1]- John Newson: The Education if Girls, Faber and Faber Ltd London N. D. (p. 159) & Chaboud, Op Cit. (p.53).

تێچووی پێکهێنانی خێزان و بەرزبوونەوەی نرخی کالاّ و شتومەك و شەپۆلی گرانی، ئەمانە هەموویان لە توانای ئەو گەنجانە بەدەرن کە خاوەن داهاتێکی مامناوەندن، ئەمە چ جای چینی هەژار کە ڕێژەیەکی زۆری کۆمەڵگا پێك دەهێنن، ئەمانەش هەموو هۆکارن بۆ زیادبوونی ڕێژەی ئەو ئافرەتانەی کە ناتوانن هاوسەرگیری بکەن ئەگەر بێت و فەرمانبەر نەبن[1].

هاوشانی زیادبوونی دیاردەی چوونەدەرەوەی ئافرەت لە ماڵەوە بە مەبەستی کارکردن پاڵەپەستۆی دەروونی لەسەر ئافرەت و کێشە و گرفتەکانی زیاتری کردووە، بەم هۆیەوە ناچار دەبێت تا ڕادەیەك مێرد و منداڵەکانی خۆی پشتگوێ بخات لە کاتێکدا بایەخدانی ئافرەت بە منداڵەکانی و خۆشەویستیی بۆ مێردەکەی لە سروشتی ئافرەتە و ئەم جۆرە کارکردنەش پێچەوانەی ئەم سروشتەیە. ئەو هەستەی ئافرەت تووشی دەبێت بەهۆی بێبەشکردنی منداڵەکەی لە سۆزی خۆی هەستێکی ڕاستەقینەیە، ئەمەش تەواو پێچەوانەی ڕای نوسەری فەڕەنسی (ئیلیزابێس پانسر)ە کە لە ((مێژووی دایکایەتی))دا دەڵێت: دایکایەتی تەنها ئەفسانەیەکە پیاوان دایانهێناوە بۆ ئەوەی ڕێ لە پێشکەوتنی ئافرەت بگرن، ئەم ئەفسانەیەش لەگەڵ سەرەتای ئەم سەدەیەدا کۆتایی پێهات پاش ئەوەی دەرکەوت کە دایکایەتی غەریزە نییە بەڵکو ئاکارێکی دەستکردە[2]. گومان لەوەدا نییە هەستکردنی ئەو دایکەی لە دەرەوەدا کاردەکات بە کەمتەرخەمی بەرامبەر بە منداڵەکانی هەستێکی سروشتی و حاشا هەڵنەگرە و لەڕووی دەروونییەوە ئازاری دەدات بەپێی ڕادە و ماوەی دوورکەوتنەوەی لە منداڵەکانی.

گرفتێکی زۆر ڕووبەڕووی ئەو ئافرەتان دەبێتەوە کە لە دەرەوە ماڵدا کاردەکەن

---

[1]- زیدان عبدالباقي: المرأة بين الدين والمجتمع، سەرچاوەیەکی پێشوو (ص ٢٤٣).

[2]- سەرچاوەی پێشوو (ص ٤٢٦).

وەك: ڕەچـاونەكردنی بارودۆخیـان لـە ڕێكارەكـانی گواسـتنەوەدا، ڕێكنەخسـتنی كاتــەكانی كــاركردنی ئافرەتــان بــە شــێوەیەك بتــوانن ڕەچــاوی پێداویســتییە خێزانیـەكانیان بكـەن، گـرفتی هاتوچـۆ كـردن بـۆ ئـەو شـوێنەی كـاری لێدەكـەن، هـەروەها ناوانێنێـت لـە كارەكـەی بـەردەوامبێت بـەهۆی سـكپڕی و منـداڵبوون و تەرخانكردنی كاتی خۆی بۆ مێرد و منداڵەكانی و تـاكو بتـوانن لـە كـار و خوێندنـدا بەردەوامبن و ئەمانە و چەندین گرفتی تریش كە ڕووبەڕووی ئافرەت دەبنـەوە و ڕێ نادەن ئاستی بەرهەمهێنانی ئافرەت بەپێی پێویست بێت[١]. ئەوەندەش بەسە ئاماژە بە ژمارەی ئەو منداڵانە بدەین كەوا لە دامەزراوەكانی تایبەت بە منداڵ سوودمەندن لە نیشتیمانی عەرەبیدا كە ژمارەیان لـە نیـو ملیـۆن منـداڵ تێپـەڕ ناكـات ئەمـە لـە كاتێكدا ئـەو منداڵانـەی تەمـەنیان لـە نێـوان یـەك بـۆ شـەش ساڵە لـە نیشـتیمانی عەرەبیدا ڕێژەیان زیاترە لـە سـێزدە ملیـۆن منـداڵ[٢]، بۆیـە پێویسـتە بەشـێوەیكی بەرفراوان بایەخ بە دایەنگـە و باخچـەی سـاوایان بـدرێت تـاكو منـداڵان لـە هەسـتی بێبەشبوون و دووركەوتنەوە لـە دایكیـان بپـارێزرێن بـە درێـژایی ئـەو ماوەیـەی كـە دایكانیان لە دەرەوەدا كاردەكەن.

دەتوانین لە ڕێی یاسا و یاسا دانانەوە چارەسەری زۆرێك لەو گرفتانە بكەین كـە ڕووبەڕووی ئافرەت دەبنەوە بەهۆی كاركردنیان لە دەرەوەی ماڵدا ئەمە ئەگەر ئێمە هـەر سـووربووین لەسـەر كـاركردنی ئـافرەت لـە دەرەوەدا، بـەڵام لـە ڕێـی ئـەم

[١]– بۆ وردەكاریی زیاتر لەبارەی كێشـەكانی ئـەو ئافرەتانـەوە كەلـەدەرەوەی مـاڵ كاردەكـەن بەنموونـە بڕوانە: زیدان عبـدالباقي: المـرأة بـين الـدين والمجتمـع، سەرچـاوەیەكی پێشـوو، (ص ٣٩٤، ٤٢٩، ٤٨٥، ٤٩٤)، سعاد إبراهيم عيسى: الآثار السلبية التي تنجم عن خـروج المـرأة للعمـل، والسـبل الكفيلـة لمواجهـة هذه الآثار، في المرأة والتنمية في الثمانينات، بحوث ودراسات، سەرچاوەیەكی پێشوو (ص ٧٧٣–٧٩٣).

[٢]– ساهرة سميح النابلسي: التعزيزات المقدمة للمرأة العاملة في الأردن في ((المرأة والتنميـة في الثمانينـات، بحوث ودراسات))، سەرچاوەیەكی پێشوو (ص ٨٤٦).

توێژینەوەوە داواکارم دووبارە بەم ئاڕاستەیدا بچینەوە لە ژێر ڕۆشنایی ئەوەی ئایا ئێمە تا چەند پێویستمان بە دەستی کاری ئافرەتانە لە دەرەوەی ماڵدا و چۆن دەتوانین بە باشترین شێوە لە تواناکانی ئافرەت سوودمەندبین لە نیشتیمانی عەرەبیدا و هەمان قسەی ڕۆجیێ گارودی بکەینەوە کە دەڵێت: ((داواکردنی یەکسانی لە نێوان پیاوان و ئافرەتاندا قۆناغێکی گرنگ و پێویست بوو و بەهیچ شێوەیەك نەدەکرا دەستبەرداری ببین، بەلاَم لەم ڕۆژگارەدا داواکردنی مافی جیاوازبوون و جۆرێتی بوون جێگرەوە و ئەڵتەرناتیڤی داواکاری یەکەمە))[١].

تێکەڵکردنی ئافرەت لەگەڵ ڕەوڕەوەی بەرهەمهێنانی نیشتیمانیدا تەنها بەو مانایە نایەت کە دەبێت ئافرەت لە دەرەوەی ماڵەکەیدا کاربکات، بەڵکو کارکردنی ئافرەت لە ماڵەکەیدا لەڕووی گرنگیەوە هیچی کەمتر نییە لە جۆری یەکەمیان، کاتی ئەوە هاتووە ئەرێنیانە بۆ کاری ئافرەت لە ماڵەکەی خۆیدا بڕوانین و دەرك بەوە بکەین کە کارکردنی لە دەرەوەدا تاکە کارێك نییە ئافرەت بتوانێت لە ڕێیەوە بەرهەمهێن بێت، بەڵکو ئافرەت لە ناو ماڵی خۆشیدا دەتوانێت بەرهەمهێن بێت، تەنانەت لەوانەشە کاری ماڵەوەی گرنگیەکەی زیاتر بێت و ئەوەشی ئەم بابەتەمان زیاتر بۆ یەکلایی دەکاتەوە شوێن پێ هەڵگرتنی ڕۆژهەلاَت و ڕۆژئاوا و چاولێکردنیان نییە بەڵکو ڕادەی پێداویستی نیشتیمان و پێداویستیەکانی خودی ئافرەت خۆیەتی بۆ کارکردنی لە دەرەوە یاخود لە ماڵەوەدا. ئەم پرسەش زۆر گرنگ و جێ بایەخە و پێویستی بە توێژینەوە و پێداچوونەوەی زیاتر و زیاتر هەیە.

**سێیەم:** ئەو ئاڵنگاریانەی سەرچاوە دەگرن لە نالەباری ئەو دیدە ڕۆشنبیریەی

---

[١]– عايدة عبد الرحمن الهواملة: واقع المرأة المسلمة في العالم الإسلامي والعربي: في المنظمة الإسلامية للتربية والعلوم والثقافة، جمعية الدعوة الإسلامية العالمية: ندوة وضع المرأة في العالم الإسلامي، القاهرة، (١٩–١٩٩١/٨/٢١م)، (ص ١٠).

بۆ ئافرەت هەیە نەك بەو شێوەیەی کە ئیسلام خوازیاری بووە، بۆ ئەم مەبەستەش سەیری زۆرێك لەو پرسانەمان کرد کە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ داب و نەریت یاخود فەتوای چەقبەستووی هەندێ زانایان کە نە لە نزیك نە لە دوور پەیوەندیان بە ئیسلامەوە نییە و ئیسلام لێیان بەریە، وەك: بێبەشکردنی ئافرەتان لە خوێندن و پێشخستنی خوێندنی پیاوان بەسەر ئافرەتاندا و بێبەشکردنی ئافرەتان لەوەی پەیوەندی بە ئەزهەرەوە بکەن تا ساڵی ١٩٦٢، و ڕێگری کردن لەوەی لە دەرەوەیماڵەوە کاربکات بەهۆی هەندێك بارودۆخی سیاسییەوە، هەروەها پێنەدانی مافی هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیانی و پێنەدانی مافی تەڵاق ئەگەر هات و لە گرێبەستی هاوسەرگیریدا ئاماژەی بەوە کردبێت مافی تەڵاق بەدەستی خۆی دەبێت، بێبەشکردنی لە مافە سیاسییەکان و تەنانەت کارکردنیش بە پرنسیپی فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە لە ناوەندی ئافرەتانیشدا، ((هەر بۆیە خێزانەکانمان و دایکانمان و ئافرەتانمان زۆر پێویستە هۆشیاربکرێنەوە تاکو بتوانن پەیامەکەیان بە باشترین شێوە بگەیەنن، گومانیش لەوەدا ئافرەتان بۆ هەستان بەم ئەرکە ئیسلامیە لە ناوەندەکانی خۆیاندا زۆر لە پیاوان بە تواناتر و گونجاوترن)).

ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە ڕێی دەقەکانی قورئان و فەرموودەوە هەموو مافێکی بە ئافرەتان بەخشیوە و هەر شتێکیش پێچەوانەی ئەمە بێت سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ داب و نەریتی دواکەوتوو و نەشیاو و فەتوای چەقبەستوو، بۆیە کاتی ئەوە هاتووە ئافرەتانمان لە دەست ئەم داب و نەریت و فەتوایانە ڕزگار بکەین کە لە بنەڕەتدا پێچەوانەی قورئان و فەرموودەی صەحیحن[١].

---

[١]– بەوردەکارییەوە باسم لەو ڕەهەندانە نەکردووە وەرکەس بۆچوونی ئیسلامیی زانستیی بەپێزی بوێت لەوەدا با بگەڕێرەوە بۆ ئەم لێکۆڵینەوە زانستییە گرنگانە:

– عبد الحليم أبو شقة: تحرير المرأ في عصر الرسالة، دار القلم، الكويت، (١٩٩٠م)، سبعة أجزاء.

## کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیە:

لـەم توێژینەوەیـەدا هەوڵمـداوە ڕوونیبکەمـەوە ئـەوەی ئافرەتـانی عـەرەبی و ئیسلامیی بەدەستیەوە دەناڵێنن و گیرۆدەی بـوون بارێکـە تـەنها تایبـەت نییـە بـە ئافرەتان بەڵکو پیاوانیشـی گرتۆتـەوە، بۆیـە ئەگـەر بمانـەوێت بـارودۆخی ئـافرەت باشـتر بکـەین پێویسـتە بـارودۆخی هـەموو کۆمـەڵگا بـاش بکـەین. هـەروەها لـەم توێژینەوەیەدا گرنگترین ئەو ئاڵنگاریانەمان خستنە ڕوو کـە بـە شـێوەیەکی گشـتی ڕووبەڕووی کۆمەڵگا دەبنەوە وەکو ئاڵنگاری ناسنامە و ئاڵنگـاری پێکـەوە گرێـدانی ڕەسـەنێتی و هاوچـەرخیبوون، و هـەرەس هێنـانی پرۆسـەی فێرکردنـی ئوممـەتی ئیسـلامیی لـە ئامـادەکردنی تـاکێکی سـەردەمیانە و داهێنـەر و هـەروەها نـەبوونی پرۆژەیەکی ژیاریی بۆ بەدیهێنانی پەرەپێدانی گشتگیری هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا.
بـە شـێوەیەکی گشـتیش ئـەم بارودۆخـە کۆمەڵایەتیانـە ڕەنگیانداوەتـەوە بەسـەر ئافرەتانـدا و کاریگـەریان دروسـتکردووە لەسـەر بـاری سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و

---

– محمد الغزالي: قضايا المرأة بين التقاليد الراكدة والوافدة، دار الشروق، (ط٥)، (١٩٩٤م).

– جمال البنا: المرأة المسلمة بين تحرير القرآن وتقييد الفقهاء، دار الفكر الإسلامي، القاهرة، (١٩٩٨م).

– احمد بن محمد بن عبد الله أبا بطين: المرأة المسلمة المعاصرة، إعدادها ومسؤوليتها في الدعوة، سەرچاوەیەکی پێشوو.

ئابووری ئافرەتاندا، ئـەم بابەتـەش دەکرێـت زیـاتر تیشـك بخرێتـە سـەری لـە ڕێـی توێژینەوەی وەسفی و ئامارییەوە.

هەروەها لە ڕێی ئەم لێکۆڵینەوەوە داواکارین لە سەرپەرشتیارانی ئەم کۆنگرەیە کۆڕبەندێك ببەستن تایبەت بێت بە لێکۆڵینەوە لـە بـارودۆخی ئافرەتـان لـە هـەموو بوارەکاندا لە جیهـانیی عـەرەبی و ئیسـلامیدا، بـەجۆرێك ئـەو توێژینەوانـەی تێیـدا پێشکەش دەکرێن ببنە ماددەیەکی سەرەتایی بـۆ ئامـادەکردنی کتێبێـك کـە دواتـر ببێتە سەرچاوە لەسـەر بـارودۆخی ئافرەتـان لـە جیهـانیی عـەرەبی و ئیسـلامیدا و هۆکارەکانیشیان دەستنیشـان بکـات، هـەروەها تـاووتوێی ڕێگاچـارەیەك بکـات بـۆ دەرچـوون لـەم قەیرانـە ژیارییـەی ئوممـەتی ئیسـلامیی بەدەسـتیەوە دەناڵێنێـت: پیاوان و ئافرەتان پێکەوە و بەشی ئافرەتانیش بەتەنها لەم قەیرانەدا.

***

# هزری پەروەردەیی
# لە دیدی پێشەوا حەسەن بەننادا[١]

## پێشەکی:

باوەڕناکەم لە سەدەی بیستەمدا کەس هەبێت لە میسر و جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیشدا هێندەی پێشەوا بەننا شایستەی نازناوی پەروەرباری ئوممەتی ئیسلامیی بووبێت، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو هەمووە توانا و بەهرە و کەسێتیە مەزنەی کە خودای گەورە پێی بەخشیبوو، هاوتا لەگەڵ بارودۆخی خێزانی و نیشتیمانی و عەرەبی و ئیسلامیەی کە پاڵنەر بوون بۆ پێشەوا بەننا، هەروەها هەموو ئەوکۆشش و هەوڵ و ماندووبوونەی کە لە بواری پەروەردەییدا و لە سەر هەردوو ئاستی هزری و کردارییدا پێشکەشی ئوممەتی ئیسلامیی کردووە لەماوەی کەمتر لە چارەکە سەدەیەکدا کە خۆی دەبینێتەوە لە سەرەتای دامەزراندنی بزووتنەوەی ئیخوان موسلیمین لە مارسی ساڵی ١٩٢٨ تاکو پەنهانکوژردنی پێشەوا حەسەن بەننا لە ١٢\٢\١٩٤٩ دا، بۆیە نازناوی پەروەریار تەواو شایستەی پێشەوا بەننا بوو.

---

[١]– پەڕەیەکی پێشکەشکراو بەکۆنگرەی زانستیی بەستراو بەبۆنەی یادی سەد ساڵەی ئیمام بەنناوە، مرکز الإعلام العربي، القاهرة، (٢٠٠٧م).

پێشەوا حەسەن بەننا لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ڕەنج و ماندووبوونێکی زۆری بەخەرجدا لە پێناو پێگەیاندن و پەروەردەکردنی نەوەکانی میسر و هەروەها جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیی، بەڕاستی هەستان بەکارێکی گەورە و بەم قەبارەیە لە توانا بەدەرە مەگەر بۆ کەسێك کە خودای گەورە توانا و وزەیەکی زۆری پێ بەخشیبێت بە هاوشێوەی پێشەوا بەننا، کە تەمای پەروەردەکردنی خێزان و وڵات و هەموو ئوممەتی ئیسلامیی هەبوو. بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستەش شەونخونی دەکرد و لە ڕۆژیشدا بێ وچان کاری دەکرد لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجەکەیدا: کە ئەویش پەروەرەکردنی ئوممەتی ئیسلامیی بوو پەروەردەیەکی قورئانی گشتگیر، تا دوا هەناسەی بە بەردەوامی و بە بێ وچان بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەی تێدەکۆشا، خودا پاداشتی چاکەی هەموو ئەو خزمەتانەی بداتەوە کە بە جیهانیی ئیسلامیی و نەتەوە و نیشتیمانی خۆی پێشکەشی کردووە.

## ڕۆڵی ژینگەی پەروەریاری ئوممەت لە پێگەیاندنیدا:

لەگەڵ باسکردنی ئەو ژینگەیەی کە پێشەوا بەننای تێدا ژیاوە باس لە گرنگیی هەڵبژاردنی مامۆستای گونجاو دەکەین کە وا پێویست دەکات ئەو مامۆستایەی دیاری دەکرێت زۆر لێهاتووبێت و هەروەها باوەڕی بە خودا و متمانەی بە نەتەوەکەی زۆربێت، چونکە کورتترین ڕێگا بۆ چاکسازی لە بواری پەروەردەییدا ئەوەندەی لە ڕێگەی هەڵبژاردنی مامۆستای باش و گونجاو هەروەها ئامادەکردنی بۆ بە ئەنجامگەیاندنی کارەکەی و گەیاندنی پەیامەکەی دەکرێت ئەوەندە لە ڕێگەی هاوردەکردنی سیستمی پەروەردەیی بێگانە لێرە و لەوێ ناکرێت. خودای گەورەش توانا و وزەیەکی زۆر و هەروەها ژینگەیەکی لەباری بۆ پێشەوا بەننا ڕەخساندبوو تاکو بتوانێت لەڕێیەوە پەرە بە تواناکانی بدات.

باوکی پێشەوا بەننا ناوی (أحمد عبدالرحمن)ە و گوتارخوێنی مزگەوتی (المحمودیە) بووە، هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەربووە و بە فەرموودە پیرۆزەکانیش زانابووە و نووسینی زۆریشی لەو بوارانەدا هەیە، باوکی پێشەوا بەننا هەمیشە پێشەوای ئاراستە کردووە بۆ لەبەرکردنی قورئان و خوێندنەوەی کتێب لە کتێبخانەکەیدا، هەروەها هانی داوە بۆ لەبەرکردنی مافەکان ئەویش هەندێکی لێ لەبەرکردووە ئەو کاتەی لە قۆناغی دواناوەندیدا بووە، هەروەها ناردویەتی بۆ ئەوەی لە چاککردنەوەی کاتژمێردا کاربکات و بەو هۆیەشەوە فێری وردبینی و ڕێکخستن و پەند وەرگرتن بووە[1]. لەبەرئەوەی باوکی گوتارخوێن و زانا بووە هەستی بە پێگەی زانایان کردووە لەناو خەڵکدا بۆیە بە ڕێزەوە لێی ڕوانیوە و لە دڵەوە حەزی بەم کارە کردووە.

ویستی خودا وادەبێت بەننا بچێتە قوتابخانەی (ڕەشادی ئاینی) و لەوێ چاوی بە مامۆستاکەی (محەمەد زەهران) بکەوێت، کە مامۆستایەکی نابینا بووە و زۆر ئارەزووی زانستی کردووە، هەر بۆیە بۆ خوێندنەوەی ئەو بابەتە زانستیانەی کە پێویستی بووە داوای لە حەسەن بەننا کردووە بۆی بخوێنێتەوە و هەروەها بەننای لەگەڵ خۆیدا گێڕاوە تێکەڵی کۆڕ و مەجلیسی زانایانی کردووە و ئەویش گوێی بۆ ڕاداون کاتێك ئەوان سەرقاڵی گفتوگۆی زانستی خۆیان بوون. بۆیە تا دەهات حەزی زانست و ڕێزی زانایان لە دڵیدا زیاتر دەبوو، جگە لەمانەش شێخ محەمەد زەهران داوای لێدەکردن ڕۆژانی پێنج شەممە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) لەبەربکەن، هەموو ئەمانەی کە پێشەوا بەننا پێیاندا تێپەڕی هاوشان لەگەڵ پێشڕەوی بەسەر هاوپۆلەکانیدا و هەروەها دواتر پەیوەندی کردنی بە قوتابخانەی

[1] – حسن البنا: مذكرات الدعوة والداعية، دار الشهاب، القاهرة، بدون تأريخ، (ص١٤–٣٥).

(المعلمين)ەوە بوونە هۆی کەڵەکەبوونی زانستێکی زۆر لەلای پێشەوا بەننا.[1]

پاش ڕۆشتنی بەننا بۆ قوتابخانەی (المعلمين) لەوێ بە مامۆستا (عبدالفتاح أبـو علاّم) ئاشنا دەبێت، کە ئەمیش هەندێك خەسڵەت لە بـەننادا بـەدی دەکـات کـە لـە قوتابیەکانی تردا بوونیان نەبوو هەروەك پابەندبوون و سووربوون لەسەر فێربـوون، هەر بۆیە ئامۆژگـاری پێشـەوا حەسـەن بـەننا دەکـات بـۆ ئـەوەی زیـاتر گوێڕایـەڵی فەرمانەکانی خودای گەورە بکات و هەروەها لێکۆڵینەوە و خوێندنـەوەی قـووڵ بـۆ نهێنیەکانی شەریعەتی ئیسلامیی و مێژووی ئیسلام و هەروەها مێـژووی مەزهـەب و کۆمەڵـە و تاقمـە ئیسـلامیەکان ئەنجامبـدات، دواتـر پێشـەوا بـەننا دەچـێتە نێـو تەریقەتی حەسافیەوە (الحصافيه) بۆ ئەوەی لە جیهانیی ڕۆحدا نوقم بێت و چێژ لە یاد و پەرستشی خودا و هەروەها لە باسکردنی ژیانی پیاوچاکان وەربگرێت تـا ئـەو ڕادەیـــەی تێکـــەڵبوونی بـــەو کەشـــە ڕۆحیـــە و ســـەرقاڵبوونی بـــە دواڕۆژ و بەدیهێنەرەکەیەوە تەواو لە خەڵکی و لە دونیا دابببڕێت.

ئەو ماوەیەی کە پێشەوا بەننا لە تەنهایی و زوهد و سۆفیگەرێتیدا بەسەری بـرد زۆر پێویست بوو لە پێکهێنانی ڕەهەنـدی ڕۆحـی کەسـایەتی پـەروەریاری ئوممـەت حەسـەن بـەنّنادا، چـونکە پـەروەریاری موسـوڵمانان ناتوانێـت لـە ئەرکەکەیـدا سەرکەوتووبێت ئەگەر بێتو پەیوەندیەکی بەهێزی لەم شێوەیە بە نەیبەستێتەوە بە خودای گەورەوە، ئەم پەیوەندیەش مانا و مەغزایەك بە ژیانی پێشـەوا دەبەخشـێت بـەرزتر لـە هـەموو جـۆرە پاداشـتێکی مـاددی و دوینیـایی، لێـرەدا دەپرسـین ئایـا حەسەن بەننا دەبووە پەروەریاری ئوممەتی ئیسلامیی ئەگەر ئەم ڕەهەنـدە ڕۆحیـە لە کەسایەتیەکەیدا بوونی نەبووایە؟ بەلاّم زۆری نەبرد تاکو حەسەن بەننا گەڕایەوە

[1]– سەرچاوەی پێشوو (ص١٤–٦٢)، رؤوف شلبي: الشيخ حسن البنـا ومدرسـة ((الإخـوان المسـلمين))، دار الانصار، القاهرة، (ص٢٥–٤٩).

سەر ڕێڕەوە ڕاستەکەی خۆی ئەویش بە هاوکاری مامۆستاکەی فەرحات سەلیم، مامۆستا بوو لە قوتابخانەی (المعلمين) کە هانی بەننایدا بۆ ئەوەی ئەو پەیوەندیە ڕۆحیەی لەگەڵ خودای گەورەدا هەیەتی وەریبگێڕێت بۆ کار و چالاکی و هەوڵ و تێکۆشان و تەواوکردنی خوێندنەکەی لە (دار العلوم) و هەروەها بەردەوامیدان بە کاروانی زانست و فێرکردن و کاری بانگەواز. پاش ئەوەی ئەم مامۆستایە وەتەری هەستیاری پێشەوا بەننای جوڵاند خێرا گەڕایەوە سەر ڕێڕەوی دروستی خۆی و سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە ژیانی زانست و فێرکردن و بانگەواز.[١]

پێش ئەوەی باس لە پەیوەندیکردنی پێشەوا بەننا بکەین بە (دار العلوم)ەوە کە بە ڕاستی ناوی بە خۆیەوە بوو لە پێگەیاندنی ژمارەیەکی زۆر زانا و قوتابی لە قاهیرەدا، چ قاهیرەیەکیش، قاهیرەی سەرفرازی، کە قەڵای زانستی ئاینی ئیسلامیی (ئەزهەر)ی لە خۆگرتووە بە هەموو زانا و مامۆستاکانیەوە کە کاریگەریەکی زۆریان لە پێکهێنانی پێشەوا بەننادا هەبووە لەڕووی ئاینی و زانستی و نیشتمان پەروەریەوە، بۆیە پێش ئەوەی باس لە ژیانی پێشەوا بکەین لە خانەی زانستەکاندا وا پێویست دەکات ئاماژە بە ڕەهەندێکی گرنگ بکەین لە پێکهێنانی کەسایەتی بەننادا، ئەویش ڕەهەندی پەروەردەی کرداریە لەسەر ئیسلام هەر لە منداڵیەوە، چونکە پەروەردەی ئسلامی پەروەردەیەکی دروست نابێت ئەگەر هاتوو ئەو زانستەی کەسێك سەبارەت بە ئیسلام هەیەتی وەرنەگێڕدرێتە سەر کردارێك کە کاریگەری لەسەر ژیان و ڕەفتاری ئەو کەسە دروست بکات، حەسەن بەنناش جوان ئەم بابەتەی فامیبوو و هەر لە منداڵیشەوە پەیڕەوی لێدەکرد، بۆیە دەبینین کاتێك

---

[١]- حسن البنا: مذكرات الدعوة والداعية، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص٥٤-٥٥)، (ص٦١-٦٢) عثمان عبد المعز رسلان: التربية السياسية عند جماعة الإخوان المسلمين، دار النشر والتوزيع الإسلامية، القاهرة، (١٩٩٠م)، (ص١٣٦).

له دواناوەندیدا بوو سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێڕی دەستەی ڕەوشتی ئەدەبی بوو لەژێر سەرپەرشتی مامۆستا محەمەد ئەفەندی عەبدولخالقدا کە مامۆستای وانەی بیرکاری بوو و هەروەها بەشداربوو لە دەستەی نەهێشتنی قەدەغەکراوەکان و دەستەی حەسافەی خێرخوازیدا لەکاتێکدا هێشتا لە قوتابخانەی (المعلمین) بوو، بۆ ئەوەی ئەم ئەزموونانە دواتر بۆی ببنە ڕاهێنانێکی کرداری لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردن و ڕێکخستن و پێکهێنانی ئەو دەستە و کۆمەڵە ئیسلامیانەی کە کردار و گوفتار پێکەوە گرێ دەدەن.

پاشان بەننا دەڕوات بۆ قاهیرە و لەوێ پەیوەندی دەکات بە خانەی زانستەکانەوە (دار العلوم)، لەو کاتەدا قاهیرە جمەی دەهات لە ڕەوتە زانستیە جیاوازەکان و بزووتنەوە موژدە دەرەکان و هەروەها ئەو کەسانەی کە بانگەوازیان دەکرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی داگیرکەر، هەر بۆیە بەننا بەهۆی بوونی لە قاهیرە و خانەی زانستەکاندا بواری بۆ ڕەخسا بۆ ئەوەی چاوی بەگەورە زانایانی ئەزهەر و بیرمەندانی سەردەمی خۆی بکەوێت و هەر لە کتێبخانەی (السلفی)دا چاوی بە موحبەددین خەتیب و محەمەد خزر حسێن و ئەحمەد تەیمور و شێخ غەمراوی دەکەوێت و لەگەڵیاندا دادەنیشێت و لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی ڕەشید ڕەزادا ئامادە دەبوو و لەوێ گوێبیستی ووتەی ڕەشید ڕەزاو ئامادەبووانیش دەبوو، هەروەها زۆر هاتوچۆی ماڵی محەمەد فەرید وەجدی دەکرد بۆ ئەوەی لێی سوودمەندبێت و زۆریش خولیای ئینسایکلۆپیدیاکەی (دائره المعارف) ببوو.

پاش تەواو کردنی خانەی زانستەکان پێشەوا بەننا بەتەواوی ئامادە ببوو بۆ ئەوەی ببێتە مامۆستایەکی پسپۆڕ لە زمانی عەرەبیدا و بە شێوەیەکی گشتیش شارەزا لە فیقهی قورئاندا، ئەمەش بە ڕوونی لەو نووسینەیدا بەدی دەکرێت کە بۆ مامۆستاکەی (أحمد یوسف)ی نوسیبوو لە کۆتا ساڵی خوێندنیدا لە خانەی

زانستەکان پاش ئەوەی ئەم مامۆستایە داوای لێکردبوون دارشتنێك بنووسن لە ژێر ناونیشانی: (باس لە گەورەترین ئاواتەکانت بکە لە پاش تەواوکردنی خوێندن لەگەڵ ئەو ئامرازانەی کەوا ئامادەیان دەکەیت بۆ بەدیهێنانیان)، پێشەوا بەنناش بۆی دەنوسێت: **گەورەترین ئاواتەکانم لە پاش تەواو کردنی خوێندن دوو ئاواتن:**

- ئاواتێکی تایبەت: کە خۆی دەبینێتەوە لە خۆشبەختکردنی خێزان و دۆست و کەسە نزیکەکانم، هەروەها وەفادارېم بۆ هاورێ خۆشەویستەکەم بە پێی هەموو توانایەکم کە دەسەڵاتم رێم پێبدات و خودای گەورە پێم ببەخشێت.

- ئاواتێکی گشتی: دەمەوێت ببمە مامۆستا و پەروەریارێك کە هەموو رۆژێکم بە درێژایی ساڵ لە فێرکردنی منداڵاندا بەسەرببەم و و شەوانیش بۆ فێرکردنی باوکان تەرخان بکەم، ئامانجی ئاینەکەیان پێ ئاشنا بکەم و سەرچاوەکانی خۆشبەختی و ئاسوودەیی ژیانیان فێربکەم، جارێك لە رێ گوتار و گفتوگۆوە و جارێکی دی لە رێی نووسین و کتێبەوە و هەروەها لەرێی گەشت و گەرانەوە.

بۆ بەدیهێنانی ئاواتی یەکەمم ئەم ئامرازەم ئامادە کردووە: ئەویش بە چاکەی چاکەکاران بزانم و بەرزیان بنرخێنم، مەگەر پاداشتی چاکە هەر چاکە نییە؟

هەروەها بۆ بەدیهێنانی ئاواتی دووەمم ئەم ئامرازانەم ئامادە کردووە:

١- ئامرازە رەوشتیەکان: خۆراگری و قوربانیدان، کەسی چاکسازیش دەبێت زیاتر لە سێبەری خۆی پەیوەستی ئەم دوو رەوشتە بێت، چونکە ئەمانە نهێنی سەرکەوتنی هەر چاکسازێکن و هەر چاکسازێکیش دەستبەرداری ئەم دوو رەوشتە ببێت تووشی شکستی گەورە دەبێت و پێی لەکەدار دەبێت.

٢- ئامرازە کرداریەکان: خوێندنێکی زۆر و بەردەوام کە ئەو بڕوانامانەی بەدەستی دەهێنم لەسەری ببنە گەواهیدەر و هەولیش دەدەم ئەو کەسانە بناسم کە باوەڕیان بەم پرەنسیپە هەیە و لەگەڵ دۆستانی ئەم رێبازەدا نەرم و نیانن،

چونکە توندی و ڕەقی دواتر بەسەر خاوەنەکەیدا دەگەڕێنەوە و هەوڵ دەدەم ئەم خوێندنەم لەگەڵ خودا و ئاینەکەیدا بگونجێت چونکە ئەوکاتە بۆ من دەبێتە بازرگانیەك و بۆندێکی پڕ قازانج بەو ئامانجەی پێی سەرفرازبم و بەو ئاواتەی خودا لێم وەرگرێت و یار بێت بۆم، هەروەکو خۆی دەفەرموێت: ﴿إِنْ تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ﴾{محمد ٧}، واتە: ((ئەگەر ئێوە پشتیوانی لە ئاینی خودا بکەن و هەوڵی سەرکەوتنی بدەن، ئەوا خودایش پشتیوانی لە ئێوە دەکات و سەرتان دەخات و پایەدار و جێگیرتان دەکات)).[1] ئەمەش بەڵێنێکە لە نێوان خۆم و خودای گەورەدا تۆماری دەکەم و مامۆستاکەشمی لەسەر دەکەمە گەواهیدەر لەم شەوەدا و لەم تەنهاییەدا کە کەس لێی ئاگادار نییە تەنها خودای میهرەبان و وردکار و ئاگادار نەبێت ﴿وَمَنْ أَوْفَى بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا﴾{الفتح:١٠}، واتە: ((هەر کەسێك وەفا بکات بەو پەیمانەی کە بە خودای داوە ئەوا لە ئایندەدا خودا پاداشتی گەورەی دەداتێ))[2]

بەم شێوەیە حەسەن بەننا لە قۆناغەکانی سەرەتای ژیانیدا ئامانج و پەیامی خۆی لەم ژیانەدا بە وردی دیاریکردبوو کە ئەویش ئەوە بوو بەو هەموو وزە و توانایەی کە هەیەتی هەروەها لەڕێ ڕێکخستنی وزە و هێزە ماددی و مرۆییەکانەوە هاوشان لەگەڵ ئەو متمانەیەی کە بە خودای گەورە هەیبوو بەوەی خودای گەورە سەرخەر و پشتیوانی ئەو کەسانەیە کە لە گوفتاردا ڕاستگۆ و لە کارەکانیاندا دڵسۆزن ببێتە مامۆستا و بانگخواز و ڕێنوێنیکەری ئوممەتی ئیسلامی.

---

[1]– حسن البنا: مذكرات الدعوة والداعية، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص٥٤–٥٥)، (ص٦١–٦٢) عثمان عبد المعز رسلان: التربية السياسية عند جماعة الإخوان المسلمين، (ص ١٣٦).

[2]– نقلا عن رؤوف شلبي: الشيخ حسن البنا ومدرسة الإخوان المسلمين، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ٧٩، ٨٠).

## حەسەن بەننا وەك مامۆستا و پەروەریار:

من لێرەدا تیشك دەخەمە سەر كەسایەتی حەسەن بەننا تەنها وەك پەروەریار و مامۆستایەك و لایەنەكانی تری ژیانی ئەم كەسایەتیە بۆ كەسانی تر بەجێدەهێڵم تاكو دەربارەی بدوێن، ئەمەش نەك لەبەرئەوەی پسپۆڕی خۆم لە بواری پەروەردەییدایە بەڵكو لەبەرئەوەی ئەم بوارە یەكێكە لە گرنگترین بوارەكانی نوێگەری لە نێو بزووتنەوەی ئیخوان موسلمیندا، چونكە ئەم بزووتنەوەیە یەكێكە لەو بزووتنەوانەی كە زۆرترین جەختیان لەسەر لایەنی پەروەردەیی كردۆتەوە لە ژیانی تاكەكانی ئوممەتی ئیسلامیدا، هەر لەگەڵ دامەزراندنی كۆمەڵەی ئیخوان موسلمیندا لە شاری ئیسماعیلیە و لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٢٨دا یەكەم كارێك كە پێی هەستان بریتی بوو لە كردنەوەی قوتابخانەی: (التهذیب للإخوان المسلمین) ئەویش لە حوجرەیەكی سادە لە ئیسماعیلیەدا و پرۆگرامی پەروەردەییش لەم قوتابخانەیەدا بەم شێوەیە دیاریكرابوو:

- ڕاستكردنەوەی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە پێی زانستی تەجوید.
- لەبەركردنی هەندێك لە سورەتەكانی قورئانی پرۆز.
- لەبەركردنی كۆمەڵێك فەرموودە لە فەرموودەكانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر).
- ڕاستكردنەوەی بیروباوەڕ و پەرستشەكان و شارەزابوون لە شەریعەتی ئیسلامی.
- ئاشنا بوون بە ئادابە گشتیەكانی ئیسلام.
- خوێندنی مێژووی ئیسلامیی و ژیانی پێشەوایانی ئوممەت.
- ڕاهێنانی ئەو كەسانەی كە توانای گوتاربێژیان هەیە لەسەر لەبەركردنی شیعر و پەخشان بە پێی توانا و پاشان داوایان لێدەكرا بۆ یەكەم جار لەم ناوەندە

بچووکەدا وانە بڵێنـەو و کەسـانی تـر فێربکـەن دواتـر داوایـان لێـدەکرا لـە شـوێن و ناوەندی گەورەتر وانە بڵێنەوە.[1]

دواتر هەر لـە ئیسـماعیلیەدا مزگـەوتی ئیخوانیـان بنیاتنـا وەك تەواوكاریـەك بـۆ لایەنی پەروەردەیی کۆمەڵە تازە لەدایك بووەکە، لە پاڵ نوێژەکاندا گوتاری هـەینی تێـدا دەدرا و وانـەی تێـدا دەخوێنـدرا و هـەروەها لـە جـەژن و بۆنەکانـدا چـالاکی جۆراوجۆری تێدا ئەنجامدەدرا، کۆمەڵەی ئیخوان هەر بەوەندەوە نەوەسـتان بـەڵکو هەستان بە دامەزراندنی پەیمانگای حیرائی ئیسلامیی فـرە پـۆل، کـە لـە سـێ پـۆل پێکهـاتبوو، پۆلێکیـان پرۆگرامـەکانی هاوشـێوەی پرۆگرامـەکانی قوتابخانـە سەرەتاییەکان بوو ئەویش بە مەبەستی ئامادەکرنی خوێندکاران بۆ زانکۆی ئەزهەر و پەیمانگا ئەزهەریەکان، پۆلێکی تریـان دەوامـی بـەیانیانی هاوشـێوەی قوتابخانـە سەرەتاییەکان بوو و دەوامـی ئێوارانیشـی هاوشـێوەی قوتابخانـە پیشەسازییەکان بوو، خوێندکارەکان لە دەوامی ئێواراندا ڕوویاندەکردە کارگە و ناوچە پیشەسـازییە تایبەتەکان کە لەلایەن کۆمەڵەی ئیخوان موسـلمینەوە بـەڕێوە دەبـران ئـەویش بـە مەبەسـتی زیـاتر فێرکـردن و ڕاهێنـانی پیشـەیی خوێنکـاران، پـۆلی سێیەمیشـیان هاوشێوەی قوتابخانە میرییە سەرەتاییەکان بوو (لە جێی قوتابخانـە ناوەندیـەکانی ئێستا) ئەویش بۆ ئامادە کردنیان بۆ قۆناغی دواناوەندی.[2]

سەرەڕای ئەوەی ئـەم پەیمانگایـە هـەمان پرۆگرامـە حکومیـەکانی لـەخۆگرتبوو لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆحێکی ئیسلامیان بە بەر شێوازی بەڕیوەبردن و چالاکی و کەشی پەیمانگاکەدا کردبـوو ئەمـەش وایکردبـوو خـەڵك زیـاتر ڕوو لـەم پەیمانگایـە بکـەن، ئەمەش بووە پاڵنەرێك بۆ ئەوەی قوتابخانەی دایکانی باوەڕداران (أمهات المؤمنین)

---

[1]- رؤوف شلبي: الشيخ حسن البنا ومدرسة ((الإخوان المسلمون))،مرجع سابق، (ص ١٤٠).

[2]- هەمان سەرچاوە (ص ١٥٤).

دابمەزرێنن کە بە هەمان شێوەی پەیمانگاکە لە گەیاندنی پەیامەکەی بەردەوامبوو تا ئەوکاتەی وەزارەتی ئەوقاف لە ئەستۆی خۆی گرت، ئەمەش بووە هۆی تەرخانکردن و دانانی بەشێکی تایبەت بە خوشکان کە ئافرەتانی ئیخوان موسلمین و کەسە نزیکەکانیانی لە خۆگرتبوو، دواتر لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٣٣دا کلێشەیەکی تایبەتیان بۆ دانرا کە شێوازەکانی کارکردن و ئامرازەکانی بانگەوازی تایبەت بە ئافرەتانی تێدا ڕێکخرابوو[١] . ئەمەش دەرگایەکی فراوانبوو ئافرەتان لە ڕێیەوە هاتنە نێو مەیدانی بانگەواز و تێکەڵ بە کاری ئیسلامیی بوون.

هەروەك چۆن حەسەن بەننا گرنگیی بە لایەنی پەروەردەی ئیسلامیی و زانستی شوێنکەوتووەکانی داوە بە هەمان شێوە گرنگیی بە لایەنی پەروەردەی وەرزشی داوە ئەویش بە مەبەستی ئامادەکردنیان بۆ ئەو جیهادەی کە لەسەر ئوممەتی ئیسلامیی پێویستکراوە تاکو بتوانن ئەو زەویانەی لە لایەن داگیرکەرانەوە داگیرکراوە بیگێڕنەوە و ئازادی بکەن، بۆ ئەم مەبەستەش گرووپی گەشتەکانی ئیخوان موسلمینی دامەزراند جیاواز لە سیستمی کەشافە و بە ڕۆحیەتێکی ئیسلامیی کە باڵی بەسەر گروپەکەدا کێشابوو، دواتریش ئەم گروپە بووە هۆی پێگەیاندنی یەکەکانی سیستمی تایبەت (النظام الخاص)، ئەم یەکانەش ئەرکی پاراستنی کۆمەڵەی ئیخوان موسلمین و هەروەها بەرەنگاربوونەوەی داگیرکەری ئینگلیزی و دوژمنی زایۆنیان پێ سپێردرابوو. بەم شێوەیەش بزووتنەوەی ئیخوان موسلمین وردە وردە لە ئیسماعیلیەدا گەشەی دەسەند بە بوونی سەرکردەیەکی ڕێنوێنیکار و مزگەوتێکی کۆکەرەوە و قوتابخانەی تایبەت بە کوڕان و کچان و هەروەها بوونی گرووپی کەشافە و وەرزشی تایبەت بە خۆیان.

حەز و ئاواتی پەروەردەیی حەسەن بەننا سنوری شاری ئیسماعیلیەی بەزاندبوو

---

[١]– هەمان سەرچاوە (ص ١٥٧، ١٥٨).

بۆ هەموو شار و لادێکانی میسر، حەزی دەکرد لە هـەموو شـار و لادێکـانی میسـردا پۆلی هەبێت بە هەموو ئەو دامەزراوە پەروەردەییانەی کە پۆل لـە خـۆی دەگرێـت، هەر لە خێزانی ئیخوانەوە (الأسرة الإخوانية) بگرە کە لە پێنج تا دە کەس پێك دێت و لێپرسراو و هەروەها پرۆگرامی پەروەردەیی و رۆشنبیریی تایبەت بە خۆیان هەیـە تا دەگاتە سیستمی تایبەت و لە سەروو هەمووشیانە وە ڕابـەری ئیخـوان موسـلمین حەسەن بەننا، هەر پۆلێـك لـەم پۆلانـەش پرۆگرامـی پـەروەردەیی و رۆشـنبیریی و سەربازی تایبەت بـە خۆیـان هـەبووە، هەرکەسـێکیش یادەوەرییـەکانی بانگـەواز و بـانگخوازی پێشـەوا بـەننا بخوێنێتـەوە تـەواو سەرسـامی ئـەو هـەمووە هـەوڵ و ماندووبوون و لێبڕانی بەننا دەبێت بۆ ئەو هـەمووە دامـەزراوە پـەروەردەیی و پۆلـە ئیخوانیانەی کە لە زۆربەی شار و لادێکانی میسردا دایمەزراندوون.

حەسەن بەننا بە بـەردەوامی لـە گەشـت و گەڕانـدابوو بـە مەبەسـتی کردنـەوەی دامەزراوەی پەروەردەیی زیاتر و هەروەها چاودێریکردنی چالاکی دامەزراوەکانی تر، بەڕادەیەك دەگەیشتە ئەوەی بەننا لە یـەك ڕۆژدا بـە شـەمەندەفەر گەشـتی بـۆ دوو شوێنی جیاواز دەکرد بۆ ئەوەی لێرە پۆلێکی نوێ بکاتەوە و لـەوێش بەدواداچـوون یاخود گوتارێك بە پۆلەکەی تر پیشکەشبکات، ئەم کۆششە زۆرەی پێشەوا بەننا لە توانـای کەسـدا نییـە تـەنها کەسـێك نـەبێت بـە تـەواوی خـۆی بـۆ ئامانجەکـەی تەرخانکردبێت و باوەڕی تەواوی پێی هەبێت و لە گەیاندنی پەیامەکەیدا بـەردەوام بێت.

حەسـەن بـەننا ڕووی پەیامـە پەروەردەییـە گشـتیەکەی خـۆی لـە هـەموو شوێنکەوتووانی ئیخوان موسلمین دەکرد بە هەموو ئاست و پلە جیاوازەکانیانـەوە، کە لە ئاستی برای یاریدەدەر یـاخود بـرای خۆشویسـتەوە (أخ مسـاعد أو المحـب) دەستی پێدەکرد ئەمانیش نزمترین ئاستی کۆمەڵەی ئیخـوان بـوون کـە ئامادەییـان

دەردەبڕی بە ئیسلامەوە پابەندبن و خۆبەخشانەش ئابوونەی مانگانە پێشکەش بە ئیخوان بکەن، ئاستی دووەمیش لە برای ئەندام پێکهاتبوو (الأخ المنتسب) کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە کۆمەڵەی ئیخوانەوە دەکرد و ئابوونەی دیاریکراوی مانگانەی دەدا و لە کۆبوونەوەی هەفتانە و ساڵانەشدا بەشداری دەکرد و هەروەها دەبوایە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودای گەورە ببێت و لە قەدەغەکراوەکانی خۆی بەدوور بگرێت، پاشان پلەی برای کرێکار دێت (الأخ العامل) کە ئەمەیان پلەیەکی بەرزترە و بۆ ئەوەی برایەك بتوانێت بەدەستی بهێنێت دەبوایە ئەم پێداویستیە پەروەردەییانەی خوارەوەی لە خۆیدا دابین بکردایە:

- خوێندنی ڕاڤەی بیروباوەڕی ئیخوان موسلمین.
- بەردەوام بوون لەسەر ویرد و یادە قورئانیەکان.
- ئامادەبوون لە دانیشتنی هەفتانەی قورئانی پیرۆز.
- بەشداری کردن لە سندوقی حەجدا.
- بەشداری کردن لە لیژنەی زەکاتدا.
- پەیوەندی کردن بە گرووپی گەشتەکانەوە ئەگەر هاتو تەمەنی گونجاوبوو بۆ ئەنجامدانی ئەم چالاکیە.
- پێویستە بە زمانی فوسحەی عەرەبی بدوێت بە پێی توانا.
- بتوانێت نێو ماڵی خۆی بە پرنسیپەکانی ئیخوان موسلمینەوە پابەندبکات.
- کاربکات بۆ خۆ ڕۆشنبیرکردن و هەوڵبدات چل فەرموودەی پێغەمبەری ئازیز (دروودی خوای لەسەر) لەبەربکات.
- تایبەتمەندیە ئەدەبیەکانی ئیخوان موسلمین پەسەند بکات.

دواتر پلەی برای تێکۆشەر (الأخ المجاهد) دێت کە پلەیەکی زۆر بەرزە لە نێو ئیخواندا و مەکتەبی ئیرشاد ئەم پلەیەی بەکەس نەدەبەخشی تەنها کاتێك نەبێت

ئەو کەسە هەموو ئەرکەکانی پلەی برای کرێکاری بەجێهێنابێت لە پاڵ دابین کردنی ئەم پێداویستیانەی خوارەوەشدا:

- بەجێهێنانی سوننەتەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) لە کردار و گوفتار و سەروەت و سامانیدا بەپێی توانا.
- شەونوێژەکانی هەموو ئەنجامبدات و نوێژەکانیشی بە کۆمەڵ ئەنجامبدات تەنها ئەگەر هاتو پاساوێکی گونجاوی هەبێت.
- دوورکەوتنەوە لە هۆکارەکانی ڕابواردن و هەموو ئەو پەرستش و مامەڵانەی کە لە ئیسلامەوە دوورن.
- بەشداری دارایی بکات لە مەکتەبی ئیرشاد و سندوقی داراییدا و وەسیەت بکات بە بەشێك لە ماڵەکەی بۆ کۆمەڵەی ئیخوان موسلمین لە پاش مردنی.
- فرمان بە چاکە بکات و ڕێگری لە خراپە بکات.
- بەدەم بانگەوازی مەکتەبی ئیرشادەوە بڕوات لە هەر کات و شوێنێکدا ئەگەر بانگهێشتکرا.
- پێویستە بە بەردەوامی قورئانی پیرۆز لە گەڵ خۆیدا هەڵبگرێت بۆ ئەوەی ئەرکەکانی بە بیربهێنێتەوە.
- ئامادەیی تێدا بێت بۆ بەسەربردنی ئەو ماوە پەروەردەییەی مەکتەبی ئیرشاد بۆی دیاریدەکات[١].

هەرکەسێك لەم پلەبەندی و ئاستانەی ئیخون موسلمین تێڕابمێنێت دەبینێت ئەم ئاستانە هەموویان پەروەردەیین و پەیوەندییان بە زانست و پەروەردە و

[١]- رؤوف شلبي: الشيخ حسن البنا ومدرسة ((الإخوان المسلمون))، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ٢١٨-٢٢٤)، عثمان عبد المعز رسلان: التربية السياسية عند جماعة الإخوان المسلمين، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ٣٣٨، ٣٣٩).

پابەندبوونی تاکی ئیخوانیەوە هەیە بە پرنسیپەکانی ئیخوان موسلمینەوە، ئەم ئاستانەش لەبەردەم هەموو ئەندامانداو کراوەن و هەر ئەندامێك ویستی لەسەر بێت ئەتوانێت هەموو ئاستەکان ببڕێت تادەگاتە برای تێکۆشەر، مەبەستی ڕاستەقینەی حەسەن بەننا و هەوڵەکانی بۆ ئەوە بوو تاکو زۆرترین برا بگەن بە پلەی برای تێکۆشەر، چونکە ئەمانە لە دیدگای حەسەن بەنناوە هیوا و ئومێدی ئوممەتی ئیسلامیی بوون بۆ ئەوەی زەوییە داگیرکراوەکانی بۆ بگێڕنەوە و خیلافەتی ڕاشیدە دابمەزرێنن.

بۆ ئەوەی بناغەیەکی پتەو دابمەزرێنێت تاکو دواتر بینای کۆمەڵەکەی لەسەر ڕابوەستێت حەسەن بەننا هەستا بە دامەزراندنی هەشت گرووپی بۆ بانگەواز و ڕێنوێنی کردن هەڵبژارد، هەریەکێك لەم گروپانەش ئەوپەڕی لە پەنجا خوێندکار پێکهاتبوون کە دەبوایە بەلانی کەمەوە لە ئاستی خوێندنی دواناوەندیدا بوونایە، هەروەها دەبوایە پازدە ڕۆژ بۆ خوێندن تەرخان بکەن کە بەننا خۆی بە ئەرکی فێرکردنیان هەڵدەستا لە قاهیرەدا، پاش ئەمە دەستیان بە چالاکی دەکرد لە بواری بانگەوازدا و بۆ ئەوەی بەننا دڵنیا بێت کە ئەم خوێندکارانە تەواو لێدەبڕێن بۆ خوێندن هەڵدەستا بە کردنەوەی ئەم خولە پازدە ڕۆژیە لە مانگەکانی تەمموز و ئاب و ئەیلول لە هەموو ساڵێکدا[1]. دەتوانرێت ناوی بانگخوازانی پێویستی لەم خوێندکارانە بنرێت چونکە کەسیان لەو ئاستەدا نەبوون بتوانن نەوەیەك پێبگەیەنن و ئەو بناغە مرۆییە ئامادە بکەن کە بە کاری بانگەواز و ئەرکە نیشتیمانی و ئیسلامیەکانی ئیخوان موسلمین هەڵبستێت.

هەروەها بە مەبەستی زیاتر بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیریی ئەندامانی ئیخوان

---

[1]– عثمان عبد المعز رسلان: التربية السياسية عند جماعة الإخوان المسلمين، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ٤٩٨).

موسلمين و ئامادەكردنيان بۆ كاری بانگەواز وهەڵگرتنی پەيامی ئيخوان بۆ هەموو ئەندامانی كۆمەڵەكە حەسەن بەننا لەساڵی (١٩٤٠) هەستا بەدانانی پرۆگرامێكی رۆشنبيريی بۆ ئيخوان موسليمين كەپێكهاتبوو لەهەڵبژاردنی خوێندنی چوار بابەت كەئەندامەكە هەڵدەستا بەهەڵبـژاردنيان بەپێی پێويستی خۆی وئەو ناوچەيەی كەبانگەوازی تێدا دەكرد، ئەو بابەتانەش كەديارييكرابوون بريتييبوون لە:

- قورئانی پيرۆز لەگەڵ ڕاڤە و زانستەكانيدا.
- سوننەتی پێغەمبەر و زانستەكانی و ئەوەشی پەيوەنديی پێوەيان هەيە.
- بيروباوەڕ و مەزهەبە فيكرييەكان.
- فيقە و ئوسولی فيقە ومێژووی تەشريع و زاناكانی.
- فەلسەفە و دەروونناسيی و پەروەردە.
- زانستە كۆمەڵايەتييەكان و خزمەتی كۆمەڵايەتيی لەگەڵ توێژينەوەيەكی پڕاكتيكيی بەتايبەتيی دەربارەی ميسر.
- ژيانی پێغەمبەرمان (دروودی خوای لەسەر) و مێژووی ئيسلاميی بەشێوەيەكی گشتی.
- هونەری وتاردان بەشێوەيەكی تيۆريی و پڕاكتيكی.

هەروەها ئەم پرۆگرامە ليستێكی گەورەی سەرچاوەكانی لەخۆگرتبوو كە لە (١٣٨) كتێب پێكهاتبوو و پێويستبوو لەسەر هەموو تاكێك بەپێی توانای خۆی زۆرترين ژمارە لەم كتێبانە بخوێنێتەوە لەگەڵ تێگەيشتن لەو پوختەيەی لەسەرەتای هەريەكێك لەو كتێبانەدا دانرابوو. بۆ ئەم مەبەستەش پشتيان بەشێوازی خود فێركردن دەبەست لەڕێگەی خوێندنەوەی ئەو كتێبانەی ليژنەی تايبەت بەپرۆگرامەكە دياريیان كردبوو هاوشان لەگەڵ ئەو وانانەی حەسەن بەننا دەربارەی چەند خاڵێكی تايبەت بەپرۆگرامەكە پێشكەشی دەكردن ودواتريش

چاپدەکران وبەسەر ئەندامان وکەسانی دیکەشدا بڵاودەکرانەوە. هەموو ئەندامانی ئیخوانیش مافی خوێندنیان هەبوو لەپاش ئەوەی لەلایەن پۆلەکانیانەوە دەپاڵێوران وهەروەها لەلایەن لیژنەی پرۆگرامەکەوە پەسەند دەکران و لەسەروو ئەمانەشەوە دەبوایە بەڵێنی بدایە لەبارنەی کار و بارودۆخی خۆیدا ببێتە یەکێك لەبانگخوازانی ئیخوان موسلمین.

هەروەها کتێبخانەی سەنتەری گشتی ئیخوان موسلمین بەڕووی هەمواندا کراوەبوو تاکو بتوانن ئەو کتێبانە بخوێننەوە کە لێی سوودمەند دەبن بۆ ئامادەکردنی توێژینەوە لەو چواربابەتەی هەڵیانبژاردبوو و لەهەمان کاتدا دەیانتوانی گوێبیستی وانەکانی ڕابەری ئیخوان موسلمین بن، بۆ ئەوانەش کە ئامادە نەدەبوون مافی بەشدارییکردنیان هەبوو لە تاقیکردنەوەکاندا بەپشتبەستن بەهەوڵ و ماندووبوونی خۆیان لە خوێندنەوە و ئامادەکردنی ئەو توێژینەوانەی لێیان داواکرابوو.

لە بایەخدانی حەسەن بەننا بەم پرۆژە ڕۆشنبیریە ئەوەبوو خودی خۆی سەرۆکایەتیی لیژنەی تاقیکردنەوەکانی دەکرد و لە هەر بابەتێکیشدا ئەو خوێندکارانەی دیاریدەکرد کە تاقیکردنەوەکان ئەنجامدەدەن، دواتر داوایان لەو خوێندکارانە دەکرد توێژینەوە لە هەر یەکێك لەو چوار بابەتەدا بکەن کە هەڵیانبژاردبوو و دەبوایە پوختەی ئەو توێژینەوانەش لە خۆ بگرێت و پاشان لیژنەی تاقیکردنەوەکان لەو بارەوە گفتوگۆیان لەگەڵ ئەنجامدەدان تاکو بزانن تا چ ڕادەیەك ئەم خوێندکارانە توانای هەڵێنجان و شیکردنەوە و بەراوردکاریان هەیە، لە پاڵ ئەمانەشدا ئاستی خوێندکار لە قورئان فەرموودە و زانستەکانیاندا تاقیدەکرایەوە بە شێوەیەکی زارەکی و هەڵدەسەنگێنران، پاشان ئەگەر خوێندکار لە هەموو تاقیکردنەوەکاندا سەرکەوتوو بووایە ئەوا دەردەچوو بە یەکێك لە

پلەکانی: (نایاب، زۆرباش، باش و ناوەند) و ئەگەریش سەرکەوتوو نەبوایە لیژنە گفتوگۆی توێژینەوەکەیان بۆ کاتێکی تر دوا دەخست، ئەوانەشی سەرکەوتوو دەبوون ئەوا دەبوونە بانگخوازی متمانە پێکراو و دەیانتوانی لە هەموو پۆلەکانی ئیخواندا بانگەواز بکەن[1].

گومان لەودا نییە ئەم پرۆگرامە رۆشنبیرە بازێکی گەورەی دا بە ئاستی بانگخوازانی نێو ئیخوان موسلمین وای کرد ئەندامانی ئیخوان بتوانن زووتر پلەکانی نێو ئیخوان ببڕن و کاراترین بە تایبەتی پلەکانی برای کرێکار و برای تێکۆشەر.

حەسەن بەننا لە پاڵ ئەم هەوڵە پەروەردەییە رێکخراوەییانەدا گرنگیی بە هۆکارەکانی ڕاگەیاند و ڕۆژنامەکان داوە و پشتی پێ بەستون بۆ بلاَوکردنەوەی بانگەواز و ڕاکێشانی ئەندامی نوێ و بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیریی و پەروەردەیی ئەندامانی ئیخوان لە هەموو پلەکانیدا، هەروەها پشتی بە کۆمەڵێك هۆکاری تریش بەستووە کە بریتی بوون لە[2]:

١- وانە گوتنەوە لە مزگەوت و پۆلەکان و بەستنی کۆڕی تایبەت و هەروەها پێشکەش کردنی گوتارێك لە هەموو ڕۆژانێکی سێ شەممەدا.

٢- زیندوو کردنەوەی یادە ئیسلامییەکان.

٣- تیشك خستنە سەر بانگەوازکردن لە زانکۆ و قوتابخانەکاندا، هەروەها دامەزراندنی بەشی خوێندکاران و سوودمەند بوون لە هەوڵ ماندوبوونی زانا و خوێندکارانی ئەزهەر.

٤- دەرکردنی ژمارەیەك پەیام و بلاَوکراوەی تر.

---

[1]- عثمان عبد المعز رسلان: التربية السياسية عند جماعة الاخوان المسلمين، مرجع سابق، (ص ٤٩٨-٥٠٠).

[2]- رؤوف شلبي: الشيخ حسن البنا ومدرسة ((الإخوان المسلمون))،مرجع سابق، (ص ٢٠١-٢٠٥).

٥- دەرکردنی پەیامی ڕابەری گشتی.

٦- دەرکردنی گۆڤاری ئیخوان موسلمین و پاشان (النذیر) و دواریش گۆڤاری (الدعوة).

٧- ڕێکخستنی کۆنگرەکان بە شێوەیەکی ناوبەناو.

حەسەن بەننا لە ڕێگەی ئەم چالاکیە پەروەردەییە هەمەجۆرانەوە توانی هزر و بیری کۆمەڵەی ئیخوان موسلمین بلاّوبکاتەوە و لەناو تاکەکانیدا بەرجەستە ببێت، بەڕاستی بەننا هەموو کات و هەوڵێکی خۆی لە پێناو ئەم ئەرکە پەروەردەییە بەنرخ و بەهادارەدا بەخشی.

حەسەن بەننا لە کۆتایی ژیانیدا هەستی بەوە کردبوو کە هەوڵە پەروەردەییەکانی بە شێوەیەکی گشتی و بە تەواوەتی ئەو ئامانجانەیان بەدی نەهێنابوو کە چاوەڕوان دەکرا لەڕووی چەندیەتی و چۆنیەتی لە پێگەیاندن و پەروەردەکردنی نەوەیەك گۆڕانکاری لەسەر دەستیان ڕووبدات، هەر بۆیە ڕووی لە خوێندنی سیستماتیکی کرد و بۆ ئەم مەبەستەش لیژنەیەکی پەروەردەیی پێکهێنا بە سەرۆکایەتی عەبدولحەمید مەتەر تاکو هەستێت بە دامەزراندنی خوێندگاکان بەشێوەیەك هەر لە قۆناغی باخچەی ساوایانەوە دەست پێبکات تاکو دەگاتە قۆناغی دوا ناوەندی و بۆ هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ ئەمەش بە ئامانجی پێگەیاندنی نەوەیەکی نوێ تاکو بۆ ئاینەکەیان بە پەرۆش بن و ڕێنماییەکانی پەروەردگاریان جێ بەجێ بکەن و هەروەها ئەمان بەو ڕاپەڕینە هەستن کە لە ئوممەتی ئیسلامیی چاوەڕێ دەکرێت، سەرەڕای ئەوەی قوتابخانەیەکی بیانی و تایبەتی زۆر هەبوون، بەلاّم ئیخوان نەیانتوانی خوێندنگاگەلێکی ئیسلامیی دابمەزرێنن کە لەڕووی چەندێتی چۆنیەتییەوە لەگەڵ ئاست و قەبارەی بانگەوازەکەیاندا بگونجێت.[١]

---

[١]- ئەم دیاردەیە پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ و گرنگیپێدانێکی تایبەت هەیە لە لایەن

وەزارەتی مەعاریف لە ١٩٤٦/٦/٢١ دا پڕۆگرامێکی دانا بۆ بەرەنگاربوونەوەی نەخوێندەواری و بۆ ئەم مەبەستەش هەستان بە ناردنی محەمەد حەسەن عەشماوی کە وەزیر بوو بۆ بنکەی سەرەکی ئیخوان موسلمین و داوایان لێکردن تا هاوکاریان بکەن و بنکەانیشیان لە شار و لادێکاندا ئاوەدانبکەنەوە و تاکو ببنە سەنتەری نەهێشتنی نەخوێندەواری و بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی گشتی، ئیخوان موسلیمینیش بەدەم داواکەیانەوە هاتن و هەموو ئەو پێداویستی و پاڵپشتی و خەرجیانەی کە پێیستیان پێ بوو لە لایەن وەزیرەوە بۆیان دابین کرابوو[1]. بەڵام سەرەڕای گرنگیی ئەم پڕۆژەیە و ئەو کاریگەریە گەورەیەی لە ژیانی ئوممەت و نیشتیماندا دروستی دەکات سەر سوڕدەمێنێت لەوەی ئیخوان درێژەیان بەم پڕۆژەیە نەدا چ بە پشتیوانی یاخود بێ پشتیوانی وەزارەتی مەعاریف.[2]

لە ژیانی ڕابەری گشتی ئیخوانەوە تاکو ئێستاش ئیخوان نەیتوانیەوە سیستمێکی فێرکاری جێگرەوە پێشکەشبکات لە جێی سیستمی فێرکاری باو، ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێك کە پێویستە بە وردی شیکار بکرێن و لێکۆڵینەویان دەربارە ئەنجامبدرێت و دەرەنجامەکانیش بخرێنە بەردەم خەڵك و ڕۆشنبیرانی ئوممەتی ئیسلامیی تاکو ئاشنابن بە هۆکارەکانی قەیرانی فێرکردن لە ئێستا و لە داهاتووشدا، سەرەڕای ئەمەش ئەو هەموو هەوڵ و ماندووبوونەی پێشەوا حەسەن

---

ئیخوان موسلمین و خەمخۆرانی ئەم ئوممەتە.

[1]– عثمان عبد المعز رسلان: التربية السياسية عند جماعة الاخوان المسلمين، مرجع سابق، (ص ١٣٥). زكريا سليمان بيومي: الاخوان المسلمون والجماعات الإسلامية في الحياة السياسية المصرية (١٩٢٨–١٩٤٨)، مكتبة وهبة، (١٩٧٩م)، (ص ٣٠١).

[2]– ئەم هاوکاری کردنە لە بواری خوێندنی بەتەمەنەکان و نەهێشتنی نەخوێندەواری پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاتر و گرنگیدانێکی تایبەت هەیە لە لایەن ئیخوان موسلمین و خەمخۆرانی ئوممەتی ئیسلامیەوە.

بەننا لە بواری پەروەردەییدا پێشکەشی ئوممەتی ئیسلامیی کردووە و لەسەر هەردوو ئاستی سیستماتیکی و نا سیستماتیکی بەسە بۆ ئەوەی پێشەوا شایستەی نازناوی پەروەریاری ئوممەتی ئیسلامیی سەدەی بیستەم بێت، ئەوەندەش بەسە ئاماژە بەوە بکەین کە بانگەوازی پێشەوا بەننا تەنها بۆ گەلی میسر نەبوو بەڵکو چ لەڕووی هزرەوە و چ لەڕووی پراکتیزەکردنەوە بۆ تەواوی جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیی بوو. بانگەوازی بەننا سەرکەوتوو بوو لە پەروەردەکردنی ئوممەتی ئیسلامیی تاکو بتوانن بەشداری کارا لە ئەرك و چالاکیە نیشتیمانی و ئیسلامیەکاندا بکەن و موسوڵمانانی بە ئاگا هێنا لەو پلانە ناوخۆیی و دەرەکیانەی کە دژ بە ئوممەتی ئیسلامیی دەگێڕدران، هەروەها ڕۆحی تێکۆشانی لە نێو گەلانی موسوڵماناندا زیندوو کردەوە و چەند نەوەیەکی لەسەر ئەوە پەروەردەکرد کە ئامادەبن لە پێناو ئاین و ئوممەتدا قوربانی بدەن.

هەروەها پێشەوا بەننا ئەوەشی بۆ هەژماردەکرێت کە توانی پەروەردەیەکی ئابووری شوێنکەوتوانیشی بکات کە خۆی دەبینییەوە لە زیادکردنی بەرهەمهێنان و دادپەروەی لە دابەشکرنی سامان و پشت بە خود بەستن لە بواری ئابوریدا و دیارترین سیماکانی ئەم پەروەردە ئابوریەش بریتین لە[١]:

- پێویستە لەسەر ئەندام پیشەیەکی ئابووری هەبێت هەرچەندە دەوڵەمەندیش بێت، هەورەها دەبێت بەدوای کار و پیشەی ئازاددا بگەڕێت هەرچەندە کەمیش بێت.
- پێویستە لەسەر ئەندام خزمەت بە سامانی ئیسلامیی بکات لە ڕێی هاندانی بەرهەمی خۆماڵیەوە تاوەکو هیچ ڕابەرێکی ئیخوان نەکەوێتە ژێر دەستی لایەنێکی

١– رؤوف شلبي: الشيخ حسن البنا ومدرسة ((الإخوان المسلمون))،مرجع سابق، (ص ٢٠١–٢٠٥).

بیـانی و ئـەوەی دەیخـوات و ئـەوەی لەبـەری دەكـات هـەمووی لـە بەرهـەم و دروستكراوی نیشتمانی خۆی بێت.

- بەشێك لە داهاتەكەی پاشەكەوت بكات هەرچەندە كەمیش بێت و هەرگیز لە زیادە جوانكارییەكاندا ڕۆنەچێت[1].

- لە ساڵی (١٩٤٥)ەوە ئیخوان موسلمین كۆتاییان هێناوە بە مامەڵە كردن لەگـەڵ بەرهـەم و كـالاّ و كۆمپانیـا بەریتانیـەكان، بـۆ ئـەم ئامانجـەش كۆمـەڵێك كۆمپانیای ئابووری دامەزران، لە گرنگترینیان[2]:

١- كۆمپانیای مامەڵە ئیسلامیەكان (كارگەیەكی بۆ مس و كارگەیەكی تری بۆ كاشی و چیمەنتۆ دامەزراند).

٢- كۆمپانیـای عـەرەبی بـۆ كانەبـەرد (ئـەمیش بـۆ بەرهـەمهێنانی كاشـی و چیمەنتۆ و ئامێری شیو لێنانی غازیی).

٣- كۆمپانیای ڕیكلامی عەرەبی.

٤- كۆمپانیای ئیخوان موسلمین بۆ ڕستن و چنین لە شەبرا خێمە.

٥- كۆمپانیـای بازرگـانی و كاروبـاری ئەنـدازیاری (بـۆ بەرهـەمهێنانی كەرەستەكانی خانوبـەرە و ڕاهێنـانی پیشـەوەرەكان لـە پیشـەكانی كارەباچێتی و دارتاشی و بۆری سازی).

٦- كۆمپانیای بریكارێتی بازرگانی لە سوێس.

---

[1]- حسن البنا: رسالة التعاليم في مجموعة رسائل الامام الشهيد، دار الكتـب السـلفية، القـاهرة، (١٩٨٣م)، (ص ٢٧٨-٢٧٩).

[2]- چی دەبوو ئەگەر تا ئێستا مامەڵە لەگەڵ كەرەستە و كالاّ بەریتانیەكاندا نەكرایـە و پشـتمان هـەر بـە پیشەسازی و ئابوری خۆمان ببەستایە؟

٧- کۆمپانیــای بازرگــانی لــه مەحەلــه (بــۆ بەرهــەمهێنانی کــالآی چــنراو و کەرەسـتەکانی نـاو مـاڵ و کەرەسـتەی ئـۆفیس و قوتابخانـە و هـەروەها کەرەسـتە کارەبابیەکان).[١]

## جوتیاری میسری: نموونەیەك لە پەروەردەی پێشەوا حەسەن بەننا:

یەکێك لە دیـارترین ئـەو نموونانـەی هـەوڵی پـەروەردەیی پێشـەوا بـەننای تێـدا بەرجەستە دەبێت چیرۆکی ئەو جوتیارە میسریەیە کە مـن خـۆم ئـەزمونی کەسـیم لەگەڵی هەیە و لەگەڵیدا ژیاوم، ئەو جوتیـارەش خـوا لێخۆشـبوو سـەعد شووشـەی خەڵکی سەنبلاوینی دەقهیلیەیە، ئـەم جوتیـارە هـەڵگری هـیچ بڕوانامەیـەك نـەبوو، بەڵام لە ڕێگەی پۆلی ئیخوان لە سەنبلاوین و پڕۆژە ڕۆشنبیریەکانی ئەم بلێسـەیەك بـوو لـە چـالاکی و لـە زەویەکەیـدا کـەپرێکی لـە قـامیش تایبـەت کردبـوو بـۆ ئـەو گەنجانەی لە قۆناغەکانی ئامادەیی و زانکۆدان و تینووی زانستن، من لـە ڕێـی ئـەم جوتیـارەوە کتێبگـەلێکی زۆری ئیخـوانم خوێنـدەوە و لـەوێ گفتوگۆیـەکی زۆری ئیسلامیی و نیشتیمانیشمان ئەنجام دەدا.

باس لە هۆنراوەکانی هەر ناکرێت کـە کەشـێکی نـاوازەی بـۆ ئێمـە دەخولقانـد، بەڕاستی خوالێخۆشبوو نموونەیەکی بەرزی پەروەردەی ئیخوانی بوو بۆ جوتیارێـك کە جگە لە دانیشتن لەسەر خوانی ئیخـوان موسـلمین هـیچ بڕوانامـە و خوێنـدنێکی تری نەبوو، ئەو دەمانـە لـە قۆناغـەکانی سـەرەتای زانکـۆدا بـووم و زۆر تامـەزرۆی خوێندنەوە بووم لەو ساتانەدا ئەم جوتیارە دەستی گرتم و ئاشنای کردم بە زۆرێـك لە ئەدەبیات و کتێبەکانی ئیخوان موسـلمین، زۆرجـار مـن لەگـەڵ هاوڕێکـانم و ئـەم

[١]- عثمان عبد المعز رسلان: التربية السياسية عند جماعـة الإخـوان المسـلمين، سەرچاوەیەکی پێشـوو، (ص ٢٢١،٢٢٢)، ئەوەی ڕاستی بێت پەروەردەی ئابوری لای کۆمەڵـەی ئیخـوان موسـلمین پێویسـتی بـە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ هەیە.

جوتیـارەدا دەکەوتینـە گفتوگۆیـەکی قووڵـەوە سـەبارەت بـە پەیوەنـدیی ئیخـوان موسلمین بە شۆڕشەوە و هەروەها پێویستی بەرەنگاربوونەوەی دوژمنی زایـۆنی لـە ڕێگەی بەرگری میللیـەوە (نـەك لـە ڕێـی جـەنگی ڕژێمیـەوە)، لـەم گفتوگۆیانەشـدا هەموو جارێك گوێبیستی ڕاو سەرنج و بۆچوونی تازە دەبووین لەم جوتیارە و کاتێك لە بەرگری لوبنانی دەڕوانم دژ بە ئیسرائیل گوتەکانی ئەم جوتیارە ڕەسەنە دێنەوە یادم، هەنـدێك کـاتیش هـۆنراوە بڵاونـەکراوەکانی بـۆ دەخوێندینـەوە کـە هـەمووی هۆنراوەی نیشتیمانی و ئیسلامیی پڕ لە سۆز بـوون، دواتـر ئـەم جوتیـارە ڕەسـەنە دەستگیر کرا بۆ ماوەیەك ئێستا لە یادم نییە ماوەکەی چەند بوو، پاشان ئازاد کـرا و منیش تەمای ئەوەم هەبوو سەردانی بکەم تا پیرۆزبایی لیٚ بکەم و هەندێك باس و خواستی لەگەڵدا ئاڵوگۆڕ بکەم، بەڵام ئەو لە ڕێگەی باوکمەوە پـەیامێکی بـۆ نـاردم کە سەردانی نەکەم لەبـەر چـەند هۆکـارێکی ئـەمنی و هـەروەها بـۆ ئـەوەی بـەهۆی سەردانی کردنی ئەوەوە من تووشی گێچەڵ نەبم، دواتـر سـەعد شووشـە گیـانی بـە خودای گەورە سپارد–خودای گەورە لێی خۆش بێت– و لە سەنبلاوین مەڕاسیمێکی گەورەی بـۆ سـازکرا لـە لایـەن ئیخوانـەوە وەك ڕێزلێنانێـك بـۆ ئـەم جوتیـارە و لـە مەڕاسیمەکەشدا گرنگترین پرنسیپ و پەیامەکانی ئیخوان موسلمین بۆ ئامـادەبووان خرانە ڕوو و تێیدا هەندێك لە گەورە و کەڵە پیاوانی ئیخوان ووتـەیان پێشکەشکرد و منیش زۆ چێژم وەرگرت  لەم وەفادارییە بەرامبەر بەم جوتیارە مەزنە و لـە ووتـەی ئەو کەڵە پیاوانە، بەم شێوەیە بە زینـدوویی و بـە مـردووییش سـوودمەند بـووم لـە سەعد شووشە.

تا ئێستاش ناو بەناو یادی دەکەم و دەڵێم: ئەگـەر ئەمـە شـوێنکار و کاریگـەری پـــەروەردەکردنی ئـــەم جوتیـــارە بێـــت ئـــەی ئـــەبێت کاریگـــەری و شـــوێنکاری

پەروەردەکردنی ڕۆشنبیران و خوێنەوارانمان چۆن بێت؟ دەسا خودای گەورە لە پێشەوا بەننا خۆش بێت و پاداشتی گەورەی بداتەوە لە بەرامبەر هەموو ئەوەی پێشکەشی کردووە بە نیشتیمان و ئوممەتی ئیسلامی.

**پێویستی ئوممەتی ئیسلامیی بە پەروەریاری سەدەی بیست و یەك:**

پێشەوا بەننا بەڕاستی پەروەریاری سەدەی بیستەمی ئوممەتی ئیسلامیی بوو، بەلام ئەمڕۆ موسولمانان لەم بارودۆخە نوێیەی تێیدا دەژین تامەزرۆی پەروەریارێکی دیکەن کە لە ئاستی دەرك کردن و تێگەیشتنی پێشەوا بەننادا بێت بۆ بارودۆخی سەردەمی خۆی و هەروەها ئەرکەکانەنی بەرامبەر ئەم بارودۆخە نوێیە، ئوممەتەکەمان ئەمڕۆ ڕووبەڕووی پڕۆژەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی نوێ دەبێتەوە بە سەرجەم لێکەوتە و دەرەنجامە ئابووری و ڕامیاری و ڕۆشنبیریەکانە بۆیە پێویست دەکات لەسەرمان ئامادەی ڕووبەڕووبوونەی ئەم پڕۆژەیە بین.[1]

پێشەوا حەسەن بەننا لە سەردەمی خۆیدا هەردەم ئەم ووتەیەی دووبارە دەکردەوە: **ئەگەر خودای گەورە ویستی لەسەر بێت و هێزی زانستی ئەزهەر و هێزی ڕەوتە ڕوحیەکان و هێزی کۆمەلە ئیسلامیە کرداریەکان یەك بگرن و بەیەك بگەن ئەوا ئوممەتێکی بێ وێنەمان لێ دروست دەبێت، کە خەلك ئاڕاستە دەکات نەوەك خۆی ئاڕاستە بکرێت و ڕێبەری دەکات نەوەك ڕێبەری بکرێت و کاریگەری**

[1]- عبد الرحمن النقيب: منظور إسلامي لتربية الطفل في ظل بدايات الألفية الثالثة، بحث منشور بمؤتمر الطفل والطفولة في مطلع الألفية الثالثة، كلية التربية بالمنيا، (٢٥-٢٦ من إبريل ٢٠٠٦م)، (ص ١٨٧-٢١٦)، التربية الإسلامية في مواجهة العالم الجديد، دار الفكر العربي، (١٩٩٧م)، (ص ٧-٥٨)، ئەوەی ڕاستی بێت ئەم پڕۆژە تایبەتە بە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست پێویستی بە لێکۆلینەوەیەکی تایبەت هەیە دەربارەی پاشەکەوتەکانی لەسەر جیهانی عەرەبی و ئیسلامی.

**لەسەر خەڵکی دروست دەکات و خۆی کاری تێناکرێت و هەروەها ئەم کۆمەڵگە سەر لێ شێواوە دەخاتە سەر ڕاستە ڕێ**[1]. بە ڕاو بۆچوونی من ئەم سێ کوچکەیە (ئەزهەر و ڕەوتە سۆفیەکان و کۆمەڵ ئیسلامیە کرداریەکان) پێویستە ڕەهەندێکی چوارەمی بۆ زیاد بکرێت ئەویش ئەو دامەزراوە زانستی و تەکنەلۆژییانەیە کە دەتوانن بە شێوەیەکی لێهاتوو کارامە بمانگەیەنن بە زانست و دەسکەوتی تەکنەلۆژی پێشکەوتوو، تاکو بتوانین ڕووبەڕووی پرۆژەی ڕۆژهەلاَتی ناوەڕاستی گەورە و ئەو هێزە شەیتانی و تیرۆریستە جیهانیە ڕێکخراوانەش ببینەوە کە لە پشتی ئەم پرۆژیەوە دەوەستن.

***

[1]– حسن البنا: مذكرات الدعوة والداعية، (ص ٢١–٢٣).

# ڕۆڵی پەروەردە لە پڕۆژەی ژیاریی ئیسلامییدا[1]

## پێشەکی:

ئەگەر پەروەردە بە درێژایی سەردەمان دروستکەری ژیارییەکان بووبێت، ئەوا ئەو پەروەردە ئیسلامییەی کە بیری موسڵمان بە درێژایی سەردەمە گەشاوەکانی دایڕشتووە بە پلەی یەکەم بەرپرسیار بووە لە ڕابوونی ژیاریی ئیسلام و بەردەوامبوونی ئەو ژیارییە بۆ چەندین سەدە، تەنانەت ئەگەر ئەو پەروەردەیە سڕ و لاواز بێت دەبینیت یەکسەر ئەو ژیارییەش لەگەڵیدا لاواز دەبێت تا موسڵمانان دەگەن بەوەی کە ئێستا پێیگەیشتوون لە لێکهەڵوەشان و سەرشۆڕی و بێبایەخی و سەرەڕای هەوڵی موسڵمانان لە هەموو شوێنێکدا بۆ چاککردنی بارودۆخیان لەڕێی وەرگرتنی پەروەردەی نوێوە و پشتگوێخستنی پەروەردەی ئیسلامیی ڕەسەن کەچی تا ئێستا ئەوەیان بەدینەهێناوە کە ئوممەتی ئیسلامیی پێویستیەتی لە هێز و یەکێتی و ڕابوون.

[1]– مركز الإعلام العربي، القاهرة، (٢٠٠٧م).

بــە بۆچــوونی مــن ڕابــوونی عــەرەبی ئیســلامیی ناکرێــت ڕووبــدات لــەڕێی پەروەردەیەکی ئیسلامیی نوێوە نەبێت کە بنەما و فەلسەفەکانی لە ڕابردووی ئیسلامیی ڕەسەنەوە وەردەگرێت و لەم لێکۆڵینەوەدا هەوڵدەدەین وێنەیەکی خێرا پێشکەش بکەین لەبارەی دیارترین سیماکانی ئەو پەروەردە ئیسلامییەی کە دەتوانێت لە ئێستادا ئاسانکار بێت لە دروستکردنەوەی ئەو ئوممەتەی لە ڕابردوودا دروستیکردبوو، هەروەها لەڕێی سیماکانیەوە دەبینین کە پەروەردەیەکی ناوازەیە لەڕووی ئامانج و خوێندکار و مامۆستا و پرۆگرام و چالاکی و بەڕێوەبردن و پاڵپشتیکردنی ماددیی و شێوازەکانی بەڕێوەبردنیدا و ئەوەی تەنها ئەم پەروەردە ئیسلامییە دەتوانێت سەرلەنوێ ڕابوونی ئیسلامیی بەدیبهێنێت.

## ئامانجەکانی پەروەردەی ئیسلامی:

جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان ئامانجەکانی پەروەردە لە جیهانیی نائیسلامیی و ئامانجەکانی لە پرۆژەی ژیاریی ئیسلامیماندا، چونکە ئەگەر ئامانجی پەروەردە لە جیهانیی نائیسلامیدا هێنانە کایەی هاوڵاتییەك بێت کە زانست و تەکنەلۆجیای پێیە و دەیانڕەخسێنێت لە پێناو چاککردنی دونیای خۆیدا تەنانەت ئەگەر لەسەر بەرژەوەندی کەسانی تریش بێت ئەوا ئامانجی پەروەردەی ئیسلامیی لە ئێستا و لە ڕابردووشدا هێنانە کایەی مرۆڤی قورئان و سوننەت بووە کە جێنشینی لە زەوی و ئاوەدانکردنەوەی دەکاتە ئامانجی ژیانی خۆی و پەرستشی خودا دەکات بەو جێنشینی و ئاوەدانکردنەوەیە کە لەسەر ڕاستی و دادوەریی و یەکسانیی نێوان مرۆڤەکان بەندە.[١]

---

[١]– سەبارەت جیاوازییەکانی ئامانجەکانی پەروەردەی ئیسلامیی وئامانجەکانی پەروەردەی ڕۆژئاوایی بڕۆرەوە سەر: عبد الرحمن النقيب: المنهجية الإسلامية في البحث التربوي نموذجا: النظرية والتطبيق،

ئەو خوێندنەی ئوممەت دەیکاتە مەبەست خوێندنێکە زانست و تەکنەلۆجیا و باوەڕ و ئامادەگی بۆ گەیاندنی پەیامی ئیسلام هەموو پێکەوە کۆدەکاتەوە: پەیامی دادپەروەریی و ئازادیی و یەکسانیی و چاکەکاریی و مرۆڤایەتی مرۆڤ: هەموو مرۆڤێك.

## ڕوانینی موسڵمانان بۆ سروشتی زانست و مەعریفە:

بەپێی وێناکردنی ئیسلامیی بۆ زانست و مەعریفەکان دەبینین هەمووی مرۆڤ دەگەیەنن بەخودا و نزیکتریدەکەنەوە لێی[1]، یان ڕاستەوخۆ ئەگەر زانستی شەرعی بن و یان بە ناڕاستەوخۆ ئەگەر زانستی کردەیی یان کار و پیشەسازی بن[2]. یەکەمیان زانیاریی مرۆڤ بەخودا زیاددەکات، دووەمیشیان توانای مرۆڤ لەسەر ژیان لە بارودۆخە زیندەگی و ئابوورییەکاندا زیاددەکات بەشێوەیەکی باشتر تاکو بتوانێت شەرعی خوداجێبەجێ بکات، بۆیە لە خوێندنی ئیسلامیی لە چاخە زێرینەکاندا ئەو جیاکردنەوە و هێڵانە نابینین لە نێوان پیاوانی زانستە مرۆیی و شەرعی و پیاوانی زانستە کردەیی و پیاوانی پیشە و کار و پیشەسازییەکاندا و ئەو ڕوانینە گشتگیرە دەبینین لە خوێندنی ئیسلامیدا ( Comprehensive Education) چ لای پیاوانی زانستە شەرعیەکان وەك غەزالی و ئیبن تەیمییە،

---

سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ١٠٦–١٠٨) .

[1] –Seyyed Hossein Naser: an Introduction to Islamic Cosmological Doctrines. Cambridge, U.S.A., (1964).
–Science and Civilization in Islam. Cambridge, U.S.A., (1968).

[2]– بڕوانە باسکردنی ئیبن خەلدون بۆ ئەو پیشەسازییانە لە (مقدمة ابن خلدون)دا، مطبعة کتاب الشعب، القاهرة، بدون، (ص ٣٥٤–٣٨٩).

یاخود لای پیاوانی زانستە عەقڵییەکان وەك ئیبن سینا و ئیبن ڕوشد، یاخود پیاوانی کار و پیشەییەکان کە جێدەستی پیشەیی خۆیان هەبووە بەمۆرکێکی ئاینی نایابەوە[1].

ئەوەی دانراوەکانی غەزالی بخوێنێتەوە –بەنموونە– تێبینی ئەوە دەکات چۆن ئەم پیاوە زانستە شەرعی و زانستە عەقڵییەکانی سەردەمی خۆی پێکەوە کۆکردووەتەوە، هەروەها ئەوەی دانراوەکانی ئیبن سینا بخوێنێتەوە پەی بەوەدەبات چۆن ئەم زانایە ڕۆشنبیریە شەرعی و زانستیەکانی سەردەمی خۆی لە هەمانکاتدا پێکەوە کۆکردووەتەوە، بەهەمان شێوە سەبارەت بە ڕۆشنبیریی پیاوێکی بازرگانی گەڕیدەی وەك (ابن حوقل). هەموویان لەو دەریای زانست و مەعریفەیەیان خواردووەتەوە کە فێرکردنی ئیسلامیی بۆی دەستەبەرکردبوون بە ڕوانینە گشتگیرەکەی بۆ سروشتی زانست و مەعریفە. بەمەش خوێندنی ئیسلامیی ڕزگارکرا لەوەی تەنها خوێندنێك بێت لە پێناو پیشەدا (Career Education) لە نێوان چینە کۆمەڵایەتییەکاندا جیاکاری بکات و هەستکردن بەخودی لەلا گەورەبکات و بێبەشی بکات لە گەشەی تەواوکاری کەسایەتی مرۆیی وەك چۆن خوێندنی هاوچەرخ دەیکات کاتێك مۆرکی پیشەیی تەسك بەسەریدا زاڵ دەبێت کە زۆربەی خوێندنە پەروەردەییە هاوچەرخەکان بەدەستیەوە دەناڵێنن[2].

---

[1] –Gabriel Baer: Egyptian Guilds in Modern Times, The Israel Oriental society, Jerusalem, (1964), (PP. 77-126).

[2]– جون لو: تعليم الكبار منظور عالمي، المركز الدولي للتعليم الوظيفي للكبار في العالم العربي، سرس الليان، (١٩٧٨م)، (ص ٣٢٥–٣٢٨).

**داواکردنی زانست پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێکی نێر و مێ:**

کاتێك زانست و مەعریفەکان بەپێی ڕوانگەی ئیسلامیی گەیەنەربوون بەخودا بە جیاوازی جۆر و سەرچاوەکانیانەوە، بۆیە خواستێکی گشتی بوو بۆ نێر و مێ پێکەوە هەریەکە و بەپێی بارودۆخ و توانا و پێویستیە تایبەتەکانی خۆی و موسڵمانان بەپیاو و ژنەوە هەموو هاندراون بۆ دەستخستنی زانست، وەك چۆن لە پیاوان ناوی زانا و ئەدیب و شاعیر و فەقیه دەرکەوتن، بەهەمان شێوە ناوی زانا و ئەدیب و شاعیر و فەقیهی ئافرەت دەرکەوتن لە سەردەمانی بووژانەوەی ئیسلامیماندا[1].

ئەوەندە بەسە لێرە باسیبکەین کە زانایەکی وەك (ابن حزم القرطبي) دان بە چاکەی زانستی ئافرەتاندا دەنێت کاتێك دەڵێت: لە ناو ئافرەتاندا بووم و لە نهێنییەکانیان شتی وام زانیوە لەوانەیە جگە لە خۆیان کەس نەیزانێت، چونکە لەناو ژوورەکانیاندا پەروەردە بووم و لە ناو ئەواندا پێگەیشتم و جگە لەوان کەسم نەدەناسی و تێکەڵاوی پیاوانم نەدەکرد تا ئەوکاتەی بوومە گەنجێك و دەموچاوم مووی لێهات و ئەوان قورئانیان فێرکردم و شیعرێکی زۆریان بۆ گێڕامەوە و لەسەر نووسین ڕاهێنانیان پێکردم[2] و بەگشتی ئێمە لە ڕێنماییەکانی ئیسلامدا یەك دەقیش نادۆزینەوە قەدەغەیبکات لەسەر ئافرەت داوای زانست بکات و زانست فێر بکات و لە مێژووی ئیسلامیدا یەك ڕووداویش نەگێڕدراوەتەوە کە خوێندن لە ئافرەت قەدەغە کرابێت بە پاساوی ئەوەی ئیسلام ڕێگری ئەوەی لێ دەکات و هەموو

---

[1] –Khalil A. Toth: The Contribution of the Arabs to Education, Publications Teachers College, Columbia University, New York, (1926), (PP. 78-84).

– سعيد إسماعيل علي: ديمقراطية التربية الإسلامية، دار الثقافة، القاهرة، (١٩٧٤م)، (ص ٥٤– ٦٦).

[2] – محمد عبد الحميد عيسى: تاريخ التعليم في الأندلس، دار الفكر العربي، القاهرة، (١٩٨٢م)، (ص ٤٥).

ئەوەی زانایانی موسڵمانان وروژاندوویانە لەبارەی خوێندنی ئافرەتەوە هەر ئەو کەیسانەن کە ئێستا دەوروژێندرێن تەنانەت لە پێشکەوتووترین و ژیاریترین وڵاتانیشدا وەك: کامیان باشتر و گونجاوترن بۆ کچ: خوێندنی تێکەڵ (Co-Education) یاخود خوێندنی جیاکراوە (Separate Education)، ئایا ئافرەت هەمان ئەو زانستانە بخوێنێت کە پیاو دەیخوێنێت یاخود ڕەچاوی ئەرکی کۆمەڵایەتی و ڕۆڵی تایبەت بەهەر ڕەگەزێك بکرێت لە کاتی دانانی پرۆگرامی خوێندندا؟ و کەیسی تریش کە دەست لە مافی ئافرەت نادات لە خوێندندا بەڵکو دەست لە ڕێکخستن و شێوەکانی ئەم ڕێکخستنە دەدات[١].

## کوالێتی سیستمی خوێندنی ئیسلامی:

سەرەڕای ئەوەی سیستمە هاوچەرخەکانی خوێندن پێیگەیشتوون لە فرەجۆری لە هەیکەل و بەیەکداچوونی ئەو هەیکەلانە بەجۆرێك دەکرێت ناویان لێبنرێت سیستمە کراوەکانی خوێندن (Open Systems)، کە زۆربەی جار لەو جۆرەیە سەرەتا و کۆتاییەکی دیاریکراوی نییە و لە چالاکیەکەیدا پێویستی بەڕێکخستنی دەرەکی نییە، بەڵکو لە ناو خۆیدا هێزی ڕێکخستنی ناوەکی لە خۆگرتووە، هەروەك چۆن زۆربەی جار گۆڕانی بەردەوامی بەسەردادێت[٢]، بەڵام کاتێك لەبارەی خوێندنی ئیسلامییەوە دەخوێنینەوە لە سەردەمێك لە سەردەمەکانیدا، هیچ سنوور و

---

[١]– لەمەدا بڕوانە:

- Jacqueline Chaboud: The Education and Advancement of Women, UNISCO, Paris, (1970), (PP. 52-53).

- Ronals King: Education, Longman, London, (1972), (P. 47).

- John Newson: The Education of Girls, Faber and Faber, LTD, London, N.D, (P. 159).

[٢]– فؤاد أبو حطب: علم النفس التربوي، الأنجلو المصرية، القاهرة، (١٩٨٠م)، (ص ٣٨).

کـۆتێکی فـەرمی نـابینین جووڵـەی سـنووورداربکات، خوێنـدکار دەتوانێـت دەسـت بەخوێندنەکەی بکات ئەوکاتەی دەیـەوێت لـەو تەمەنـەی دەیـەوێت و بـەردەوام لـە زانست و مەعریفەکان وەردەگرێت هەرچۆنێکی بوێت و لە نێوان ئەڵقە زانستیەکاندا هاتوچۆ دەکات لێرە و لەوێ و لەوانەیە شاری خۆی بەجێ بهێڵێت بۆ شـوێنێکی تـر لەپێناو دەستخستنی زانستدا، لە کاتێکدا هیچ زانستێکی دیـاریکراو لەسـەری فـەرز ناکات کە لە چەند سـاڵێکی دیـاریکراو و لـە شـوێنێکی دیـاریکراودا تـەواوی بکـات، بەڵکو خوێندکار بە پێـی توانـای خـۆی لـە خوێندنەکەیـدا بـەردەوام دەبێـت و ئـەم لێهاتووییەش لەوانەیە وێنەی مۆڵەتێك وەربگرێت کە شێخەکەی پێی ببەخشـێت لـە زانسـتێك یـاخود زیـاد لـە زانسـتێکدا، یـاخود ببێتـە خـاوەنی یـەکێك لـە ئەڵقـە زانستیەکان و وێنەی تریش لە وێنەکانی لێهاتوویی و شارەزابوون لە زانستێکدا.

لەوانەیە خوێندکارێك ببینین گەیشـتووە بـە پلـەی مامۆسـتایەتی لـە زانسـتێکدا بەڵام وەك قوتابی لەوانەی زانستێکی تـردا دادەنیشـێت و لەوانەیـە لـە مزگـەوت لـە وانەکانی بەردەوام بێـت و پاشـان بـڕوات بـۆ ڕوانگـە یـاخود بیمارسـتان، لەوانەشـە نیشتمانەکەی بەجێبهێڵێت بۆ شوێنێکی تر، بەم شێوەیە بەبێ هیچ کۆتێك جگە لـە کۆتی زانست و خۆشویستن و بەدەمەوەهاتنییەوە نەبێت و زانایانیش ئازادییـان لـە خوێندکاران کەمتر نییە، چونکە ئەوان پرۆگرام و کاتی خوێنـدن دیاریدەکـەن دوای نوێژی بەیانی بێت یان لە ناوەڕاستی ڕۆژ یان کۆتاییەکـەی و ژمـارەی ئـەو وانانـەی دەیڵێنەوە: ڕۆژی یەك جار بێت یان دوو یان سێ... هتـد و ئـەوان مۆڵـەتی زانسـتی دەدەن بە خوێندکارەکان و بەڕێوەبردنی خوێندن بەڕێوەبردنێکی خودکارییە لەڕێی چـاودێری وەقفـەوە یـاخود ئـەو کەسـەی متمانـەی خـەڵك بەدەسـتدەهێنێت لـە بەڕێوەبردنیـدا و کەشـی زانسـتی کەشـێکی ڕۆحیـی ئیسـلامییە لەسـەر سـۆز و خۆشەویسـتی نێـوان مامۆسـتا و خوێنـدکارانی بەنـدە و ئـاداب و ڕەوشـتە

ئیسلامییەکان پەیوەندیی نێوان مامۆستا و خوێندکارەکان ڕێکدەخەن و بێ ئەوەی پێوستیی بە ئامرازی دەرەکی هەبێت بۆ ڕێکخستنی ئەم پەیوەندییە و کەم یان زۆر لە پەروەردەی ئیسلامیی بخوێنینەوە هەر دەبێت سەرسامبین بەو کەشە دیموکراسی و ئازادییە زانستیە تەواوەی کە خوێندکار و مامۆستاکان تێیدا دەژین لە سەردەمانی بووژانەوەی ئیسلامیماندا، کە ئازادییەکە زۆر دەگمەن خوێندکار و مامۆستای ئەم سەردەمە دەتوانن هەیانبێت لە سایەی کۆمەڵە سیستمێکی خوێندندا کە ئازادیی خوێندکار و مامۆستا سنووردار دەکات لە زۆر لە شتەکاندا[١].

## کوالێتی خوێندن بە پەخشکردن و بڵاوکردنەوە و خۆڕاییبوونیەوە:

لە هەستی ئیسلامیدا جەختکراوەتەوە کە خوێندن و فێرکردن تەنها پیشە و کار نییە بەڵکو لە بنەڕەتدا پەرستش و نزیکبوونەوەیە لە خودا، وەك چۆن زانا لە ئیسلامدا پێویستە لەسەری بەهەڵەداوان بەرەو فێربوون بڕوات و لە هەوڵی دەستخستنی زانست و مەعریفەی زیاتردا بێت، ئەوا بەهەمان شێوە پێویستە لەسەری خەڵکی تریش فێربکات، لە کاتێکدا ئەگەر یەکێك زانستێك بشارێتەوە ئەوا خوای گەورە لغاوی ئاگرین دەکات بەدەمیەوە لە ڕۆژی دواییدا و خودای گەورە زانایانی بەنی ئیسرائیلی سزادا بەهۆی شاردنەوەی زانستەوە، پاشان پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر) فەرموویەتی: ((رب مبلَّغ أوعى من سامع)) واتە: (لەوانەیە پێڕاگەیەندراوێك باشتر تێبگات لە کەسێك کەخۆی قسەکەی بیستووە) بەمەش

---

[١]– سەبارەت هەندێك لەلایەنەکانی قەیرانی دیموکراسیی خوێندنی هاوچەرخ، بۆنموونە بڕوانە:
- Anthony Arblaster: Academic Freedom, Penguin, Books Education, LTD, (1974).
- O'lester Smith: Government of Education, Penguin Books, LTD, (1971).
- David Rubinstein and Colin Stineman (Editors): Education of Democracy, Penguin Books, LTD, (1973).

لەسەر زانایان دوو شت پێویست بووە: زانستیان زیاد بکەن و  ئەو زانستە بگەیەنن و لە ناو خەڵکدا بڵاویبکەنەوە ئەگەرنا تووشی سزادەبن، بۆیە زانایانی ئیسلام هەمیشە بەم دوو ڕۆڵە هەردووکی هەستاون: ڕۆڵی داواکردنی زانست و سوودمەندبوون لێی و ڕۆڵی بڵاوکردنەوەی زانست لە نێو خەڵکدا لەسەر فراوانترین ئاست و لەڕێی دامەزراوە پەروەردەییە جیاوازەکانەوە و ئەم کارەیان بە ئەرکێکی شەرعی داناوە نەك وەك هۆکارێك لە هۆکارەکانی پارە پەیداکردن، بۆیە زانایەکی وەك ئەبو حەنیفە دەبینین کە پێی حەرامە پاداشت و بەخشش وەربگیرێت لە بەرامبەر فێرکردنی قورئان چونکە بەم کارە قورئان وەك کاڵای لێدەکرێت و وەرگرتنی پاداشت لەسەر فێرکردنی بنەماکانی ئایین و فیقه متمانەی خەڵك بەزانست لە دەستدەدات، ئەمە ئامۆژگاری پێشەوابوو بۆ قوتابییەکەی (أبو یوسف)[1]. تەنانەت کاتێك بارەکە گۆڕا و زانایان ئاسانکارییانکرد لە ڕەوابوونی وەرگرتنی پاداشت لەسەر فێرکردن چەند مەرجێکیان بۆ دانا کە جەخت لە ئەرکی کۆمەڵایەتی ئەو زانایانە دەکاتەوە لەگەڵ پێویستی یەکلاییبوونەوەیان بۆ ئەم کارە و خەمخۆرییان بۆ بڵاوکردنەوەی زانست لەنێو خەڵکدا.

## کوالێتی خوێندن بە بایەخدانی زانایان بە پێداویستیەکانی ئوممەت:

زانا لە ئیسلامدا لێی داواکراوە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە تەنها بەگەیاندنی زانست نەوەستێت، بەڵکو پێویستە سەرەڕای ئەو نارەحەتی و ئاستەنگانەی دێنە سەر ڕێی هەستێت بە ئەرکی فەرمان بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە، زانا هێزەکەی لە زانستە زۆرە قایلکەرەکەی و لە سەربەخۆیی ماددییەوە لە دەسەڵات و دەسەڵاتدار وەردەگرێت ، لە کاتێکدا وەقفەکانی خوێندن زۆربەی کات بەشی زانا و

[1]– أبو حنيفة والمنهج التربوي (ص ١٣)، من أبحاث مؤتمر التربية الإسلامية الذي عقدته جمعية المقاصد الخيرية، بيروت، (١٢–٢١ من آذار ١٩٨١م)، جمعية المقاصد الخيرية الإسلامية، بيروت، (١٩٨١م).

خوێندکارەکانی کردووە و بێنیازی کردوون لە دەسەڵاتداران، زانا موسڵمانەکان بە درێژایی سەردەمەکان ڕۆڵی سەرکردایەتییان گێڕاوە لە ژیانی گەلەکانیاندا، هیچ کتێبێك لە کتێبەکانی کەلەپوور ناخوێنینەوە باسێکی تێدا نەدۆزینەوە لەبارەی پەیوەندیی زانایان بەدەسەڵاتەوە و لەوەی کە دەبێت پێی بڕازێتەوە لە لە خودا ترسان و فەرمان بەچاکە و ڕێگریکردن لە خراپە[1]، بازنەی فەرمان بەچاکە و ڕێگریکردن لە خراپە ئەوەندە فراوان بووە بەردەوام کاروبارە سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکانی... هتد گرتووەتەوە، زانا ئەوەی لێچاوەڕێ نەدەکرا تەنها ئاڕاستەی کاروبارە ئایینییەکان بکات بەو واتا تەسکەی باوە لەبارەی پەروەردەی ئیسلامیی وزانایانی ئیسلامەوە، بەڵکو ئەو کاروبارە ڕامیاریانەش جێی بایەخی زانایان بوون کە پەیوەندییان بەڕەفتاری فەرمانڕەواکانەوە هەبووە لەگەڵ ئەوەی بۆیان ڕەوابووە و ئەوەشی بۆیان ڕەوا نەبووە، هەروەها کارووبارە ئابوورییەکان کە پەیوەندیی بە کار و پیشەسازییەکان و ڕەوشتەکانی پیشە و ڕاددەی شارەزایی لە پیشەکە و چاودێری کڕین و فرۆشتنەوە هەیە لە بازاڕەکاندا و کاروباری کۆمەڵایەتیەکانی وەك پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و دابونەریتەکان و... هتد، هەموو ئەمانەش جێی بایەخی زانایان بوون.

بۆیە سەیر نییە کاتێك دەبینین زانایەکی وەك شێخ (محمد سعيد القاسمي) و کوڕەکەی (جمال الدين) لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستدا کتێبێك دادەنێن بەناوی ((قاموس الصناعات الشامية)) تێیدا پیشەکانیان ژماردووە لەو کاتەی پاپۆڕە بیانییەکان لە نزیکیانەوە لەسەر کەنارەکانی بەندەری بەیروت

---

[1]– بڕوانە:

– الغزالي: إحياء علوم الدين، البابي الحلبي، القاهرة، (١٩٥٧م)، (١/٥٨–٨١).

– ابن الجوزي: نقد العلم والعلماء أو تلبيس إبليس، إدارة المطبعة الخيرية، (بدون)، (ص ١١٧–١٢٠).

بەرهەمە هێنراوەکانیان بەتاڵ دەکردەوە، وەك ئـەوەی پـەییان بـە مەترسـییەکانی هێرشـی ئـابووریی بـۆ سـەر جیهـانیی ئیسـلامیی کردبێـت[1]، ئەمـەش هەمیشـە وەك یـەکێك لـە سـیماکانی زانـا ڕاسـتەقینەکان دەمێنێتـەوە بـە درێـژایی سـەردەمە ئیسلامییەکان، کە پەی بەپێویستیەکانی نیشتمانەکانیان و ئەو مەترسییانەی لێیان نزیك دەبنەوە بکەن و هەستن بە ئەرکی فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە و بەبێ ئەوە خوێندن هیچ کوالێتیەکی نابێت.

## کـوالێتی خوێنـدن لــە فرەجـۆری و زۆری دامــەزراوەکانی و ئاســانی سوودمەندبوون لە خزمەتگوزارییەکانیان:

لەبــەر ئــەوەی سیســتمی خوێنــدنی ئیســلامیی لــە ســەرەتای دروســتبوونیدا سیستمێکی میللی خۆڕسك بوو و بەدەمەوەهاتنی پێویسـتییە ئایینییـەکانی خـەڵك بوو بۆ ئەوەی لە کاروباری ئایینەکەیان شارەزا ببن و پاشان ئەم پێویستییە گۆڕدرا بۆ خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی، کە خەڵك خۆیان پێـی هەڵدەسـتن لـەڕێی هاریکـاری یەکدیەوە بۆ پێشکەشکردنی ئەو خزمەتگوزارییە بە ڕۆڵەکانیان، بۆیە ئەم سیستمە توانی پارێزگاری لە میللیبوونی خۆی بکات، تەنانەت ئەو کاتەش کـە فـەرمانڕەوا و وەزیر و دەسەڵاتدارانی تریش لە دواتردا دەستی یارمەتییان بۆ ئەم سیسـتمە درێـژ کرد. ئەمەش ئەوەی لێ بەرهەم هات کە دامـەزراوەکانی ئـەم سیسـتمە تـەنها یـەك شێوەی نەگۆڕیان وەر نەدەگرت، بەڵکو شێوە و دامەزراوەکانی فرەچەشن بوون بە ژمارەی ئامانجە میللیەکانی پشـت هەریـەکێك لـەو دامـەزراوە فێرکارییانـە، ئـەوەتا

---

[1] – وجيه كوثراني: الإسلام والمركزية الأوربية، (ص ٨–١٢)، من أبحاث مؤتمر التربية الإسـلامية، بـيروت، سەرچاوەیەکی پێشوو.

((الكتاتيب)) هەن بۆ لەبەركردنی قورئان و فێربوونی بنـەماكانی ئـاینی ئیسـلام[١] و مزگەوت هەیە بۆ خوێندنی فرەجۆرتر و قووڵتر[٢] و قوتابخانە یان زانكۆش هەن، كـە خوێندنێكی پسـپۆڕانە و دیاریكراوترە و پێویسـتی بـە یەكلاییبوونەوەیـەكی تـەواو (Full Time Student) و مانــەوەی نــاوخۆیی لــە خوێندنگــە هەیــە[٣]، بیمارســتانەكان زانســتە پزیشـكییەكانیان لــێ دەسـت دەكـەوێت و ڕوانگـەكانیش (المراصد) زانستەكانی فەلەكیان لێ دەست دەكەوێت[٤] و دامـەزراوەی پـەروەردەیی فرەچەشنی تریش[٥] كـە لـە دەرئـەنجامی پێویسـتیە جەماوەرییەكانـەوە هاتوونەتـە كایەوە و لەڕێی چەندین وەقفەوە پشتگیرییان لێ كراوە و حكومەتە ئیسـلامییەكان چاودێریان كردوون لەڕێی پاڵپشـتی مـاددی و دانپێـدانانی مەعنـەوی بـە دەسـەڵاتی مامۆستا و خوێندكارەكانیدا.

هیچ شارێك یاخود گوندێكی ئیسلامیی نابینیـت شـێوەیەك لـە شـێوەكانی ئـەم خوێندنەی تێدا نەبێت كە لەلایـەن دانیشـتووانی گوندەكـەوە دەسـتەبەر كـراوە بـە جۆرێك لەگەڵ پێویستی تاكەكانیدا بگونجێت، وەك چۆن زانایان باسی لێ دەكەن و ئەوەی یەكێك لە لێكۆڵەران باسی دەكات بەسە لێرەدا باسی بكەین، كە تەنانەت لە

---

[١]- أحمد شلبي: تاريخ التربية الإسلامية، النهضة المصرية، القاهرة، (١٩٧٣م)، (ص ٤٤-٧٥).

[٢]- سەرچاوەی پێشوو، (ص ١٠١- ١١١).

[3]-L. Tibawi: "Origins and Character of Al-Madrasah" in the Bulletin of the schools of oriental and African studies, University of London, vol. xxv, (1962), (PP. 225-238).

[4]- Seyyed Hossein Naser: Islamic Science, An illustrate Study, world of Islam Festival Publishing Company, LTD, London, (1976), (19-24).

[٥]- سعيد إسماعيل علي: معاهد التعليم الإسلامي، دار الثقافة، (١٩٧٨م).

سەردەمانی لاوازی و کزی ڕۆشنبیرییشدا لە سەدەی هەژدەیەمی زاینیدا، وڵاتێکی ئیسلامیی وەك میسر گوندێکی تێدا نەبووە بەلایەنی کەمەوە بۆ منداڵان دامەزراوەیەکی فێرکاری تێدا نەبووبێت[1]، ئەمە لەپاڵ ژمارەی زۆری مزگەوتە زانکۆییەکاندا لە زۆربەی شارە ئیسلامییەکانی وەك (أسیوط) و (دمیاط) و (دسوق) (الفیوم) و (جرجا) و (المحلة) و (المنصورة) و (منوف) و (رشید) و (طنطا) و (الإسكندرية) و (الجیزة) و (قلیوب) و (قنا) و (قوص)... هتد، کە شێوەیەکی تر لە شێوەکانی خوێندنی باڵای تایبەتمەند دەنوێنن[2]، واتا خوێندنی ئیسلامیی کورتنەبووبوویەوە لەسەر دانیشتوانی شار بەڵکو بەسروشتی پێکهاتنی بۆ دانیشتوانی شار و لادێ دەستەبەربوو، و لەوەش گرنگتر ئەم خوێندنە دەستەبەرە دابڕاو نەبوو لە پێویستیەکانی لادێ و داواکارییەکانی وەك ئەوەی لە خوێندنی هاوچەرخدا دەیبینین لە دابڕان و کارلێك نەکردنی لەگەڵ داواکاری و پێویستیەکانی لادێدا[3].

**بەشداریکردنی کۆمەڵگەیی وەك یەکێك**

**لە سیماکانی کوالێتی خوێندنی ئیسلامی:**

بە هەمان شێوە لەبەر ئەوەی سیستمی خوێندنی ئیسلامیی لە درووستبوونیدا

---

1- S.I. Hammad: The Impact of Europe on Islam Viewed in Education: Ph.D, Thesis in Comparative Education, Institutes of London, (1952), (P. 64).

2- J.H. Dunne: An Introduction to the Histoy of Education in Modern Egypt, Frank Cass, London, (1968), (PP. 19-23).

3- Richard D'Aeth: Education and Development in the Third World, Saxon House, England, (1975), (PP. 59-81).

– Joseph S. Szyliowicz: Education and Modernization in the Middle East, Corell University Press, London, (1973), (PP. 53-60).

میللی و خۆڕسك بوو بە چەندین چەشن بەشداریی میللی تێدا بەرجەستە بووبوو لە پارەدان و بەڕێوەبردنیدا، کە وەقفە ئەهلییەکانی خوێندن زۆربوون و داهاتەکانیان زۆر بووبوو بەهۆی بووژانەوەی ڕۆشنبیریی و ئابووریی جیهانیی ئیسلامییەوە، تا هەموو وەقف و بازاڕ و دوکان و ماڵ و زەوی و نەخۆشخانەکانی گرتبوویەوە... هتد، بەوەش ئەو داهاتە ماددییە زۆرانە توانیویانە خزمەتگوزاریی زۆر بۆ زانا و خوێندکارەکان دابین بکەن لە کاروباری خواردن و خواردنەوە و شوێنی نیشتەجێبوون، کاروباری چارەسەر و چاودێری پزیشکیی تەواو، جلوبەرگ، گواستنەوە (پەیداکردنی ئاژەڵ بۆ زانا) و خزمەتگوزارییە نووسینگەییەکان و... هتد، ئەگەر کەمێکیش بخوێنینەوە لە دۆکیومێنتارییەکانی وەقفە ئیسلامییەکان کە پەیوەستن بە خزمەتگوزارییەکانی فێرکردنەوە سەرسام دەبین بەو خزمەتگوزارییانەی بۆ زانا و خوێندکار دابینکراون کە وایانلێدەکات بەتەواوی خۆیان تەرخان بکەن بۆ زانست و فێرکردن، هەروەها پەی بەنهێنی باسکردنی زۆری کتێبە فقهییەکان دەکەین بۆ ئەو وەقفانە و ئەو بابەتانەی پەیوەندیی پێیانەوە هەیە.

ئەو کتێبانە دەستیان داوەتە بابەتی وەك: پێویستی یەکلاییبوونەوەی زانا و خوێندکار بەتەواوەتی بۆ زانست تاکو شایەنی ئەوە بن لە ماڵی وەقف یارمەتی وەر بگرن، تەنانەت ڕەوا نییە بۆیان جگە لە زانست سەرقاڵی شتێکی تر بن تەنانەت پەرستشەکانیش، ئەوەی ئەگەر یەکێکیان بە شتی تر جگە لە زانستەوە سەرقاڵبوو ڕۆژانەکەی لێدەبڕدرێت واتا نابێت هیچ لەوەقف ببات،[1] و گرنگیی ئەوەی خوێندکار لە دامەزراوەی فێرکارییدا بمێنێتەوە و لێی نەڕواتە دەرەوە تاکو شایەنی ئەو خۆراك و ئاسانکارییانە بێت کە لە وەقفەکانەوە بۆی دابین دەکرێن، هەروەها ئایا

---

[1]– وداد القاضي: نبذة عن المغرب في أواخر القرن التاسع الهجري في ضوء المعيار للونشريشي، مؤتمر التربية الإسلامية، بيروت، سەرچاوەیەکی پێشوو، (ص ٣٠).

گونجاوه پارەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بگوازێتەوە، یان ئایا باشتر وایە تاك پارەکەی لە دروستکردنی وەقفێکی نوێدا دابنێت یان لە پاڵپشتیکردنی وەقفێکدا کە هەیە، یان ئایا ڕەوایە ئەو زیادەیەی لە وەقفەکە دەمێنێتەوە لە پڕکردنەوەی کەموکورتی وەقفێکی تردا بەکاربهێنرێت؟ هەروەها لە بابەتەکانی وەقفەکانی خوێندن[1] و ڕاددەی بایەخدانی زانایان بە سەرپەرشتیکردنی خوێندکاران گەشتە ئاستێك کە دەوڵەمەندەکانیشیان بگرێتەوە: کە ئایا ڕەوایە ئەو خوێندکارەی باوکی دەوڵەمەندە لە وەقفەکان ببات ئەگەر خۆی بۆ زانست یەکلاییبکاتەوە یان نا، لە کاتێکدا دەتوانێت پارە لە باوکە دەوڵەمەندەکەی وەربگرێت؟ و گەشتنە ئەوەی ئەگەر خوێندکار باڵغبوو و بە هیچ کار و پیشەیەکەوە خەریك نەبوو جگە لە زانست ئەوا ڕەوایە لە وەقفەکان ببات، چونکە بە باڵغبوون بەرپرسیارییەتی خەرجیکردنی لەسەر شانی باوکی لاچووە،و لەوانەشە باوکی بەشی ئەوەی بداتێ کتێب و تێنووسی پێ بکڕێت، بەڵام ئەمە بەشەکەی خۆی لێ حەرام ناکات کە بۆی براوەتەوە[2]، هەرچەند زیاتر و زیاتر بخوێنینەوە لەو بەڵگانەی لەبارەی وەقفەوەکانەوە هاتوون و لە بۆچوونی زانایان لەبارەی ئەم بابەتەوە ڕەهەندی نوێمان بۆدەر دەکەوێت لە بەشداریی میللی لە کاروباری فێرکردندا.

بەشداری میللی لە فێرکردندا کورت نەبووبوویەوە لەسەر پاڵپشتی ماددی، بەڵکو پەلی کێشابوو بۆ سەرپەرشتیکردن و بەڕێوەبردنی دوور لە کاریگەری حکومەت و دەستتێوەردانی دەسەڵاتە فەرمییەکان، واتا خوێندنی ئیسلامیی سیستمی بەڕێوەبردنی تایبەت بەخۆی بۆ دەستەبەربوو، دانیشتوانی گوند یان ئەهلی مزگەوت هاوکاری دەستەی وانەگوتنەوە و بەڕێوەبەرانی مزگەوت یان

---

[1]- سەرچاوەی پێشوو، (ص ٣٠-٤٤).

[2]- سەرچاوەی پێشوو، (ص ٣٢).

قوتابخانە یان بیمارستان و... هتد دەکرد، زۆر جاریش دیاریکردنی ئەو کەسانە لەڕێی پلەبەندی یان لەسەر بنەمای زانست و تەقواکاری هەروەها لەسەر بنەمای متمانەی تەواو و یاخود هەڵبژاردنی خۆکارییەوە دیاریدەکران، بەمەش ئەو بەڕێوەبردنەی خوێندنی ئیسلامیی ملکەچ نەبوو بۆ بەجێگەیاندنی هەندێك مەرج کە دەسەڵات داوایدەکات، بەڵکو بەهەڵبژاردنێکی سروشتی هەڵیاندەبژارد لە نێو ئەو خوێندکارانەدا کە لە هەمووی زیاتر بەرەو زانست دەڕوات و زیاتر خۆی بۆ یەکلاییکردووەتەوە و دڵسۆزترە لە خزمەتکردنیدا.

و جیاوازی زۆرە لە نێوان سیستمێکی بەڕێوەبردندا کە پشت بە سەرکردایەتی خۆکاریی و میللی دەبەستێت لە بەڕێوەبردن و پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە گشتیەکاندا (سیستمی ئیسلامی) لەگەڵ سیستمێکی تردا کە پشت بە سەرکردایەتی یاسایی و فەرمی دەبەستێت کە دەسەڵاتەکان لە دیاریکردنیدا دەستوەردەدەن، پاشان دەستیشی هەبێت لە ئاڕاستەکردن و گۆڕینیدا (سیستمە پەروەردەییە نوێیەکان)، لێرەوە لێکۆڵینەوەی بەشداری میللی وەك یەکێك لە سیماکانی کوالێتی هەر دەبێت ئەو ڕۆحە ئیسلامییە بهێنێتە پێش کە خەڵکی جووڵاندووە بۆ ئەو بەشدارییە چ لە پاڵپشتی ماددیدا یان بەڕێوەبردندا کە ئەویش بەهیچ شێوەیەك دەستنادات بۆ بانگەوازەکانی کوالێتی گشتگیر بەپێی ڕوانگەی ڕۆژئاوایی.

## کوالێتی زانا و خوێندکار:

هیچ خوێنەرێکی راستوێژ ناتوانێت سەرسامنەبێت بە جێبەجێکردنی ئەرکی زانستی نایابی زانا موسڵمانەکان، جا چ بە ژمارەی کاتژمێرەکانی وانەگوتنەوە

بیپێوین یان ژمارەی دانراو و نوێکارییە زانستیەکان یان بەشدارییان لە پەرەپێدانی کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، ئەو زانایانە زۆربەی کاتەکانیان لەگەڵ خوێندکارەکانیان بەسەربردووە لە دامەزراوە پەروەردەییە جیاوازەکاندا: مزگەوت، پەرتووك، قوتابخانە، بیمارستان، ڕوانگە (المرصد) و... هتد، ئەمەش جگە لە ڕۆیشتنی خوێندکاران بۆ ماڵەکانیان –زانایان– بۆ لێکۆڵینەوە و گفتوگۆی زیاتر و هەروەها تاکو زیاتر پێکەوە بن و (عبداللطیف البغدادي) وێنەیەکمان لەوبارەیەوە پێشکەش دەکات و دەڵێت: ((ژیانی من لەو ماوەیەدا –ماوەی مانەوەی لە میسر– ئەوە بوو قورئانم بە خەڵك دەخوێند لە مزگەوتی ئەزهەر لە سەرەتای ڕۆژەوە (ڕاستەوخۆ دوای نوێژی بەیانی) بۆ ماوەی چوار کاتژمێر (مەبەستی چوار کاتژمێر دوای نوێژی بەیانییە) و لە ناوەڕاستی ڕۆژدا ئەوانە دەهاتن کە دەیانەویست پزیشکی و زانستی تریش بخوێنن و لە کۆتایی ڕۆژدا دەگەڕامەوە بۆ مزگەوتی ئەزهەر و کۆمەڵێکی تر قورئانیان لا دەخوێندم و شەویش لەگەڵ خۆم خەریك دەبووم)).[1]

زۆر دەگمەنە پەیوەندییەکی نێوان خوێندکار و مامۆستاکەی ببینینەوە نزیك بێت لەو پەیوەندییەی لە نێوان خوێندکار و مامۆستاکەیدا هەبووە لە سەردەمە ئیسلامییە بووژاوەکاندا. مامۆستا وەك کوڕی خۆی مامەڵەی لەگەڵ خوێندکارانیدا دەکرد، خوێندکارانیش ڕێزیان لە مامۆستاکانیان دەگرت و شانازییان بەوەوە دەکرد کە خوێندکاری فڵانە مامۆستان. کاتێك ژیاننامە جیاوازەکان دەخوێنینەوە هەستدەکەین لە بەردەم خوێندنگەی زاستی و ئەدەبی و شەرعیداین کە مامۆستا دەکاتە تەوەر زیاد لەوەی بەدەوری دامەزراوەیەکدا بسوڕێتەوە کە خوێندکارانی

[1]– بڕوانە:

- محمد عبد الله عنان: مصر الإسلامية، مطبعة الخانجي، القاهرة، (١٩٦٩م)، (ص ١٣٢).
- عبد الرحمن النقيب: فلسفة التربية عند ابن سينا، دار الثقافة، القاهرة، (١٩٨٤م).

لێی دەردەچن، هەر زانایەك دەدرێتە پاڵ مامۆستاکانی فلاَن و فلاَن، لە هەمان کاتدا باس لە خوێندکارەکانی دەکرێت (لە خوێندکارەکانی فلاَن و فلاَن) واتا ئێمە بەڕاستی لەبەردەم خوێندنگەی زانستی و ئەدەبی و شەرعیداین. گومانیشی تێدا نییە کە بوونی خوێندنگەی زانستی و ئەدەبی بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بەڵگەیە لەسەر ئاستی زانستی و ئەکادیمی نایاب.

زۆریی بەرهەمی زانستی و هزری مامۆستایانی خوێندنی باڵا لای موسڵمانان ئاماژەیە بە بوونی ئاستێکی نایاب، چونکە زۆری ئەم ڕێژەیە سەرسامت دەکات، بە تایبەت ئەگەر باری قورسی وانەگوتنەوەمان لە پێش چاو بێت کە ئەو زانایانە هەڵیان گرتووە و تا ئێستاش لەیادمە کە چۆن سەرسام بووبووم پاش تۆمارکردنی نامەی ماجستێرەکەم لەبارەی ((بۆچوونە پەروەردەییەکان لە نووسراوەکانی ئیبن سینادا)) کاتێك بینیم ئەم پیاوە زیاد لەسەد و پەنجا چاپکراو و دەستنووسی هەیە زۆربەی زانستەکانی سەردەمی خۆی گرتۆتەوە تەنانەت شیعریش. کە (الأب قنواتي) ناوی ئەو دانراوانەی ژماردووە[1]، بۆ زانینی بەرهەمی مامۆستایانی تری خوێندنی باڵا لای موسڵمانان (ابن سینا) بکە پێوەر.

سەرەڕای ئەو بەرهەمە زانستیە زۆرانە زانایان ڕۆڵی نایابیان هەبووە لە کرانەوەدا بەسەر هەموو ڕۆشنبیریەکانی سەردەمی خۆیاندا، هەروەها لە وەرگێڕانی هەموو زانست و مەعریفەکان بۆ عەرەبی، پاشان تێپەڕاندنی قۆناغی وەرگێڕان بۆ قۆناغی داهێنان و شارەزایی لە ماوەی دوو یان سێ نەوەدا: نەوەی وەرگێڕان، نەوەی ڕابوون، نەوەی داهێنان، کە ئەوەش کارێکی ژیاریی مەزنە بەهەر پێوەرێکی

---

[1]- الأب قنواتي: مؤلفات ابن سينا، دار المعارف، القاهرة، (١٩٥٠م).

زانستی بپێورێت. بەڵێ لە پشت ئـەوەوە سیسـتمێکی سیاسـی هـەبوو کـە بڕیـاری بەعەرەبیکردن و کۆکردنەوەی هـەموو کتێبـەکانی دا لـە سەرتاسـەری جیهانـەوە و پێدانی نرخی کتێبە وەرگێڕدراوەکە بەکێشی خۆی لـە زێـڕ، بـەڵام ئەگـەر ئـیرادەی بەهێزی ئەو زانایانە و شانازیکردنیان بەزمانەکەیانەوە و بەتواناییان تێیدا نەبووایە، ئەو ڕووداوە ژیارییە مەزنە ڕووینەدەدا. زاناکان چۆنبوون خوێنـدکارانیش بەهـەمان شێوەبوون لە وچان و تێکۆشانیاندا، هەروەها لـە بەدەمەوەچـوونیان بـۆ زانسـت و پەیوەندیی جوانیان لەگەڵ هاوڕێ و مامۆستاکانیان و شانازیکردنیان بـە دامـەزراوە فێرکارییەکانیانەوە و پارێزگارییان بۆیان کە لە هەموو ئەمانەدا ڕۆحێکی ئیسـلامیی پاڵنـەریان بـووە بـۆ ئـەوەی ڕێـز لـە زانسـت و زانایـان بگـرن، ئەمانـە و بـوونی سیستمێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیش کە هەموو ڕێچکەکانی زانست و فێرکردنیان بۆ دابیندەکردن[١].

## کوالێتی باڵەخانەی خوێندن:

زۆرێـك لـەو لێکۆڵینەوانـەی باسـی ئـەو مەرجانـە دەکـەن کـە پێویسـتە لـە

---

[١]- بڕوانە:

- محمد عبدالعليم مرسي: مسيرات البحث العلمي عند المسلمين، إدارة الثقافة والنشر، جامعة الملك محمد ابن سعود الإسلامية، الرياض، (١٤٠٨هـ).

- أحمد محمد إبراهيم فلاته: آداب المتعلم في الفكر التربوي الإسلامي، دار المجتمع للنشر والتوزيع، (١٩٩٣م).

- عبد الرحمن النقيب: ((المعلم المثالي كما تصوره بعض كتب تراثنا التربوي))، في بحوث في التربية الإسلامية، الكتاب الأول، دار الفكر العربي، القاهرة، (١٩٨٣م)، (ص ٥-٨٣).

باڵەخانـەکانی خوێندنگەکانـدا هـەبن جـەخت لەسـەر  گرنگیـی شـوێن و فراوانـی باڵەخانە و مەرجە تەندروستیەکان دەکەن و بـاس لـە کاریگـەرییان دەکـەن لەسـەر کوالیێتی پرۆسەی خوێندن، گرنگیی کوالیێتی باڵەخانـەکانی خوێنـدن سـەرەڕای ئـەو کاریگەریـە باشـەی هەیـەتی لەسـەر تەندروسـتی خوێنـدکار و فەرمانبـەرەکانی گرتگییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی وەك نموونەیەك بۆ ژیانێکی تەندروست چـاوی لێدەکرێت، چونکە ژیانی تەندروستی خوێندنگە ئەزموونێکی واقیعیە کـە چـەندبارە دەبێتـەوە و دەبێتـە هـۆی دروسـتکردنی خـووی تەندروسـت و پـەروەردەبوون و پێگەیشتنی لاوان لەسەر لایەنی ئەو خووە تەندروستانە[1] و گومانی تێدانییە هـەموو ئەوەی لە سەرچاوە عەرەبی و بیانییەکاندا هاتوون لەبارەی کـوالێتی باڵەخانـەکانی خوێندنـەوە لـەو بابەتـە گرنگانـەن کـە دەبێـت لێیـان سـوودمەندبین لـە کـاتی پلاندانانماندا بۆ خوێندنگە و دامەزراوە فێرکارییـەکانمان، بـەڵام سـوودمەندبوونمان لە هەموو ئەوانە نابێت ببێتە هۆی پشتگوێخستنی کەلەپووری پەروەردەییمان بێـت لەم بوارەدا. چونکە موسڵمانان لە سەردەمانی بووژانەوەیانـدا گرنگیـان بـەوە داوە هەموو مەرجێکی تەندروستی و جوانکاری بۆ باڵەخانـە فێرکارییـەکانیان دابینبکـەن کەوا لەو دامەزراوانە دەکەن کاریگـەرتربن، جـا چ مزگـەوت بـن یـان قوتابخانـە یـان بیمارستان یان... هتد.

---

[1]– بڕوانە:

– يحيـى هنـدام، محمـد الشـبراوي علـي: أساسـيات الصـحة المدرسـية، دار النهضـة العربيـة، القـاهرة، (١٩٦٤م).

– محمـد محيـي أحمـد حشـمت: الصـحة المدرسـية والتربيـة الصـحية، المعهـد العـالي للصـحة العامـة بالإسكندرية، بدون.

و سەرچاوە ئیسلامییەکان باس لە شوێنی دەستنوێژگرتن دەکەن لە پاڵ مزگەوتەکاندا و خۆرگر (کەپری تەختەیی) کە لەسەر دەرگا و پەنجەرەکانەوە دادەنرێن بۆ ئەوەی ناوەوە بپارێزن لە خۆر و باران و ئامرازێکی نەخش و جوانکارییشی بۆ زیاد بکەن و حەوزی پڕ لە ئاو لە ناوڕاستی مزگەوت یان خوێندنگەدا بۆ فێنککردنەوەی کەش یان لە ترسی ئەوەی بەشەودا ئاگربکەوێتەوە و حەمامی خۆشۆردن و چێشتخانە بۆ چێشتلێنان و کاتژمێر بۆ زانینی کات و جوانکردنی باڵەخانەکان و تابلۆی قورئانیی پایە و دیوارەکانی پێ برازێندرێنەوە بەنەخشە جوانەکانیان و پەنجەرە مسەکان بەنەخشە ئەندازەییە ناوازەکانیەوە.[١]

ئەگەر هەموو سیماکانی جوانیی و هۆکارە تەندروستیەکان بهێنین کە موسڵمانان بۆ پەیمانگا فێرکارییەکانیان دابینیان کردووە باسەکەمان زۆر درێژە دەکێشێت، ئەوەی جێی داخە پەرتووکە پەروەردەییەکانی ئێستا کە باس لە باڵەخانەکانی خوێندن دەکەن بەنزیکەیی بەتاڵن لە باسکردنی ئەم لایەنە گرنگە کە وێنایەکی وا لای لێکۆڵەر دروستدەکات ئەم کارانە بەرهەمی ئەم سەردەمەن و موسڵمانان زۆر گرنگیان پێنەداوە، ئەمەش پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە کە ئەو لایەنە جوانکاریی و تەندروستیە دەربخات لە باڵەخانەکانی خوێندندا لە سەردەمە ئیسلامییەکاندا.

## کوالێتی پرۆگرامەکانی خوێندن و گشتگیرییان:

کتێبەکانی پۆلێنکردنی زانستەکان لای موسڵمانان –وەك (إحصاء العلوم)ی

[١]– ڕۆڵی ئیسلام وڕێنماییەکانی لەپلاندانانندا بۆ پەروەردەی تەندروستیی لەخوێندنگەکانی جیهانی ئیسلامییدا لە: عبد الرحمن النقيب: بحوث في التربية الإسلامية، الكتاب الثاني، دار الفكر العربي، القاهرة، (١٩٨٤م)، (ص ١٠٩) وەئەوەی بەدوایدادێت.

فارابی، (مفاتیح العلوم)ی خەوارزمی، (الفهرست)ی ئیبن نەدیم، (مفتاح السعادة ومصباح السیادة)ی طاش کوبری زادە، (مقدمة ابن خلدون) و هی تریش- وێنەیەکمان دەدەنێ لە دەوڵەمەندیی ئەو پرۆگرامانە و چۆن پێشی مەعریفەی ئوممەتەکانی تری سەردەمەکەی داوەتەوە، هەروەك چۆن بیرۆکەیەکمان دەدەنێ لەو زانستە فرەچەشنانە کە زانستخواز دەیانتوانی ئەوەی دەیانەوێت لێیان هەڵبژێرن. زانایانی موسڵمانان ئەو پۆلێنکردنانەیان وەك ڕێبەری زانستی بۆ خوێندکارەکانیان پێشکەشکردووە کە بوارەکانی پسپۆڕییە جیاوازەکانیان تێدا ڕوونکردووەتەوە لەگەڵ بیرۆکەیەکی کورتکراوە لەبارەی هەریەکێك لە زانستەکان و بەناوبانگترین لێکۆڵینەوەکان کە لەهەر زانستێکیاندا نووسراوە بە جیا و هانی زانستخوازانیان داوە ئەو زانستانە هەڵبژێرن کە حەزیان لێیەتی و بە زانستە گرنگەکان دەستیانپێدەکرد، پاشان کەمتر گرنگ و هەروەها، چونکە تەمەنی مرۆڤ کورتە و زانستەکانیش زۆرن.

خوێندکاران بەرەو ئەو زانستانە ڕۆیشتن باوەڕدار بەوەی لەسەروو هەموو خاوەن زانستێکەوە زانایەك هەیە و ئەوەی کە داواکردنی زانست لە بێشکەوە تا ناو گۆڕە و بە داواکردنی زانست بە ڕوانینێکی پسپۆڕانەی تەسکەوە نەوەستان کە هەر لەیەك بابەت یان لقدا لە زانست ببنە پسپۆڕ بە بێ گرنگیدان بە زانست و مەعریفەکانی تر. ئەو مەعریفە پسپۆڕییە تەسکە ((زانای پسپۆڕی یەکڕەهەندیی)) بۆ بەرهەم هێناین کە یەکێك لە زانایان بە تەنزەوە لەبارەیەوە دەڵێت: "زانینی زۆرتر و زۆرترە دەربارەی کەمتر و کەمتر." یەکێکی تریشیان دەڵێت: "بەردەوام پسپۆڕتر دەبوو و پسپۆڕتر دەبوو تا وایلێهات لە هیچدا بوو بە پسپۆڕ".

خوێندنەوەیەکی خێرا بە ناو ژیاننامەی زانا موسڵمانەکاندا جا بە هەر پسپۆڕییەك بەناوبانگ بووبن، ئەوەمان لا دڵنیا دەکاتەوە کە هەموویان خاوەن پسپۆڕیی فراوانبوون. سەرەڕای بەناوبانگبوونی یەکێکیان بە فیقهـ و ئەدەب یان پزیشکیی یان فەلسەفە یان کیمیا...هتد زۆر دەگمەنە کە هەموو بایەخدانێکی تەنها

لــەو زانســتەدا بووبێــت کــە تێیــدا بەناوبانگــە، بــەڵکو هەمیشــە بازنــەی گرنگیــدانی زانستیان فراوانبووە تا لێکۆڵینەوەی هاودەمی لە سروشت و سیاسەت و ڕەوشــت و گەردووناســیی...هتد گرتووەتــەوە و (بــڕاون) و لێکۆڵــەرانی تــریش هەڵــە دەکــەن کاتێك ئەوە دەگەڕێننەوە بۆ ئەوەی کۆی مەعریفەکان لە سەردەمە ئیسلامییەکاندا زۆر زەبەلاح نەبوون، بەجۆرێك بەدەربن لە توانای کەسێك کە بتوانێت لە هــەموویان بگات[1]، هەر ئەو کتێبانەی پۆلێنکردنی زانستە ئیسلامییەکان کە ئاماژەمان پێدا ئەم قسەیە دادەروخێنن. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە سیستمی فێرکردنی ئیسلامیی بەنـدە لەسەر خۆشویستن و پیرۆزکردنی زانست لەلایەك و ئازادیی خوێندکار لە هەڵبــژاردن و دەستدانە هەر زانستێك کە دەیەوێت لەلایەکی تر بــەبێ ئــەوەی ببەســترێتەوە بــە قۆنــاغی خوێنــدنی دیــاریکراوەوە، و ئــازادیی لــە شــوێنگۆڕین لــە پێنــاو داواکردنــی زانستدا، ئەمە لەپاڵ ئــەو ئاســانکارییە مــاددیی و مەعنەوییانــەدا کــە بــۆ خوێنــدکار دەستەبەربوون لە سەردەمی بووژانەوەی ئیسلامییدا[2]، ئەمانە هــەموو هۆکــاری ئــەو (بەپیتییە زانستیە) بوون کە زانا موسڵمانەکان پێی تایبەتمەندبوون لەو کاتــەدا چــا هەر پسپۆڕییەکیان هەبووبێت، کە ئەویش بەپیتییەکە زۆریی دانراوەکانیان و زۆریی خوێندکارەکانیان و جۆری ئەو ژیانە زانستیەی کە ژیاون و ئــەو شــوێنپێ زانســتی و ژیارییەی کە دوای خۆیان بەجێیان هێشتووەهەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەری.

---

[1]- إدوارد ج. براون: الطب العربي، ترجمة: أحمد شوقي حسن، مؤسسة سجل العرب، القاهرة، (١٩٦٦م)، (ص ١٤٠، ١٤١).

[2]- محمد عبد العليم مرسي: مسيرات البحث العلمي عند المسلمين، إدارة الثقافة والنشر، جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية، (١٤٠٨م).

# کۆتایی:

ئەمە وێنەیەکی خێرایە لە شاکارەکانی پەروەردەی ئیسلامیمان و ئەوەی چۆن مەزنترین ژیاریی پێشکەش بە جیهان کرد، ئەوەش بەسە ئەم پەروەردەیە ئەو ژیارە بڵندەی بەرهەمهێنا کە مرۆڤ لەژێر سایەیدا بۆ چەندین سەدەی دوورودرێژ حەسایەوە، بۆ خاوەنەکانی و ئوممەت و گەلەکانی تریش پێشکەوتنی زانستی و ڕەوشتی و ژیاریی بەدی هێنا و ئەگەر گەندەڵیی سیاسی و لێکەوتەکانی نەبوایە وەك لاوازیی ئابووری و بەردەوامی هێرش و جەنگەکان لەلایەن دەوڵەتانی ترەوە کە تەماحی داگیرکاریی لە وڵاتە ئیسلامییەکان دەیجووڵاندن ئەم خوێندنە لاواز نەدەبوو و ڕەگەزەکانی کوالێتیەکەی لەدەست نەدەدا و موسڵمانان نەدەگەیشتنە ئەوەی پێیگەیشتوون لە دووبەرەکیی و لاوازی و دواکەوتن لە هەموو بوارەکانی ژیاندا.

و ئەگەر ئەمڕۆ هەوڵی ڕاپەڕینێکی پەروەردەیی ڕاستەقینە بدەین و بانگەواز بۆ کوالێتیەکی فێرکردن بکەین کە دووبارە بەرزمانبکاتەوە بۆ ڕیزی دەوڵەتە پێشکەوتوو و خاوەن شارستانییەتەکان، چونکە زۆر مەترسییدارە ئەگەر بمانەوێت ئەوکارە دوور لە ڕێنماییەکانی ئیسلامەکەمان بکەین بێئاگا لە کەلەپووری پەروەردەییمان بەهەموو ئەوەی لە خۆیدەگرێت لەبەها و جێبەجێکردنی پەروەردەیی بەرز.

***

# ئیسلامێتی پەروەردە
# وەك ئامرازێك بۆ بەدیهێنانی گونجانی ئیسلامی[1]

## پێشەكی:

ئوممەتی عەرەبی و ئیسلامیمان ڕووبەڕووی كێشمەكێشمی سیاسی و ئابووری و تەكنەلۆجی وەها بووەتەوە سەختە یەك وڵات بە تەنها بتوانێت ڕووبەڕووی ببێتەوە و لەوانەیە پرۆژەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورە بە هەموو لێكەوتە سیاسی و ئابووری و تەكنەلۆجیەكانیەوە كۆتا وێنە لە وێنەكانی ئەو كێشمەكێشمانە بنوێنێت[2]. سەرەڕای مەترسییداریی ئەم پرۆژە ئەوروپییە ئەمریكییە ئیسرائیلییە كە هەڕەشە لە بوونی عەرەبی و ئیسلامیی دەكات، گەلە عەرەبی و

---

[1]- لێكۆڵینەوەیەكی پێشكەشكراو بەكۆنگرەی نێودەوڵەتیی بۆ ڕۆڵی ڕۆشنبیریی وزانستەكان وفێركردن لەچەسپاندنی گونجانی ئیسلامییدا، تاران –ماوەی نێوان (٢٠-٢١ ی شوباتی ٢٠٠٨م) بەسەرپەرشتیی: وەزارەتی پەروەردە و فێركردن و لیجنەی (ئیسیسكۆ)ی نێودەوڵەتیی لەكۆماری ئیسلامیی ئێراندا.

[2]- عماد الدين شاهين: ((الشرق الأوسط الكبير. أصداء الرؤى العربية))، في أمتي في عام (٢٠٠٣/٢٠٠٤م)، مركز الحضارة للدراسات السياسية، القاهرة (٢٠٠٥م)، (ج ١)، عبد الرحمن النقيب: ((كليات التربية وتحديات الشرق الأوسط الكبير)) في الندوة السنوية الخامسة لقسم أصول التربية – كلية التربية بطنطا، ج.م.ع، الثلاثاء (١٨ من أبريل ٢٠٠٦م).

ئیسلامییەکانمان –چ جای زۆربەی حکومەتەکان– گرنگیی بەم مەترسییە نادەن کە ڕووبەڕووی بوونیان دەبێتەوە و مەترسییەکی وا هانیان نادات بۆ پێویستی یەکگرتن و هاوکاری لە پێناو ڕووبەڕووبونەوەی ئەم مەترسییە کە پلانی بۆ داڕێژراوە بۆ لێکپچڕاندنی یەکێتیمان و لاوازکردنی ئوممەتمان و دزینی سامان و خێروبێرەکانمان و سڕینەوەی شوناس و ژیاریی عەرەبی و ئیسلامیی بڵندمان.

ئەم توێژینەوە جەخت لەوەدەکاتەوە کە ئەم پڕۆژە ئەورووپییە ئەمریکییە ئیسرائیلییە لە بنەڕەتەوە هەر دەرنەدەکەوت ئەگەر ئوممەتی عەرەبی و ئیسلامیمان هێشتا نەوەی قورئان و سوننەتی پەروەردە بکردایە کە ملکەچی تەواوی بۆ (الله)یە وەك پەروەردگار و بۆ قورئان وەك دەستوور و پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) وەك سەرکردە ڕێنیشاندەر.

تێکچوونی پەروەردە لە وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکانماندا بەرپرسیارە لە بوونی نەوەیەك لە ئێستادا رازییە بە دووبەرەکیی لە جیاتی یەکێتی و بەلاوازیی لە جیاتی هێز و بەدواکەوتن لە جیاتی پێشکەوتن و ژیار و پێشڕەوییەکی دادپەروەرانە.

ئێمەش –پەروەردەکارە مسوڵمانەکان– چ لەڕووی شەرعەوە بێت یان لەڕووی عەقڵەوە ئەوەمان لێداواکراوە خۆمان بە لێکۆڵینەوەی ئەوەوە سەرقاڵبکەین چۆن نەوەکانی ئوممەت بە پەروەردەیەکی ئیسلامیی پەروەردەبکەین بتوانێت ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم ئاڵنگاریانە ببێتەوە بەباوەڕێکی بەهێز و زانستێکی پتەو و تەکنەلۆجیایەکی کاریگەر.

**مەبەستمان چییە لە پەروەردەی ئیسلامیی خوازراو؟**

هەندێك لە لێكۆڵەران هەوڵی ئەوەیاندا پێناسەی ئەو پەروەردە ئیسلامییە بکەن کە دەمانەوێت، ئەمانەش چەند نموونەیەکن لەو پێناسانە:

**پەروەردەی ئیسلامیی بریتییە لە:** ((پەرەپێدان بە کەسایەتی ئیسلامیی لە هەموو ڕوویەکەوە، لەڕووی هزر و سۆز و جەستە و لایەنی کۆمەڵایەتی و هەروەها ڕێکخستنی ڕەفتارەکانی بە پێی پرنسیپ و ڕێنماییەکانی ئیسلام بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانی ئیسلام لە هەموو بوارەکاندا)).

**پەروەردەی ئیسلامیی بریتییە لە:** ((ئامادەکرنی تاکی موسوڵمان بە شێوەیەکی تەواو و لە هەموو ڕوویەکەوە و لە هەموو قۆناغەکانی گەشەکردنیدا بۆ ژیانی دونیا و دوارۆژی ئەمەش لەژێر سێبەری بەها و پرەنسیپەکانی ئیسلام و هەروەها لەژێر سێبەری شێواز و ڕێگاکانی پەرەوەردەی ئیسلامی)).

**پەروەردەی ئیسلامیی بریتییە لە:** ((کۆمەڵێك چەمك کە بەیەکەوە پەیوەستن لە چوارچێوەیەکی هزریدا و پشت دەبەستێت بەو بەهاو پرنسیپانەی ئیسلام لەگەڵ خۆی هێناوە و هەروەها وێنەی کۆمەڵێك ڕێکار و شێوازی کرداری دەکێشێت کە جێبەجێکردنیان لەلایەن کەسێکەوە دەبێتە هۆی ئەوەی ڕەفتارەکانی ئەو کەسە لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامیدا یەکبگرێتەوە)).

**پەروەردەی ئیسلامیی بریتیە لە:** ((چالاکیەك کە تاك و کۆمەڵگە پێی هەڵدەستن بە مەبەستی پێگەیاندنی مرۆڤ لەڕووی هزر و بیروباوەڕ و هەروەها لەلایەنی کۆمەڵایەتی و جەستەیی و ویژدان و جوانی و ڕەوشت، هەروەها پڕکردنی بە زانست و زانیاری و بەهاو لێهاتووی پێویست بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی دروست و بە پێی ئامانجەکانی ئیسلام گەشە بکات و پەرەبسەنێت)).

**پەروەردەی ئیسلامیی بریتییە لە:** ((پرۆسەیەکی ئامانجدارە لە ژێر ڕۆشنایی

شـەریعەتی ئیسـلامیی ئەنجامـدەدرێت، ئامـانجی برەودانـە بـە هـەموو ڕووەکـانی کەسایەتی مرۆڤ بۆ بەدیهێنانی بەندایەتی تەواو بۆ خودای گـەورە، تێیـدا کۆمـەڵێك کەسی لێهاتو و پسپۆڕ هەڵدەستن بە ئاڕاستەکردنی کەسـانی تـر لـە ڕێگـای چـەند شێوازگەلێکی گونجاو، ئەمەش بە بـەکارهێنانی نـاوەڕۆکێکی فێرکـاری دیـاریکراو و شێوازی ڕاستکرنەوەی گونجاو)).

و ئـەوەی تێبـینی دەکرێـت لەسـەر هـەموو ئـەو پێناسـانە ئەوەیـە پـەروەردەی ئیسلامیی پێویسـتە ئاڕاسـتە و فەلسـەفە و مەبەسـتەکانی هـەمووی لـە شـەریعەتی ئیسـلامیەوە وەربگرێـت، هـەروەها ئـەو پێناسـانە دووری و پـەرگیری پـەروەردەی ئیسـلامیی لـە ئاڕاسـتە و ڕێنماییـەکانی ئیسـلام ڕەت دەکەنـەوە جـا چ لـەڕووی تیۆریەوە بێت یاخود لـەڕووی کرداریـەوە. وە پـەروەردەی ئیسـلامیی بـەم واتایـە پەروەردەیـەکی ئامانجـدارە و مەبەسـتی دروسـت کـردن و پێکهێنـانی تـاکێکی موسوڵمان و کۆمەڵگەیەکی موسوڵمان و ئوممەتێکی موسوڵمانە  کە جێنشین کراوە لە زەویدا بۆ هەڵگرتنی پەیامی خـودا، جـا ئـەم پەرەوەردەیـە چ لـەڕێی دامـەزراوە فەرمیەکانی وەك قوتابخانە و زانکۆکانەوە ئەنجامبدرێت یاخود لەڕێگەی دامـەزراوە نافەرمیـەکانی وەك مـاڵ و دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن ئـەنجام بـدرێت وەك یـەك وایـە و جیاوازی نییە.

**پەروەردەی ئیسلامیی بەم واتایە بریتییە لە:** ((سیستمێکی پەروەردەیی خودای گەورە پێویستی کـردووە لەسـەر موسـوڵمانان کـە خۆیـان و منداڵـەکانیانی لەسـەر پـەروەردە بکـەن، هـەروەها لـەژێر ڕۆشـنایی ئـەم سیسـتمەدا خـزم و کەسـیان پێبگەیەنن و ئاڕاستەیان بکەن دوور لە سیستمە بێبـاوەڕی و ئاتایسـتەکان، یـاخود سیستمە سیکولارە بێدینییە خوارۆخێچەکان)).

**هەروەها پەروەردەی ئیسلامیی بریتییە لـە:** ((ئـەو سیسـتمە پەروەردەییـەی

خودای گەورە پێویستی کردووە لەسەر دەسەلأتدارانی موسوڵمانان و بەرپرسانی کاروباری پەروەردەیی و فێرکاری و ئەو دامەزراوانەی کە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ پەیوەندییان پێوەی هەیە بۆ ئەوەی کار بۆ بەدیهێنانی ئامانج و مەبەستەکانی ئەم سیستمە بکەن، ئەمەش لەڕێگەی ئەم دامەزراوە پەروەردەییانە و پرۆگرامەکانی و جێ بەجێکردنەکانی و سیستمەکانیەوە))[١].

ئەم پەروەردە ئیسلامییەیە کە بەکردەیی دەتوانێت یەکێتی ئوممەت و پێکەوە گونجانی بەدیبهێنێت، بەرپەرچی هەموو ئەو پیلانانەش بداتەوە کە ڕووبەڕووی کراونەتەوە.

زانا پەروەردەییەکانی ئوممەت لەڕێی ئەو شەش کۆنگرەوە کە بەستوویانە لە: مەککەی پیرۆز (نیسان ١٩٧٧ز)، ئیسلام ئاباد لە پاکستان (ئازار ١٩٨٠ز)، دەککا لە بەنگلادش (ئازار ١٩٨١ز)، جاکارتا لە ئیندۆنیسیا (ئاب ١٩٨٢ز)، قاهیرە (١٩٨٧ز)، کیپتاون لە باشووری ئەفریقا (ئەیلول ١٩٩٦ز)، هەوڵیاندا ئەو پەروەردەیەی لە ئێستادا هەیە لە جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیماندا ڕزگاری بکەن و جێگرەوەی بۆ دابنێن چ لەڕووی هەیکەلی فێرکارییەوە بێت یان ئامانجەکانی فێرکردن و ناوەڕۆك و پرۆگرامەکانی یاخود لە ئامادەکردنی مامۆستا و جۆرێتی و چۆنیەتی هەڵبژاردنی بێت، ئامادەکردنی خوێندکار و ئەوەی دەبێت بۆی دەستەبەربێت لە بارودۆخی کۆمەڵگەیی ئیسلامیی گونجاو. دەکرێت بەمشێوەیە کورتبکرێنەوە:

---

[١]– محب الدين أحمد أبو صالح: تصور مقترح حول منهج البحث في المنهجية الإسلامية والعلوم السلوكية والتربوية، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، هيرندن، الولايات المتحدة الأمريكية، (١٤/٣).

### ١- هەیکەلە فێرکارییەکان:

لایەنگرانی ئاڕاستەی ئیسلامیی بە شێوەیەکی گشتی دەزانن کە ئەو بارودۆخانەی لە دامەزراوە پەروەردەیی و فێرکارییەکانی ئێستادا بەرپایە لە زۆربەی وڵاتانی جیهانیی ئیسلامیدا وێنەیەکی ئیسلامیی دروست نانوێنن و بە ڕۆڵی سەرشانیان هەڵناستن لە پێگەیاندنی نەوەکانمان لەسەر ڕێنموونی ئیسلام لەڕووی پەرستش و بیر و هەڵسوکەوتەوە، لەپاڵ ئەوەی هاتۆتە نێو خوێندنەوە لە هزر و بیری پێچەوانە و دژ لەگەڵ ئاییندا[1]. لایەنگرانی ئەم ئاڕاستەیە وای دەبینن کاتی ئەوە هاتووە سیستمێکی فێرکاری ئیسلامیی دابنرێت بۆ جێگرتنەوەی ئەو سیستمە ڕۆژئاواییانەی کە لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا گیراونەتە بەر، ئەمە و دانانی سیاسەتێکی فێرکاریی ئیسلامیش کە ئامانجی بنیاتنانی کەسایەتی موسڵمانی هاوسەنگ بێت و کار بکات بۆ پاراستنی گەنجان لە لادانی بیروباوەڕی و ڕەفتاری و هێرشی هزری و ڕەوشتی[2].

هەروەك چۆن هەڵگرانی ئەم ئاڕاستەیە ئەو دووفاقەییە بڵاوەی خوێندن ڕەتدەکەنەوە، کە خۆی دەبینێتەوە لە بوونی دوو سیستمی خوێندندا: خوێندنێکی ئیسلامیی ڕەسەن کەوا گرنگیی بەزانستەکانی ئایین و زمانی عەرەبی دەدات بە پلەی یەکەم و خوێندنێکی نوێی هاوردە کە گرنگیی بە زانستە کۆمەڵایەتی و سروشتییەکان دەدات[3]. ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەو دووفاقەییە بڵاوە هاوکارە لە

---

[1]- المركز العالمي للتعليم الإسلامي (مكة المكرمة): توصيات المؤتمرات التعليمية الإسلامية الأربع، جامعة أم القرى، مكة، (١٩٨٣م)، (ص ١١).

[2]- سەرچاوەی پێشوو، (ص ٥٠).

[3]- سيد سجاد حسين، سيد علي أشرف: أزمة التعليم الإسلامي، ترجمة: أمين حسين الرباط، عكاظ للنشر

دروستبوونی بۆشاییەکی ڕۆشـنبیریی لـە نێـوان ڕۆشـنبیرانی ئوممەتـدا. لێرەشـەوە پێویستە بەخێرایی ئەم دووفاقەییە لە ناوببرێت ئەویش بەیەکخستنی خوێندن لەیەك چوارچـێوەی ئیسـلامیدا. لەگـەڵ بـەرپابوونی سیسـتمە فێرکارییـە ئیسـلامییە پێشنیارکراوەکەدا یەکێتی ئاڕاستەی هزری لە هەموو جۆرەکانی خوێنـدن و هـەموو قۆناغەکانیـدا دێتـە دی لـە وڵاتـە ئیسـلامییەکاندا، ئەمـەش ئاسـانکاری دەکات لـە پاڵپشتییکردنی یەکبوونی ئوممەتی ئیسلامییدا[1].

هەڵگرانی ئەم ئاڕاستەیە دەڵێن بڵاوبوونەوەی هەژاری و بێبەشبوون و برسێتی و نەخۆشـی و نەخوێنـدەواری لـە نێـو زۆرینـەی گـەلانی وڵاتـە ئیسـلامییەکاندا جێـی شەرمە، بە بەراورد لەگەڵ ڕابردووی ئوممـەتی ئیسـلامیی و ئـەو جـۆرە ژیانـەی کـە ئیسـلام دەیخوازێـت، بۆیـە داوای دەسـتەبەرکردنی خوێنـدنێکی گشـتی بـۆ هـەموو منداڵان دەکەن لەگەڵ ئەوەی پێشینە بەم قۆناغە بـدرێت. پاشـان هـەل بـۆ هـەموو ئەوانە بڕەخسێت کە داوای خوێندن دەکەن و دەیانەوێت بخوێنن ئەگەر لە توانایاندا هەبوو، بە چاوپۆشی لەوەی سەر بە چ چینێکن یاخود چ ڕەنگن یـان پلـە و پایـەی کۆمەڵایەتییان چییە، تاکو پلان بۆ خوێندن بە شێوەیەك دابنرێت پێداویستییەکانی گەشەکردنێکی گشتگیر پڕ بکاتـەوە لەگـەڵ پێویسـتی بایەخـدان بـە پڕۆگرامـەکانی فێرکردنی گەورەکان و دروستکردنی دایەنگەی ئیسلامیی کە موسڵمانان لە دایەنگـە نائیسلامییەکان بێنیازبکەن[2].

---

والتوزيع، جامعة الملك عبدالعزيز، جدة، (١٩٧٧م)، (ص ٣٥، ٣٦).

[1]– المركـز العـالمي للتعلـيم الإسـلامي (مكـة الكرمـة): توصـيات المـؤتمرات التعليميـة الإسـلامية الأربـع، سەرچاوەی پێشوو (ص ٤٢، ٥٢، ٥٩).

[2]– سەرچـاوەی پێشـوو ، (ص ٤١، ٤٢)، التوصـية الثالثـة للمـؤتمر الخـامس للتربيـة الإسـلامية، القـاهرة

سەبارەت بەفێرکردنی کچانیش، سەرەڕای ئەوەی کە تەوژمی ئیسلامیی هەوڵدەدات زانست لە نێو ئافرەتاندا بەفراوانترین شێوە بڵاوبکاتەوە، بەوپێیەی داواکردنی زانست ئەرکە لەسەر هەموو موسڵمانان بە پیاو و ژنەوە، کەچی داوادەکەن هەردوو ڕەگەز لە کاتی خوێندندا لەیەکتر جیا بکرێنەوە و بە گرنگیی دەزانن ناوەڕۆکێکی فێرکاریی گونجاو لەگەڵ سروشتی ئافرەتاندا دابنرێت و ئەوەی کۆمەڵگە پێویستیەتی لە خزمەتگوزاری مێیینە دابینبکرێت و ئەوە بەدیبهێنێت کە ئیسلام دەیکاتە ئامانج لە پاراستنی سروشتی دروستی هەریەك لە پیاو و ژن و پاراستنی خێزان و ڕەوشتە جوانەکان و کارکردن لەسەر لە بەرچاوگرتنی ئەو پسپۆڕییە پیشەییانەی لەگەڵ فیترەتدا دەگونجێن[1].

و هەڵگرانی ئەم تەوژمە جەخت لەوەدەکەنەوە ئەو وڵاتانەی سیستەمی تێکەڵاویان بۆ خوێندن داناوە و ئافرەتیان لەسەر ئەو پرۆگرلمانە فێرکردووە کە لە بنەڕەتدا وادانراوە گونجاو بێت لەگەڵ سروشتی پیاو و پێویستیەکانی بە پشتگوێخستنی سروشتی ئافرەت و ئەرکە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکانی ئێستا بەدەست دەرەنجامەکانی ئەو کارەوە دەناڵێنن لە لێکترازانی خێزان و کەموکورتی لە سەرپەرشتی منداڵدا. بۆیە دەبێت سروشتی ئافرەت لەبەرچاو بگیرێت لە خوێندندا بەهەموو قۆناغەکانیەوە تەنانەت بە پسپۆڕی قۆناغە زانکۆییەکانیشەوە بە جۆرێك گونجاو بێت لەگەڵ پەیامی سەرەکی ئافرەت لە ژیاندا[2].

---

(١٩٨٧م)، في: عبد الرحمن عبد الرحمن النقيب: بحوث في التربية الإسلامية (٣)، رسالة الفكر العربي، القاهرة، (١٩٨٧م).

[1]– المركز العالمي للتعليم الإسلامي (مكة المكرمة): توصيات المؤتمرات التعليمية الإسلامية الأربع، سەرچاوەی پێشوو (ص ٢٢، ٢٣، ٥٥).

[2]– سەرچاوەی پێشوو (ص ٩٢–٩٤).

### ٢- ئامانجەکانی خوێندن و ناوەڕۆك و پرۆگرامەکانی:

هەڵگرانی تەوژمی ئیسلامیی لە پەروەردەدا جەخت لەوە دەکەنەوە کە ئامانجی فێرکردن نابێت تەنها پەروەردەکردنی هاوڵاتی بەرهەمهێن بێت، یاخود کورت بێتەوە لەسەر گەشەپێدانی هەندێك لایەنی کەسایەتی مرۆیی لەسەر پشکی لایەنەکانی تر، بەڵکو دەبێت ئامانجی خوێندنی ئیسلامیی بەدیهێنانی گەشەیەکی هاوسەنگ بێت بۆ کەسایەتی مرۆیی بەهەموو لایەنەکانیەوە، ئەوەش لەڕێی پەروەردەکردنیەوە لەڕووی ڕۆحی و عەقڵی و سۆزداریی و جەستەییەوە دەبێت. تاکو بە پەروەردەکردنی ڕۆحی و عەقڵی و سۆزداری و ئایینی گرنگیی بە هەموو لایەنەکانی مرۆڤ بدات و بە ئاڕاستەیەکی ڕاست ئاڕاستەی بکات و بتوانێت بیگەیەنێتە کۆتا مەبەستی خوێندنی ئیسلامیی کە بریتییە لە: بەدیهێنانی بەندایەتی تەواو بۆ خودای گەورە لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵی مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی گشتی[١].

بەم پێیە ناوەڕۆکی خوێندن و پرۆگرامەکانی، چ زانستی شەرعی بن یان زانستی کۆمەڵایەتی و سروشتی هەر دەبێت دووبارە دابڕێژرێنەوە، بەجۆرێك ئەم ئامانجە – دروستکردنی مرۆڤی چاکەکاری خوداپەرست-بەدیبهێنێت و پاشانیش دەبێت بایەخ بدرێت بەپێدانی زانستە شەرعیەکان بە درێژایی قۆناغەکانی خوێندنی زانکۆیی و بەرەوپێشچوونی بابەتەکانی لەگەڵ بەرەوپێشچوونی خوێندکاردا لە خوێندنەکەیدا: و داواکردن لە زانکۆکان لەوڵاتە ئیسلامیەکاندا بۆ دانانی پرۆگرام لەسەر ئیسلام و ژیاریی ئیسلامیی و بێگومان لەسەر جیهانیی ئیسلامیی نوێش لەسەر ئاستی

---

[١]- المركز العالمي للتعليم الإسلامي (مكة المكرمة): توصيات المؤتمرات التعليمية الإسلامية الأربع، (ص ١١٢). و محمد النقيب العطاس: التعليم الإسلامي وأهدافه ومقاصده، ترجمة: عبدالحميد محمد الخريبي، عكاظ للنشر والتوزيع، جامعة الملك عبدالعزيز، جدة، (١٩٨٤م).

کۆلێـژەکان، کـە دەبێـت ناچـاریی بێـت بـۆ هـەموو خوێنـدکارەکان کـە لـە زانکـۆ دەخوێنن و دەبێـت ئـەم پرۆگرامانـە بگەنـە ئاسـتێك خوێنـدکار هۆشـیار بکرێتـەوە دەربـارەی کەسـایەتیە ئیسـلامیەکەی، هـەروەرها وای لێبکـەن شـانازیی بکـات بـە کەلەپووری ئیسـلامیەوە و پشـتگیریکردن و لایـەنگری بـۆ ئوممەتەکـەی بێـت و بـە شێوەیەکی گشـتی پێویسـتە رێـژەی پێکهاتـەی خوێنـدنی زانسـتە شـەرعیەکان لـە زانکـۆدا کـەمتر نـەبێت لـە ٢٠٪ ی سـەرجەم پرۆگرامـەکانی خوێنـدنی زانکـۆیی کـە مەرجە بخوێنرێن لە سەرەتاوە بۆ دەرچوون[١]. و هەڵگرانی ئەم ئاراستەیە پەی بەوە دەبەن کە ئیسلامێتی سیستمی خوێندن واتای ئەوە نییە بابەتێك یان دوو بابەت لە بابەتە ئیسلامیەکان بۆ پرۆگرامەکان زیادبکرێت، بەڵکو کارەکە پێویستی بەدووبارە دارشتنەوەی هەموو ماددەکان و پرۆگرامەکانی خوێندن هەیـە بـە دارشـتنەوەیەکی ئیسلامیی کە هەموو ئەو چەمکە ئیسلامییانەی لە هەر یەکێك لەو ماددانەدا هەن لە لقە جیاوازەکانی مەعریفە لە خۆبگرێت [٢].

لەبەرئـــەوەی پرۆگرامـــەکانی ئێســـتا و بەتایبـــەت پرۆگرامـــە کۆمەڵایـــەتی و سروشتییەکان، هەندێك گریمانە و بیردۆز لەخۆدەگرن کـە ناراسـتییان سـەلماوە لـە روانگـەی ئیسـلامیەوە و لەبـەر ئـەوەی بەئیسـلامیکردنی ئـەو پرۆگرامانـە کـارێکی ئاسان نییە لە ماوەیەکی کەمدا ئەنجامبدرێن، هەڵگرانی ئەم ئاراستەیە وایدەبینن بە ((رێبـەری مامۆسـتا)) دەسـتپێبکرێت کـە کۆمـەڵێك رێنمـایی و ئامۆژگـاری لـە

[١]– المركز العالمي للتعليم الإسلامي (مكة المكرمة): توصيات المؤتمرات التعليمية الإسلامية الأربع، سەرچاوەیەکی پێشوو (ص ٦٠، ٦٢، ١٣٠).

[٢]– بۆ وردەکاریی زیاتر بروانە: محمد حامدي الأفندي، نبي أحمد بالوتش: المنهج وإعداد المعلم، (ص ١٥، ١٦٤)، إسماعيل راجحي الفاروقي، عبد الله عمر نصيف: العلوم الطبيعية والإجتماعية في وجهة النظر الإسلامية، سيد حسين نصر: الفلسفة والأدب والفنون الجميلة من وجهة النظر الإسلامية، ترجمة: عبد الحميد محمد الخريبي، عكاظ للنشر والتوزيع، جامعة الملك عبدالعزيز، جدة، (١٩٨٤م).

خۆدەگرێت ئاڕاستەی مامۆستا کراوە، ئامانج لێی هاوکاریکردنیەتی لە گوتنەوەی بابەت یاخود بابەتەکانی پسپۆڕییەکەیدا بەشێوەیەك گونجاو بێت لەگەڵ ئەو چەمکە ئیسلامیانەی کە پەیوەندیی بە بابەتەکانی پسپۆڕییەکەیەوە هەیە بەبێ ئەوەی مەترسی تێکدانی سروشتی هەریەکێك لەو بابەتانە لە ئارادا بێت[1].

لەپاڵ ((ڕێبەری مامۆستادا)) هەڵگرانی ئەم ئاڕاستەیە هەست بەگرنگی ئەوە دەکەن کار بکرێت لەسەر کۆکردنەوەی ئەو ئایەت و فەرموودانەی پەیوەندییان بە هەر لقێك لە لقەکانی مەعریفەوە هەیە، بە جۆرێك هەر مامۆستایەکی قوتابخانە یان زانکۆ بنەما ئیسلامیەکانی ئەو بابەتانەی دەستکەوێت کە دەیڵێتەوە. ئەمیش وەك سەرچاوەیەکی لێدێت کە بۆی دەگەڕێتەوە لە گوتنەوەی ئەو بابەتانەدا. هەروەها دەبێت مامۆستایان هانبدرێن لەسەر ئامادەکردنی بابەتی زیادە تێیدا ڕوانگەی ئیسلامیی لەو بابەتانەدا ڕوون بکەنەوە کە دەیڵێنەوە بەخوێندکارانیان، هەروەها ئەو بیرۆکە و بابەتانە ڕوونبکەنەوە کە لەگەڵ ئیسلام و ڕێنماییەکانیدا پێچەوانەن، بە جۆرێك ئەو مەعریفەیەی دەدرێت بە خوێندکاران ناوەڕۆکێکی ڕاستی هەبێت لەڕووی مەعریفی و ئیسلامیەوە[2]. ئەگەر ئوممەتی ئیسلامیی –سەرەڕای جیاوازی کیشوەرەکانی نیشتەجێبوون و جیاوازی قەوارە ڕەچەڵەکی و زمانەوانی و نەتەوەییەکانیەوە– یەك ئوممەت بێت بەو شێوەیەی خودای گەورە ویستی لەسەر بووە، ئەوا دەبێت پرۆگرامەکانی خوێندنیشی لەگەڵ جیاوازیی ئاست و جیاوازی چەشنەکانی خوێندنی تیشك بخاتە سەر یەکێتی ئەو ئوممەتە، لەگەڵ گرنگیی ئەوەدا کە خوێندکار و مامۆستا لە نێوان ناوچە ئیسلامیە جیاوازەکاندا ئاڵوگۆڕیان

[1]– المركز العالمي للتعليم الإسلامي (مكة المكرمة): توصيات المؤتمرات التعليمية الإسلامية الأربع، سەرچاوەی پێشوو (ص١٨٤).

[2]– سەرچاوەی پێشوو ، (ص ١٧٢، ١٨٥).

پێ بکرێت، هەروەها هاندان لەسەر خوێندنی زمانی گەلە ئیسلامیەکان (ئەفریقی و ئاسیاییەکان) لەپاڵ زمانە ئەوروپییەکاندا و وەرگێڕانی کتێبە ئیسلامییە سەرەکییەکان کە بەردەستن بەزمانە ئیسلامیەکانی وەك فارسی و تورکی و ئۆردۆ و بەنگالی و ئیندۆنیسی و سەواحیلی و هۆسا بۆ زمانی عەربی[1]. شتێکی ئاساییە کە یەکێتی زانستە شەرعیەکان و یەکێتی چەمکە ئیسلامیەکانی هەر بابەتێك لە بابەتەکانی خوێندنی قۆناغە جیاوازەکانی خوێندن و لقە جیاوازەکانی مەعریفە یارمەتیی دەرە لە دووبارە گێڕانەوەی هەستکردن بەیەکبوونی ئوممەتی ئیسلامی.

به ڕوانین بۆ ئەو پلەوپایە بێهاوتایەی زمانی عەرەبی لای هەموو موسڵمانان هەیەتی وەك زمانی قورئان و فەرموودە پیرۆزەکان و زۆربەی کتێبەکانی کەلەپووری ئیسلامیی ئاڕاستەی پەروەردەیی کار لەسەر ئەوە دەکات زمانی عەرەبی زمانی لێك تێگەیشتنی هاوبەش بێت لە نێوان ئوممەتی ئیسلامیدا و لە ریزبەندی دووەم بێت لە قۆناغە جیاوازەکانی خوێندندا لە دوای زمانی نەتەوەییەوە، لەگەڵ گرنگیی پارێزگاری پیتە عەرەبیەکان بۆ نووسینی زمانەکانی نەتەوە ئیسلامیەکان تاکو نێوان ئەو گەلانە و قورئانی پیرۆز دوور نەخرێتەوە، هەروەها ئەم ئاڕاستەیە بانگەواز بۆ ئەوەدەکات زانستە ڕووت و ئەزموونیەکان بە زمانی عەرەبی بخوێنرێن لە هەموو ئاستەکاندا لە جیهانیی عەرەبیدا، لەگەڵ بایەخدان بە وەرگێڕانی کتێبە زانستیە زۆر گرنگەکان لە پسپۆڕییە جیاوازەکاندا بۆ سەر زمانی عەرەبی[2]. بەمەش زمانی عەرەبی ئەو پلەوپایەی شایەنیەتی بەدەستی دەهێنێتەوە وەك زمانی زانست و ئایین و ژیاریی ئیسلامی.

---

[1]– المركز العالمي للتعليم الإسلامي (مكة المكرمة): توصيات المؤتمرات التعليمية الإسلامية الأربع، سەرچاوەیەکی پێشوو (ص ٤٢، ٤٣، ٩٦، ١٠١).

[2]– سەرچاوەی پێشوو ، (ص ٧٢، ٧٣، ٩٥، ٩٦).

### ٣- مامۆستا:

هەڵگرانی ئەم ئاڕاستەیە دەرك بەوە دەكەن كە زۆربەی زۆری مامۆستاكان لە وڵاتە ئیسلامیەكاندا لەبەر چەندین هۆكار بەپێی پێویست ئامادە نەكراون وەك مامۆستایەكی موسڵمان. چونكە مامۆستای موسڵمان تەنها خاوەن پیشەیەك نییە، بەڵكو كە سێكی بانگخواز و خاوەن پەیامە، بۆیە كارەكەی بەپلەی یەك پشت بە باوەڕ و بیروبڕوا و هەڵسوكەوتی دەبەستێت نەك تەنها لە بەدەستهێنانی بڕوانامەی زانستی و شارەزاییە هونەرییەكاندا بوەستێتەوە، هەڵگرانی ئەم ئاڕاستەیە بەداخەوەن كە زۆربەی ئەو مامۆستایانەی لە ئێستادا بەكاری وانەگوتنەوە هەڵدەستن كەمترین زانستیان بە چەمك و بنەما ئیسلامیەكان نییە، كە وایكردووە نەتوانن پەی بە پەیوەندیی نێوان ئەو چەمك و بنەمایانە بكەن لەگەڵ بابەتەكان كە پسپۆڕن تێیاندا، ئەمەش وادەكات توانایان نەبێت لە ڕوانگەیەكی ئیسلامیەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو بابەتانەدا بكەن[1].

بەهۆی ئەوەوە كە ڕابورد و وەك ترسێك لەسەر پێگەیشتنی موسڵمان لە داهاتوودا لە سەرتاسەری جیهاندا، بەهۆی خراپی ئامادەكردنی مامۆستاوە، كە خوێندكارە موسڵمانەكان چەندین ئاڕاستەی عەلمانی جۆربەجۆریان ڕووبەڕوودەكرێتەوە لەڕێی ئەو مامۆستایانەوە كە بەكاری وانەگوتنەوە هەڵدەستن لە خوێندنگەكانی ئەمڕۆدا، كە وای لێكردوون تادێت زۆرتر و زۆرتر لە بنەما و بەها و ڕەوشتە ئیسلامیەكان دووردەكەونەوە، بەهۆی هەموو ئەم هۆكارانەوە پەیڕەوانی ئەم ئاڕاستەیە هێنانەوەی ئەو توخمە ئیسلامیانە بە گرنگ دەزانن كە كاری مامۆستایەتی وەك پیشەیەكی پەیامدار سەیردەكەن و بە شوێنپێ هەڵگرتنی

---

[1]- المركز العالمي للتعليم الإسلامي (مكة المكرمة): توصيات المؤتمرات التعليمية الإسلامية الأربع، سەرچاوەی پێشوو (ص ٨٧، ٨١).

پێغەمبەرانی دادەنێن[1].

هەروەها پەیڕەوانی ئەم ئاڕاستەیە وایدەبینن کە پرۆگرامەکانی ئامادەکردنی مامۆستا هەر دەبێت پێداچوونەوەی بۆ بکرێت بەجۆرێك بتوانێت مامۆستای بەتوانا لە پسپۆڕییەکەیدا بخاتە مەیدانەوە، بتوانێت پسپۆڕییەکەی بە چەمك و بنەما ئیسلامیەکانەوە ببەستێتەوە، مامۆستای بە توانا لە هەڵسوکەوت و ڕەوشت و پابەندییەکانیدا، هەروەك چۆن پەیڕەوانی ئەم ئاڕاستەیە بە پێویستی دەزانن ئەم بابەتانە بۆ پرۆگرامەکانی ئامادەکردنی مامۆستا زیاد بکرێن: فەلسەفەی ئیسلامیی بۆ پەروەردە، مێژووی پەروەردەی ئیسلامیی، پەروەردەی بەراوردکراو لە ڕوانگەیەکی ئیسلامیەوە، لەگەڵ پێویستی پێداچوونەوەی هەموو بابەتەکانی تر کە مامۆستا لە ڕوانگەی ئیسلامیەوە بە خوێندکارەکانی دەڵێتەوە[2].

وەك دانپێدانانێك بە ڕۆڵی پێشڕەوی مامۆستادا کە دەیگێڕێت وەك ڕۆشنبیرێك و سەرکردەیەك و ڕێنیشاندەری نەوەکانی داهاتوو، پەیڕەوانی ئەم ئاڕاستە ئیسلامیە لە پەروەردەدا جەخت لە گرنگیی ئەوەدەکەنەوە کە مامۆستا مووچەیەکی شایەن بەخۆی پێ بدرێت لەپاڵ تایبەتمەندی تردا بەپێی لێهاتووییەکانی و سروشتی ئەو ڕۆڵەی پێی هەڵدەستێت[3].

---

[1]- سەرچاوەی پێشوو (ص ٨٨).

[2]- سەرچاوەی پێشوو (ص ١٩٦)، هەروەها: التوصية الأولى، الفقرة (د) من توصيات المؤتمر العالمي الخامس للتربية الإسلامية، القاهرة (١٩٨٧م)، في: عبد الرحمن عبد الرحمن النقيب: بحوث في التربية الإسلامية (٣)، سەرچاوەی پێشوو (ص ٢٢١)، بۆ وردەکاریی زیاتر بڕوانە: محمد حامد الأفندي، نبي أحمد باوتش: المنهج وإعداد المعلم، سەرچاوەی پێشوو (ص ١٦٥، ٢٩٥).

[3]- المركز العالمي للتعليم الإسلامي (مكة المكرمة): توصيات المؤتمرات التعليمية الإسلامية الأربع، سەرچاوەیەکی پێشوو (ص ٩٠).

٤- **خوێندكار:**

ئاڕاستەی ئیسلامیی لە پەروەردەدا وایدەبینێت خوێندكار ئەو مرۆڤەیە كە دەیەوێت خۆی بە زانست تەواو بكات، جا چ زانستی شەرعی یان كۆمەڵایەتی یان سروشتی بن، لە كاتێكدا دەرك بەوە دەكەن داواكردنی ئەو زانستانە پەرستشێكە مرۆڤ لەڕێیەوە لە خودا نزیك دەبێتەوە، ئامرازێكن بۆ ئاوەدانكردنەوەی زەوی، بەم پێیەش خوێندكار ئەو مرۆڤەیە كە هەوڵدەدات خۆی چاكبكات و خۆی بە زانست پاڵفتەبكات، تاكو بەو پەرستنەی كە شایەنیەتی خودا بپەرستێت، و زەوی ئاوەدانبكاتەوە بەپێی شەریعەتەكەی و تەرخانی بكات بۆ خزمەتی بیروباوەڕ بەپێی پرۆگرامەكەی[1].

و تاكو بتوانرێت نەوەكان بە پەروەردەیەكی ئیسلامیی دروست پەروەردەبكرێن ئەوەندە بەس نییە تەنها مامۆستای موسڵمان لەگەڵ پرۆگرامە ئیسلامیەكان بخەینە مەیدانەوە، بەڵكو پەیڕەوانی ئەم ئاڕاستەیە جەخت لە گرنگیی جێبەجێكردنی ئیسلام دەكەنەوە بە جێبەجێكردنێكی واقعییانە لەناو دامەزراوە فێركارییەكاندا، ئەمەش بە دروستكردنی مزگەوت لەناو هەر خوێندنگەیەك یان دامەزراوەیەكی فێركارییدا و بە بەجێگەیاندنی نوێژی بەكۆمەڵ لە كاتی خۆیدا و هاندانی هەڵسوكەوتی ئیسلامیی لە نێو خوێندكارەكاندا لە ڕاستگۆیی و دەستپاكی و جوامێری و خۆنەویستی و خاوێنی و...هتد و بەرهەڵستیكردنی هەموو هەڵسوكەوتێكی نائیسلامی چ لە مامۆستاكانەوە دەربچێت یان لە خوێندكارەكانەوە، هەروەها هۆكارەكانی ڕاگەیاندن بەشێوەیەكی گشتی لە گرنگترین ئەو ئامرازانەن كە دەتوانن هاوكاری دامەزراوە پەروەردەییەكان بكەن لە ئەركەكەیاندا ئەگەر لەسەر ڕێچكەیەكی ئیسلامیی بڕۆن، بەهەمان شێوە لە

[1]- المركز العالمي للتعليم الإسلامي (مكة المكرمة)، سەرچاوەیەكی پێشوو (ص ١٢، ١٣).

توانایدایه هەموو ڕووخسارێکی پەروەردەی سیستماتیك لـە ناوببـات ئەگـەر لەسـەر ڕێچـکەیەکی پێچـەوانەی بـەها ئیسـلامیەکان بـڕوات، بۆیـە دەبێـت هۆکارەکـانی ڕاگەیاندن پابەندبن بەبـەها و دروشمـە ئیسـلامیەکانەوە و پـلان بـۆ ئـەوە دابنرێـت بەباشترین شێوە بەکاربهێنرێن لە پێگەیاندنی نەوەکاندا بە پێگەیاندنێکی ئیسلامیی دروست[1].

و بۆ ڕەخساندنی زیاتری کەشی ئیسلامیی بـۆ خوێنـدکارەکان، پـەیڕەوانی ئـەم ئاڕاسـتەیە لـە پـەروەردەدا هـانی ئـەوە دەدەن کـە وەزارەتـەکانی پـەروەردە و فێرکـردن و هـەموو سەرپەرشـتیارانی دامـەزراوە فێرکارییـەکان گرنگیـی بـدەن بـە دروستکردنی بالەخانەکانی خوێندن بە شێوازی تەلارسـازیی ئیسـلامیی و بـەجۆرێك کە پێداویستییەکانی ژینگە و داواکارییەکانی سەردەمی تێدا جێبەجێبکەن، هەروەك چۆن پەیڕەوانی ئەم ئاڕأستە پەروەردەییە ئیسـلامیە جـەخت لـەوە دەکەنـەوە کـە پێگەیاندنی خوێندکار بـە پێگەیانـدنێکی ئیسـلامیی دروسـت ناکرێـت تـەنها لـەڕێی سیسـتـمی خوێنـدنی فەرمییـەوە بکرێـت، بـەبێ ئـەوەی هاوکـات بێـت لەگـەڵ ئاڕاستەکردنێکی ئیسلامیی هاوچەشندا لە هەموو دامەزراوە کۆمەڵایەتی و ئـابووری و پەروەردەییەکان لە کۆمەڵگەدا، بەجۆرێك خوێنـدکار لـە بـارودۆخێکی ئیسـلامیدا بژی و وایلێبکات گەشەکردنێکی دروست گەشەبکات، لە کاتێکدا ناتوانرێـت وێنـای سیستمێکی ئیسلامیی خوێندن بکرێت لـەناو کۆمەڵگەیـەك یـان وڵاتیکـدا کـە پشـت بەسیسـتمی ئیسـلامیی نابەسـتێت و پـەیڕەوی ناکـات و ڕۆڵـەکانی لەسـەر ئـەوە پەروەردە ناکات خۆشەویستی و لایەنگرییان هەبێت بۆی[2].

---

[1]- سەرچاوەی پێشوو (ص ٢١، ٢٣).

[2]- المركز العالمي للتعليم الإسلامي، سەرچـاوەیەکی پێشـوو (ص ٢٧، ٣٧، ٣٨)، بـۆ وردەکـاریی زیـاتر بڕوانە: محمد وصي الله خان: التربية والمجتمع في العالم الإسلامي، مصدر سابق.

له کۆتاییدا پەیڕەوانی ئەم ئاڕاستەیە بە گرنگیی دەزانن خوێندکار ببەسترێتەوە بە کەمینە موسڵمانەکانەوە لە جیهاندا کە نزیکەی (٤٠٪)ی موسڵمانان پێکدەهێنن، چونکە ئەوان بەشێکن ناتوانرێت لە ئوممەتی ئیسلامیی جیابکرێنەوە و بە گرنگیی دەزانن چاودێری ئەو کەمینانە بکرێت و پارێزگاری لە کەسایەتی ئسلامییان بکرێت و بپارێزرێن لە توانەوە لە ناو کۆمەڵە نائیسلامیەکاندا، ئەمەش بە هاوکاریکردنیان لەڕێی پرۆگرام و کتێب و مامۆستاوە و لە پێشینە دانانیان لە ئۆفەرەکانی خوێندندا[١].

ئەم کۆششە زانستیە بەکۆمەڵەی زانایانی ئوممەتی ئیسلامیی بەخەرجیاندا لە ساڵی (١٩٩٦م)دا ڕاوەستا، بۆیە دەرکی بە مەترسییەکانی پرۆژەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورە نەکردووە کە لە ئێستادا ئێمە ڕووبەڕووی دەبینەوە، هەروەها ئەم کۆششە زانستیە بەکۆمەڵە ((لایەنی سەرپەرشتیار))ی دەستنەکەوت کە بەردەوامی و گرنگیی بەکارەکە بدات و دەرك بە مەترسیی بەجێهێشتنی پەروەردە بکات لە جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیماندا بەبێ ئاڕاستەکردنێکی پێگەیشتوو و دڵسۆز.

بەم پێیە ئەوەی ئێستا بەڕاستی پێویستمان پێی بێت بوونی دەستەیەکی جیهانییە لە شارەزایانی پەروەردەی ئیسلامیی کە هەموو ئەو شارەزا پەروەردەییانە لە خۆبگرێت کە پێکەوە گونجانی ئیسلامیی جیهانییان لەلا گرنگە، لەگەڵ بەهێزکردنی پەیوەندیی لە نێوان ڕەگەزەکانی ئوممەتدا و ئامادەکردنیان

[١]- المركز العالمي للتعليم الإسلامي (مكة المكرمة): توصيات المؤتمرات التعليمية الإسلامية الأربع، سەرچاوەیەکی پێشوو (ص ١٧٦، ١٧٨)، هەروەها: التوصية الخامسة من توصيات المؤتمر العالمي الخامس للتربية الإسلامية، القاهرة، (١٩٨٧م)، في: عبد الرحمن عبدالرحمن النقيب، بحوث في التربية الإسلامية (٣)، سەرچاوەیەکی پێشوو (ص ٢٢١).

بەئامادەکردنێکی ئیسلامیی ڕاست لە پێناو ڕووبەڕووبوونەوەی کێشمەکێشمەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورەدا بەهەموو کێشمەکێشمە سیاسی و ئابووری و تەکنەلۆجیەکانیەوە.

ئوممەتی عەرەبی و ئیسلامیی بە یەکێتی و پێکەوە گونجانەوە شتێك نییە بتوانرێت پشتگوێ بخرێت، وەك هەندێك وادەزانن بەڵکو ئەوەندە توانای ماددی و مرۆیی و ڕۆحی تێدایە کە وایلێدەکات بتوانێت ڕووبەڕووی هەموو ئاڵنگاریەکان ببێتەوە و کاتێك ئێمە باس لە ئوممەتێکی عەرەبی و ئیسلامیی پێکەوە گونجاو دەکەین ئەوا ئێمە باس لە توانای ئیسلامیی زۆر گەورە دەکەین لەپاڵ ئەو وڵاتانەی کە بە عەرەبی دەدوێن وڵاتی کارای تر دەگرێتەوە وەك پاکستان و تورکیا و ئێران و ئەفغانستان و مالیزیا و ئەندۆنیسیا...هتد. چ جای ئەو شەش کۆمارەی بەم کۆتاییانە سەربەخۆییان لە یەکێتی سۆڤیەت وەرگرت کە هەندێکیان چەکی ئەتۆمی پێشکەوتوویان هەیە لەپاڵ شوێنی هەڵدانی مووشەکی دوور مەودادا، لەگەڵ سەروەت و سامان و ژمارەی مرۆیی زۆر گەورەدا[1].

ئەو توانا مەزنانە لە ژێر سایەی بیروباوەڕی ئیسلامیی نەمردا کاری زۆری پێدەکرێت لە پێناو بەدیهێنانی ژیارێکی ئیسلامیی نوێ لەڕێی یەکبوونێکی ئیسلامیی ڕاستەقینەوە لە هەموو بوارە سیاسی و ئابووری و سەربازیی و پەروەردەییەکاندا و ئەوەندەش بەسە لێرەدا باسیبکەین کە ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری ئیسلامیی (ئیکۆ) کە ئێران و پاکستان و تورکیای لەخۆدەگرت لەساڵی

[1]- بۆ وردەکاریی زیاتر لەبارەی هێزی دەوڵەتە ئیسلامییە سەربەخۆکان لەیەکێتیی سۆڤیەت، بڕوانە لێکۆڵینەوەکانی کۆنگرەی نێودەوڵەتیی: المسلمون في آسيا الوسطى والقوقاز: الماضي والحاضر والمستقبل، جامعة الأزهر: مركز صالح عبد الله كامل، القاهرة، الفترة من (٢٨-٣٠ من ديسمبر ١٩٩٣م)، القاهرة (١٩٩٣م)، ثمانية مجلدات.

(١٩٦٥ز) و ئێستا دەوڵەتە ئیسلامیە زەبەلاحەکان لە خۆدەگرێت کە تازە پەیدابوون لە: ئۆزباکستان و تورکمانستان و کازاخستان و قیرغیزستان و ئازەربایجان و تاجیکستان، چ جای ئەفغانستان، ئەمیش لە ڕۆژی (١٩٩٢/١٢/٢٨)ەوە بەمەش گەورەترین گردبوونەوەی ئابووریان پێکهێنا دوای بازاڕی ئەورووپی هاوبەش، (٣٠٠) ملیۆن دانیشتوو لە خۆدەگرێت کە کەلتوورێکی هاوبەش کۆیاندەکاتەوە و بەرهەمی نەتەوەییان ساڵانە دەگاتە (٣٠٠) ملیار دۆلار[١].

ئەوەندە بەسە باسیکەین کە وڵاتیکی تازە دروستبووی وەك کازاخستان ژمارەیەکی زۆر چەکی هەیە کە (١٠٤) مووشەکی بالیستیی کیشوەربڕ لە خۆدەگرێت و لە شوێنی جێگیر دانراون، لەگەڵ چل چەکی ئەتۆمی و گۆڕەپانی تاقیکردنەوەی چەکی ئەتۆمی و مووشەکی دژە مووشەك، لەپاڵ هۆکاری گواستنەوە و هەڵدانی ئەم چەکە ترسناکانەدا. بە کورتی کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست حەفتا ملیۆن لە موسڵمانان لەخۆدەگرن کە زۆربەی وڵاتی دەوڵەمەندن بە سامانە سروشتییەکانیان لە لۆکە و نەوت و کانزای وەك یۆرانیۆم و زێڕ و هیتریش[٢].

ناوەڕاستی ئاسیای موسڵمان و ئەو ناوچەیەی دەکەوێتە باشووری ئەم کۆمارانەوە: ئێران و تورکیا و ئەفغانستان و پاکستان دەتوانن ببنە هێزێکی ژیاریی ئیسلامیی مەزن بەتایبەت لەگەڵ بوونی تێکەڵاویی سیاسی و ئایینیدا سەرەڕای فرەیی نەتەوەکان و پارێزگاری لە نەریتە ئیسلامیەکان[٣]، دەتوانێت گەشەبکات

---

[١]– محمد عبد القادر أحمد: هموم إسلامية في نظام عالمي جديد، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، (١٩٩٣م)، (ص ١٣٣).

[٢]– محمد عبد القادر أحمد: هموم إسلامية في نظام عالمي جديد، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، (١٩٩٣م)، (ص ١٤٥).

[٣]– فريد عزيز: النظام العالمي الجديد في القرن الواحد والعشرين، دار الجديد، دار الرشيد، بيروت،

لەگەڵ بوونی پەروەردەیەکی ئیسلامیی کارا کە لایەنگری ئەو ناوچانە بۆ شوناسی ئیسلامیان زیاددەکات کە ئیمپڕاتۆریەتی شەڕانگێزی پێشوو ((یەکێتی سۆڤیەت)) و هێزی چەتەگەری سنووربەزێنی ئەمڕۆ ((ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا)) ویستیان بیتوێننەوە لە دەریای نەتەوە دەمارگیرەکان و ژیارە ڕۆژئاواییە وێرانکەرەکاندا بەهەموو ئەوەوە کە تێیدایەتی لە مرۆڤایەتی و ڕەوشتبەرزی.

هاوکاریەکی ئیسلامیی لە نێوان ئەو وڵاتە ئیسلامیانەدا، لەپاڵ ئەو ژمارە زۆرەی کەمایەتییە ئیسلامیەکان لە وڵاتە جیاوازەکانی کیشوەرەکانی ئاسیا و ئەفریقا و ئەوروپا و ئوسترالیا و دوو ئەمریکاکە و ئەوەی ئەو کەمایەتییە موسڵمانانە دەتوانن پێشکەشی بکەن لە پاڵپشتی ماددی و مەعنەوی بۆ سیستمی ئیسلامیی جیهانی، هەرگیز ناگونجێت کەمتر بێت لەو پاڵپشتییە ماددی و مەعنەوییەی کەمینە جوولەکەکان لە جیهاندا پێشکەشی دەکەن بەوڵاتی ئیسرائیل[1].

منیش دەڵێم: تەنها سیستمێکی ئیسلامیی جیهانیی وەها دەتوانێت جێگرەوەیەکی ژیاریی نوێ پێشکەش بە مرۆڤایەتی بکات کە ئاسایش و جێگیرییەکەی دەپارێزێت و ئاستی بەها و مرۆڤ و کۆمەڵگەکانی بەرزدەکاتەوە لە ژێر سایەی ژیاریی ئیسلامیی دادپەروەردا کە مرۆڤایەتی پێشتر ئەزموونی کردووە، لە پێناو بەرهەمهێنانی ژیارستانییەکی لەم چەشنە پێویستە پەنا ببرێت بۆ ((پەروەردەی ئیسلامی)) بۆ پەروەردەکرنی مرۆڤی قورئان و سوننەتی بەتوانا بۆ بەرپاکردنی ژیاریی ئیسلامیی جێگرەوە و فریادڕەس، لە کاتێکدا بەبێ

(١٩٩٤م)، (ص ١٠٠).

[1]– دەربارەی ئەو کەمینە موسڵمانانە لە جیهاندا، بروانە: أبحاث الندوة العالمية للشباب الإسلامي بالرياض بعنوان الأقليات المسلمة في العالم، الرياض الفترة من (٢٢–٢٧ من يناير، ١٩٨٦م)، الرياض، أربعة أجزاء.

دروستکردنی سیستمێکی پەروەردەیی ئیسلامیی بەتوانا لەسەر پەروەردەکردنی مرۆڤی قورئان و سوننەت هەرگیز لە توانادا نابێت سیستمێکی هەرێمایەتی عەرەبیی ئیسلامیی بەهێز دابمەزرێت لە بازنەی جیهانیی ئیسلامیی فراواندا و لە ژێر چاودێریی کەمایەتییە ئیسلامیەکاندا لە هەموو جیهاندا، کە هەموویان وا پەروەردەکرابن تاکو مرۆڤی قورئان و سوننەت بن و بەرپاکەری شۆڕشی ئیسلامیی دووەمبن کە زەوی پڕدەکات لە دادپەروەریی و ئازادی و یەکسانی و چاکەکاریی وەك چۆن شۆڕشی ئیسلامیی یەکەم کردی بەسەرکردایەتی پێغەمبەری ئازیزمان محمد (دروودی خوای لەسەر) و جێنشینە ڕاشیدەکان لە دوای ئەو، تا ئەو کاتەی ئاڵای ژیاریی ئیسلامیی کەوت بۆئەوەی دەستی ژیاریی ڕۆژئاوایی وەریگرێت و بیکات بەئاڵای دەمارگیری و خۆسەپاندن و دەستبەسەرداگرتن و سنووربەزاندن هەروەك چۆن مێژووی نوێ و هاوچەرخمان شایەتی ئەوە دەدەن.

بەم پێیە زانایانی ئەو دەستەیە سەرقاڵدەبن بە پرسە پەروەردەییەکانی ئوممەتی عەرەبی و ئیسلامیەوە.

**ئەرکەکانی زانایانی دەستەی جیهانیی بۆ پەروەردەی ئیسلامی:**

هەوڵدەدەین لەم بەشەی لێکۆڵینەوەکەدا هەندێك لەو ئەرکە زانستی و کردەییانە دیاری بکەین کە زانایانی ئەو ڕابیتەیە بەتەمان لە ماوەی قۆناغی داهاتوودا پێی هەستن لە پێناو نزیکبوونەوە و پێکەوە گونجانی زیاتر لە نێوان گەلەکانی ئوممەتی عەرەبی و ئیسلامیدا، کە زانایانی ئەم دەستەیە هەر ئەرکێکی تر کە وادەزانن هاوکار دەبێت لە بەدیهێنانی ئامانجەکانی دروستبوونیدا زیادی دەکەن بۆ ئەم ئەرکە پێشنیارکراوانە.

**لەو ئەرکانەش:**

١- هەوڵدان بۆ دروستکردن و پێکهێنانی فەلسەفەیەکی ئیسلامیی تەواوکار، لە کاتێکدا ئەوەی کاری پەروەردەیی ئاڕاستەدەکات و ڕێنموونی دەکات فەلسەفەی پەروەردەییە و سەرەڕای بوونی کتێب و لێکۆڵینەوەی زۆر کە بەشێوەیەکی پچڕ پچڕ دەستیانداوەتە وردەکارییەکانی پێکهاتەی ئەو فەلسەفەیە: سروشتی مرۆیی لە قورئان و سوننەتدا، ڕەوشت لە قورئان و سوننەتدا، مەعریفە لە قورئان و سوننەتدا، زۆربەی ئەم ناونیشانانە ناونیشانی نامەی زانکۆیین لە پەروەردەی ئیسلامیدا[١]، بەڵام ئەو بابەتانە هێشتا پێویستیان بەلێکۆڵینەوەی قووڵی زۆرتر هەیە، هەروەها سوود وەرگرتن لە هزری پەروەردەیی ئیسلامیی و جیهانیی لەگەڵ دابەزاندنیدا بەسەر واقیعی ئوممەتی عەرەبی و ئیسلامیی تاکو بزانرێت چۆن دەتوانرێت ئەو فەلسەفە پەروەردەییە ئیسلامیانە بەسەر واقیعی پەروەردەیی هاوچەرخماندا جێبەجێبکرێت، وا دەزانم لە نەبوونی فەلسەفەیەکی پەروەردەیی ئیسلامیی ڕوون و دیاریکراودا، زۆرێك لە کۆششە پەروەردەییەکانمان لە بەردەم ئەگەری دژیەکی و ڕووکەشیبوون و کارانەبوونی پەروەردەییدایە، کە وادەکات لێکۆڵینەوە لەم بوارەدا گرنگ و پێویست بێت بە تایبەت لەم قۆناغەدا.

٢- نووسینەوەی مێژووی پەروەردەیی ئیسلامیمان بەتەواوەتی و لێکۆڵینەوە لە هەر شتێك کە پەیوەندیی بە مێژووەوە هەیە لە ئامانج و دامەزراوە و پرۆگرام و شێوازی وانەگوتنەوە و پاڵپشتیکردنی ماددی و بەڕێوەبردن و...هتد. ئەوەی کە چۆن پەروەردەی ئیسلامیی بە درێژایی سەردەمەکان هەوڵیداوە مرۆڤی قورئان و سوننەت پەروەردە بکات، کەی ئەو پەروەردەیە سەرکەوتوو بووە؟ کەی هەرەسی هێناوە؟ هۆکارەکانی سەرکەوتن و هەرەسهێنانی چی بوون؟ دیارترین

---

[١]- عبد الرحمن النقيب: دليل مستخلصات الرسائل الجامعية في التربية الإسلامية بالجامعات المصرية والسعودية، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، الأردن، (١٩٩٣م).

کەسایەتییەکانی کێ بوون؟ و کاتێك ئێمە لێکۆڵینەوەی ئەم مێـژووە ئیسـلامیە بـە گـرنگ دەزانـین، هـەر لـە سـەردەمی پێغەمبـەرەوە (دروودی خـوای لەسـەر) تـاکو ئەمڕۆ، مەبەسـتمان ئـەوە نییـە تـەنها بـۆ کـات بەسـەربردن و خۆشـی لێکۆڵینـەوە بکەین، یان تەنها بۆ بەدەستهێنانی زانیـاری مێـژوویی، بـەڵکو بـۆ تێڕامـان و پەنـد وەرگـرتن و سـوودمەندبوون لێـی لـە بنیاتنـانی پـەروەردەی عـەرەبی ئیسـلامیی هاوچەرخماندا و سەرەڕای ئەوەی نووسـراو و لێکۆڵینـەوەی زۆر هەیـە کـە هـەر لـە مێژووی پەروەردەی ئیسلامیدا نووسراوە، بەڵام ئەوەی تائێسـتا نووسـراوە هێشـتا بەشێکی کەم نەبێت لە تەمەنی مێژووی پەروەردەیی دوورودرێژمان هیچی تر ناگرێتە خـۆ، هـەروەك چـۆن زۆربـەمان بەداخـەوە تیشـك دەخەینـە سـەر هەنـدێك مـاوەی مێژوویی دیـاریکراو و هەنـدێکیان یـەکتری دووبـارە دەکەنـەوە و پابەنـد نابێـت بـە میتۆدێکی مێژوویی یەکلاکەرەوەوە[1]، کە وا دەکـات پێویسـتیمان بـە لێکۆڵینـەوەی پەروەردەیی مێژوویی زیاتر بێت تاکو مێژوویەکی پەروەردەیی نووسراو و خوێنراو و خوێندراوەمان هەبێت.

٣- ئیسلامێتی زانستەکان و مەعریفە، لەڕووی تیۆرییـەوە چـۆن دەبێـت، ئایـا بەئیسـلامیکردن تـەنها لـەڕێی پشتبەسـتن بـە قورئـان و سـوننەت و کەلـەپوورەوە دەبێت بەبێ سوودمەندبوون لە بەرهەمی مرۆڤی جیهان؟ یاخود بـە پشتبەسـتن بـە هەموو ئەوانە و تێپەڕاندنیشی و بەرهەمهێنانی زانست و مەعریفـەی گونجـاو لەگـەڵ واقیعی سەردەمماندا دەبێت؟ و ئایا چـۆن ئـەو شـتە ڕوودەدات لـە هـەموو زانسـتە کۆمەڵایەتی و مرۆیی و گەردوونییەکاندا؟ و ئایـا ئیسـلامێتی زانسـتەکان و مەعریفـە لەگەڵ بابەتیبوونی زانستیدا تێکناگیرێت؟ ئایا سـنوورەکانی بابـەتیبوونی زانسـتی

---

[1] - عبد الرحمن النقيب: دليل مستخلصات الرسـائل الجامعيـة في التربيـة الإسـلامية بالجامعـات المصـرية والسعودية، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، الأردن، (١٩٩٣م).

چـین؟ و چـۆن پرۆسـەی بەئیسـلامیکردن ئەنجامـدەدرێت لـە بـواری زانسـتە پەروەردەییەکانـدا: پـەروەردە بـە لقـە جیاوازەکانیـەوە و دەروونزانـی بـە لقـە جیاوازەکانیـەوە و پرۆگرامـەکان و شـێوازەکانی وانەگوتنـەوە بـە لقـە جیاوازەکانیەوە؟ و مەترسی ئـەوە چییە ئـەو زانسـتانە لـە چەشـنە عەلمانیەکـەی ئێستایدا بمێنێتەوە؟ هەروەها هەڵسەنگاندن بکرێت بۆ هەوڵەکانی بەئیسلامێتیکردن کـە تـا ئێسـتا دراون و توێژینـەوە ئـەنجام بـدرێت بـۆ زانـینی پێویسـتیەکانی بەئیسلامێتیکردن و بەربەستەکانی و چۆن دەتوانرێت ئەو بەربەستانە تێبپەڕێنرێت و تایبەتمەندێتی و پێکهێنانی توێژەران چین لە بواری بەئیسلامێتکردندا[1].

٤- خوێندن لە وڵاتانی جیهانیی ئیسلامیدا. لـە کاتێکـدا تـاکو ئێسـتا -بەپێی زانیاری توێژەر- زنجیرە لێکۆڵینـەوەی قـووڵ بـوونی نییـە لـە بـارەی خوێنـدن لـە وڵاتـانی جیهـانیی ئیسـلامیدا، وەك: ئێـران و تورکیـا و پاکسـتان و ئەندۆنیسـیا و مالیزیا و...هتد، تەنانەت زۆرێك لە لێکۆڵەرانی بواری پەروەردە خۆشـیان زۆر شـت هەیە نایزانن لە بارەی خوێندن لـەو وڵاتـە ئیسـلامیانەدا، بەنـدەی توێـژەر بەپلـەی پرۆفیسۆر کاتێـك سـەردانی زانکـۆی ئیسـلامیی جیهـانیی مالیزیـام کـرد سـێ سـاڵ لەمەوپێش، بیرمە کە پێش سەفەرەکە ویستم بۆ یەکەمجار سەبارەت بە خوێندن لە مالیزیا شتێك بخوێنمەوە، بە سەختی توانیم هەندێ زانیاریی دەستبخەم، ئەمـە لـە کاتێکـدا لـە بنەڕەتـدا خـۆم بـە یـەکێك لەوانـە دەزانم کـە گرنگیـی بەپـەروەردەی ئیسلامیی دەدەن، ئەگەر ئەمە حاڵی من بێت دەبێت حاڵی خەڵکی تـر چـۆن بێـت؟ مەترسـی ئـەوە لەوەدایـە، سـەرەڕایی بێئاگـای لـە جیهـانی ئیسـلامی و واقیعـە پەروەردەییەکەی، ناشتوانرێت پەی بە کـۆی ئـەو کێشـە پەروەردەییـە هاوبەشـانە

---

[1]- عبد الرحمن النقيب: دراسة للعلوم التربوية من منظور إسلامي، إسلامية الكتاب الجامعي في الإدارة التربوية، في التربية الإسلامية، رسالة ومسيرة، دار الفكر العربي، القاهرة، (١٩٩٠م).

ببرێت کە ڕووبەڕووی وڵاتانی جیهانیی ئیسلامیی دەبنەوە، هەروەها ئەو مێژووە پەروەردەییەی کە پێیدا تێپەڕبووە، کۆی ڕووبەڕووبوونەوە یەکلاکەرەوەکانی لە نێو هەوڵەکانی بەرۆژئاواییکردنیدا و هەوڵەکانی پارێزگاریکردنی لە شوناسی ئیسلامیی لەڕێی خوێندنەوە بە هەموو دامەزراوە جیاوازەکانیەوە.

زۆر بەداخەوە خوێندکارانمان لە کۆلێژەکانی پەروەردە زیاتر زانیارییان لەبارەی خوێندنی ئەوروپا و ئەمریکا هەیە تا خوێندن لە جیهانیی ئیسلامیدا، کتێب و سەرچاوەکان لە کتێبخانە پەروەردەییەکانماندا کە باس لە خوێندن دەکەن لە ئەوروپا و ئەمریکا بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر زیاترە لەوانەی کە باس لە خوێندن دەکەن لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا. ئەمەیە کە دەبێت هەوڵی گۆڕینی بدەین بە ئاڕاستەکردنی خوێندکار و توێژینەوەکانمان تاکو لێکۆڵینەوە بکەن سەبارەت بە خوێندن لە دەوڵەتە ئیسلامیەکاندا، بەجۆرێك کتێبخانەی پەروەردەییمان دەوڵەمەندبکەین لەو جۆرە نووسراو و لێکۆڵینەوانە[١].

٥- خوێندنی کەمایەتییە موسڵمانەکان لە جیهاندا، لە کاتێکدا ملیۆنان کەمایەتی موسڵمان لە کیشوەرەکانی ئەوروپا و ئەمریکا و ئاسیا و ئەفریقا و ئوستڕالیا هەیە، بە نزیکەیی هیچیان لەبارەوە نازانین، بەڕاستی جێی شەرمە ئەو کەمایەتییانە پشتگوێ بخەین یان لەوان و لەو هەوڵانەی کە دەدرێن بۆ تواندنەوەیان لە کۆمەڵگە زۆرینەکاندا تاکو ئایین و ئینتیمای ئیسلامیان لەبیربکەن

---

[١]- لەئێستادا زنجیرەیەی سیستەمەکانی خوێندن لەدەوڵەتە ئیسلامییەکاندا دەرکەوتووە لەلایەن کۆمەڵێك لێکۆڵەرەوە، لەوانە:

- نظام التعليم في أفغانستان، محمد شحات الخطيب، دار الخريجي للنشر والتوزيع، الرياض، (١٩٩٢م).
- نظام التعليم في باكستان، محمد شحات الخطيب: دار الخريجي للنشر والتوزيع، الرياض، (١٩٩٢م).
- نظام التعليم في تركيا، مصطفى محمد متولي، دار الخريجي للنشر والتوزيع، الرياض، (١٩٩٢م).
- نظام التعليم في ماليزيا، محروس غبان، تحت المطبع.

بێ ئاگابین، بە نزیکەیی هیچ لەبارەیانەوە نابیستین تا ئەوکاتەی تووشی کارەساتێك دەبن، لەکاتێکدا ئیسرائیل کەمایەتیی جوولەکە دەپارێزێت لە هەر شوێنێکی جیهانبن و لێیان سوودمەند دەبێت بۆ بەرژەوەندی ئیسرائیل، بایەخێکی زۆر دەدەن بە پەروەردەی یەهوودیی و زمانی عیبری و مێژووی عیبری بۆ هەموو جوولەکەیەك لە جیهاندا و ئەوانە ئەرکی ئایینیین و خۆمان دەبینین کە بە تەواوەتی بارودۆخی کەمایەتیە موسڵمانەکانمان پشتگوێ خستووە و بەتایبەت بارودۆخی پەروەردەییان. ئەمەش بوارێکە تا ئێستا لێکۆڵینەوە لەبارەیەوە دەگمەنە، بەجۆرێك کە تەنها سێ نامەی لەبارەوە هەیە لە کۆی (٢٥٨) نامە کە ڕێبەری پوختەی نامە زانکۆییەکانی پەروەردەی ئیسلامیی لە زانکۆ میسرِی و سعودییەکاندا لەخۆیدەگرێت[1]. ئەمەش ڕاددەی کەمتەرخەمیمان دەردەخات لە لێکۆڵینەوە لەم بوارەدا، توێژەر خودی خۆی هەستی بە پێویستی ئەو کەمایەتیە موسڵمانانە کرد بۆ خوێندنێکی عەرەبی و ئیسلامیی گونجاو کاتێك خوێندکاری دکتۆرا بوو لە ئینگلتەرا، کاتێك سەردانی موسڵمانانی کرد لە ئەڵمانیا و ئەمریکا لە دواتردا و بە چاوی خۆی ئەوەی بینی کە موسڵمانان پێویستیانە لە چاودێریی پەروەردەیی، ئەگەر سەرکەوتووبین لە پێشکەشکردنی پێیان بەوێنەیەکی ڕاست ئەوا پەیوەندییان بەعەرەب و ئیسلامەوە بەهێز دەکەین، ئەمەش ئەرکێکی ئیسلامیە کە هەر دەبێت هانی توێژەران بدرێت بۆ گرنگیدان بەم بوارە بە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون و پسپۆڕیی ئەگەر پێویستی کرد.

٦- فێرکردنی زمانی عەرەبی و ئیسلام بەو کەسانەی بە زمانی عەرەبی نادوێن، لەبەرئەوەی زۆربەی زۆری موسڵمانان لەوانەن کە بە عەرەبی نادوێن ، زمانی

---

[1]- عبد الرحمن النقيب: دليل مستخلصات الرسائل الجامعية في التربية الإسلامية بالجامعات المصرية والسعودية، سەرچاوەیەکی پێشوو (ص ١٨٤، ٢٠٠، ٢٧٨).

عەرەبی و ئیسلام و مێژووی ئیسلامیان بە شێوەیەکی بێزارکەر پێدەدرێت و لێیان دەکرێتە کارێکی قورس، لە کاتێکدا ڕۆژئاوا ئامرازە فێرکارییەکانی پەرەپێدەدات بۆ فێرکردنی ژیارەکەی و زمانی و مژدەدان بەمەسیحییەت بەجۆرێك هەڕەشە لە موسڵمانە ناعەرەبەکان دەکات، هەست بەچەقبەستوویی و وشکیی و تەنانەت دواکەوتووییش دەکەین لە ڕێگەی پێشکەشکردنمان بۆ عەرەبی ئیسلام بە قسەنەکەرەکان بەزمانی قورئان، کە بوارەکە بەنوێیی دەهێڵێتەوە بۆ ئەو لێکۆڵینەوانەی پەیوەندییان بە کێشەکانی فێرکردنی عەرەبی و ئیسلامەوە هەیە بەواتەی بە زمانی عەرەبی نادوێن، چۆن مامۆستای زمانی عەرەبی و ئیسلام بۆ ئەو ناوچانە دابین بکرێن؟ چۆن پرۆگرام و چالاکی فێرکاریی و پەروەردەیی گونجاویان بۆ ئامادەبکرێت، ئەو بەربەستانە چین کە لەنێوان ئەوان و فێربوونی عەرەبی و ئیسلامدا دەوەستن؟ چۆن زمانی قورئان بەلایەنی کەمەوە ببێتە زمانی دووەم لە ژیانی ئەو موسڵمانانەدا؟ دەبێت چی بکەین لەم بوارەدا؟

٧- پێشکەشکردنی وێناکردنێکی تیۆریی تەواو بۆ خوێندنگەی ئیسلامیی، چۆنبن لەڕووی باڵەخانە و بەڕێوەبردن و پاڵپشتییکردنی ماددیی و چالاکی و پرۆگرام و پلەبەندیی خوێندن و پەیوەندیی بە ژینگە و چواردەور و کەشی فێرکاریی و... هتد. لەسەر هەمان پێوەر زانکۆی ئیسلامیش بپێوە: ئایا زانکۆی تایبەتبن تەنها بەزانستە شەرعیەکانەوە، یان بۆ هەموو زانستەکانبن و لە ناویشیاندا زانستە شەرعییەکان، ئایا دووفاقەیی خوێندن لەسەر ئاستی خوێندنگە و زانکۆکان شتێکی پەسەندە یاخود ناپەسەندە؟ و ئایا چۆن ئەم دووفاقەیی لە خوێندندا نەهێڵرێت؟ ئایا پاڵپشتیی حکومی بێت یان میللی؟ بەڕێوەبردنی ئیسلامیی چۆن دەبێت؟ ئایا خوێندن کراوە بێت؟ ئایا خوێندن لەسەر سیستمی پۆل دەبێت یان نا؟ و سەدان پرسیاری تر کە پێویستیان بە وەڵامدانەوەی زانستی و لێکۆڵینەوەی

جیاواز هەیە بۆ پێشکەشکردنی وێنایەك بۆ جێگرەوە ئیسلامیەکان بۆ خوێندنگـە و زانکۆکانی ئێستا کە سەرنەکەوتووبوون لە پەروەردەکردنی نەوەیەکدا بتوانێت ئـەو قەیرانـەی ئوممـەتی عـەرەبی وئیسـلامی پێیـدادەڕوات تێپـەڕێنێت و هـیچ کەسـێك ناتوانێت گەل و حکومەتەکان لۆمەبکات لەسەر ئەوەی خوێندنگە و زانکۆکانمان ئەو چەشـنە ئەوروپییـەیان وەرگرتـووە لـە کاتێکـدا شـارەزا ئیسـلامیەکانی پـەرورەدە نەیانتوانیوە –تەنانـەت لەسـەر ئاسـتی تیـۆرییش– جێگرەوەیـەکی ئیسـلامیی بـۆ خوێندنگە و زانکۆکان پێشکەشبکەن کە دەبێت چۆنبن؟ بەجۆرێك ئەم جێگرەوەیـە ئیسلامیە بەڕاستی کاراتربێت و زیاتر بەدەم پێویستیەکانی ئوممەتـەوە بێـت. مـن ئەمـە بەئاڵنگارییـەکی ڕاسـتەقینە دادەنـێم بـۆ لێکۆڵـەران و شـارەزایانی بـواری پـەروەردەی ئیسـلامیی و هـەر دەبێـت لـە قۆنـاغی داهـاتوودا بەشـێکیان هـەوڵی ئەوەبدەن وێناکردنێکی تیۆریی ڕوون درستبکەن بۆ خوێندنگە و زانکۆی ئیسـلامیی کە دەبێت چۆنبن، بەجۆرێك بتوانن هەموو پێویستیە پەروەردەیی و ژیارییـەکانمان پڕبکەنەوە.

٨– پەیوەسـت بـەخاڵی پێشـووەوە: دانـانی وێنـاکردنێکی تیـۆریی بەلایـەنی کەمەوە بۆ خودی کۆلێژی پەروەردە کە دەبێت چۆنبێت، ئەمیش لەبەر ئەو بایەخە مەزنەی کۆلێژەکانی پەروەردە هەیانە لە خسـتنە مەیـدانی ئـەو مامۆسـتایانەدا کـە نەوەکانی ئوممەت پەروەردە دەکەن، چۆن خوێندکاری ئەو کۆلێژانە هەڵبژێردرێن؟ پێـوەر و بنـەماکانی ئـەم هەڵبژاردنـە چـین؟ چـۆن مامۆسـتاکانی ئـەو کۆلێژانـە ئامـادەبکرێن؟ و پرۆگـرام و چـالاکیەکان چـۆن دەبـن؟ لەگـەڵ ڕاسـتکردنەوە و هەڵسەنگاندنی ئەو کۆلێژە پەروەردەییانەی ئێسـتا هـەن لـە جیهـانیی ڕۆژئـاوایی و ئیسـلامیدا کـە بـە ئاسـتی جیـاواز سـەرکەوتوو نـەبوون لـە ئامـادەکردنی نـەوەی مامۆستادا کە بتوانن ڕابوونێکی ئیسلامیی گشتگیر بەرپا بکەن، بەڵکو لێکۆڵینەوەی

ئەزموونی ئیسلامیی و جیهانیش لـەم بـوارەدا و چـۆن دەتـوانین سـوودمەندبین لـە هەموو ئەوانە لە دامەزراندنی کۆلێژە پەروەردەییە ئیسلامیە نموونەییەکاندا کە ئەو مامۆستایانەمان بۆ دەخەنە مەیدانەوە کە دەمانەوێت.

٩- هـەروەها پەیوەندیـدار بـەخاڵی پێشـووەوە نەهێشـتنی ئـەو دووفاقەییـەی خوێندن کە لە جیهـانیی عـەرەبی و ئیسـلامیماندا هەیـە لـە نێـوان زانکـۆ عەلمانیـە نوێیـەکان و زانکۆکـانی زانسـتە شـەرعیەکاندا، لێکۆڵینـەوەی بـارودۆخی ئێسـتای زانکۆکانی زانستە شەرعیەکان لەسەر ئاستی جیهان و دانانی وێنـاکردنێکی تیـۆریی بەلایەنی کەمەوە بۆ ئەو زانکۆیانە بە تایبەت لە ناوچـە ناعەرەبیەکانـدا. بـارودۆخی زانکۆکـانی زانسـتە شـەرعیەکان بـەزۆریی چەقیبەسـتووە و زۆر لـە خـوار ئـەو ئاستەوەیە کە شایەنیەتی و لەبەر ئەوەی تا ئێستا ئەو زانکۆیانە بە تایبـەت قـەڵای پتەوی ئیسـلامبوون، بۆیـە پێویسـتیان بـە تازەکردنـەوە و پەرەپێـدان و چاودێری زیاتر هەیە تاکو پەیامە ئیسلامیەکەی بەجێ بگەیەنێت و ئەوەی جێی داخە ئەوەیە کە هەندێك لەو زانکۆیانە بە تایبەت لە وڵاتە ناعەرەبیەکانـدا لـەو ئاسـتەدانین، بـەم پێیەش توانایان نییـە زمـانی عـەرەبی و ئیسـلام بەوێنەیـەکی پێویسـت پێشـکەش بکەن و هەندێکیان زیان بە زمانی عەرەبی و ئیسلام دەگەیەنن ئەمەش جەخت لەوە دەکاتـەوە کـە پێویسـتمان بـە لێکۆڵینـەوە و بەدواداچـوونی زیـاتر هەیـە بـۆ ئـەو زانکۆیانە و بارودۆخی ئێستایان و ئەوەی لە داهاتوودا دەبێت چۆنبن.

کـار گەشـتووەتە ئـەوەی یـەکێك لـە لێکۆڵـەران دەڵێـت هەنـدێك لـەو زانکۆیانـە لەلایەن کەسانێکەوە بەڕێوەدەبرێن لە بنەڕەتدا دژ بە ڕۆشنبیریی ئیسلامین، بـەڵکو تەنانەت هەندێك جـار هـەر موسـڵمانیش نـین، و ئـەو ئۆفـەری خوێندنانـەی (المـنح الدراسیە) دەگـات بـەو زانکۆیانـە بـە تایبـەت لەوڵاتـە عەرەبیەکانـەوە دەدرێـت بـە مەسـیحییەکان و موسـڵمانانی لـێ بێبـەش دەکرێـت، و زۆربـەی ئـەو زانکۆیانـە بـە

دەست باری ماددی ناهەموارەوە دەناڵێنن[1].

بەکورتی زۆربەی ئەو زانکۆیانە پێویستیان بە لێکۆڵینەوەی هەڵسەنگێنەر و ڕاستەکردنەوە هەیە لەپاڵ لێکۆڵینەوەی تیۆریی بۆ زانکۆکانی زانستە شەرعیەکان کە دەبێت چۆن بن، هەروەها لێکۆڵینەوەی پەیمانگاکانی زانکۆ شەرعیەکان کە خوێندنی ئاییني پێش زانکۆیی دەخەن و لەبەر ئەوەی ئەو پەیمانگا شەرعیانە یەکێکن لەو دامەزراوانەی خوێندکارانی زانستە شەرعیەکان لە خۆدەگرن ئەوانیش پێویستیان بە لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە لەسەر ئاستی جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیی، لەگەڵ پێشکەشکردنی وێناکردنێکی تیۆریی ڕوون بۆئەوەی چۆن ئەو پەیمانگایانە دابمەزرێنرێن لەڕووی باڵەخانە و پرۆگرام و ئامانج و کەشی فێرکاریی و پاڵشتی ماددی و بەڕێوەبردنەوە...هتد؟ هەموو ئەم بوارانە هێشتا لەلایەن لێکۆڵینەوەکانی پەروەردەی ئیسلامیەوە بە قووڵی دەستیان نەدراوەتێ مەگەر زۆر بەدەگمەن نەبێت[2].

١٠- هەروەها پەیوەندیدار بەخاڵی پێشووەوە لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ بۆ پرۆگرامە جیاوازەکانی زانستە شەرعیەکان لە هەموو قۆناغەکانی خوێندندا،

---

[1]- لێکۆڵینەوەکەی محمد جميل خياط: الجامعات الإسلامية دراسة مسحية تحليلية تقويمية، رابطة الجامعات الإسلامية، الرياض، (١٩٩٤م) – بەیەکێك لەلێکۆڵینەوە پێشڕەوەکان دادەنرێت بەم ئاڕاستەیە، کەزۆرێك لەبارودۆخی خراپی ئەو زانکۆیانە ئاشکرادەکات بەتایبەت لەدەوڵەتە ناعەرەبییەکاندا، بەڵام لەزۆربەیدا تەنها لێکۆڵینەوەیەکی وەصفییە وهەڵسەنگاندن وشیکردنەوەی تێدانییە، هەروەها بڕوانە:
- A.Elnakib: The Educational Reform of Al-Azhar (1872-1972), Ph.D Thesis, Exeter University, England, (1980).

[2]- هەندێك لێکۆڵینەوە هەن کەباسیان لەهەندێك لەو پەیمانگا شەرعییانە کردووە، بەڵام لەزۆربەیاندا تەنها وەصفە وبەدەگمەن قووڵبوونەتەوە لەشیکردنەوە وهەڵسەنگاندندا لەبەر نەبوونی چوارچێوەیەکی تیۆریی ئیسلامیی ڕوون، بڕوانە: دليل مستخلصات الرسائل الجامعية في التربية الإسلامية بالجامعات المصرية والسعودية، مصدر سابق.

لەبەرئەوەی ئـەو پرۆگرامانـە لـە هـەموو پرۆگرامـەکانی تـر کـەمتر کەوتووەتـە بـەر هێرشـی ڕۆشـنبیرییەوە و لـە ئێسـتادا لـە هـەموویان زیـاتر توانـای ئـەوەی هەیـە پارێزگـاری لـە شوناسـی عـەرەبی و ئیسـلامیی بکـات لـە کاتێکـدا کـە ئوممـەتی عەرەبیمان ڕووبەڕووی ئەو مەترسییە بووەتەوە لە ڕەگـە عـەرەبی و ئیسـلامیەکانی هەڵبکێشرێت و ون بێت لە کەلتوورێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیدا، تا چ ڕاددەیەك ئـەو پرۆگرامە شەرعیانە گونجاون بۆ ئامانجەکانی ڕابوونی عەرەبی و ئیسلامی؟ تا چەند ئـەو پرۆگرامانـە توانایـان هەیـە شوناسـی عـەرەبی و ئیسـلامیی بـە خوێنـدکاران ببەخشن؟ ئەو چالاکیانە چین کە دەبێت لەگـەڵ ئـەو پرۆگرامانـەدا هـەبن؟ هۆکـارە یارمەتییدەرەکان چین لەسەر سەرکەوتنیان؟  خەسڵەتەکانی ئەو مامۆستایانەی لـە توانایاندایە ئەو پرۆگرامانە بڵێنەوە چین؟ چۆن ئـەو پرۆگرامانـە ببنـە ئامرازێك بـۆ بەدیهێنانی ئینتیمای عەرەبی ئیسـلامیمان؟ و سـەرەڕای ئـەوەی لێکۆڵینـەوەی زۆر هەن کە دەستیان داوەتە ئەم بابەتـە[1] بـەڵام زۆربـەیان لـە وێنـاکردنێکی ئیسـلامیی ڕوونیان کەمە کە لێکۆڵینەوەکەی پێوە پابەند بێت و لە ژێر ڕۆشناییدا شـیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی ئەو پرۆگرامانە بکرێت کـە بـۆ خوێنـدکارانمان دانـراون لـە هـەموو قۆناغـەکانی خوێندنـدا و ئـەوەی جێـی سـەرنجە نـەبوونی لێکۆڵینـەوە لـەبارەی پرۆگرامەکانی زانستە شەرعیەکانەوە کـە دەدرێـت بەکەمایەتییـە موسـڵمانەکان لـە جیهاندا، هەروەها بەموسڵمانە ناعەرەبەکان مەگەر زۆر بەکەمیی نەبێت.

١١- پاشان پێویستیمان هەیـە بەپێداچوونەوە و بڵاوکردنـەوە و لێکۆڵینـەوەی کەلەپووری پەروەردەیی و دەروونیی ئیسلامیمان بە درێژایی سەردەمەکان و دانانی لیسـت بـۆ دەسـتەواژە و چـەمکە پـەروەردەیی و دەروونییـەکان و لێکۆڵینـەوە دەربارەی پەرەسەندنی ئەو دەستەواژە و چەمکانە بە درێژایی سەردەمە ئیسـلامیە

[1]- سەچاوەی پێشوو.

گەشاوەکان، هەموو ئەمانە تاکو لێکۆڵەرانی بواری پەروەردەی ئیسلامیی هۆشدارییان زیاتربێت بەم کەلەپوورە و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵی و سوودمەندبوون لێی[1] و لەوانەیە پێویستی زیاترمان هەبێت بە لێکۆڵینەوە لەبارەی ئەو چەمك و دەستەواژە پەروەردەییانە لە قورئان و سوننەتدا تاکو تێگەیشتن لەو دەستەواژە و چەمکە پەروەردەییە ئیسلامیانە ئاسانتربێت بۆ ئەو لێکۆڵەرانەی پەیوەندیی بە بوارە جیاوازەکانی لێکۆڵینەوەکانیانەوە هەیە.

**بەپێی ئەوەی باوەڕم وایە هەر لیکۆڵینەوەیەکی تیۆریی هەر دەبێت مەبەستێکی جێبەجێکاریی هەبێت و ئەوەی کە ئیسلام بە گوفتار ڕازیی نابێت بەبێ کردار، دەڵێم زانایانی ئەو دەستەیە لە قۆناغی داهاتوودا بە لێکۆڵینەوەی پڕاکتیکییەوە سەرقاڵدەبن، لێرەشدا باس لە هەندێك لەو بوارانە دەکەین کە دەکرێت لێکۆڵینەوەکانی قۆناغی داهاتوویان ئاڕاستەبکرێت:**

أ- لێکۆڵینەوەی زانستی دەربارەی خوێندنگە ئیسلامیەکانی ئێستا و چۆن پەرەیان پێ بدەین و ئاستی خوێندکارەکانیان بەرز بکەینەوە و وایانلێبکەین پەیوەندیی زیاتریان هەبێت بە کۆمەڵگەکانیانەوە و زیاتر خزمەتیان بکەن، لە کاتێکدا ئامانج دروستکردنی خوێندنگەیەکی ئیسلامیی نموونەیی بێت، ئەگەر چی یەك خوێندنگەش بێت لەهەر شوێنێك لە جیهانیی عەرەبی یان ئیسلامیی، کە بتوانین بەڕاستی لەبارەیەوە بڵێین: ئەمە خوێندنگەیەکی ئیسلامیی نموونەییە، چونکە قسەکردن لەبارەی خوێندنگەی ئیسلامیەوە هەرچەند شیرینیش بێت هێشتا

---

[1]- پەیمانگای جیهانیی بۆ هزری ئیسلامیی لەقاهیرە هەوڵێکی جوانی داوە لەم بابەتەدا کەبریتیە لە: دليل الباحثين إلى المفاهيم النفسية في التراث، ثلاثة مجلدات، القاهرة، (١٩٩٢م)، هێشتا پێویستییمان زۆرە بەم جۆرە چەمکانە لەقورئان وسوننەتدا، لەپاڵ چەمکە پەروەردەییەکاندا لەکەلەپووردا، وەبەهانشێوە لەقورئان وسوننەتدا.

هـەر بەقسـەیەکی تیـۆریی دەمێنێتـەوە و بـە چ حاڵێـك بەخـەڵك قایـل دەکـات تـا ئەوکاتەی خۆی لە خوێندنگەیەکی واقیعییدا دەبینێتەوە کە خەڵك دەیبینێت.

ب- و پەیوەندیدار بە خاڵی پێشوو: بوونی زانکۆیەکی ئیسـلامیی نموونـەیی لـە هەر شوێنێك لە جیهانیی ئیسلامیدا، کە ئەویش زانکۆیەکـە ڕۆحـی ئیسـلامیی پێدا دەڕوات: بـــە خوێنـــدکار و مامۆســـتا و بـــەڕێوەبردن و پرۆگـــرام و کەشـــی فێرکارییەوە...هتد. زانکۆیەك کە جیاکاریی ناکات لە نێـوان زانسـتە شـەرعیەکان و زانستە گەردوونییەکانـدا بـەڵکو زانکۆیـەك دەبێـت بـۆ هـەموو زانسـتەکان و هـەموو زانستەکانیش تێکەڵ دەبن بە ڕۆحی ئیسلام.

هەموو هەوڵەکانی چاکسازی زانکۆیی لە جیهانیی عەرەبی و ئیسـلامیماندا تـاکو ئێستا نەیانتوانیوە یاخود نەیانویستووە بەرز ببنەوە بـۆ ئـەم ئاسـتە: ئاسـتی یـەك زانکۆی ئیسلامیی یەکگرتوو و لەوانەشە ئەزموونی زانکـۆی ئیسـلامیی جیهـانیی لـە مالیزیا لە ئەزموونە پێشڕەوەکان بێت لەم بوارەدا.

ج- و لەگەڵ ئەوەشدا بوونی کۆلێژی پەروەردەی ئیسلامیی نموونەیی، کـە لـە دوای باسکردنی زانکۆی ئیسلامیی نموونەیی باسمکردووە هەرچەندە بەشێکە لێـی، ئەمیش لەبەر باوەڕبوونی لێکۆڵەر بە گرنگیی بوونی جۆرێکی تایبەت لە مامۆستایان بـە تایبـەت لـەم قۆناغـەی تەمـەنی ئوممـەتی عـەرەبی و ئیسـلامیماندا. هـەروەها گرنگیی دروستکردنی شـارەزای پـەروەردەیی ئیسـلامیی کـە سەرپەرشـتی کـرداری گۆڕانکـاری پـەروەردەیی بکـات لـە عەلمانیەتـەوە بـۆ ئیسـلام، هـەموو ئەمانـە پێویستیان بە جـۆری تایبـەت لـە کۆلێـژی پـەروەردە هەیـە، و جـۆری تایبـەت لـە خوێنـدکار و ئەنـدامانی دەسـتەی وانەگوتنـەوە و پرۆگـرام و باڵەخانـە و چـالاکی و کەشی پەروەردەیی...هتد، ئەگەر سەرکەوتوو نەبین لـە دامەزرانـدنی ئـەو کۆلێـژە پەروەردەیـە نموونەییـەدا، ئـەوا زۆرێـك لـە نووسـین و لێکۆڵینـەوەکانمان لـەبارەی

پەروەردەی ئیسلامیەوە هەمیشە زۆر لە خوار ئەوەوە دەبن کە ئێمە هیوامان پێیەتی[1].

د- هەروەها پەیوەندیدار بەو خاڵەوە دووبارە نووسینەوەی هەموو بڕیارنامە و پرۆگرامەکان لە ڕوانگەیەکی ئیسلامیەوە: ئیسلامێتی زانستەکان و مەعریفە، لە کاتێکدا کە خوێندنگە و زانکۆ ئیسلامیەکان هەرگیز بەو شێوەیە نابن مەگەر بەزانست و لێکۆڵینەوە و کۆمەڵە پرۆگرامێك نەبێت کە دووبارە بە داڕشتنەوەیەکی ئیسلامیانە داڕێژرابێتنەوە، لێرەشەوە گەورەترین کۆششی لێکۆڵەران لە قۆناغی داهاتوودا دەبێت ئاراستەکراو بێت بۆ بەئیسلامیکردنی زانستە مرۆییەکان و گەردوونییەکان بەیەکەوە، نازانم ڕێگر چییە لەوەی خوێندکارێك پلەی زانستی ماجستێر و دکتۆرا بەدەستبێنێت لە پسپۆڕییەکدا ئەگەر لە ماستەرنامەکەی یان تێزەکەی ڕەخنە لەو نووسراوانەی ئێستا بگرێت کە لە ڕوانگەیەکی ئیسلامیەوە نووسراون، جێگرەوەی نووسراو پێشکەشبکات لە ڕوانگەیەکی ئیسلامیەوە. بۆنموونە: ڕەخنەگرتن لە کتێبەکانی بنەماکانی پەروەردە کە ئێستا هەن و زۆربەی لە ڕوانگەیەکی عەلمانیەوە نووسراون و پێشکەشکردنی نووسراوێك لە بنەماکانی پەروەردەدا لە ڕوانگەیەکی ئیسلامیەوە. بە هەمان شێوە هەموو بابەتە پەروەردەیی و ناپەروەردەییەکانی تریش.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە تەنها بە تیۆریی باس لە ئیسلامێتی زانستەکان و مەعریفە بکەین، یان ڕەخنەگرتن لە پرۆگرامەکانی ئێستا لەبەر ئەوەی عەلمانین، یان لەبەر ئەوەی هێرشێکی ڕۆشنبیریی دیاریکراویان لە پشتەوەیە، یان ئەوەی لایەنێکی دەرەکی دیاریکراو هەوڵی بەڕۆژئاواییکردنی پرۆگرامەکان دەدات لە

[1]- عبد الرحمن النقيب: مشروع إنشاء المعهد العالمي للتربية الإسلامية، في التربية الإسلامية، رسالة ومسيرة، دار الفكر العربي، القاهرة، (١٩٩٠م)، (ص ٢٢٣).

وڵاتەکانماندا، دەڵێم: کاتی ئەوە هاتووە بە باسکردنی تیۆریی بەس نەکەین و هەنگاو بەرەو قۆناغی بەرهەمهێنانی زانستی بنێین لە پێناو پێشکەشکردنی زانست و مەعریفەکان لە ڕوانگەیەکی ئیسلامیەوە.

هـ- هەروەها دیزاینکردن و تاقیکردنەوەی پرۆگرامی کارا لە زانستە شەرعیەکاندا بە هەموو قۆناغەکانی خوێندنیەوە، هەروەرها پێشکەشکردنی خوێندنی عەرەبی و ئیسلامی و مێژووی ئیسلامیی بە کەمایەتییە موسڵمانەکان و موسڵمانە ناعەرەبەکاندا و پەرەپێدانی ئەو پرۆگرامانە و باشترکردنیان تاکو بەرهەمی چاوەڕوانکراو بەدەستبێنن، بەجۆرێك ببێتە پاڵپشتێکی بەهێز لە یەکخستنی ئوممەتی عەرەبیدا وەك ناوکێکی پتەو بۆ یەکخستنی ئوممەتی ئیسلامیی گەورە و پارێزگاری لە شوناسی ئیسلامیی هەموو کەمایەتییە موسڵمانەکان لە جیهاندا.

هەل بۆ لێکۆڵەر ڕەخساوە کە سەردانی هەندێك لە پەیمانگا زانستی و زانکۆ شەرعیەکان بکات لە ئەندۆنیسیا و مالیزیا و بینیویەتی چۆن زمانی عەرەبی و ئیسلام دەگوترێتەوە بە موسڵمانە ناعەرەبەکان لەڕێی پرۆگرامی بێزارکەر و شێوازی کۆن و بەسەرچووەوە. ئەگەر خۆشەویستی سروشتیی ئەو موسڵمانانە نەبوایە بۆ ئیسلام ئەوا لەڕێی ئەو پرۆگرامە کۆنانەوە فێری عەرەبی و ئیسلام نەدەبوون. کاتێك وەڕسی خۆمم دەربڕی لەو بارودۆخە پەروەردەییە نزمانە هاوڕێیەکم لەوێ پێی گوتم کە سەردانی هەندێك پەیمانگا و زانکۆی شەرعی کردووە لە هەندێك لە دەوڵەتە ئەفریقییە ئیسلامیە ناعەرەبەکان و بارودۆخ لەوێ زۆر خراپترە، کە جەخت لە پێویستی ئاڕاستەکردنی زۆرێك لە کۆششی لێکۆڵینەوەکانمان دەکاتەوە لە قۆناغی داهاتوودا بەرەو پێشکەشکردنی پرۆگرام و ڕێگەی وانەگوتنەوەی جێگرەوەی گونجاو بۆ فێرکردنی عەرەبی و ئیسلام و ژیاریی ئیسلامیی بە هەموو موسڵمانە ناعەرەبەکان لە هەموو جیهانیی ئیسلامیدا.

و- لەگەڵ ئەوەشدا پەرە بە تاقیکردنەوە و پێوەری تایبەت بە خۆمان بدەین کە ئاراستە ئیسلامیەکانمان و ڕاددەی پابەندبوونی ئیسلامیمان بپێوێت، هەروەرها مەیل و تواناکانمان و ئەو ئامراز و پێوەرانە دەبێت لێوانلێوبن لە ڕۆح و ڕۆشنبیریی ئیسلامیی لەجیاتی ئەوەی پشت بەپێوەر و هەڵسەنگاندنی ڕۆژئاوایی ببەستین و ئەو تاقیکردنەوە و پێوەرانە وەربگێڕدرێن بۆ سەر هەموو زمانە ئیسلامیەکان تاکو لە هەموو خوێندنگە و زانکۆ ئیسلامیەکان بتوانرێت بەکاربهێنرێت لەسەر ئاستی هەموو جیهانیی ئیسلامی[1].

ز- و پەیوەندیدار بەوەی پێشوو: پێویستی دروستکردنی میکانیزمێکی ئیسلامیی جیهانیی بۆ سەرپەرشتی کردنی ئەو کۆششانەی لەو توێژینەوانەدا بەخەرج دەدرێن و ڕێکخستنیان لەسەر ئاستی جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیی، بەجۆرێك هەوڵ و کۆششەکان بڵاوە نەبن یاخود دووبارە ببنەوە یان پەك بخرێن و ئەو لایەنە جیهانییە بەرپرسیار بێت لە بەستنی خولی ڕاهێنان بۆ لێکۆڵەرانی بواری پەروەردەی ئیسلامیی بە مەبەستی باشترکردنی ئاستی زانستیان[2] و بە شێوەیەکی بەردەوام کۆڕبەند و کۆنگرەی پەروەردەیی ئیسلامیی ببەستێت بۆ گفتوگۆکردنی پرسە پەروەردەییە گرنگەکان کە پەیوەندییان بە ڕابوونی ژیاریی پەروەردەیی ئیسلامیەوە هەیە، هەر وەك چۆن ئەو دامەزراوەیە بەرپرسیار دەبێت لە دەرکردنی

---

[1]- عبد الرحمن النقيب: مقياس الالتزام الإسلامي لدى الشباب الجامعي، الأنجلو المصرية، القاهرة، (١٩٨٣م).

[2]- پەیمانگای جیهانیی بۆ هزری ئیسلامیی لەقاهیرە خولی ڕاهێنانی یەکەمی بەست بۆ لێکۆڵەرانی بواری پەروەردەی ئیسلامیی لەماوەی (٢٤-٢٦ی کانوونی دووەم ١٩٩٥م)، بۆ لێکۆڵەرە گەنجەکان بوو لەپەروەردەی ئیسلامییدا، وەئەوەندەی لێکۆڵەر زانیاریی پێی هەبێت ئەم خولی ڕاهێنانە یەکەم خولی ڕاهێنان بوو بۆ ئەومەبەستە بەسترابێت، وەلێکۆڵەر بەپێویستی دەزانێت خولی لەوجۆرە دووبارە ببێتەوە لەداهاتوودا وەگشتگیرتربێت بۆ ئامادەکردنی لێکۆڵەران لەپەروەردەی ئیسلامییدا.

**گۆڤاری پەروەردەیی ئیسلامیی لەسەر ئاستی ئەکادیمیی جیهانیی کە تێیدا ئەرکی بڵاوکردنەوە و پەخشکردنی هزری پەروەردەیی ئسلامیی دەگرێتە ئەستۆ لەگەڵ ئاڵوگۆڕی بیرۆکە لە نێوان لێکۆڵەر و خوێنەراندا، هەروەك چۆن دەتوانێت بە بەردەوام ڕێبەری دەربکات بۆ لێکۆڵەر و بایەخدەرانی بواری پەروەردەی ئیسلامیی و زانیارییەکانیان و پوختەی لێکۆڵینەوەکانیان لەخۆ بگرێت تاکو لێکۆڵەرانی بواری پەروەردەی ئیسلامیی بتوانن یەکتر بناسن، هەروەها دەرکردنی بەردەوامی ڕێبەرێك تایبەت بەو لێکۆڵینەوە و توێژینەوە و نامە زانکۆییانەی لە پەروەردەی ئیسلامیدا نووسراون لەسەر ئاستی هەموو جیهان، جگە لەوەش لە چالاکی کە ئەو دامەزراوە پەروەردەییە جیهانییە پێشنیارکراوە دەتوانێت ئەنجامی بدات[1].**

**ئەو دەستە جیهانییە بۆ پەروەردەی ئیسلامیی کە بانگەوازی بۆ دەکەین لەڕێی ئەم کۆنگرەوە هەر دەبێت لیستی ڕێکخراوی خۆی تایبەت بە چالاکیەکانی هەبێت لەگەڵ بنکەیەکی هەمیشەییدا کە لەسەری ڕێك دەکەون و وا دەزانم ئەو دەستەیە بەو چالاکیە پێشنیارکراوانە دەتوانێت لە چەند ساڵێکی کەمدا کاری زۆر بکات لەپێناو بەرپاکردنی پێکەوە گونجاندا لەنێوان هەموو وڵاتانی جیهانیی ئیسلامیدا**

---

[1]– زۆر بەداخەوە سەنتەری جیهانیی بۆ خوێندنی ئیسلامیی لەساڵی (١٩٧٧م) لەمەککە دامەزرا بەهیوای ئەوەی بەم ڕۆڵە هەستێت، بەڵام لەپاشاندا هەوری هەرێمایەتیی تەسك ڕێگربوو لەنێوان ئەو وهەستان بەم ڕۆڵە جیهانییەدا، پاشان ڕێکخراوی ئیسلامیی بۆ پەروەردە وزانستەکان وڕۆشنبیریی (ئیسیسکۆ) لە (١٩٨٢م) لە (الرباط) دامەزرا بەڵام تائێستا نەیتوانیوە هەستێتەوە بۆ ئاستی ئەو بەرپرسیارییەتەی خراوەتە سەر شانی، هەروەك چۆن پەیمانگای جیهانیی بۆ فیکری ئیسلامیی دامەزرا لەئەمریکا لەساڵی (١٩٨١م) و لقی زۆری لێبوویەوە لەهەندێك لەپایتەختە عەرەبیی وئیسلامییەکاندا، بەڵام تائەم کۆتاییانە گرنگیی بەلایەنی پەروەردەیی نەدا، وەوادەزانم هەرگیز بێنیازمان ناکات لەدروستکردنی ڕابیتەی زانایانی پەروەردەی موسڵمان کەلەڕێی ئەم دامەزراوەیەوە بانگی بۆدەکەین لەژێر سایەی ژینگەیەکی هاوڕێ ولەخۆگری وەك کۆماری ئیسلامیی ئێراندا.

لـەڕێی ئـەو پرۆگرامـەی پێشـنیار کـراوە. ئـەو دەسـتە پەروەردەییـە ئیسـلامیە جیهانییەیـە کـە دەتوانێـت بەڕاسـتی یـەکێتی ئوممـەت کـارا بکاتـەوە و هـەموو هۆکارەکانی دووبەرەکیی و پەرشوبڵاویی لا ببات، هەموو کۆششێك ئاڕاستە بکات بۆ دروستکردنی نەوەی ئیسلامیی بەتوانا بۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی ئـەو ئاڵنگاریانـەی ئوممەت ڕووبەڕووی دەبێتەوە. ئەمەش پێویستی بە کۆششـی زیـاتر و کـاری زیـاتر هەیە کە لە پێناویدا بەخەرجی بدەین بۆ ژیاندنەوەی ئەو ئوممەتەی خودای گـەورە ویستوویەتی باشترین ئوممەتبێت کە بۆ خەڵك نێردراون.

ئایا لایەنە ڕێکخەرەکانی ئـەم کۆنگرەیـە دەتـوانن لـە مـاوەی ڕۆژێکـدا لـە دوای ڕۆژانی کۆنگرەکە ئەم کارەبکەن یان وا بەباش دەزانن کە بانگەواز بۆ کۆنگرەیـەکی پەروەردەیی ئیسلامیی جیهـانیی بکـەن، کـە تێیـدا بایەخـدەران بـەم بابەتـە بـانگ بکـرێن، و لەوانەشـە ناونیشانەکەشـی بـریتی بێـت لـە: ئـەرك و لەپێشـینەیی کـاری پەروەردەیی ئیسلامیی لە قۆناغی داهاتوودا، هەروەها ئەو دەستەیە لقـی جیـاوازی هەبێت لە وڵاتە عەرەبی و ئیسلامیەکاندا، و پاڵپشـتیکردنی مـاددی بـریتی بێـت لـە پاڵپشتیکردنێکی میللی ئیسلامیی جیهانی.

***

# توێژینەوەی زانستیی پەروەردەیی ئیسلامیی لە میسری هاوچەرخدا (کۆمەڵە وانەیەکی سوودلێوەرگیراو)[1]

لە سەدەی ڕابردوودا هاوشانی ئەو ڕابوونە ئیسلامیەی جیهانیی عەرەبی و ئیسلامیی گرتبوویەوە بانگەواز دەکرا بە شێوەیەکی زانستی ژیاریی ئیسلامیی زیندوو بکرێتەوە بە هەموو مەعریفە و زانستەکانیەوە بە جۆرێك ڕەسەنێتی و مۆدێرنی پێکەوە کۆ بکاتەوە، لەم بوارەشدا زانکۆکان و سەنتەرەکانی توێژینەوەی زانستی ڕەنجێکی زۆریان بەخەرج داوە، ئەمەش نموونەی چەند دامەزراوەیەکی زانستی کە خاوەن مۆرکێکی ئیسلامیی و جیهانین: سەنتەری جیهانیی بۆ توێژینەوە لە ئابووری ئیسلامیدا لە جیددە، پەیمانگای جیهانیی فکری ئیسلامیی لە واشنتۆن، ڕێکخراوی ئیسلامیی بۆ پەروەردە و زانست و ڕۆشنبیریی لە ریبات، سەنتەری

---

[1]- ئەم توێژینەوەیە لە دووەم کۆنگرەی زانستی جیهانی پێشکەش کراوە: التكامل المعرفي بين علوم الوحي و علوم الكون، جامعة القرآن الكريم والعلوم الإسلامية، أم درمان–سودان،يناير (٢٠٠٩م).

توێژینەوە لە مێـژوو و هونـەر و ڕۆشـنبیریی ئیسـلامیی لـە ئەسـتەنبوڵ، و زانکـۆی ئیسلامیی جیهانیی لە مالیزیا، ڕێکخراوی پزیشـکی ئیسـلامیی لـە سـەفای کوێت و چەندەها ڕێکخراو و دامەزراوەی تر کە خزمەت بەم ئاڕاستەیە دەکەن.

لێـرەدا هـەوڵی کۆکردنـەوەی هـەموو ئـەو توێژینـەوە و لێکۆڵینـەوە زانسـتیانە دەدەین کە لە بواری پەروەردەدا و لە زانکۆ مسـرییەکاندا ئەنجامـدراون و هـەوڵیان داوە ئیسـلام و ڕێنماییـە پەروەردەییـەکانی و جێبەجێکردنـەکانیان لـە چـاخە زێڕینەکانیدا بکەنە خاڵی دەستپێك و لەوێوە لە پرسە پەروەردەییە هاوچەرخەکانی ئوممـەتی ئیسـلامیی بکۆڵنـەوە تـاکو بتـوانن دوایـن شـتێك کـە پرۆگرامـە پەروەردەییەکانی جیهان پێی گەیشتووە کۆبکەنەوە لەگەڵ دیدی گشتی ئیسلام بۆ مرۆڤ و گەردوون و ژیان، دەتوانین ئەمەش بە ((میتۆدی ئیسلامیی لـە توێژینـەوەی پەروەردەییدا)) ناوزەند بکەین[1].

بۆ ئەم مەبەستەش زیاتر پشت بە توێژینەوەیەك دەبەسـتین لـە سـاڵی ١٩٩٣ دا دەرچـووە لـە ژێـر ناونیشـانی: ((دلیـل مستخلصـات الرسـائل الجامعیـه فی التربیـه الاسـلامیه بالجامعـات المصـریه والسـعودیه))[2] تێیـدا چـاودێری هـەموو ئـەو نامـە ماجستێر و دکتۆرایانەی کردووە کە لە زانکۆکانی میسردا پێشکەش کراون هـەر لـە سەرەتای دەستپێکردنیانەوە تا کاتی دەرچوونیان، هەروەها ناوی ئـەو مامۆسـتا و

---

[1]– پەیمانگای جیهانی بـۆ هـزری ئیسـلامی هـەوڵی زۆری داوە بـۆ داڕشـتنی ئـەم میتـۆدە ئیسـلامیە لـە توێژینەوەدا کە دواترینیان ئەمانە بوون: پەیپـەری خـولی میتـۆدی ئیسـلامی (١٦–٢١ ی ئـابی ٢٠٠٨م)، سەنتەری لێکۆڵینەوەی مەعریفی لە قاهیرە (لە ژێر چاپدایە)، توێـژەریش لـەم بـوارەدا کۆمـەڵێك هـەوڵی هەیە لەوانە: میتۆدی ئیسلامی لە توێژینەوەی پـەروەردەیی بـە نموونـە: بـیردۆز و جـێ بـەجێکردن، دار الفکر العربي، القاهرة، (٢٠٠٤م).

[2]– عبد الرحمن عبد الرحمن النقیب: دلیل مستخلصات الرسائل الجامعیة في التربیـة الإسـلامیة بالجامعـات المصریة و السعودیة، المعهد العالمي للفکر الإسلامي، فرع الأردن، عمان، (١٩٩٣م).

دکتۆرانەش لـە خۆدەگرێـت کـە سەرپـەرشـتی ئـەو توێژینەوانـەیان کـردووە لەگـەڵ ژمارەی ئەو توێژینەوانەی هەر یەکێك لـەو مامۆسـتایانە سەرپـەرشـتیان کـردووە، و لیستێکیش ناوی ئەو زانکۆ و کۆلێژ و بەشانەی ئەو پلە زانستیانەیان بەخشـیوە لـە خۆدەگرێت، لەگەڵ ناوی ئەو توێژینەوانەی هەر یەکێك لەو زانکۆ و کۆلێژ و بەشـانە پێشکەشیان کردووە، لە کۆتاییشـدا لیسـتێك تایبـەتکراوە بـۆ بـوارە پەروەردەییـە جیاوازەکـان لەگـەڵ ژمـارەی ئـەو توێژینەوانـەی لـە هەریـەکێك لـەو بـوارە پەروەردەییانەدا پێشکەشکراوە.

لەگەڵ ئەوەی ئەم ڕێبەرییە تا ڕادەیەك کۆنە بەو پێیەی ئێمـە ئێسـتا لـە سـاڵی ٢٠٠٨ دایـن، بـەلاَم هەوڵمـداوە درێـژەی پـێ بـدەم لـە توێژینەوەیەکمـدا لـە ژێـر ناونیشانی: ((المنهجية الإسلامية في البحث التربوي نموذجا: النظرية والتطبيق)) کـە لە ساڵی ٢٠٠٤ دا دەرچووە، لەڕێی ئەم دوو ڕێبەرییەوە دەتوانین ئاڕاسـتەی گشـتی کاروانی توێژینەوەی پەروەردەیی ئیسلامیی لە میسردا دەستنیشان بکەین.

ئەوەشی زیاتر هاندەرم بوو بۆ ئامادەکردنی ئەم ڕێبەرییە پێویستی زۆرمان بـوو لەو کاتەدا بە ڕێبەرییەك لەم بوارەدا تاکو زیاتر پەرە بـەم بـوارە بـدەین و کـوالێتی بەرهەمەکانی باشتر بکەین، بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی بسەلمێنێت لە مەیدانی زانستی پەروەردەیی لە میسر و جیهانیی عەرەبیدا. چونکە خستنە ڕووی ئـەو توێژینـەوە و لێکۆڵینەوانەی پێشتر ئەنجامدراون دەبنە هۆی زیاتر دەوڵەمەندکردنی هزری توێژەر و وروژاندنی، بەمەش سوودمەند دەبێت لەوەی توێژەرانی پێش خـۆی لـەو بـوارەی ئەمدا پێشکەشیان کردووە و ئاگاداری ئەو کەمو کـوڕی و دژیەکیانـەش دەبێـت کـە کەسانی پێش خۆی تێی کەوتوون، و دەتوانێت ئەو توێژینەوانەش دەست بخات کە مەبەسـتیەتی. هـەروەها لـەڕێی ئاشـنابوون بـە بەرهـەمی توێـژەرانی پـێش خـۆی دەتوانێـت گرفتێـك لـە گرفتـەکان دەستنیشـان بکـات و ڕێگەچـارەی گونجـاوی بـۆ

بدۆزێتەوە، بە هەمان شێوە بە کۆمەڵێك سەرچاوە و ڕاستی و چەمك و بیردۆزیش ئاشنا دەبێت و بۆ توێژینەوەکەی سوودیان لێ دەبینێت. سەرەڕای ئەمانەش لە کاتی گەڕانیدا بە ناو بەرهەمەکانی پێش خۆی تێبینی خاڵی بەهێز و لاوازی بەرهەمەکانیان دەکات و بەمەش خۆی لە دووبارەکردنەوەی هەڵەکانیان دەپارێزێت و لە بەکارهێنانی ئەو ڕێگایانەش دوور دەکەوێتەوە کە سوودی بۆ توێژینەوەکەی نابێت.

وەك دەزانین بۆ بەدەست هێنانی پلەی ماجستێر و دکتۆرا وا پێویست دەکات لەسەر خوێندکار داهێنان بکات و بەرهەمی نوێ لە توێژینەوەکەیدا پێشکەش بکات بە شێوەیەك بگونجێت لەگەڵ ئەو پلەیەی بە دەستی دەهێنێت، هەر بۆیە دیاردەیەکی جوان نییە ئەم توێژینەوانە دووبارە و چەندبارە ببنەوە تەنها بەهۆی ئەوەی توێژەر ئاگاداری ئەو توێژینەوانە نییە کە لە پێش خۆی و لە هەمان بواری خۆیدا ئەنجامدراون، بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی بە فیڕۆدانی کات و ماندووبوونێکی زۆر لە کارێکی دووبارەدا و هەروەها تەواو نەکردنی کاری کەسانی تر بە جۆرێك ئەوان لە کوێ ڕاوەستان توێژەر لەوێوە دەست پێبکاتەوە. بە داخەوە ئەوەی چاو بەم ڕێبەرییەدا بخشێنێت سەرنجی ئەوە دەدات زۆرێك لە توێژینەوەکان لەڕووی ناونیشان و ناوەڕۆك و میتۆدی توێژینەوەوە هاوشێوەی یەکدین و چەندبارە بوونەتەوە، ئەمەش لە خۆیدا بۆتە ئاستەنگێك لە بەردەم بەرەوپێشچوون و باشتر بوونی توێژینەوە لەم بوارە نوێیەدا: بواری پەروەردەی ئیسلامی.

ئا لێرەدا گرنگیی ئەم ڕێبەرییە بۆ توێژەران و لێکۆڵەران دەردەکەوێت لە بواری پەورەردەی ئیسلامیدا، کە هەوڵ دەدات ببێتە دوانگەیەکی ئازاد تێیدا هەموو ئەو توێژینەوە و لێکۆڵینەوانەی پێشتر ئەنجام دراون لەم بوارەدا بخاتەڕوو بە هەموو ئەو ئاراستە هزریە جیاوازانەی توێژەرەکان هەیانە، سەرەڕای ئەوەی بە پێی توانا

به شێوەیەکی تواو ئەو هەوڵە نوێیانەی کە لەو توێژینەوە زانستیانەی لە بواری پەروەردەی ئیسلامیدا بە خەرج دەدرێن دەخاتە ڕوو، ئەمەش دەروازەی ئاسۆی نوێ و گەلێك توانای بەرهەمهێنمان بۆ دەکاتەوە.

لەبەر ئەوەی توێژینەوە لە پەروەردەی ئیسلامیدا مەیدانێکی نوێیە، بۆیە ئاواتە خوازم ئەم ڕێبەرییە ببێتە پردێك بۆ ناساندنی توێژەران بە یەکدی و ناساندنی ئەو کۆلێژانەش کە گرنگیی بەم بوارە دەدەن. بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستەش بایەخم داوە بەوەی ئەم ڕێبەرییە لیستێکی تێدا بێت ناوی توێژەران و سەرپەرشتیاران و ئەو کۆلێژانەی توێژینەوەکانیان تێدا پێشکەشکراوە لەخۆ بگرێت. هەروەها ئامانج لەم ڕێبەرییە بەو هەموو زانیارییانەی تێیدایەتی لە بارەی توێژینەوەکانی پێشتر لە هەمان بواردا ئەوەیە ڕێ بگرێت لە دووبارەبوونەوە و ئەنجامدانی توێژینەوە تەنها لە یەك ڕووی بابەتێکدا.

لە کۆتاییدا هاوشێوەی ئەم ڕێبەرانە ئەوەیان لێ چاوەڕێ دەکرێت بیرۆکەی نوێ ببەخشن لەبارەی لێکۆڵینەوە لە پەروەردەی ئیسلامیدا، جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی ئەم بوارە بوارێکی بەرفراوانە و تەنها کورت نابێتەوە لەسەر لێکۆڵینەوەی مێژوویی و بنەماسازی، بەڵکو پەل دەکێشێت تاکو لە ڕوانگەیەکی ئیسلامیەوە هەموو بابەت و بوارە پەروەردەییەکان بگرێتەوە. هەروەها توێژەر لە پەروەردەی ئیسلامیدا دەبێت بەوە نەوەستێت کە هونەری بەکارهێنانی پرۆگرامە جیاوازەکانی توێژینەوە شارەزا بێت: پرۆگرامی وەسفی یان مێژوویی، یان تاقیبکاریی یان بەراوردکراو... هتد، بەڵکو پێویستە لەسەری لەپاڵ ئەوەدا زانیاری و ئاگادارییەکی باشی بە بنەما ئیسلامیە ڕاستەکان هەبێت لە قورئان و سوننەت، کە پەیوەندییان بە بابەتی لێکۆڵینەوەکەیەوە هەیە، توانای هەبێت ئەو زانیارییانە لە لێکۆڵینەوەکانیدا بەکار بهێنێت بەکارهێنانێکی دروست و گونجاو.

**ئەوەی هانی دام ئەم لیکۆڵینەوەیە ئەنجام بدەم ((میتۆدی ئیسلامیی لە توێژینەوەی پەروەردەییدا وەك نموونە))** پێویستی زۆرمانبوو لەو کاتەدا بە ڕاستکردنەوەی ڕێڕەوی توێژینەوەی پەروەردەیی ئیسلامیی و مژدەدان بە میتۆدێکی ئیسلامیی لە توێژینەوەی پەروەردەییدا کە بەلایەنی کەمەوە کێبڕکێی میتۆدەکانی تری توێژینەوە بکات لە پراگماتی و مارکسی و بونیادگەرایی (Constructivism) و پیشەیی...هتد. ئەگەر ئەو میتۆدانە لە سەرتاسەری جیهاندا ڕەخنەیان لێ گیرا بێت و دەر کەوتبێت کە هیچکامیان توانایان نییە توێژینەوەی پەروەردەیی وەها بەرهەمبهێنن تاکو بتوانن چارەسەری زانستی ڕاست بدۆزنەوە بۆ گرفتە پەروەردەیەکانی مرۆڤ، و ئەگەر هەندێك پێشنیاری ئەوەیان کردبێت کە توێژەر زیاد لە میتۆدێك بەکاربهێنێت تاکو توێژینەوەی گشتگیرتر بێت و بتوانێت بەشێوەیەکی زانستیانەتر دەستبداتە کێشەکانی پەروەردەکردنی مرۆڤی هاوچەرخ، چونکە هەر میتۆدێکیان تایبەتمەندی و لایەنی کەموکوڕی خۆی تێدایە، ئەوا بە بۆچوونی من جێگرەوە ئەوەیە ئێمە خۆمان سەرکەوتووبین لە پەرەپێدان و پێشکەشکردنی میتۆدێکی ئیسلامیی گشتگیردا کە بەکردەیی دەتوانێت ڕووبەڕووی کێشەکانی پەروەردەکردنی مرۆڤی هاوچەرخ ببێتەوە گونجاو لەگەڵ دیدی گشتگیری ئیسلامیی بۆ مرۆڤ و گەردوون و ژیان و مەعریفە و ڕەوشت و کۆمەڵگا. دیدێك نێوان هەموو پێدراوەکانی عەقڵ و هەموو پێدراوەکانی سرووش، نێوان هەموو ڕاستییەکانی واقیع و هەموو ڕاستییەکانی پەنهان کۆبکاتەوە. ئەمەش ئەرکێکە هیچ میتۆدێکی تر ناتوانێت پێی هەستێت میتۆدی ئیسلامیی نەبێت.

میتۆدی توێژینەوەی ئیسلامیی بەو شێوەیەی پەرتووکەکە دەیخاتەڕوو جیاوازە لەو میتۆدانەی تر کە ئێستا لە دەزگاکانی توێژینەوەی زانستیدا باون، جیاوازن لەڕووی سەرچاوەی ئیسلامییەوە: قورئان و سوننەت. وا بە بیرمدا دەهات کە تاکە

ئـامرازە بـۆ بەرهـەمهێنانی زانسـتە پەروەردەییـە ئیسـلامیەکان و توێژینـەوەی پـەروەردەیی ئیسـلامیی، پاشـان جێبەجێکردنـە پەروەردەییـە ئیسـلامییەکان. باوەڕێکی بەهێزم هەبوو کە ئەگەر توانیمان خوێندکارانی خوێندنی باڵا و توێـژەران لەسەر ئەو میتۆدە ڕابهێنین و یارمەتییان بدەین لە دەستخستنی ئامرازەکانیدا ئەوا بەڕاستی دەتوانین لە ڕوانگەی ئەو میتۆدەوە بۆ پرس و کێشە پەروەردەییـەکانمان بڕوانین، بەڵکو باوەڕێکی بەهێزیشم هەبوو کە دەتوانین داهێنانیش بکـەین لـەبواری پەروەردەدا، هەروەها ناتوانین زۆرێك لە کێشە پەروەردەییەکانمان چارەسەر بکەین لە کاتێکدا ئەو میتـۆدە لـەلای خوێنـدکاران و توێـژەرانمان جێگیرنـەبووە. زۆربـەی ئەوەی دەیخەینەڕوو لـە هـزری پـەروەردەیی و چارەسـەری پـەروەردەیی و پاشـان جێبەجێکردنی پەروەردەیی هەموو خاڵییە لە ڕۆحی ئەو میتۆدە ئیسلامیە سرووش بەخشە.

میتـۆدی توێژینــەوە لــەو لێکۆڵینەوەیــەدا جیـاواز بـوو لــە میتۆدەکـانی ئــەو توێژینەوانەی کە لەسەر لێکۆڵینەوەی ئەو ڕێوشـوێن و هـەنگاوە ڕێکخراوانـە کـورت دەبنەوە کە توێژەر لە چارەسەرکردنی بابەتەکانی توێژینەوەکەیـدا دەیانگرێتەبـەر لە پێناو وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی و تاقیکردنەوەی گریمانەکانی، لێرەدا میتۆدی توێژینەوە بەرز دەبێتەوە بۆ بـەرزترین ئاسـت بۆئـەوەی گرنگیـی بـدات بـەوەی لـە پشت میتۆدی ئەو توێژینەوانەوە هەیە لە فەلسەفەی ئاڕاسـتەکەر و زاڵ لـە مـرۆڤ و کۆمەڵگا و پەیوەندیی نێوانیاندا. دەستەواژەکە زیاد لەوەی هەڵدەگرت کە هەندێك دەربارەی (Paradigm) دەیڵێن کە کورت دەبێتەوە لەسەر شێوازی توێژینەوەی باو لە نـاو بـوارێکی توێژینـەوەیی دیـاریکراودا یـان پسـپۆڕییەك لـە پسـپۆڕییەکان. سەرەڕای بە باشتر زانینم بـۆ دەسـتەواژەی (Paradigm) لـەم کاتـەدا بەرامبـەر شێوازناسـی بـەڵام مـن لـە ڕاسـتیدا مەبەسـتم لـە شـتێك بـوو کـە زیـاترە لـە

(Paradigm) به واتا تەسکەکەی. لەوانەیە بەکارهێنانی (صلاح إسماعیل) بۆ (The Grand Islamic Paradigm) بەواتای (نموونەی ئیسلامیی مەزن) کە نموونەی بچووکتری لێدەکەوێتەوە و دەکرێت وەڵامی ئەو پرسیارانەی لێ بەرهەم بێت کە دەکەونە بەردەم موسڵمان لە ئەنجامی جیاوازبوونی بوارەکانی توێژینەوە — ئەوەی من لەو ماوەیەدا مەبەستمبوو و ئێستاش جەختی لەسەر دەکەمەوە ئەم واتایە دەگەیەنێت.

هیوایەکی زۆرم هەیە بە توێژەرە گەنجەکان، نامەوێت وەك ئێمە تەمەنی گەنجییان لە وەرگرتنی کۆمەڵە میتۆدێکی توێژینەوەدا بەسەر بەرن کە ئیسلامیی نین، و ئەگەر ئێمە بێبەشبووبین لەوەی لە ماوەی خوێندن و دوای خوێندنیشدا باسێك بە وردەکارییەوە ببیستین لەبارەی ئەو میتۆدە ئیسلامیەوە ئەوا شیاونییە نەوەی نوێ لە لێکۆڵەرە گەنجەکان بەجێبهێڵین بەبێ ئەوەی پەیامی ئەو میتۆدە ئیسلامیەیان پێ بگەیەنین، و هەندێك جار وا دەهاتە پێش چاوم ئەگەر سەرکەوتووبین لە گەیاندنی ئەوە بە گەنجی توێژەر ئەوا دەستکەوتێکی گەورەمان بەدیهێناوە، چونکە ئەم نەوەیە لە گەنجان —بەدڵنیاییەوە— ئەو میتۆدە وەردەگرن، چونکە بەهێزترینە، و بەتواناترینە لە چارەسەرکردنی کێشەکانی نیشتمان و ئوممەت. ئەگەر سەرکەوتووبین لە پێدانی ئەو میتۆدە بە توێژەرانی گەنج ئەوا ئەم دراوە ڕاستەقینەیە هەرچی دراوی تری ساختەیە دەریدەکات لە بواری توێژینەوەی پەروەردەییدا.

و سەرەڕای ئەوەی بیرۆکەکە ڕوونبوو لە زەینمدا هەروەك چۆن لێکۆڵینەوەکەش دەریدەخات، بەڵام لەم کاتەدا نوێیە لە بواری پەروەردەدا. بیرۆکە نوێیەکان لە بوارەکانیاندا پێویستیان بەوەیە بە فراوانترین شێوە بانگەشەی بۆ بکرێت و پێویستی بەتاوتوێ هەیە لەگەڵ خستنەڕووی بۆ زۆرترین ژمارەی توێژەران و

خوێنەران تاکو دەرکەوتن و ڕوونییەکەی زیاتر بێت. لێرەدا هەر دەبێت سوپاسی هەندێك هاوکاری بەڕێز و هەندێك سەرۆك بەشی کۆلێژەکانی پەروەردە بکەم لە (المنصورة) و (دمیاط) و (طنطا) و (بنها) و (الأزهر) و (شبین الکوز) و (الإسکندریة) و (الإسماعیلیة) و پەیمانگای لێکۆڵینەوە پەروەردەییەکان لە زانکۆی قاهیرە و سوهاج، کە بەخشندەییان نواند بە بەستنی سیمینار لە کۆلێژەکانیاندا بۆ تاووتوێ کردنی بیرۆکەکانی لێکۆڵینەوەکە و بە تایبەت ئەوەی پەیوەندیی بە میتۆدی ئیسلامیەوە هەیە لە توێژینەوەی پەروەردەییدا و ڕەگەزەکانی و چۆنیەتی پێکهاتنی لای توێژەران.

هەروەها پەیمانگای جیهانیی فکری ئیسلامیی بە هاوکاری لەگەڵ سەنتەری لێکۆڵینەوە مەعریفییەکان لە قاهیرە لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەی پێشوودا خولی ڕاهێنانیان کردووەتەوە لە بوارەکانی پەروەردە و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و ئابووری ئیسلامیی دەربارەی میتۆدی ئیسلامیی لە لێکۆڵینەوەی: پەروەردەیی (دوو خول) و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان (یەك خول) و ئابووری ئیسلامیی (یەك خول)، و ڕێم بۆ خۆشکرا بەشداری بکەم لە چالاکیەکانی ئەو خولانەدا بە ئامادەکردن و ڕاهێنان و بەشداریکردن، و ژمارەیەکی زۆر لە لێکۆڵەران ئامادەی ئەو خولانە بوون، و هەڵبژاردەیەکی نایاب لە مامۆستای خاوەن شارەزایی لەم بوارەدا وانەیان تێدا گوتەوە.

و لەڕێی ئەو گفتوگۆ زۆرانەوە چ لەناو کۆلێژەکانی پەروردەدا، یان لەناو خولەکانی ڕاهێناندا دڵنیابوومەوە کە ئەو ((میتۆدە ئیسلامییەی)) دەبێت لەبارەوەیەوە بدوێین تەنها لەسەر توێژینەوەی پەروەردەیی، یان لێکۆڵینەوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان یان ئابووری ئیسلامیی کورت نابێتەوە، بەڵکو پەل دەکێشێت بۆ هەموو بوارەکانی لێکۆڵینەوە مرۆییەکان. هەموو بوارێکی لێکۆڵینەوە

هەر دەبێت پشت بەو میتۆدە ئیسلامیە ببەستێت. بەکارهێنانی ئەو میتۆدە ئیسلامییەیە کە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی وەها بەرهەم دەهێنێت تاکو هەڵگری ڕوانگەیەکی ئیسلامیی بن جیا لە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکانی تر، کە هەڵگری ڕوانگەیەکی عەلمانین. بەم پێیە دەبێت ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە بەم شێوەیە بێت ((میتۆدی ئیسلامیی لە توێژینەوەی پەروەردەییدا بەنموونە)) واتا لێکۆڵینەوەی پەروەردەیی لە نموونەیەك زیاتر نییە بۆ جێبەجێکردنی ئەو میتۆدە ئیسلامیە، و لەوانەیە دەرکەوتنی کارەکانی خولی میتۆدی ئیسلامیی لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا (بواری زانستە سیاسیەکان بەنموونە) ڕەنگدانەوەی ئەم تێگەیشتنە نوێیە بێت.[١]

**هەروەها لەڕێی ئەو تاوتوێ و مشت و مڕە زۆرانەوە چ لەناو کۆلێژەکانی پەروەردەدا یاخود لەناو خولەکانی ڕاهێناندا بێت سێ پرسی گرنگ هەبوون:**

**پرسی یەکەم: پەیوەندیی بە خودی چەمکی شێوازناسی (المنهجیة) و تێکەڵاوبوونی لەگەڵ چەمکەکانی ترەوە هەبوو،** بەتایبەت لە ساڵانی سەرەتادا هاوتا لەگەڵ دەستەواژەی بیانی (Paradigm) بەکارمدەهێنا و دەستەواژە بیانییەکە هەرگیز ئەوەندە فراوان نەدەبوویەوە بۆ ئەو مەبەستەی من دەمەوێت، چونکە دەستەواژە بیانییەکە دەکرێت هاوواتا بێت لەگەڵ نموونەی پێوانەیی لە ناو بوارێکی مەعریفی دیاریکراودا. دەستەواژەی ((نموونەیەکی پێوانەیی)) بڵاوببوویەوە بەڵام کێشە لەبەکارهێنانیدا ئەوەیە لە یەك بواری مەعریفی کورت دەبێتەوە، و ئەوەی کە دیدی تەواوی ئیسلامیی ناگرێتەخۆ و (منى أبو الفضل)

[١]– نادية محمود لطفي، سيف الدين عبدالفتاح (إعداد وإشراف): المنهجية الإسلامية في العلوم الإجتماعية، حقل العلوم السياسية نموذجا، (٢٩/٧/٢٠٠٠م) إلى (٢/٨/٢٠٠٠م)، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، القاهرة، (٢٠٠٣م).

چــەمکی ((النمــوذج المعــرفي التوحيــدي)) پێشکەشــکرد وەك دەســتەواژەیەکی گشتگیرتر، هەروەرك چۆن دەستەواژەی ((النموذج المعرفي الإسلامي)) دەرکەوت[١]، بەڵام من وایدەبینم نزیکە لە تیۆری مەعریفەی ئیسلامیەوە زیاد لەوەی کە لێرە مەبەستمانە لە شێوازناسی ئیسلامیی (المنهجیه الاسلامیه).

ئەگەر (The macro Islamic Paradigm) یان ( The Grand Islamic Paradigm) بەکاربهێنین کە هەموو بوارەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی لە خۆدەگرێت ئەوا لەوانەیە گرێکەمان چارەسەر کردبێت و ئەو دەستەواژەمان دیاری کردبێت کە مەبەستمانە لە شێوازناسی ئیسلامیی (المنهجیه الاسلامیه) لە توێژینەوەدا. هەروەها دەستەواژەی ((المنهجية الاسلامية)) گشتگیرتر و فراوانترە لە دەستەواژەی (Methodology) کە زیاتر لە فەلسەفەی توێژینەوەوە نزیکترە وەك لەوەی شێوازناسی ئیسلامیی (The grand Islamic paradigm) لە خۆی دەگرێت لە پێکهاتە و کارامەیی لە توێژینەوەی دیاریکراودا کە دەبێت توێژەر لێیان شارەزا بێت تاکو بەڕاستی ببێتە هەڵگری ئەو میتۆدە و لەڕێیەوە لێکۆڵینەوە بکات و دەکرێت بوارێکی مەعریفی دیاریکراو لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان یان زانستی دیکەش لەڕێی میتۆدی ئیسلامیی گشتیەوە میتۆدێکی ئیسلامیی تایبەت بەو بوارە مەعریفییەی هەبێت (Micro Islamic Paradigm) لە چوارچێوەی (The grand Islamic paradigm)دا. لەوانەیە بەم ڕوونکردنەوەیە ئەو ناڕوونییەمان ڕەواندبێتەوە کە لەسەر زاراوەی شێوازناسی (المنهجیة) هەبوو، لە کاتێکدا ئەم زاراوەیە هەمان زاراوەیە کە پەیمانگای جیهانیی فکری ئیسلامیی و سەنتەری لێکۆڵینەوە مەعریفییەکان لە قاهیرە بەکاریاندەهێنا لە خولی

---

[١]- نصر محمد عارف: مفهوم النظام المعرفي والمفاهيم المتعلقة به ((في نحو نظام معرفي إسلامي)) حلقة دراسية، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، عمان، الأردن، (٢٠٠٠م)، (ص ٦٣، ٦٤).

ڕاهێنانەکانیاندا لەسەر ئەو میتۆدە. لەوانەیە هەندێك پێشنیاری ئەوە بکەن کە هەر زاراوەیەکی بیانی هاوواتای (المنهجیة) واز لێ بهێنین و تەنها زاراوە عەرەبیەکە بەکاربهێنین، بەتایبەت بەکارهێنانی زاراوەی بیانی ئەو هەستە دەبەخشێت کە ئەم چەمکە چەمکێکی مۆدێرنە، و لە خەڵکی ترەوە وەگیراوە. لەوانەیە ئەمە گونجاو بێت ئەگەر ئێمە قسەکانمان تەنها ئاڕاستەی گەلی خۆمان بکەین، یان ئەوانەی کە بەزمانی بیانی نەیانخوێندووە، بەڵام ئێمە لە ڕاستیدا ڕووی دەممان دەکەینە موسڵمان و ناموسڵمانیش، و ئەوانەش کە بەزمانی عەرەبی و بیانی خوێندوویانە، تاکو جەخت لەوە بکەینەوە ئەو شێوازە ئیسلامیە بەهێزترین و بەتواناترینە لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی کێشە پەروەردەییەکانی مرۆڤ –سەرجەم مرۆڤایەتی–، و ئەوەی کە شێوازناسی ئیسلامیی بەو شێوەیەی لەو لێکۆڵینەوەدا ڕوونمانکردووەتەوە بەرهەمێکی هاوچەرخ نییە پەیوەندیی بە مێژووی زانستی موسڵمانانەوە نەبێت، بەڵکو لە سەردەمانی بووژانەوەی ئسیلامیدا جێبەجێدەکرا هەروەك چۆن لە لێکۆڵینەوەکەدا ڕوون دەبێتەوە.

**پرسی دووەم: ئەوەی کە بە مێشکی توێژەر و خوێنەراندا دەهات لە ماوەی ئەو تاوتویێ زۆرانەدا، چ لەناو کۆلێژەکانی پەروەردەدا یان لە ناو خولی ڕاهێنانەکاندا کە ئەگەر ئەمە شێوازناسی ئیسلامیی بێت لە توێژینەوەدا ((ئایا زانا موسڵمانەکان کاتێك پرسە پەروەردەییەکانیان چارەسەر کردووە ئەم شێوازەیان بەکارهێناوە؟ یان ئەمە بیرۆکەیەکی نوێیە؟ وەئایا ئەگەر ئێمە ئەم شێوازە جێبەجێبکەین بەرهەمە زانستیەکانمان پەسەندکراو دەبێت لەلایەن لیژنە زانستیەکان و کۆمەڵگای زانستیەوە؟ و ئایا لە مامۆستا گەورە هاوچەرخەکان کەس هەیە ئەم شێوازە ئیسلامیەی جێبەجێ کردبێت لە لێکۆڵینەوەکانیدا، و بەرهەمەکەی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی زانستی ئاستبەرز بووبێت؟))**، و زیادکردنی بەشی دووەمی

لێکۆڵینەوەکە لە پێناو چارەسەرکردنی ئەم پرسەدا بوو (نموونەی کردەیی بۆ ئەو شێوازە لە بواری پەروەردەدا) چ لەسەردەمە ئیسلامیە گەشاوەکانەوە بێت: (ابن سحنون، ابن مسکویە، الغزالي، ابن خلدون)، یان لە سەردەمی نوێ و هاوچەرخەوە بێت: پرۆفیسۆر دکتۆر (سید عثمان) لە بواری دەروونناسییدا، پرۆفیسۆر دکتۆر (سعید إسماعیل علی) لە بواری بنەماکانی پەروەردا، ئەم دوو لێکۆڵینەوەیەی پێشوو ئەوەیان دەرخستووە کە چۆن شێوازناسی ئیسلامیی لە لێکۆڵینەوەی پەروەردەیی هاوچەرخدا کاری زانستیی نایابی بەرهەمهێناوە لە بوارەکانی لێکۆڵینەوەی پەروەردەییدا: بنەماکان، و دەروونزانیی. مەبەستم ئەوە نییە ئەم دوو نموونەیە هەموو نموونەکانن یان تەنانەت بەهێزترینیشیان بن لە جێبەجێکردنی ئەو شێوازناسیە لە بوارەکانی پەروەردە و دەروونزانیدا، چونکە گومانی تێدانییە کەسانی زۆر هەن بەڵام من بەم دوو نموونەیە بەسبووم بەهۆی نزیکیم لە خاوەنەکانیانەوە، هەروەها بە ئاسانیش مامەڵە لەگەڵ بەرهەمە زانستیەکەیاندا دەکرێت، گەڕان و ناسینی زۆرێك لەو نموونانەی ئەم شێوازەیان جێبەجێکردووە لە لێکۆڵینەوەکانیاندا بۆ توێژەران و خوێنەران بەجێدەهێڵرێت، و هەتا توێژەر زیاتر ئەو نموونانە بناسێت توانای زیاتر دەبێت لەسەر بەدەستهێنانی ئەو شێوازە.

**پرسی سێیەمیش لای ئەوانەی قەناعەتیان بە بیرۆکەی ئەو شێوازە ئیسلامیە کردووە، چۆن توێژەر ئەو شێوازە لای خۆی پێکبهێنێت لە کاتێکدا زۆربەی خوێندکارانی زانستە مرۆڤایەتییەکان لە نێویشیاندا پەروەردە ڕۆشنبیریەکی ئیسلامیی قووڵیان نییە. ئایا نووسراو و خوێندنەوەی پێویست هەن یارمەتییان بدەن لەسەر بەدەستهێنانی ئەم شێوازە؟** سەرەڕای ئەوەی خوێندکاری خوێندنی باڵا و توێژەر بە شێوەیەکی گشتی هەر دەبێت خۆی خۆی پێبگەیەنێت، و سەرەڕای ئەوەی بواری خوێندنەوەی یارمەتیدەر بوارێکی فراوان و بێ سنوورە، و

سەرەڕای ئەوەی کە هەندێك جەخت لە پێویستی ئەوە دەکەنەوە کە توێژەر دەبێت خۆی خۆی پێبگەیەنێت، و ئەو هەنگاوە بنێت و سەختییەکانی بچێژێت، بەڵام من هەستم بەپێویستی خوێندکاران ولێکۆڵەران کرد بەڕێنمونێك کە یارمەتییان بدات لەسەر هەڵبژاردنی گرنگترین خوێندنەوەکان کە یارمەتییان دەدات لەسەر نووسراوی یارمەتییدەر وئەوەیە کە من لێرە مەبەستمبوو لە ((کتێبخانەی ڕوونکەرەوە بۆ شێوازی ئیسلامیی لە لێکۆڵینەوەی پەروەردەییدا وەك نموونە)).

بانگەشەی ئەوە ناکەم ئەو کتێبخانە ڕوونکەرەوەیە هەموو ئەوە لەخۆدەگرێت لەم بوارەدا کە توێژەر دەیەوێت یاخود بۆی دەگەڕێتەوە، چونکە سەرچاوە و مەرجەع و گۆڤاری زانستی زۆر هەن کە لەو کتێبخانەیەدا نین، و ئەوەندە بەسە لێرەدا ئاماژە بە دوو گۆڤاری گرنگیی وەك ((إسلامية المعرفة)) و ((المسلم المعاصر)) بکەین کە لەو لێکۆڵینەوەیەدا باسنەکراون و زۆرێك لە خوێندنەوە بەسوودەکان لەم بوارەدا لەخۆدەگرن، و ئەوەندەی باسکراوە تاڕاددەیەکی زۆر خوێنەر بێ نیازدەکات، هەروەها ویستم هەندێك لەوەی ئەو کتێبخانەیە لەخۆیدەگرێت هەڵبژێرم کە پێویستە بە لایەنی کەم وەك کەمترین ڕاددەی خوێندنەوە دابنرێت و ئەوەشی دەمێنێتەوە دەکەوێتە پاش کەمترین ڕاددەی پێویست بۆ خوێندنەوە.

هەروەها وامدانابوو بۆ هەر تەوەرێك لە تەوەرەکانی کتێبخانەکە ژمارەیەکی تر لە توێژینەوە و خوێندنەوە دابنێم خوێنەر بۆیان بگەڕێتەوە بۆ سوودمەندبوونی زیاتر، بەڵام بەم برە وەستام تاکو هەل بۆ توێژەر و خوێنەران برەخسێت خۆیان گەشە بە خۆیان بدەن و ئەوەندەی لە توانایاندایە خوێندنەوەی زیاتر ئەنجام بدەن.

**ئەم خوێندنەوانەش لە ژێر شەش تەوەردا هاتن:** دیدی ئیسلامیی تەواو کە دیدی ئیسلامیی لە مرۆڤ و گەردوون و مەعریفە و ڕەوشت و کۆمەڵگە لەخۆدەگرێت لە

کاتێکـدا نێـوان سـرووش و عـەقڵ و پـەنهان و ئاشـکرا کۆدەکاتـەوە. چـۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ قورئان و سوننەتدا کـە گـرنگترین کتێبـەکانی ڕاڤـەی قورئـان و فـەرموودە صـەحیحەکان دەخاتـەڕوو بـۆ توێـژەر، و چـۆنیەتی مامـەڵکردن لەگـەڵ کەلـەپووردا و هەنـدێك وێنـە لـەم مامەڵەکردنـە لـەڕێی چـەندین خوێندنـەوەوە، و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ هزری ڕۆژئاواییدا تاکو توێژەر ڕوانگەی تایبەت بەخۆی هـەبێت لـە مامەڵەکردنـدا لەگـەڵ ئـەم هـزرەدا، و چـۆنیەتی مامەڵـەکردنی لەگـەڵ واقیعدا، چ واقیعی هزرەکان یان کەسەکان یان شتەکان بێت و چۆنیەتیی بنیاتنانی چەمکەکان تاکو زیـاتر ئیسـلامیبن، و کـەمتر کاریگـەربن بـە چـەمکە پەروەردەییـە ڕۆژئاواییەکان.

و لەوانەیە خستنەڕووم بۆ ئەو دوو لێکۆڵینەوەیە بە مەبەستی دەرخستنی ئـەوە بێـت کـە سـودان پێویسـتیەکی زۆری بـەوە هەیـە سـوودیان لێوەربگرێـت لـە دروستکردنی ڕێبەرێکی پوختەی لێکۆڵینەوەکاندا کە هەڵگری ئاڕاسـتەی ئیسـلامین لە هەموو بوارەکاندا و بە تایبەت بواری پەروەردەی ئیسلامیی، ئەم ڕێبەرییە لەپاڵ خستنەڕووی پوختەی نامە زانستیەکاندا مامۆستا سەرپەرشتیارەکانیش بناسێنێت، لەگەڵ زانکۆ گرنگەکان کە ئەو پلانە دەبەخشن، هەروەها ئەو بابەتانـەی ئـەو نامـە زانستیانە لـە خۆیـانگرتووە. هـەروەها سودان پێویسـتی بەوەیـە خـولی ڕاهێنـانی چڕوپڕ بدات بـە خوێنـدکارەکانی ماجسـتێر و دکتـۆرای لـە هـەموو زانسـتەکاندا بـە تایبەت پەروەردە لەبارەی میتۆدی ئیسلامیەوە لە توێژینەوەدا بۆ ئەمەش سوود لە ئەزموونی میسریی وەربگرێت و هەوڵیش بدات ئەو ئەزموونە تێپەڕێنێت بەو پێیـەی بارودۆخی سیاسی هاندەرە و لە باری بۆ ڕەخسـاوە کـە پشـتگیری ئـەم ئاڕاسـتەیە دەکات، و گومانیشی تێدا نییە کەشی ئازاد و هاندان لەو هۆکاری یارمەتیـدەرن بـۆ پاڵپشتیکردنی ئەو میتۆدە و چەسپاندنی.

**لەڕێی خستنەڕوومانەوە بۆ دەرهاویشتەکانی ئەو دوو لێکۆڵینەوەیە کە پێشتر ئاماژەمان پێدان ((ڕێبەری پەروەردەیی)) و ((میتۆدی ئیسلامی)) دەتوانین نیشانە گشتیەکانی شارەزایی میسری لە بواری توێژینەوەی پەروەردەیی ئیسلامیدا بەم شێوەیەی خوارەوە بخەینە ڕوو:**

**١- دەگمەنی بوونی پسپۆڕ لە پەروەردەی ئیسلامیدا لە نێو توێژەراندا،** لە کاتێکدا دەگمەنە خوێندکاران هەردوو پلەی ماجستێر و دکتۆرا بەدەستبهێنن لە پەروەردەی ئیسلامیدا بە تایبەت لە کۆلێژەکانی تردا جگە لە ئەزهەر، ئەویش لەبەر سەختیی لێکۆڵینەوە لەم بوارەدا، کەوا لە توێژەر دەخوازێت لە کارامەییەکانی پرۆگرامەکانی توێژینەوەی ڕۆژئاوایی شارەزا بێت لە هەمانکاتدا لەگەڵ کارامەیی و پێویستیەکانی میتۆدی ئیسلامیی لە لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوەدا، بۆیە زۆرێك لە خوێندکارانی خوێندنی باڵا دەبینین بواری پەروەردەی ئیسلامیی وازلێدەهێنن پاش بەدەستهێنانی ماجستێر یان هەر لە بنەڕەتەوە ناچنە ئەو بوارەوە مەگەر لە قۆناغی دکتۆرادا نەبێت و لەوانەشە یەکێکی تر لە هۆکارەکانی سەختی ئەم بوارە نەبوونی خواستێکی کۆمەڵایەتی بێت لەسەر ئەو لێکۆڵینەوە خاوەن باکگراوندە ئیسلامیانە.

**٢- دەگمەنی بوونی پرۆفیسۆری سەرپەرشتیاری پسپۆڕ لەم بوارەدا کە توانای هەبێت سەرپەرشتیەکی زانستی ڕاست و دروست بکات لەسەر خوێندکارانی ماجستێر و دکتۆرا،** لە کاتێکدا کەمێکیان بەکردەیی نێوان ئامادەکردنی پەروەردەیی ئەکادیمی لە وێنە جیهانییەکەیدا کە لەلایەن کەسی خاوەن پسپۆڕییەکەوە دانیپێدانراوە کۆبکاتەوە لەگەڵ ئامادەکردنی لە زانستە

شەرعیەکاندا لە وێنە زانستیەکەیدا کە وایانلێدەکات شایەنی ئەوەبن سەرپەرشتی و ئاراستەکردنی وەها بابەتانێك بکەن.

**٣- نامە زانستیەکان لە پەروەردەی ئیسلامیدا سەرەڕای زۆرییەکەی کە نزیکەی دووسەد نامەیە-هەروەکو لە ڕێبەری و میتۆدۆلۆجیدا هاتووە-لایەنی مێژوویی بەسەریاندا زاڵە ئەویش بە** باسکردنی کەسە دیارەکانی پەروەردەی ئیسلامیی لە سەردەمە گەشاوە ئیسلامیەکاندا، یاخود باسکردنی ماوەیەکی مێژوویی لە سەردەمەکانی ئیسلام هەروەها دووبارەبوونەوەی زۆر تێیاندا ڕوویداوە و دەگمەنە چارەسەری گرفتێکی واقیعی پەروەردەیی بکەن، و پێشنیاری چارەسەری پەروەردەیی ئیسلامیی گونجاو بکەن و تائێستا دەستەوسانبوون لە پێشکەشکردنی جێگرەوەیەکی تیۆری و کردەیی بۆ پەروەردەی ئێستا، کە هەموو بەدەستییەوە دەناڵێنن، و جەخت لەوە دەکەنەوە کە توانای نییە نەوەکانی ئوممەت پێبگەیەنێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئاڵنگاریەکانی سەردەم.

**٤- زۆرێك لەو لێکۆڵینەوانە ملکەچی پرۆگرامەکانی لێکۆڵینەوەی ڕۆژئاوایی بوون بەبێ ئەوەی ئامرازەکانی میتۆدی ئیسلامیان هەبێت یاخود بە کارامەییەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ دەقە شەرعیەکانەوە وەستان دوور لە واقیعی پەروەردەیی هاوچەرخ** و ئەوەی دەیخوازێت لە ئامرازی توێژینەوەی نوێ بۆ چاودێریکردن و شیکردنەوەی، بۆیە زۆربەی ئەو لێکۆڵینەوانە بەجۆرێك هاتوون نزیك لە لێکۆڵینەوەیەکی شەرعیی یان ڕۆشنبیریی ئیسلامیی یان نزیك لە لێکۆڵینەوەی پەروەردەیی هەڵگری ئاراستەی ڕۆژئاوایی.

**٥- بەردەوام نەبوون و کەڵەکە بوونی مەعریفەی پەروەردەیی ئیسلامیی لەڕێی ئەو نامە زانستیانەوە،** لە کاتێکدا ئەو لێکۆڵینەوە و توێژینەوانە پەرشوبڵاو بوون و لەپاڵ زانکۆی ئەزهەردا لە ژمارەیەکی زۆر کەم لە زانکۆکاندا نەبێت دەر ناکەون و

بوونیـان بـەردەوام نابێـت لـەو کۆلێژانـەدا مەگـەر بەرێکـەوت نـەبێت لەبـەر بـوونی پرۆفیسـۆرێکی سەرپەرشـتیار کـە بایـەخ بـەم بـوارە دەدات، تـاکو کاتێـك ئـەو پرۆفیسۆرە دەبرێت بۆ شوێنێکی تر یان وەفات دەکات یان گرنگیـدان بـە بوارەکـە وازلێـدەهێنێت ئـەوکات لێکۆڵینـەوەی پـەروەردەیی هـەڵگری ئاراسـتەی ئیسـلامیی پشـتگوێ دەخرێـت، ئەمـەش لـە زیـاد لـە کۆلێـژ و بەشـێك ڕوویـداوە لـە زانکـۆ میسرییەکاندا.

**٦- نەبوونی خواستی کۆمەڵایەتی لەسەر ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە بەشێوەیەکی گشتی،** بە تایبەت لەبەردەم زلهێزی جیهانیدا کە ئیسلام بە دوژمنی ستراتیجی خۆی دەزانێت، و هەوڵدەدات ببێتـە بەربەسـت لـە نێـوان ئیسـلام و سـەرکردایەتیکردنی ژیـاریی ئوممـەت و هـەموو جیهـان. پـەروەردە لەسـەروو هـەموو لەپێشـنەییەکانی زلهێزە خۆسەپێنەرەکانی جیهان دێـت کـە هـەموو هـەوڵی خـۆی دەدات تـاکو ئـەم ئوممەتە هزرێکی پـەرورەدەیی ئیسـلامیی دەسـتنەخات دامـەزراوەی پـەروەردەیی ئیسلامیی لەسەربنیادبنرێت و بەرهەمەکەی نەوەیـەکی ئیسـلامیی ڕاسـتەقینە بێـت زەویی پڕبکات لە دادپەروەریی و ئاشتی و ڕەحمەت.

**٧- پـــەرش و بـــڵاوی کۆششـــەکانی خوێنـــدکارانی خوێنـــدنی بـــاڵا، و سەرپەرشتیارەکانیشـیان کـە باوەڕیـان بـەم بـوارە هەیـە،** پەرشـوبڵاویی کـارە زانستییەکانیان و سەرقاڵبوونیان بە کاروباری ژیانەوە و هەوڵـدان بـۆ دەسـتخسـتنی ڕۆزیی خۆیان و منداڵەکانیان، هەروەها نەبوونی ئەوەی کە پێویستیانە لە سەرچاوە و پەیوەنـــدیی زانســـتی بـــەردەوام لەنێوانیانـــدا بـــۆ بـــەردەوامیی لێکۆڵینـــەوە و بەدواداچوون لەم بوارە پەروەردەییە گرنگەدا.

**٨- لە کۆتاییدا گرنگترین ئاماژە دێت: ئەویش ئەوەیە ئەم بواری لێکۆڵینەوەی ئیسلامیە سەرەڕای هەموو ئەو سەختییانەی پێشتر ئاماژەمان پێدا، ماوەتەوە و**

**بەردەوامبووە بەهێزتربووە و گەشـەی زیاتریشـی کـردووە.** ئـەو خوێندکارانـەی خوێندنی باڵا کە دەیانەوێت لێکۆڵینەوە بکەن لە بابەتەکانی پەروەردەی ئیسلامیدا ژمارەیـان زیاددەکـات و کـەم ناکـات، و مامۆسـتا سەرپەرشـتیارەکان لـەم بـوارەی لێکۆڵینەوەدا توانا و شارەزاییان زۆرتر دەبێت لـە کارامەییـەکانی لێکۆڵینـەوە لـەم بوارەدا، و پاڵنەرێکی ئیسلامیی بەهێز هەیە کە هەمووان دەجووڵێنێت و ڕووبەڕووی سـەختییەکان دەبێتـەوە و پـاڵ هـانی هـەمووان دەدات بـۆ ڕێـك و پێکـی زیـاتر و باشترکردن و دڵسـۆزی زیـاتر لـە کارکردنـدا بـۆ خـودا، و بـە ویسـتی خـودا زلهێـزە خۆسەپێنەرەکانی جیهانیش دەستەوسان دەکات لە بـەدیهێنانی ئامانجـەکانیان لـە بواری پەروەردەییدا و لەسەروو هەمووشـیانەوە بـواری لێکۆڵینـەوەی پـەروەردەیی ئیسلامی.

**لەوانەیە هەموو ئەمانە هانمانبدەن بۆ قسەکردن لەسەر ڕێچکەی لێکۆڵینەوەی پەروەردەیی ئیسلامیی لە وڵاتی سوودانداا** کە لە ئەنجامی سەردانەکانی کۆتاییمەوە دەبینم زانایانی پەروەردەیی هەن و هەلێکی دەگمەنیان بۆ ڕەخساوە کە بۆ زۆرێك لە شارەزایانی پەروەردە نارەخسێت لە جیهانیی عـەرەبی و ئیسـلامیماندا. ئـەویش هەلی بوونی سیستمێکی سیاسـیە کـە هـەوڵی چاکسـازی دەدات لـەڕێی بنـەماکانی ئیسـلامەوە، بـەم پێیـەش سەرپەرشـتی هەوڵـە زانسـتیە ڕاسـتگۆکان دەکـات کـە ئامانجیان ژیانەوەی ژیاریی ئیسلامیە لە جیاتیی ئەوەی دژایەتییان بکات. کە هـەل بۆ شارەزایانی پەروەردە دەڕەخسێنێت لەو وڵاتەدا کاری بەکۆمـەڵی پلانبۆدارێـژراو لەپێناو بەدیهێنانی پەروەردەی ئیسلامیدا لەسەر ئەرزی واقیع بە تیۆریی و کردەیی ئەنجام بدەن.

لێکۆڵینەوەی پـەروەردەیی ئیسـلامیی لـە سـوودان‌دا ژینگەیـەکی بـۆ ڕەخسـاوە لـەخۆی دەگرێـت و چـاودێریی دەکـات لەبـەربوونی دامەزراوەیـەکی لێکۆڵینـەوەیی

پەروەردەیی ناوەندیی کە باشترین لێهاتووییەکانی بۆ کۆدەکاتەوە لە گەنجانی توێژەر و پرۆفیسۆری بەتوانا لەسەر سەرپەرشتیکردن و ئاڕاستەکردنی زانستی بۆ ئەم کارە مەزنە، جگە لە ڕەخسانی هەموو پێداویستیەکی ماددیی و مەعنەویی بۆ ئەو دامەزراوەی توێژینەوەیە تا وای لێ بکات بەکردەیی بتوانێت جێگرەوەیەکی پەروەردەیی ئیسلامیی لەسەر ئاستی تیۆریی و کردەیی پێشکەش بکات.

ڕەنگە یەکەم شتێك کە پێویست بێت بۆ ئەو دامەزراوەی توێژینەوە پەروەردەییە فەراهەم بکرێت، هێنانی سەرکردایەتییەکی زانستی بێت، کە میتۆدی ئیسلامیی بنوێنێت بەوەوە کە تێیدایە لە توانای داهێنان و بەخشش لەگەڵ باوەڕ و پەرۆشییەکی بەهێز ئەو سەرکردایەتییە بجوولێنێت و وای لێ بکات بتوانێت گرنگترین ڕەگەزی بەتوانا لەنێو گەنجانی توێژەردا هەڵبژێرێت و ئامادەیان بکات بۆ بەجێگەیاندنی ئەو ئەرکە، لەپاڵ ئەوەدا بوونی کتێبخانەیەکی زانستی کە گرنگترین سەرچاوە و مەرجیعەکان و بڵاوکراوەی زانستی خولیی و کۆششی پێشووتر لەخۆ بگرێت لە بواری بنەمادۆزیی پەروەردەیی و شەرعیدا[1]. ڕاهێنانی ئەو توێژەرانە لەسەر پێکهێنەرەکانی میتۆدی ئیسلامیی لە لێکۆڵینەوەی پەروەردەییدا و لە خۆشبەختیی ئەو توێژەرە گەنجانە ئێستا نووسینی زانستی بەهێزمان هەیە لە میتۆدی ئیسلامیی لە لێکۆڵینەوەی پەروەردەییدا کە دەتوانرێت بخوێنرێنەوە و سوودیان لێوەربگیرێت، هەروەك چۆن لە سوودان کۆمەڵێك مامۆستای پێشەنگ هەن کە دەتوانن ئەو گەنجانە ڕابهێنن لەسەر کارامەییەکانی ئەو میتۆدە بە تایبەت کارامەییەکانی: بنەمادۆزیی چەمکە پەروەردەییە بەکار هێنراوەکان، مامەڵەکردن

[1]– دەبێت لەمەدا سوود لەهەموو هەوڵەکانی پەیمانگای نێودەوڵەتیی ئیسلامیی وەرگیرێت لەم بابەتەدا، بەتایبەت پەڕەکانی کۆتا خولی ڕاهێنان لەسەر مەنهەجییەتی ئیسلامیی کەپێشتر ئاماژەمان پێدا.

لەگەڵ قورئـان و سـوننەت و کەلـەپووردا، مامەڵـەکردن لەگـەڵ هـزری ڕۆژئـاوایی و مرۆییدا بە شێوەیەکی گشتی، هەڵبژاردنی لـە پێشـینەییەکانی لێکۆڵینـەوە بـەپێی کێشـە ڕاسـتەقینەکان کـە ئوممـەت ڕووبـەڕوویان دەبێتـەوە.[١] لەگـەڵ ئـەوەی ئـەو دامـەزراوە پەروەردەییـە کـۆنگرە یـان وۆرکشـۆپێکی هـەبێت لـە لێکۆڵینـەوەی پەروەردەیی ئیسلامیدا و ئەو شـارەزایانەی پـەروەردەی ئیسـلامیی بـۆ بانگهێشـت بکـات کـە بەڕاسـتی سـەرقاڵن بـە پرسـە پەروەردەییـەکانی ئوممەتـەوە و لێکۆڵینەوەکانی هەر کۆنگرەیەك یان هـەر وۆرکشـۆپێکی لێکۆڵینـەوەیی لـە دەوری بابەتێکی دیاریکراو بێت، یان پرسێکی دیاریکراو، کە بۆ نیشتمان و ئوممەت گرنگە و باوەڕمان وا بێت خزمەت بە یەك نیشتمانی ئیسـلامیی دەکـات، لـە هـەمان کاتـدا خزمەت بە هەموو ئوممەت بکات و بودجەی پێویستی بۆ دەستەبەر بکرێت لـەپێناو بەدیهێنانی ئامانجە خوازراوەکاندا. بـاوەڕم وایـە سـوودان بـە بـارودۆخ و تواناکـانی ئێستایەوە دەتوانێت بە ویستی خودا ببێتە ئەو وڵاتـە ئیسـلامیەی کـە ئـەم پـڕۆژە ئیسلامیە مەزنە لەخۆدەگرێت.

**هاوکاریکردنی زانایان و کاربەدەستان لەسەر دۆزینەوەی چارەسەری ئیسـلامیی بۆ کێشە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی ئوممەتی ئیسلامیی نموونـەییترین وێنەیە بۆ ڕابوونی ئیسلامیی خوازراو و هاوکاریکردنی شارەزایانی پەروەردە لەگـەڵ**

---

[١]– لەوانەیە یەکەم ئەرکـەکانی شـارەزایانی پـەروەردەی گرنگیـدەر بـەم بـوارە دیـارییکردنی لەپێشـینە لێکۆڵینەوەییەکان بێت، کە دەبێت لێکۆڵەری پەروەردەیی لە ماوەی داهـاتوودا پێـوەی خـەریك بـن، وە بەجێنەهێشتنی ئەو کارە بۆ ڕێکەوت، خودی لێکۆڵـەریش هـەوڵێکی بچـووکی هەیـە بـەم ئاڕاسـتەیە وەك سەرەتایەك بۆکۆششێکی بەردەوام لەم مەسەلە گرنگەدا. بگـەڕێرەوە بـۆ: المنهجيـة الإسـلامية في البحـث التربوي، سەرچاوەی پێشوو، (ص ٥٢١–٥٣٦).

کاربەدەستەکاندا لە سەرەتای پێویستیەکانی ئەو ڕابوونەوە دێت، چونکە ڕابوونی ئیسلامیی ڕوو نادات بەبێ موسڵمانی ڕاستەقینە و موسڵمانی ڕاستەقینەش نابێت بەبێ پەروەردەیەکی ئیسلامیی دروست. جا ئایا زانایانی پەروەردەی سوودان دەتوانن ئەو نموونەیە پێشکەش بکەن لەم بوارەدا؟ هیوا خوازین... و دەڵێم: ئێوە کار بکەن ئێمەش لەگەڵتاندا کار دەکەین... و خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ﴾{التوبة: ١٠٥} واتە: ((بەوانە بڵێ: کردەوە بکەن جا بێگومان خودا و فروستادەکەی و بڕواداران کردەوکانتان دەبینن)).

وبالله التوفيق

***

# ژیاننامەی نووسەر

ناو: عەبدولڕەحمان عەبدولڕەحمان نەقیب.

مێژوو و شوێنی لەدایکبوون: ١٩٤٢/٨/٢١ز –الدقهليه–مصر.

- بڕوانامە زانستییەکان:

- لیسانس لە ئاداب، زانکۆی قاهیرە، ساڵی (١٩٦٢ز).

- ماجستێر لە فەلسەفەی پەروەردەدا، ناونیشانی نامەکە: الآراء التربوية في كتابات ابن سينا (واتە: بۆچوونە پەروەردەییەکان لە نووسینەکانی ئیبن سینادا)، زانکۆی عەین شەمس (١٩٧٠ز).

- دکتۆرا لە فەلسەفەی پەروەردە، ناونیشانی نامەکە: الإصلاح التربوي في الأزهر (واتە: چاکسازی پەروەردەیی لە ئەزهەردا) (١٨٧٢–١٩٧٢ز) كليه التربيه – جامعة إكستر، إنجلترا، (١٩٨٠ز).

The Education Reform of Al-Azhar (1872-1972), Exter University, England (1980).

- چالاکی زانستی:

- بەشداریی لە چەندین کۆنگرەی زانستی نەتەوەیی و جیهانیدا کردووە.

- سەرپەرشتیی چەندین نامەی زانستی ماجستێر و دکتۆرای کردووە.

- کتێب و نووسین و بڵاوکراوەکانی:

- التربية العلمية: أسسها النظرية وتطبيقاتها، بالإشتراك مع نخبة من أعضاء هيئة التدريس، كلية التربية – جامعة المنصورة، مكتبة الأنجلو المصرية، (١٩٨٢م).

- بحوث التربية الإسلامية: ثلاثة أجزاء، دار الفكر العربي، القاهرة، (١٩٨٣م، ١٩٨٤م، ١٩٨٧م).

- مقياس الإلتزام الديني لدى الشباب المسلم، بالإشتراك مع د. محمد لبيب النجيحي، د. إسماعيل محمد دياب، الأنجلو المصرية (١٩٨٣م).
- بعض القوى والعوامل المؤثرة على التدين الإسلامي لدى الشباب الجامعي، دراسة ميدانية، بالإشتراك مع إسماعيل محمد دياب، دار الفكر العربي (١٩٨٣م).
- التأهيل التربوي في مصر، دراسة تقويمية لإحدى الدورات بالإشتراك مع د. إسماعيل محمد دياب، دار الفكر العربي (١٩٨٣م).
- الإعداد التربوي والمهني للطبيب عند المسلمين، دار الفكر العربي، (١٩٨٤م).
- مقدمة في التربية وعلم النفس، بالإشتراك مع الدكتور صلاح أحمد مراد، المنظمة الإسلامية للتربية والعلوم والثقافة، الرباط، (١٩٨٧م).
- التربية الإسلامية: رسالة ومسيرة، دار الفكر العربي، (١٩٩٠م).
- دليل مستخلصات الرسائل الجامعية في التربية الإسلامية بالجامعات المصرية والسعودية، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، فرع عمان، الأردن، (١٩٩٣م).
- التربية الإسلامية في مواجهة النظام العالمي الجديد، دار الفكر العربي، (١٩٩٧م).
- أولوية الإصلاح التربوي، الكتاب رقم (١) من سلسلة: نحو وعي تربوي مغاير، دار النشر للجامعات، القاهرة، (١٩٩٧م).
- نحو تأصيل إسلامي للبحث التربوي، الكتاب رقم (٢)، من سلسلة: نحو وعي تربوي مغاير، بالإشتراك مع د. منى علي السالوس، دار النشر للجامعات، (١٩٩٩م).
- المنهجية الإسلامية في البحث: التربية نموذجا، النظرية والتطبيق، دار الفكر العربي، (٢٠٠٣م).

***